سال‌ها پیش پیرزنی در یک دهکده زندگی می کرد. او تنها بود و دختری داشت که با همسرو بچه‌هایش در روستای دیگری زندگی می کرد. مدت‌ها بود که پیرزن از دخترش خبری نداشت، به همین خاطر با خودش تصمیم گرفت پیش دخترش برود و او را ببیند. پیرزن برای اینکه به خانه دخترش برود باید از جنگل عبور می کرد و از کوه بالا می رفت. پیرزن در این فکر بود که برای نوه‌هایش سوغاتی ببرد. سراغ گاوش رفت و او را دوشید و با آن برای نوه‌هایش کلوچه‌های خوشمزه درست کردو مقداری هم تخم مرغ جمع کرد. بعد گره چارقدش را محکم بست و بقچه‌اش را برداشت و به راه افتاد تا به جنگل ترسناکی رسید.



مدتی نگذشته بود که گرگ بدجنسی از پشت درخت جلوی پیرزن پرید و در حالی که آب دهانش راه افتاده بود گفت: به به، چه غذای خوشمزه ای. ننه پیرزن کجا می ری؟ خوش آمدی، فکر می کنم یک ذره بتوانم شکم خود را سیر کنم. پیرزن با ترس و لرز گفت: آقا گرگه شما تاج سر مایی من که چیزی نیستم، هزار تا پیرزن فدای سرتان. من یک پیرزن مردنی هستم، اجازه دهید تا بروم خانه دخترم و غذا بخورم، چاق و چله بشوم بعد بیایم شما مرا نوش جان کنید. آقا گرگه سرش را تکان داد و گفت: باشه برو اما خیلی زود برگرد. پیرزن خوشحال شد و زود راه افتاد.




له زنجیره بڵاوكراوەكانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە

زنجیرەی كتێب ٦٥

# مێژووی ڕەخنەسازی

**پ.د.كامل حەسەن بەسیر**

كۆكردنەوە و ئامادەكردن: **د. گیان كامل بەسیر**

- پێداچوونەوەی: عەبدولڕەحمان مەعروف
- سەرپەرشتی گشتیی كتێب: ماردین ئیبراهیم
- دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆك: ئاكار جەلیل كاكەوەیس
- چاپ: یەكەم/ ٢٠١٥
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ١٢٠٠٠ هەزار دینار
- بڵاوكار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان ژمارە(١٣٠٧)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە

# پێرست

پێشەکی/ ل ١١
گەواهییە زیندووەکان/ ل١٣

بەشی ١/مێژووی ڕەخنەسازی/ ل١٧
سەرچاوەی لە دایکبوونی ڕەخنەسازی

بەشی ٢/چەمکی ڕەخنەسازی/ ل٢٣
زاراوەی ڕەخنەسازی
زاراوەی (النقد) لە زمانی عەرەبیدا
زاراوەی (Criticism) لە زمانی ئینگلیزیدا
زاراوەکانی ڕەخنەسازی لە زمانی کوردیدا

بەشی ٣/سنووری ڕەخنەسازی/ ل٢٩
سنووری جیاکەرەوەی ڕەخنەسازی
ڕەخنەسازی و وێژە
ڕەخنەسازی و مێژووی وێژە
پەیوەندیی ڕوانیێژی بە ڕەخنەسازییەوە
نموونەیێکی پەیڕەویکراو بۆ دەستنیشانکردنی سنووری جیاکەرەوەی ڕەخنەسازی

بەشی ٤/بەراوردکاری/ ل٣٧
بەراوردکاری

بەشی ٥/قۆناغەکانی ڕەخنەسازی/ ل٤٣
قۆناغە گشتییەکانی ڕەخنەسازی
قۆناغی ڕەخنەسازیی پسپۆڕ
ڕێبازەکانی ڕەخنەسازی
ڕێبازی ڕەخنەسازیی مێژوویی
کەموکوڕی ڕێبازی مێژوویی لە ڕەخنەسازیدا
ڕێبازی هونەری
بناغەکانی ڕێبازی هونەری
ڕێبازی دەروونی
ڕێبازی هەمەڕەنگە
ڕێچکە مێژوویییەکانی ڕەخنەسازی

بەشی ٦/یۆنان و ڕەخنەسازی/ ل٦٣
میللەتی یۆنان
شارستانێتی یۆنانی
وێژەی یۆنانی
سەرەتای ڕەخنەسازیی یۆنانی
ڕەخنەسازیی یۆنانی پێش پەیدابوونی بیروڕا ڕەخنەسازییەکانی ئەفلاتوون
سوکرات و ئەفلاتوون
سەرچاوە ڕەخنەسازییەکانی ئەفلاتوون
بناغەی هەڵوێستی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراو
نرخی هونەری هۆنراوە لە لای ئەفلاتوون
چەمکی ئەفلاتوون دەربارەی سروشتی لاساییکردنەوە
چەمکی ئەفلاتوون دەربارەی سروشتی لاساییکردنەوە
هۆی دەرخستنی ئەم هەڵوێستەی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراو و هەستیاران
ئاکامی بیروڕاکانی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراو لە ڕەخنەسازیی جیهانیدا
ئەرستۆ و هونەری هۆنراو
سەرچاوەی هۆنراوە لە لای ئەرستۆ
چەشنەکانی هۆنراوە لە لای ئەرستۆ
هونەری لاساییکردنەوە لە ئەفلاتوونەوە بۆ ئەرستۆ
بناغەکانی شانۆگەری لە لای ئەرستۆ
بیردۆزەکەی ئەرستۆ دەربارەی زمان
ئەرستۆ و وشە
سنووری وشە لە لای ئەرستۆ
زمان و هۆشمەندی لە لای ئەرستۆ
ڕستە و ڕاستی لە لای ئەرستۆ

ڕێبازی ئەرستۆ بۆ هەڵسەنگاندنی زمان
ئەرك و ئامانجی زمان
بناغەکانی گواستنەوەی وشە لە واتای حەقیقییەوە بۆ واتای مەجازی

**بەشی ٧/عەرەب و ڕەخنەسازی/ ل٩٥**
ڕەخنەسازیی عەرەبی
نەتەوەی عەرەب و هونەری هۆنراوە
لەدایکبوونی ڕەخنەسازیی عەرەبی
شوێن و بەشداریکەرەکان لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا
چەشنەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا
تایبەتییەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا
ڕەخنەسازیی عەرەبی لە بەرەبەیانی سەردەمی ئیسلامدا
چەمکی هۆنراوە لە قورئانی پیرۆزدا
پێوانەی قورئانی پیرۆز لە دابەشکردنی شاعیراندا
پێوانەکانی جیاکردنەوەی شاعیرە پەیامدارەکان
پێغەمبەر ( د.خ.) و هۆنەری هۆنراوە:
پێوانەی پێغەمبەر(د.خ.) لە هەڵسەنگاندنی هونەری هۆنراوەدا
مەسەلەی فۆرم لە هونەری هۆنراوەدا و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.)
ئەمریی هونەری هۆنراو لە ژیانی نەتەوەی عەرەبدا
ئەرکی هۆنراو لە تێڕوانینی پێغەمبەر(د.خ.)
بناغەکانی ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ.) لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا
چەند تێبینییەکی ڕەخنەسازی لە لای جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ.)
جێنشین عومەر (ڕ.خ.) و ڕەخنەسازی
جێنشین عومەر و مەسەلەی پەیامداری لە هونەری هۆنراوەدا
ڕەخنەسازیی عەرەبی دوابەدوای سەردەمی جێنشینەکان
ڕەخنەسازیی عەرەبی لە کۆڕی زانا تابیعییەکاندا
بناغەکانی کوڕی تەمیمیە لە ئینکاری بوونی مەجازدا
ڕەخنەسازیی عەرەبی لە کۆڕی زاناکانی ڕێزمان و زمانەوانیدا
ڕەخنەسازیی عەرەبی پاش سەردەمی جێنشینەکان

**بەشی ٨/ژینگەی ڕەخنەسازیی عەرەبی/ ل١٢٥**
ژینگەی ڕەخنەسازیی عەرەبی
ڕەخنەسازیی عەرەبی لە ژینگەی حیجازدا
ژینگەی شام
ژینگەی عێراق

**بەشی ٩/سەرچاوەی ڕەخنەسازیی عەرەبی/ ل١٣٥**
بابەت و سەرچاوە ڕەخنەسازییەکانی نەتەوەی عەرەب

**بەشی ١٠/کاروانی ڕەخنەسازیی عەرەب/ ل١٣٩**
یەکەم: کوڕی سەلامی جومەحی
پێوانەی کوڕی سەلامی جومەحی لە دابەشکردنی هەستیارەکاندا
چەمکی ڕەخنەسازیی لای کوڕی سەلامی جومەحی
توێژینەوەی دەقی ویژەیی لە کتێبی چینە هەستیارەکاندا
دووەم: کوڕی قوتەیبەی دەینەوەری
چەشنەکانی هۆنراوە لە چەمکی کوڕی قوتەیبەدا
پێوانەی کوڕی قوتەیبە لە دەستنیشانکردنی هۆنراوەی پایەبەرز
کوڕی قوتەیبە و سەرچاوەی هۆنراوەی ڕاستینە
سێیەم: قودامەی کوڕی جەعفەر
پێناسەی هۆنراوە لە نێوان ئەرستۆ و قودامەی کوڕی جەعفەردا
کەموکوڕی پێناسەکەی قودامە دەربارەی شیعر
پێوانەکانی قودامە لە هەڵسەنگاندنی هۆنراوەدا
چوارەم: کوڕی تەباتەبای عەلەوی
کوڕی تەباتەبای عەلەوی و بناغەکانی سازکردنی هەڵبەست
کوڕی تەباتەبای عەلەوی و یەکێتیی بابەت لە هەڵبەستدا
کوڕی تەباتەبای عەلەوی و مەسەلەی ڕاستگۆیی لە هۆنراوەدا

**بەشی ١١/نوێخوازی و هۆنراوەی عەرەبی/ ل١٥٧**
نوێخوازی لە هۆنراوەی عەرەبیدا
سروشتی نوێخوازی لە هۆنراوە و ڕەخنەسازیی عەرەبیدا
ڕەخنەسازی و مەسەلەی دزیی ویژەیی
چەشنەکانی پەیوەندیی لە نێوان ویژەرەکاندا
چەند بنواشەیەك بۆ جیاکردنەوەی بەرهەمی هاوبەش و دزیی ویژەیی

**بەشی ١٢/لە نێوان ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازیدا/ ل١٦٧**
زۆرانبازی نێوانی ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژی

**بەشی ١٣/کتێبی (الصناعتین) لە نێوان ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژیدا/ ل١٧١**
زانایێکی بلیمەت لە کۆڕی ڕەوانبێژیی عەرەبیدا

**بەشی ١٤/ڕەخنەسازیی ئەورووپی/ ل١٧٧**
ڕێبازی کلاسیزم لە هۆنراوەدا
میان و ئامانجی ڕێبازی کلاسیزم لە ڕەخنەسازیدا

بنەرەتی لاسایکردنەوە
بنەرەتی شانۆگەریی ئامانجدار
بنەرەتی مانیزم لە ڕێبازی کلاسیزمیدا

**بەشی ١٥/کلاسیزم و وێنەی هونەری/ ل١٨٧**
ڕێبازی کلاسیزم و وێنەی هونەری لە زمانی هۆنراوەدا

**بەشی ١٦/ڕۆمانتیزم/ ل١٩١**
سەرچاوە و زاراوەی ڕۆمانتیزم

**بەشی ١٧/ڕۆمانتیزم و ڕەخنەسازی/ ل١٩٧**
ڕەوتی ڕۆمانتیزمیی و ڕێبازی ڕەخنەسازی

**بەشی ١٨/زاراوەی ریالیزم و مەبەست لە بەکارهێنانی/ ل٢٠٣**
یەکەم: ریالیزمی فۆتۆگرافی
دووەم: ریالیزمی ڕەخنەگری
سێیەم: ریالیزمی سۆشیالیزمی

**بەشی ١٩/ڕۆماننووسی سەرکەوتوو/ ل٢٠٩**

**بەشی ٢٠/ڕێبازی سروشتی/ ل٢١٥**
ڕێبازی سروشتی و ئەمیل زۆلا
ڕێبازی سروشتی لە ڕەخنەسازیدا
سەرئەنجامی ڕێبازی سروشتی

**بەشی ٢١/پەرناسیزم/ ل٢٢٣**
ڕێبازی پەرناسی
سروشتی ڕێبازی پەرناسی
ڕوخسار و ناوەڕۆك لە ڕێبازی پەرناسیدا
بنواشەکانی ڕازانەوەی شێواز و ڕوخساری ڕەسەن
هونەر و دەستووری ڕەخنەسازی
بۆدلێر و زمانی هۆنراوە

**بەشی ٢٢/ڕێبازی ڕەمزی/ ل٢٣٥**
بنەرەتەکانی ڕێبازی هێمایی "ڕەمزی"
ڕامبۆی هەستیاری بەناوبانگ و ڕێبازە نوێیەکەی لە هۆنراوەدا
ئەرکی وشە لە هۆنراوەدا
هۆنراوەی سەربەست
ڕووگەی مالارمیە و ڕێبازی هێمایی
لەدایکبوونی ڕێبازی هێمایی لە ڕەخنەسازیدا
بیردۆزەکەی ڕنیە غیل لە مۆسیقای وشەدا

**بەشی ٢٣/ڕێبازی سریالیزم/ ل٢٤٧**
زەمینەی بەرپابوونی ڕێبازی سریالیزم
واتا و سروشتی ڕێبازی سریالیزم
ئامانج و تایبەتییەکانی ڕێبازی سریالیزم
هەڵسەنگاندنی ڕێبازی سریالیزم

**بەشی ٢٤/ڕێبازی وجوودی/ ل٢٥٣**
چەمك و واتای وجوودی
بناغە و سەرئەنجامەکانی فەلسەفەی بوونیەتی
خود و ڕەوشت و ژیان
ڕێبازی وجوودی و ئازادیی کەسیی
پەیامداری لە وێژە و ڕەخنەسازیی وجوودیدا
بەراوردکارییەك لەنێوانی پەیامداریی وجوودییەت و پەیامداری لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا

**بەشی ٢٥/شاسوارانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی/ ل٢٦٣**
یەکەم: ڕەخنەسازی ئینگلیزی ولیەم وردس ورپ
چەمك و واتای هۆنراوە
هۆشمەندی و هەڵچوون لە کۆڕی هۆنراوەدا
جیاوازی لەنێوانی هۆنراوە و پەخشاندا
وردسورپ و یەکێتیی هۆنراوە و پەخشان
وێنەی هونەری و زمانی هۆنراوە
ڕێبازی هۆنراوە بەرەو کۆڕی جیهانی
دووەم: ڕەخنەسازی بەناوبانگ هنری جیمس
هنری جیمس و هونەری ڕۆمان
ڕەگەزەکانی ڕۆمان
چەشنەکانی ڕۆمان
ڕۆمان و کورتەچیرۆك
ڕەنگاوڕەنگیی کۆڕی ڕۆماننووس
ئەرکی ڕەخنەسازی لە پێناوی نرخێندانی ڕۆماندا
سێیەم: ڕەخنەساز و فەیلەسوفی بەناوبانگ هیگل
چەمکی تراژیدیا
هیگل و زۆرانبازی تراژیدیا
تراژیدیای نموونەیی لە ڕوانگەی هیگلەوە
هەڵسەنگاندنی بیروڕاکانی هیگل

چوارەم: ڕەخنەساز و هونەرمەندی ئینگلیزی هربرت رید
بەرپابوونی سریالیزم لە ژینگەی ئینگلیزیدا
هربرت رید و زاراوەی سریالیزم
سەرچاوەی هۆنراوەی سریالیزمی لە نێوانی ئەفلاتون و ریددا
پێنجەم: ڕەخنەساز و دەروونناس س. ج. یونج
وێژە و زانستی دەروون
فرۆید و داهێنانی دەقی وێژەیی
یونج و داهێنانی وێژە لە کەسایەتییەوە بۆ سەرچاوەی مرۆڤایەتی
حەوتەم: ڕەخنەساز و هەستیار و فەیلەسووفی ئینگلیزی ستیفن سبندر
مەرجەکانی هەستیار و هۆنراوەی لە یاسا و دەستوورلاداو
خورپە و کاری هونەری
بیری هەستیار
بڕوای هەستیار
هەشتەم: ڕەخنەسازی چەشە. داڤید هیوم
جیاوازی چەشەی خەڵکی
زمان و یەکێتیی چەشە
ڕێگا بۆ سازکردنی پێوانەی چەشە
بناغەکانی چەشەی ڕاستینە
ڕەخنەساز و چەشەی ڕاستینە
نۆیەم: ڕەخنەسازی بە ناوبانگ ماپیو ئارنۆلد
نەمریی هۆنراو
گرنگیی هۆنراو
پێوانەی بەرزیی هۆنراو
هەڵە سەرەکییەکان لە هەڵسەنگاندنی هۆنراودا
پێوانەی هەڵسەنگاندنی هۆنراوەی بەرز
دەیەم: "هاری لیڤن"ی ڕەخنەساز و نووسەری ئینگلیزی
ڕووگە و ڕێبازە زانستییەکان لە لێکۆڵینەوەی وێژەییدا
چارەنووسی بیرۆکەی خورپە و بەهرە لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا
هەڵەی زانست لە توێژینەوەی وێژەی نەتەوایەتی بیانی (بێگانە)دا
ڕەخنەسازە کۆمەڵایەتییەکان
پەیوەندیی گۆڕان و پەرەسەندنی چەشنی وێژەیی
یازدەم: "ئای. ئی. ڕیتشاردز"ی ڕەخنەسازی بەناوبانگ
ڕەخنەسازیی کارتێکردن
بیردۆزەکەی فرۆید لە ڕاڤەکردنی هونەر
هۆیێکی دیکە لە هۆیەکانی بەرپابوونی ڕەخنەسازیی کارتێکردن
بابەت و سەرچاوەی جوانی
ڕیتشاردز و زمانی هۆنراو
ڕیتشاردز و جوانناسی
خستنەڕووی هۆیەکانی جوانی
دوازدەم: "لاسل ئابر کرومبی"ی مێژوونووس و ڕەخنەسازی ئینگلیزی هاوچەرخ
سوکرات و ڕەخنەسازی
بەهرەکانی جیهانی وێژە
ئەرکی ڕەخنەسازی
سروشتی ڕەخنەسازی
بوارەکانی ڕەخنەسازی
پێناسەی وێژە
لایەنەکانی وێژە
ئامانجەکانی وێژە
کەرەسەی وێژە
بنەڕەتی سەرەکی ڕەخنەسازی
چلۆن ئاڤێکردنەوەی وێژەیی دەگەیەنرێتە خوێنەر
زمانی وێژە
دابەشکردنی وێژە
سێزدەهەم: سامۆئێل تیلور کولردج"ی ڕەخنەساز
بەهرەی گشتی و وزەی تایبەتی لە هونەری هۆنراوەدا
تایبەتی وێنەی هونەری
تایبەتی قووڵی و چالاکی بیری
سەرچاوەکانی بلیمەتیی شکسپیر
چواردەهەم: مەسەلەی هۆنراوەی دراما لەبەر تیشکی دەمەتەقێی "ت.س.ئەلیۆت"دا
هونەری دراما لە ئەرستۆوە بۆ درایدن
ئەرکەکانی هونەری دراما
ڕوخسار و زمانی دراما
هونەری دراما لە کۆت و زنجیری هەڵبەستەوە بەرەو ئاسۆی هونەری باڵێ
ڕەگەزەکان و ئامانجی هونەری باڵێ
پازدەهەم: داڕشتنی ڕۆمان و "ی.م. فورستەر"ی ڕەخنەسازی بەناوبانگ
کەسایەتی لە نێوان ئەرستۆ و "ی.م.فورستەر"ی ڕەخنەسازی بە ناوبانگ
ئەرکی ڕۆمان
داڕشتنی ڕۆمان
خوێنەر و داڕشتنی ڕۆمان
تایبەتییەکانی داڕشتنی ڕۆمانی سەرکەوتوو
شازدەهەم: ئەرکی ڕەخنەساز لە نووسینەوەکەی ر.ب. بلاکمور دا

هۆنراوە و ژیان
دوو ڕێبازی جیاواز بۆ دەربڕین لە ڕاستی
وتارێکی فەلسەفی دەربارەی هۆنراوە
کتێبێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی لە تەرازووی ڕەخنەسازیدا
ئەرکی ڕەخنەساز

**بەشی ٢٦/مێژووی ڕەخنەسازیی کوردی/ ل٣٦١**
داهێنان و خوڵقاندن لە هێنانەبەرهەمی هۆنراوە
زمانی هۆنراوە
ڕەخنەسازیی بەراوردکاری
نووسینەوە بە زمانی کوردی
باری هۆنراوەی کوردی و ڕۆشنبیری و ڕەخنەسازی
باری هۆنراوەی کوردی و ڕۆشنبیری و ڕەخنەسازی

**بەشی ٢٧/کوردی و حاجی قادری کۆیی/ ل٣٧١**
هەستیاری بەناوبانگ. کوردی
حاجی قادری کۆیی و ڕەخنەسازی

**بەشی ٢٨/گەشتێ لەگەڵ کتێب و نووسەرانی مێژووی وێژەی کوردیدا/ ل٣٨١**
ئەمین فەیزی بەگ
کتێبی ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد
سەنعەتکاری لە ڕوانگەی ئەمین فەیزی بەگەوە
شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە تای ترازوی ڕەخنەسازیدا

**بەشی ٢٩/قوتابخانەی هۆنراوەی کوردی/ ل٣٨٩**
مەولەوی لە ڕوانگەی ڕەخنەسازییەوە
زانست و هۆنراوە
پیشەی هەستیارێتی

**بەشی ٣٠/بیاریی لاوان و زمان و وێژەی کوردی/ ل٣٩٥**
وەلی دێوانە لە ڕوانگەی وێژەی بەراوردکارییەوە
سەرچاوەی هەستیارێتی وەلی دێوانە
سەرگوزشتەی وەلی دێوانە و هەڵوێستی ڕەخنەسازی
نموونەیەك لە هۆنراوەی وەلی دێوانە

**بەشی ٣١/شعر و ئەدەبیاتی کوردی/ ل٤٠٥**
ئامانجی شعر و ئەدەبیاتی کوردی

حەمدی صاحێبقران
هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەسازی
پێوانەی وشەسازی و هەڵسەنگاندنی هۆنراو
لایەنی ناهەمواری (سلبی) هەستیاران
نرخپێدانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی وەك ڕەخنەسازێك
پێوانەی کوردی پەتی لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا

**بەشی ٣٢/یادگاری لاوان و ڕەخنەسازیی کوردی/ ل٤١٧**
نەبوونی ڕەخنەسازیی کوردی
پێوانەیەکی ڕەخنەسازیی بۆ دەستنیشانکردنی پلەی هەستیاران
بەرپەرچدانەوەی پێناسە لاسایی کەرەوەکەی هۆنراوە
بوونی شیعری کوردی
خودی بابەتی هۆنراوەی کوردی
هۆنراوەی دڵداری کوردی
چارەسەرکردنی باری هۆنراوەی کوردی

**بەشی ٣٣/مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی و ڕەخنەسازی/ ل٤٣١**
هۆنراوە و ڕێبازی واقیعیەت
ڕێژمان و ڕەخنەسازی
مامۆستا ا.ب هەوری و وتارەکەی د. یوسف هەیکەل
چەشنەکانی ڕەخنەسازی
سوودی ڕەخنەسازی
دڵداری هەستیار لەنێو گری ڕەخنەسازیدا
زەمینەی زۆرانبازیی ڕەخنەسازی
بۆچوونە ڕەخنەسازییەکانی مامۆستا
زانستەکانی وێژە لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانی دڵداردا
دڵدار و هۆنراوەی چیرۆك
دڵدار و هۆنراوەی دڵداری
سەردەستەی نووسەرانی گۆڤاری گەلاوێژ و مامۆستا ڕەفیق حیلمی
مامۆستا (جیم) و بەرپەرچدانەوەی بۆچوونەکەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی
مامۆستا ڕەمزی قەزاز و مامۆستا "جیم" لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا

**بەشی ٣٤/ڕۆشنبیرە کوردەکان و کتێبی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی/ ل٤٥٥**
ڕەخنەسازیی تەتبیقی

مامۆستا جیم لە تای ترازووی ڕەخنەسازیدا
سوودی وێژەی بێگانە بۆ وێژەوە کوردەکان
پێویستی ڕەخنەسازی و دەوری ڕەخنەساز
دەستەقتییەکی تر لەگەڵ مامۆستا ڕەمزی قەزازدا
مامۆستا یێکەس و مامۆستا أ.ب.هەوری لە کۆڕی بزووتنەوەی ڕەخنەسازیدا
بەرپرسیارێتی گۆڤاری کوردی
هەڵسەنگاندنێکی گشتی بۆ چوارینەکانی مامۆستا أ.ب.هەوری
فەلسەفەی خیام و مامۆستا هەوری
بەرێوەبەرانی گۆڤاری گەلاوێژ و دەستەقاڵەی وێژەیی
ناونیشان و ناوەرۆک
خەڵکی و هەڵسەنگاندنی هۆنراوە
زمانی ڕەخنەسازی و سازکردنی وێژە
ئەرکی ڕەخنەساز
مامۆستا گۆران و کەڵکی ئەدەب
بەراوردکاری لە نێوان زانست و وێژەدا
مامۆستا گۆران و ئەرکی وێژە
شێخ سەلام و چوارینەکانی خیام لە تای ترازووی دڵداری هەستیاردا
شێخ سەلام و وەرگێڕانی چوارخشتەکییەکانی خیام
ئەرکی چوارخشتەکییەکانی خیام
یێکەسی ئەمر، مامۆستا کاردۆخی لە تای ترازووی شیعردا هەڵسەنگێنێ
ناوەرۆکی هۆنراوە
هەڵوێستی یێکەس لە هونەری وشەسازیدا
سەرواسازی
سازکردنی وێنەی هونەری
شعر و شاعر لە وتارە ڕەخنەسازییەکەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵدا
پێناسە و سەرچاوەی هۆنراوە
دەور و ئەرکی هەستیار
پێرانەی نوێخوازی لە هونەری هۆنراوەدا
میرزا مارف شیعرێکی پیرەمێرد هەڵسەنگێنێ
پلەی پیرەمێرد لە خزمەتکردنی وێژەی کوردیدا
نرخپێدانی پیرەمێرد
هەڵەی کێش

**بەشی ٣٥/پەیدابوونی شیعر / ل٤٩٧**

کۆنی پەیدابوونی هۆنراو
دێرینیی پەخشان
بابەتەکانی هۆنراوە

**بەشی ٣٦/نووسین و ڕەخنە/ ل٥٠٣**

پێناسەی ڕەخنەسازی
ئەرکی ڕەخنەساز
چەشنەکانی ڕەخنەسازیی

**بەشی ٣٧/سەرچاوەکان/ ل٥٠٩**

بەڵگەنامەکان
ژیاننامە

# • پێشەکی

(مێژووی ڕەخنەسازی)، پێکهاتووە لە چەندەها بابەتی قووڵ لە دووتوێی ٣٦ بەشدا، هەر بەشێکی باس لە چەند بیرۆکەیەك دەکا، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی پێکهاتووە لە مێژووی ڕەخنەسازی، لای پسپۆڕان و زانایانی بیانی و کورد و عەرەب، کاتی خۆی خوالێخۆشبووی باوکم "پ. د. کامل بەسیر" ئەم بابەتانەی لە شێوەی زنجیرە بۆ ڕادیۆی کوردی کۆماری عێراق ئامادەکردبوو و هەر لەوێش پەخش کراوە، نیازیشی وابوو دواتر ئەم بابەتانە بخاتە دووتوێی کتێبێك و بە ناوی (مێژووی ڕەخنەسازی لە جیهاندا) چاپ بکاتە بەڵام بەداخەوە مەرگ ڕێی ئەوەی پێنەدا ئەم کارەو زۆر کاری تری بە ناتەواوی مایەوە، ئێمەش وەك پێداویستییەکی ڕۆشنبیری و وەفایەك بۆ گیانی د. کامل شانمان دایە بەر ئەو کارە. لە ئەنجامدا توانیمان ئەم بابەتانە بە هاوکاری مامۆستا کاروان مەهدی کۆبکەینەوە و لە بەشی یەکەمەوە دەستمان پێکرد هەتا بەشی شەشەم توانیمان ئەم بابەتانە لێ دووتوێی کتێبێکدا بڵاو بکەینەوە ئەمەش لە سۆنگەی خەمخۆریمان بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو بەرهەمە تا بکەوێتە بەردەستی خوێنەران و ئەدەبدۆستان و خوێندکارانی ئەدەبیات بە گشتی و ڕەخنەسازی بەتایبەتی.

- یەکەم هەوڵێك بۆ سەرخستنی ئەو بیرۆکەیە لەلایەن دایکم (شاپەڕ عەلی ئەمین)ەوە بوو، کە

بەشی یەکەمی لە ساڵی ١٩٩٣ بە ناوی (مێژووی ڕەخنەسازی) کە لە (سەرچاوەی لە دایکبوونی ڕەخنەسازی)یەوە دەستپێدەکا تا دەگاتە (ڕەخنەسازی عەرەبی) لە بەغدا بە چاپگەیاند، وا بڕیاربوو بەشەکانی دیکەشی بەدوادابێن، بەڵام بوار نەبوو تا ساڵێک لەمەوبەر بۆ تەواوکردنی ئەم هەوڵە، کە جارێکی دیکە من و دایکم گەڕاینەوە سەر بابەتەکە بۆ بڵاوکردنەوەی هەموو بەشەکانی لە دووتوێی کتێبێکدا، کە ئەوەی بەردەست ئەنجامی ئەو هەوڵ و شەونخوونییەیە.

- دیارە ئەم بابەتانە وەك لە ناوەڕۆکەکەیاندا دەردەکەوێ لە سەرەتای هەشتاکان نووسراون و کتێبەکە بە پێی بابەتەکان و سەرباسەکان دابەشی سەر ٣٦ بەش کراوە، پ. د. کامل ئەم دابەشکارییەی بەبێ ناولێنانی هەربەشێك کردووە، بۆیە لە هەر بەشێك لەو ٣٦ بەشەدا بە پێی گرنگی ئەو بابەتەی بەشەکەیان لێ پێکدێت ناو لە بەشەکان نراوە.

- لە پێناو باشتر خوێندنەوەی دەقەکان ڕێنووسی کتێبەکە خراوەتەسەر شێوەنووسینی باوی ئێستا و هەندێك لە وشە و زاراوە بەکارهاتووەکانیشمان هێناوەتە سەر شێوازی ڕێنووسی ئەمڕۆ، لەوەشدا پرسیارمان لەو کەسانە کردووە کە شارەزای ئەو بوارەن.

هیوادارم بەو هەوڵەمان توانیبێتمان خوێنەران و ئەدەبدۆستانی گەلەکەمان بە دیوو بۆچوون و بەرهەمێکی دیکەی پ. د. کامل ئاشنا بکەین.

**د. گیان کامل بەسیر**
**سلێمانی ٢٠١٤**

# • گەواهییە زیندووەکان[١]

- پرۆژەی گەڕاندنەوەی مێژووی ڕێژەی کوردی، پرۆژەی ژیانمە کە تێیدا بەردەوام دەبم.
- خەبات و تێکۆشانی ئافرەتی کوردستانی بە شێوەی ئافرەتانەی بەرچاو بە خاتوو حەفسە خانی نەقیب خێزانی قادری حەفید سەرۆك وەزیرانی شانشینی کوردستان دەست پێ دەکا.
- بەداخەوە نەبوو کە بە دەریادا تێبپەڕم، بەڵام لە خێزانەکەم و هەندێك لەو هاوڕێیانەی کە خۆشیان دەویستم بەو بەلەمە گەیشتم.
- بەکارهێنانی زاراوەی زاری وێژەیی و زاراوەی زمانی یەکگرتوو ڕەتدەکەمەوە لە بری ئەمانە زاراوەی زمانی نەتەوەیی هەڵدەبژێرم، چونکە بەم زاراوەیە دەمەوێ ئەم زمانە بۆ هەموو کاروبارەکانی ژیان و هەموو کوردان بێت.
- ئەو ڕێسایەی پشتی پێ دەبەستم لە بەزیندوو ڕاگرتنی زمانی نەتەوایەتی کوردی گەنجینەی ئەم زمانەیە کە ئەو زیندوویییەش بەهۆی دیالێکتەکانییەوەیەتی، گەواهیدەری ئەمەش لە شیعرو جۆراوجۆری فۆلکلۆرەکەیەتی.
- شانازی بە گەلەکەمەوە دەکەم و ئەگەر ئێستا باس لەو کۆسپانە بکەم کە هاتوونەتە سەر ڕێم ئەوا ڕەنگە هەر کەسێك کە نووسینەکانم دەخوێنێتەوە تووشی سەرسامی ببێ، لەبەرئەوەی تووشی ئەو

---

[١] پێویستی دەزانم ئەوە بۆ خوێنەران ڕوون بکەمەوە کە ئەم بابەتە بریتییە لە کۆی ئەو تێبینی و ڕێنوێنی و چاوپێکەوتن و سەرنجانەی خوالێخۆشبوو پ.د.کامل کە لە شوێنی جیاواز جیاوازدا بڵاوکراونەتەوە گەواهیدەری بیرو ئەندێشەی ئەون. هەروەها بەهۆی درێژی تێبینی و سەرنجەکانی لە کات و شوێنی جیاوازدا ڕەنگە خوێنەر بابەتەکە وەکو چەند سەرهەڵدانێکی پچڕ پچڕ ببینێ. د. گیان کامل بەسیر

بەربەست و کۆسپانە نەبووم لەلایەن ڕۆڵە سادەکانی گەلەوە، بەڵکو لەلایەن هەندێ لە خوێنەواران و ڕۆشنبیران و پسپۆڕانەوە بوو و ناشزانم لەبەرچی؟

- لە گرتنی پێنووس و نووسین بەردەوام دەبم و بە هەموو تەختی دنیای ناگۆڕمەوە.

- هەندێك لەوانەی لە بارەی وێژەی کوردییەوە دەنووسن یارمەتی لە بێگانەوە وەردەگرن و نەخشە دادەنێن و پاشان بەسەر وێژەی کوردیدا دەیسەپێنن، من ئەمە ڕەتدەکەمەوە، بۆیە لە مێژوو و ڕەخنە و ڕەوانبێژیدا دەستم بە نووسینی وێژەی کوردی کرد.

- بەشیر موشیر بە "تەها حوسێنی کوردان" ناوی بردووم و (ڕەفیق حیلمی)ش وەڵامی داوەتەوە بەوەی، کە من(کاملی کـوردان)م و گوتویەتی: تەها حوسێن ئەرکی خۆی بە نسبەت عەرەبەوە جێبەجێ کردووە و منیش پێشبینی دەکەم کە کامل بەسیر ئەرکی خۆی لە بەرامبەر گەلی کورددا بەجێ بگەیێنێ.

- کامەران موکری بڕینێکە سارێژ نابێ مرۆڤێکی زوڵم لێکراو بوو لەلایەن پێنووس و فکرەوە، بۆیە لە نووسینەکانی خۆمدا گرتمەخۆ.

- ئامۆژگاری ڕۆژنامەگەری کوردی دەکەم بۆ دوورکەوتنەوە لە شێوازی وروژاندن لە بڵاوکردنەوەی ئەو وتارانەی، کە ئاگری نەیاری و ڕق لە نێوان ڕۆشنبیراندا دادەگیرسێنێ و لاپەڕەکانی دەکاتە مەیدانێك بۆ ململانێی پاڵەوانییەتییەکان و ناڵێم بۆ ململانێی فکری، چونکە بەرهەمی ململانێی فکری فکرو پێشکەوتنە، بەڵام ململانێی پاڵەوانییەتییەکان کاتی بەسەرچووە من بە ڕۆژنامەگەری کوردی نیگەران دەبم لەوەی کە لە مەیدانی شۆڕشی فکریدا دوابکەوێ.

- کەس نکوڵی لەوە ناکا، کە هەر نەتەوەیەك دڵی ڕۆشنبیرییەتی و عەقڵی شارستانییەتییەکەی لـە ژیانـدا بـۆ زاناکانی واڵا دەکات و ڕووبارێك بۆ داواکارانی زانست درێژدەکاتەوە. ئاشکرایە ئێمە لەسەر بنەمای پێودانگی هەژاری و دەوڵەمەندی لۆمەی چێنەرانی گوڵ لە باواتی چاکەکارمان لە کتێبخانەی کوردیدا ناکەین، بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانین ئەو ئامارە ترسناکە لەبیر بکەین، کە مامۆستا (مستەفا نەریمان) لەبارەی پەرتووکەوە لە کتێبخانەی کوردیدا کردوویەتی و ئەو هەژارییە تونـدەی ئاشکرا کـردووە کـە کتێبخانەی کـوردی بەدەستییەوە دەناڵێنێ، ئەمەش وامـان لێ دەکات پرسیاری کراوە ئاڕاستەی سەرجەم دامەزراوە پەروەردەیی و ڕۆشنبیرییە کوردییەکان بکەین؟

- هیچ مرۆڤێکی لەبارمان نییە، کە کاروبارەکانی شکۆیی بە شانازییەوە درابێتە پاڵ وەکو شەهید، قورئانی پیرۆز وەك زیندوو لە لای خودا وێنای شەهیدی کردووە ڕۆزی پێ دەدا لە فیردەوسدا و بە عەرەبی ناوی داڕشتووە لە مادەکانی (ش.ە.د)، کە دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ شیرینترین وشە لە سەدا و شکۆ لە ماناڈا، لەوانەش شەهید گەورەی شکۆداران، شەهادە کلیلی دڵی ئیمانداران بۆ شانشینی ئاسمان، گەواهیدەر خاوەنی قسەی یەکلاکەرەوە لە کێشە گەورەکاندا. ئا ئەوەیە زمانی کوردی پێی دەچریکێنێ و دەکەوێتە دەستی گەورە شاعیرانی و هۆنراوەکانیانی پێ بەخێودەکەن، هەروەك "پیرەمێرد"ی شاعیر بۆ شەهید چریکاندوویەتی لە نێو چەندەها تابلۆی هۆنراوە نەمرەکەیدا.

- بابەتی پاککردنەوەی زمانی کوردی لەو وشانەی هاتوونەتە ناوییەوە بابەتێکی پێویستە و

بابەتەکە رووکەشی نییە، بەڵکو بابەتێکی فکرییە، کاتێکیش لە ئەورووپا یان لە فارس وەریدەگرین، وەکئەوەی بەرگێکی تری پۆشیبێ، لەبەرئەوەی هەر گەلێك زمانی تایبەتی خۆی هەیە بۆ دەربڕینی فکری.

ـ لەبارەی خواستنی زاراوەی کلاسیکی لە ڕەخنەی ئەورووپییەوەو جێ کردنەوەی لە هۆنراوەی کوردیدا دەڵێین: کەی ئەو ڕۆشنبیرییە جیا دەکەینەوە، کە خووی میللەتێکە و ڕوحی ژیرییەتی و ڕەنگی بیرکرنەوەیەتی لەو شارستانییەتییەی، کە سوڵتانی ماددەو توێژی بوون و ئامرازەکانی ژیانە؟ کەی هەست دەکەین کە ڕەسەنی دارێکە بە ڕەگەکانی لە ناو کەلەپوور و جووڵەی ژیانی هاوچەرخماندا دەجوڵێ و سێبەر بەسەر داهاتووی داواکراوماندا دەکات، لە نێوان ئەو نەریتەی، کە شوێنی تووتییەو دەنگدانەوەی ڕێگای ئاسنین کەی و کەی؟

ــ وتنەوەی ئەو زمانە ئەدەبییە کوردییە دێرینەی کە لە سەردەمانی پێش ئیسلامەوە پێمان گەیشتووە، پێویستی بە پسپۆڕ گەلێك هەیە کە شارەزای زمانی عەرەبی و زمانە ئیسلامییەکانی دراوسێمان بن، تا بتوانن دیراسەی زمان و رەوانبێژییەکەی بکەن، ئەو پسپۆڕ گەلانەی بە حەق توانای ئەومیان هەیە جڵەوی ئەدەبی کوردی دێرین و شێوەزارەکانی بگرنە دەست، دەتوانن ئەو وانەیە بڵێنەوە.

ـ ئێمە دەربارەی پەخشانی هونەریی عەرەبی رایەکمان خوێند کە ئەم پەخشانە بە عەبدولحەمید دەستی پێ کرد و بە ئیبنولعەمید کۆتایی هات، ئەو رایە مانای ئەومیە کە نیوەی ئەدەبی عەرەبی کە پەخشانە لەژێر کاریگەری بێگانە لەدایك بوون لەگەڵ کفن و دفن کردنی بێگانە ئەویش مرد، ئەگەر عەقڵێك مەیلی لە توێژینەوەی زانستی و ماددە و میتۆدەکانی هەبێت گوێ لەم رایە ناگرێت. زیادەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم گوێ نەگرتنم بۆ ئەو رایە زۆر لەسەرم کەوت و لە هەمان کاتدا باجێکی زۆرپشم دا.

ـ خوێندنی باڵا کێڵگەیەکە کە هزری زانایان و بیرمەندان تیایدا نەشونوما دەکات و وڵات ڕێبەری دەکات بەرەو ئامانجە باڵاکانی گەشەی راستەقینە بە هەموو لایەنە رووحی و ماددییەکانییەوە، لێرەوە دەبێت ئەو دەستانە بگوشین کە لەو کێڵگەیەدا دەچێنن، دڵنیابین لە بڕی دڵسۆزییەکەی و لەسەرمانە لە بەپیتی ئەو تۆوەش دڵنیا بین کە لەو کێڵگەیەدا دەچێنرێت، وەلێ کەشوهەوای پەیوەست بە چاودێری ئەو کێڵگەیە و ئامادەکردنی بۆ بەرهەم مەسەلەیەکە دەبێت بەردەوام پێداچوونەوە بە هاوکێشەکانیدا بکەین، چونکە هەر ئەومیە حوکم بەسەر دەرئەنجامەکانی نییەتی مامۆستا و ئامادەیی قوتابیدا دەدات و رەنگە بڕیار یەکلایی بکاتەوە دەربارەی خوێندنی باڵا لەنێوان زەرووەتی بە بەرهەم و ئەو ئومێدەی کە هێشتا شین نەبووە. (جریدة العراق ـ ١٩٨٤)

ـ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دیوانی هۆنراوەی عەرەبی و کوردی و بڕوانینە هۆنراوەکانی دڵداری و لێکچواندن، کە لە قۆناغە جیاوازەکانی خوێندنماندا لە ئەزبەرمان کردوون و وە گوێمان لە زۆربەیان دەبێتەوە لە گۆرانییە بیستراوو بینراوەکانی بەیانیان و ئێوارانمان، وە وێنەکانیشمان لە پیشاندانی جوانی ئافرەت بە پێی پێودانگی حەز بەدەرخست، ئەوا سەرسوڕمانی و گاڵتەجاڕی دەبینین کاتێك ئەو وێنەیەی، کە لە سەردەمی (ئیمرولقەیس) شای شاعیرانەوە کۆبووەتەوەو چەسپاوە و هەتا چرکەساتەکانی لە دایکبوونی دوا هۆنراوەی هاوچەرخ لە هۆنراوەی دڵداریدا، ئەوا بەرجەستەبوونی ئافرەت دەبینین وەکو

ئامرازێکی جەنگی بکوژ، برژانگەکانی تیرن و برۆکانی قەوس و بەژنی شیر و چەپکەکانی پرچی مارن و سووری کولمەکانی خوێنی دڵداری و...هتد. لەوانەیە ئێمە وەکو پیاوان و ئافرەتان و لێکۆڵەرانی ئەکادیمی و گوێگرانی ناپسپۆڕ بەم وێنە سامناکانە ڕازی بین، پرسیارەکەش لێرەدا بڕیار دەدا کە ئەو وێنانە ئەگەر بیانوو هێنانەوە بۆیێ بەهۆی باروودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و حەزی هەژێنەری وێرانکەر بێ، ئەی چی بیانوو بۆ بەردەوامییەتی و زۆربوونی لێشاو لە دوای لێشاوی لەم سەردەمەدا ئەهێنێتەوە؟ ئایا ئافرەت نەبووەتە شتێکی تر لە ڕۆژانی خاڵیدا؟

ئافرەت لەم ڕۆژانەدا ئەو مامۆستاییەیە، کە نەوەکان پەروەردە دەکات و ئەو ئەندازیارەیە، کە شارستانیەت بنیات دەنێ و ئەو پارێزەرەیە، کە بەرگری لە مافەکان و ڕامیاری ئەکات و ڕابەرایەتی دەکات بۆ تێکۆشان. ئافرەت نیوەی کۆمەڵە و دایکی نیوەکەی ترە، ئایا شاعیرە بەرێزەکانمان واز لە چنینەوەی ئەم وێنانە دێنن و پێنووسەکانیان لە بەدی ڕزگار دەکەن.

ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین، کە شاعیران و کەسانی تریش خۆشەویستی بکەن و دڵیان بە خۆشەویستی و ئامەزرۆییەوە لێبدا. بەڵام ئایا زمانێکی تر بۆ خۆشەویستی و ئامەزرۆیی و دڵداری نییە، کە بێجگە لەم وێنانە قسەی پێ بکا؟

- (دڵدار)ی شاعیر لە سەردەمی چلەکاندا وەکو شاعیرێکی داهێنەر لە باخچەی وێژەی کوردیدا ناوی دەرکردو هونەری هۆنراوەی لە ڕووی واتای کۆمەڵایەتی ئامانجدارەوە تازە کردەوەو شێوەی هۆنراوەی بە وێنای سادەو پارێز دارشت کە لە شێوازی نەریتی بۆماوە هەڵگەڕایەوە، بەڵام کەس بەم ئاماژانە ڕازی نەبوو و بە چەقۆی قەساب بە وشەی تیۆری داباڕینە سەری کە پشت بە دەقێك لە هۆنراوەی (دڵدار) بە گەراهێك لە دیوانەکەی نابەستێ. ڕاستییەکەی (دڵدار)ی شاعیر لە هەموو ئەمەدا ڕەخنەگرێکی وێژەیی بۆ هۆنراوەی کوردی دەوێ بەشێوەی گشتی کە تایبەتمەند بێ لە ڕەخنەدا بەشێوەی تیۆری و کردارەکی و لە کاری فکری و هونەریدا قەساب نەبوو چەقۆی بەزەیی بە سۆزی شاعیردا نەیەتەوەو جیاوازی لە نێوان لاوازو قەڵەو و هەڵاوسان و چەوریدا نەکا لە هونەری گوتن، ئایا لە دێرنشینماندا ڕەخنەگرێکی وێژەیی وەکو ئەمە لە دوای زیاتر لە چل ساڵ لە مردنی (دڵدار)ی شاعیر لە دایك بووە؟

لەوانەیە بە مەبەستی ڕاست هەڵە نەکەین بەبێ هیچ هۆکارێ ئەگەر بە لۆجیکی ئامارو زمانی ژماردن باسی ئەوە بکەین کە کۆسپەکان ڕۆژ دوای ڕۆژ دوور دەکەونەوە لەبەردەم ئەوانەی ئەم هەستە یان ئەو هەستەیان لەدەست داوەو سەرەڕای ئەوەش لەسەرووی تەختی ئەم وێنەیەوە چوارمشقی دانیشتوون و لەگەڵ ئەمەشدا فشۆڵ لە واقعی باروودۆخیاندا و نەویستراو بۆ فەلسەفەی شکۆمەندکردنیان بە زاراوەی کەمئەندام ناوببردرێن ئەوەش لەبەرئەوەی لە سەرکەوتنیان ناخات لە ژیانیاندا بەتایبەت ئەگەر لەم سەرکەوتنە وێنەی بیرمەندی ڕامیاری و وێژەیی داهێنەرو کارگێڕی سەرکەوتوومان ئامادەکرد. بۆچی زاراوەی کەمئەندام نەگۆڕین بە زاراوەی ڕەنج بەبادا نەچوو لە کاتێکدا (ڕەنج بەبادانەچوون جوڵەکەرە بە کردنەوە و ڕەنج بەبادا نەچوو لە زماندا بردنەوە و ڕزگاربوون و مانەوەیە لە چاکەدا) کەواتە ئایا ئێمە کاراین؟

## • سەرچاوەی لە دایکبوونی ڕەخنەسازی

خەڵکی کە دەست بە خوێندنەوەی دەقێکی وێژەیی دەکەن، یاخود گوێ لە خوێندنەوەی دەگرن، شوێنەوارێکی تایبەتی لە دڵیاندا دەربارەی ئەو دەقە پەیدادەبێت و لە مێشك و هۆشیاندا دەنگدەداتەوە. ئەو شوێنەوارە تایبەتییە دەشێت چاك بێت و ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی دەقەکە و دەشێت خراپ بێت، سەرئەنجام لە پلەی هەمان دەق نزمبکاتەوە. ئا ئەم شوێنەوارە تایبەتییە بێگومان سەرچاوەی لەدایکبوونی ڕەخنەسازییە و بناغەی ئەو تێبینی و بیروڕایانەیە، کە خەڵکی ئاڕاستەی دەقە خوێنراو و گوێلێگیراوەکەی دەکەن.[1]

## • سروشتی ڕەخنەسازی

ئەو شوێنەوارە تایبەتییە، کە بەرهەمی ئەدەبییە، یاخود گوێگرتنە، دەقێکی وێژەییە، ئەگەر

---

١ اصول النقد الادبي ل٤٩ - ٥٠

هاتوو ڕەسەن بوو، لە دڵی مرۆڤدا کاریگەربوو. ئەو مرۆڤە توانای گەیاندنی بە خەڵکی هەبوو و بەهرەی دەربڕینی بە هۆی زمانەوە بەرز بوو دەتوانێ لە جیهانی هونەری وێژە و زانستەکانی زماندا خۆی بنوێنێ و ببێ بە ئاکامێکی پێکراو. ئەم ئاکامە کە بە ناوی ڕەخنەسازییەوە ناسراوە، سروشتێکی تایبەتی هەیە و بوون و فۆڕمی هەموویان سەرئەنجامی ئەم هەنگاوانەی خوارەوەیە:

**یەکەم:** خوێندنەوەیێکی قووڵ و گوێگرتنێکی هۆشمەندانە لە دەقێکی وێژەیی کە هۆی بنیاتنانی پەیوەندییەکی هەست و نەستییە لە نێوانی ئەو دەقە و گوێگر و خوێنەرەکەیدا.

**دووەم:** چێژوەرگرتن لەو دەقەو بەیەکداچوون لەگەڵیدا.

**سێیەم:** لێکدانەوەی مەبەستی دەقەکە و شیکردنەوەی توخمەکانی و دەستنیشانکردنی سروشتی هەموو لایەنەکانی لە وشە و ڕستە و دارشتنی گشتی و واتا و ئەندێشە و سۆز، پشتبەستن لەم کارە هونەری و زانیارییە بە زمان و ڕێزمان و ڕێنووس و ڕەوانبێژی و دەروون و کۆمەڵگا و ئابووری.

**چوارەم:** دەستنیشانکردنی جوانی و ناجوانی و ڕاست و چەوتەکانی ئەو دەقە لەبەر تیشکی ئەو دەستوورانەی، کە بە جۆرێکی ئەکادیمی دەربارەی چەشنی ئەو دەقە لەلایەن پسپۆڕەکانەوە چەسپێنراون.

**پێنجەم:** چەسپاندنی حوکمێك و وەرگرتنی بڕیارێك دەربارەی پلە و نرخی ئەو دەقە وێژەییە، پاش بەراوردکردنی لە تەك دەقە هاوچەشن و سەردەمەکانیدا.

**شەشەم:** دەربڕینی ئەو هەنگاوانە هەموویان بە شێوازێکی ڕاست و ڕەوان و کاریگەر.

## • پێناسەی ڕەخنەسازی

ڕەخنەسازی کە ئەوە سروشتەکەی بێت و بەرهەمی چەندین هەنگاوی هۆشمەندی و چەژمی و ئایدۆلۆجی و زمانی بێت، هەڵبەت ئاسۆیێکی فراوانی هەیە و ناتوانرێ بە ئاسانی سنوورێکی پۆڵایینی بۆ دابنرێت و توێژەران و پسپۆڕان بتوانن بەبێ مشتومڕ پێناسەی بکەن و پێناسەکەش دەستنیشانکراو و بێخەوش بێت.

ئەم ڕاستییە لەوەوە بەرچاودەکەوێ، کە تا ئەمڕۆ پێناسەیێکی یەکگرتوو بۆ ڕەخنەسازی دانەنراوە، ئەوانەی هەوڵی ئەوەیان داوە هەتاکو ئێستا مشتومڕیانە و تا دێت جیاوازی نێوانیان لەم ڕووەوە قووڵتر و فراوانتردەبێت. جا ئێمە ئەگەر بمانەوێ لەم بوارەدا پێناسەیێکی دەستنیشانکراو بۆ ڕەخنەسازی دابنێین هەر دەبێ لە نێوان پێناسە جۆربەجۆرەکانیدا[1] پێناسەیەك سازبکەین و لە

١ د. عزالدين اسماعيل، اصول النقد الادبي، ل ١١٥

هەر پێناسەیێکی بەر لە ئێمە چەمکێکی زانستی هەڵبژێرین. جا کە کارەکەمان هەر ئەوە بێت دەتوانین بڵێین: ڕەخنەسازی زانست و هونەرێکی لێکدراوە، کە بە هۆی دەستوورەکانی و تواناى تایبەتی و چەژەی ئەنجامدەرەکەیەوە، کە ڕەخنەسازە دەتوانێ دەقی وێژەیی چاك و خراپ لەیەك جودابکرێتەوە و واتای ڕاست و ناڕاستی پێجیابکرێتەوە و ئەو شوێنانەی، کە هەڵەن بە هۆیەوە بدۆزرێنەوە.

## ● مەرجەکانی ڕەخنەسازی

هەروەکو لە لێدوانەکەی پێشوومان بۆمان ساغبووەوە، کە ڕەخنەسازی زانستێکی ڕوون نییە، چونکە پێویستی بە بەهرەو چەژەو سۆزو ئەندێشەی تایبەتی ڕەخنەساز هەیە. هەروەها هونەرێکی پەتی نییە، چونکە ڕەخنەساز دەبێت خۆی بە دەستوورەکانی ئەو زانستانەی، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان بە کارەکەوە هەیە ببەستێ. بۆیە جگە لە دەستنیشانکردنی سروشتی ڕەخنەسازی و چەسپاندنی پێناسەیێکی تەواو، پسپۆڕەکانیش ئەم مەرجانەی خوارەویان بۆ داناوە:[1]

**یەکەم:** دەبێت ڕەخنەساز خاوەن مێشکێکی وریاو هۆشیار بێت و بە هیچ ڕەنگێ کەللەڕەق و مانگر نەبێت.

**دووەم:** زەینڕۆشن و بیرتیژبێت.

**سێیەم:** دەبێت ڕەخنەساز دەستبەجێ و زوویەزوو بە دەم هەموو شـوێنەوارێکەوە بچێت، کە پەیوەندی بەو دەقە وێژەییەوە هەیە، کە خەریکی هەڵسەنگاندنیەتی.

**چوارەم:** دەبێت ڕاددەی تێگەیشـتن و ژیرێتی بەرز بێت و ئاسـۆی بیرکردنەوەی تەنگەبەر نەبێت.

**پێنجەم:** دەبێت ڕەخنەساز هەروەکو "ماتیو ئارنۆلد" دەڵێ: توانای ئەوەی هەبێت، کە شت هەروەکوو خۆی چۆنە و لە ڕاستیدا چلۆنە، ببینێ.

**شەشەم:** نابێت ڕەخنەساز بۆ هیچ بیانوویێك ملکەچی ئارەزووی تایبەتی خۆی بێت و دوای بیروڕاکانی پێشووی بکەوێت. واتا دەبێت بە چەشنێکی ڕاستەقینە خەریکی کارەکەی بێت و هەموو مەبەستێکی خزمەتی ڕاستی بێت.

**حەوتەم:** دەبێت ڕەخنەساز ڕۆشنبیرێکی خاوەن ئەزموون بێت و بە لایەنی کەمەوە، جگە لە زمانی نەتەوایەتییەکەی بە جۆرێکی شارەزایانە زمانێکی بێگانە بزانێ.

---

١ النقد الأدبي ل١، ٥ ل١٩٤

## • زاراوەی ڕەخنەسازی

هەروەکو تێبینی دەکەن، ئێمە زاراوەی ڕەخنەسازی یاخود نرخشووناسی، کە لەمەوبەر پسپۆڕ و توێژەرە کوردەکان لە کتێب و وتارەکانیاندا بەکاریانهێناوە فەرامۆشیاندەکەین و لە جیاتیان زاراوەی ڕەخنەسازی بەکاردەهێنین. ئەم کارەش بێگومان سەرنجڕادەکێشێت و پرسیارێکمان ئاراستە دەکات و دەپرسێ؟ بۆچی یەکێك لەو زاراوە کوردییانە، کە تا ئێستا لە وێژەو هونەری کوردیدا چەسپاون بە کارناهێنین؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە چەشنێکی زانستیانە دەبێت تەماشای هەندێك لەو زاراوە بێگانانە بکەین، کە بۆ چەمك و واتای زانست و هونەری ڕەخنەسازی داڕێژراون و سازکراون.

## • زاراوەی (النقد) لە زمانی عەرەبیدا

بەر لە هەموو شتێك با تەماشای زاراوەی (النقد) بکەین، کە لە زمانی عەرەبیدا بەر لە

هەزارو دووسەد ساڵ دارێژراوەو بۆ چەمك و واتای زانست و هونەری ڕەخنەسازی بەکارهاتووە.
ئەم وشەیە لە فەرهەنگی زمانی عەرەبیدا[1] بۆ سێ واتای سەرەکی بەکارهاتووە:
واتای یەکەم: (لێدان)ە. عەرەب دەڵێ: " نقدت رأسه بأصبعي اذا ضربته" واتا "کەشکم لێدا".
واتای دووەم: عەیبلێگرتنە. ئەبو دەردا وتویەتی: " ان نقدت الناس نقدوك وان ترکتهم ترکوك".
واتا: ئەگەر هاتوو عەیبت لە خەڵکی گرت و بە دوای خراپە و هەڵەیاندا گەڕایت، ئەوانیش هەمان ڕەفتارت لەگەڵدا دەکەن.
واتای سێیەم: جیاکردنەوەی پارەی قەڵبە لە پارەی ناقەڵب. لە دراوکاریدا وتراوە: "التنقاد والانتقاد، تمییز الدراهم و اخراج الزیف منها".
ئەم وشە عەرەبییە واتا (النقد)، لەو سێ واتایانەوە گواستراوەتەوە بۆ چەمکێکی زاراوەیی و کراوە بە زاراوەیێکی وێژەیی، کە هەروەك لە پێناسەی ڕەخنەسازیدا، وتمان: زانست و هونەرێکە بۆ ڕوونکردنەوەو سەرنجڕاکێشان ئەوجا لێکدانەوەی مەبەست و دوابەدوای ئەوەش گەیشتن بە بڕیارێك و دانانی ئامۆژگاری و یاسای بە کەڵك لە هۆنراوەو پەخشاندا.
سێ واتا زمانییەکەی وشەی (النقد)ی عەرەبی بێگومان لە چەمکی زاراوەکە جیانابنەوەو هەمیشە هەنگاوبەهەنگاو لە تەکیدان. بۆیە دەبینین نووسەری عەرەب، زۆرجار ئاوەڵناوی (الادبی) دەخاتە پاڵ (النقد) و دەڵێ: " النقد الادبي " چونکە ئەگەر هاتوو تەنیا وشەی (النقد)ی بەبێ ئاوەڵناو بەکارهێنا، ڕەنگە خەڵکی لە مەبەستە ڕاستەکەی تێنەگەن و سەرنجیان بۆ واتای (لێدان) یاخود (عەیبگرتن و جیاکردنەوەی پارەی قەڵب لە ناقەڵب) ڕابکێشرێ.

## • زاراوەی (Criticism) لە زمانی ئینگلیزیدا[2]

ئەگەر لە فەرهەنگە سەرەکییەکانی ئینگلیزیدا بە دوای واتای وشەی (کریتیسیزم)دا بگەڕێین، دەبینین ئەم وشەیە لاتینی ڕەگەزەو سێ واتای هەیە:
واتای یەکەم: بە درۆخستنەوەی یەکێك.
واتای دووەم: ڕەخنەسازی و وێژەیی و هونەرییە.
واتای سێیەم: تێبینی و ڕووکاری زاراوەیە.

---

1 اصول النقد الأدبي ل ١١٤
2 المورد، تألیف: منیر البعلبکي - دار العلم للملایین - بیروت

ئەم سێ واتایە وەکو دیارە لە یەکترەوە دوورنین، بگرە لە چوارچێوەیێکی یەکگرتوودا لە یەکترەوە نزیکن و چەمکێکی هاوبەش پێکدەهێنن. ئەم چەمکەش واتای زاراوەی وشەکەیە، کە ببێ ئاوەڵناو، یاخود وشەیێکی دیکە ئەرك و مەبەستی رەخنەسازی و زانست و هونەری رەخنەسازی دەدرکێنێ و دیگەیەنێت.

## • زاراوەکانی رەخنەسازی لە زمانی کوردیدا

لەم سەردەمەدا کە لە رۆشنبیری کوردی، زانست و هونەری رەخنەسازی وردەوردە پەیدابوو، پسپۆرو توێژەرە کوردەکان هەوڵی دارشتن و سازکردنی زاراوەی کوردی پەتییان دا. سەرئەنجام ئەم هەوڵدانە هەروەکوو دەزانین، داتاشینی چەند زاراوەیەك بوو.

لەم زاراوانە زاراوەی (رەخنە)یە، جا با بزانین ئەم زاراوەیە تا چ رادەیەك زاراوەیێکی زانستییە و پڕ بە پێستی چەمکی (النقد الادبی) عەرەبی و (کریتیسیزم)ی ئینگلیزییە. ئایا دەتوانێ چەمك و زانستی هونەری رەخنەسازی دەربڕێ؟

لە زمانی کوردیدا وشەی رەخنە و دارێژراوەکانی تەنیا بۆ دەرخستنی شورەیی (عەیب) و کەموکوڕی دۆزینەوە بەکارهاتووە. کورد دەڵێ: "رەخنەی تێبووە" واتا " کونی تێبووە " یان دەڵێ: " رەخنەی لێدەگرێ " واتا " عەیبیلێدەگرێ " یان دەڵێ: " فلان رەخنەبازە " واتا " عەیب لە شت دەگرێ ".[1]

زانست و هونەری رەخنەسازی هەروەکوو لەمەوپێش بینیمان مەبەستی سەرەکی توانجگرتن و عەیبدۆزینەوەو پلارهاویشتن نییە، بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین، کە وشەی رەخنە بە تەنیا ناتوانێ ببێ بە زاراوەیێکی وێژەیی و چەمکی (النقد الادبی) و (کریتیسیزم)بگەیەنێ و بەبێ کەموکوڕی ئەرکی ئەم زانست و هونەرە دەربڕێ. هەروەها وشەی (نرخشووناسی) ش وشەیێکی لێکدراوە لە (نرخ) واتا (القیمە) و رەگی چاوگی (شناستن)ی فارسی، کە واتاکەی ناسین و زانیارییە، وەرگیراوە، بۆیە لە سروشت و زانستی هونەری رەخنەسازی بەدەرە، چونکە واتا فەرهەنگییەکەی لە زمانی کوردیدا بۆ کاروباری بازرگانی و نرخدانان و نرخداشکاندن چەسپاوە ئەو ناسۆ فراوانەی نییە، کە یاریدەی بدات و بیکات بە زاراوەیێکی وێژەیی و هونەری.

سەرئەنجام بیروڕای ئێمە، کە دەبێ بە هۆی رێبازی لێکدانەوە زاراوەیێکی نوێباوی کوردی بەرامبەر بە ( النقد الادبی و کریتیسیزم ) دابنێین و ئەم زاراوەیەش لە وشەی (رەخنە)

---

١ نرخ شوناسی ل٦

و وشەی (ساز)، کە لە فەرهەنگی کوردیدا بە مانای (شتی جوان و ڕێکخراو) هاتووە دەبێت پێکبهێنرێ و ببێ بە زاراوەی (ڕەخنەسازی).

ئەم زاراوە لێکدراوە دیارە پڕ بە پێستی زاراوەی (النقد الادبی) و (کریتیسیزم)ە، چونکە هەر دوو لایەنەکەی کاری (الناقد)، کە دەستنیشانکردنی لایەنی چاکەو خراپەی بەرهەمی وێژەییە دەردەبڕێ: لایەنی یەکەمی بە هۆی وشەی (ڕەخنە)وە دەبێت و لایەنی دووەمی بە هۆی وشەی (ساز)ەوە ئەنجامدەدرێ. کەوابوو بەرامبەر بە (النقد) زاراوەی (ڕەخنەسازی)مان دەبێت و شانبەشانی زاراوەی (الناقد) زاراوەی (ڕەخنەساز)مان بۆ دێتەکایەوەو کاری زاراوەسازیمان لە کەموکوڕی (ڕەخنە)و ڕەخنەگرو نرخشووناسی دووردەخەینەوە.

## • سنووری جیاکەرەوەی ڕەخنەسازی

یەکێك لە هۆیە سەرەکییەکانی پێشنەکەوتنی ڕەخنەسازی لە زمانی کوردیدا، ڕەنگە تێکەڵکردنی بوارەکەی بێت لەگەڵ بواری چەند بابەتێك و چەشنە هونەرێکدا: وەکوو وێژە و مێژووی وێژە و ڕەوانبێژی ( بلاغە ). بۆیە دەبێت ئەم هۆیە چارەسەربکەین و سنووری جیاکەرەوەی بواری ڕەخنەسازی لە بواری ئەم بابەتانە بە ڕوونی و ئاشکرایی بچەسپێنین.

## • ڕەخنەسازی و وێژە

ئەگەر بە وردی لە سروشت و ڕێباز و ئامانجی ڕەخنەسازی و وێژە بکۆڵینەوە، بە ئاسانی دەتوانین سنووری نێوانیان دەستنیشانبکەین و نەخشەی بواری لە یەکترجیاکەرەوەیان بکێشین.[1]

یەکەم: وێژە بەر لە ڕەخنەسازی لەدایکدەبێت و دێتە بەرهەم، واتا: پێویستە دەقی وێژەیی

---

١ اصول النقد الادبي ل٥٠

هەبێت، ئەوجا بەهۆی بوونی ئەو دەقەوە ڕەخنەسازی دێتەکایەوە و لێیدەکۆڵێتەوە.

دووەم: وێژە چ هۆنراوە بێت چ پەخشان بەرهەمێکی ئیجابییە و ئاکامێکی خولقێنراو دەدا بە دەستەوە، بەڵام ڕەخنەسازی بابەتێکی سەلبییە، بەرەنگاری وێژەر دەبێتەوە، بەرهەمەکانی هەڵدەسەنگێنێت. ڕەنگە هەندێك جاریش ئیجابی بێت و ڕێگای خولقاندنی وێژەی بەنرخی پیشانبدات.

سێیەم: وێژە ئاوازێکی خۆییە، واتا (زاتییە). کەسایەتی تەواوی خاوەنەکەی کە وێژەرە دەنوێنێت و هەست و بەهرە و هەڵوێستی تایبەتی دەخاتەڕوو، بەڵام ڕەخنەسازی کارێکی ئاوێتەیە لە مەوزوعییەت و زاتی پێکهاتووە، چونکە لە ڕوویێکەوە خاوەنەکەی کە ڕەخنەسازە لەبەر تیشکی چەند دەستوورێکی زانستی دانپێدانراودا ئەنجامیدەدات. لە ڕوویێکی تریشەوە، ئاوێتەی چێژ و سۆز و تێڕوانینی تایبەتییە، واتا وێژە هونەرێکی پەتییە، بەڵام ڕەخنەسازی لە هونەر و زانست هاتۆتە ئەنجام.

وێژەی ڕاستینە بەرهەمێکی خولقێنراو و داهێنراوە، بەڵام ڕەخنەسازی شوێنەوارێکە بۆ پێناسین و لێکدانەوەی مەبەستی بەرهەمی وێژە هاتۆتەکایەوە.

## • ڕەخنەسازی و مێژووی وێژە

جیاکردنەوەی بابەت و بواری ڕەخنەسازی لە بابەت و بواری مێژووی وێژە کارێکی ئاسان نییە، چونکە بە درێژایی تەمەنی هەردووکیان لە لای زۆربەی میللەتان لەگەڵ یەکتردا تێکەڵکراون و سنووری جیاکەرەوەیان بە دەگمەن دیاریکراوە.[1]

بۆ زاڵبوون بە سەر ئەم دیاردە نازانستییەدا، دەپرسین مێژوونووسی وێژە بۆ چ مەبەستێك تێدەکۆشێت و لە چی دەکۆڵێتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بە لای ئێمەوە ئەوەیە، کە مێژوونووسی وێژە لەو بڕوایەدایە، کە دەقە وێژەییەکان بەرهەمی دوو هۆی سەرەکین:

یەکەم: دەرفەتی خاوەن وێژەیە، بە واتای فراوانی دەرفەت، کە سەرئەنجامی سروشت و سەردەم و کۆمەڵگایە.

دووەم: کەسایەتی و زاتی وێژەرە، بۆیە مێژوونووسی وێژە لە کارەکەیدا، کە مێژووی وێژەیە، بەرەنگاری سێ بابەت دەبێت و لێیاندەکۆڵێتەوە:

بابەتی یەکەم: دەقە وێژەییەکانە، کە چەند تایبەتییێکی ناوەرۆکی و فۆڕمی لە واتا و ئەندێشە و سۆز و وشە و ڕستەسازی و دارشتنی گشتیدا هەیە.

---

١ اصول النقد الادبي ل٥٢ ـ ٥٥

بابەتی دووەم: دەرفەتە، کە وێژەر لە ژێر سێبەریدا، دەقە وێژەییەکانی خوڵقاندووە و هەنگاو بە هەنگاو لە ژیانی تایبەتیدا ملکەچی کارتێکردنی بووە.

بابەتی سێیەم: سەرگوزشتەی ژیانی وێژەرە، کە لە کەسایەتییەکەیەوە دەقە وێژەییەکانی هەڵقوڵاون و شوێنەوارێکن بۆ ئەو کات و شوێنەی تێیدا ژیاوە، بەڵام ڕەخنەساز لە بابەتێکی تاقانە دەکۆڵێتەوە، ئەو بابەتەش هەروەکوو وتومانە دەقی وێژەییە و هەموو مەبەستێکی هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژەرە.

بەڵێ مێژوونوسی وێژە دەشێ پشت بە هەندێ لە پێوەرەکانی ڕەخنەساز ببەستێت و لابەلا پەنجە بۆ پلەی وێژەر لە مێژووی ژیانی وێژەرانی هاوسەردەمی و بەر لەو درێژبکا، بەڵام ئەمە مەبەستێکی سەرەکی ئەو نییە.

هەروەها ڕەخنەسازیش ڕەنگە سوود لە دەرفەت و سەرگوزشتەی وێژەر وەربگرێ، بۆ خستنەڕووی هۆی پێشکەوتن، یاخود دواکەوتنی وێژەر لە بەرهەمەکانیدا، بەڵام ئەم سوودوەرگرتنە دەبێت تەنگەبەر و ناسەرەکی بێت، چونکە هیچ کەسێك داوای هۆ و خستنەڕوو، واتا شیتەڵکردن (تحلیل) لە ڕەخنەساز ناکات. ئەگەر هاتوو کارەکەی لە هەڵسەنگاندنی دەقی وێژەییدا بە جۆرێکی زانستی و هونەری ئەنجامدابێت.

## • پەیوەندی ڕەوانبێژی بە ڕەخنەسازییەوە

پەیوەندی ڕەوانبێژی (بلاغە)بە ڕەخنەسازییەوە لە ڕووی بابەت و مەبەستەوە زۆر پتەو و بەتینە، چونکە ڕەوانبێژی بە هەرسێ زانستەکەیەوە، زانستی واتاناسین و زانستی ڕوونبێژی و زانستی جوانکاری، بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی درەختی ڕەخنەسازی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، ئەم جیاوازیانەی خوارەوە لە نێوانیاندا بە ئاسانی بەدیدەکرێن:

یەکەم: زانستەکانی ڕوونبێژی چەند دەستورێکی ڕەچاوکراو لەبەر دەستی وێژەردا دەنوێنن و ڕێگای خوڵقاندنی پیشاندەدەن و ڕابەریدەکەن بۆ چۆنێتی سازکردنی هونەرەکانی وشەسازی، بەڵام ڕەخنەسازی بەرهەمی وێژەر هەڵدەسەنگێنێ و لە چۆنێتی پەیڕەوکردنی دەستوورەکانی ڕەوانبێژی دەپرسێتەوە. دووەم: ڕەوانبێژی تەنیا لە ڕووخساری وێژە دەکۆڵێتەوە، وەك لێکچواندن و خوازە و خواستە و درکە و چەشنەکانی تری وشەسازی شیدەکاتەوە، کەچی ڕەخنەسازی ناوەڕۆك و فۆڕمی وێژە، وەکوو ئاوێتەیێکی یەکگرتوو دەداتە بەر لێکۆڵینەوە و لێدوان و خۆی بە لایەنێکی تایبەتییەوە نابەستێ.

نموونەیێکی پەیڕەویکراو بۆ دەستنیشانکردنی سنووری جیاکەرەوەی ڕەخنەسازی

بۆئەوەی لێدوانەکەمان دەربارەی سنووری جیاکەرەوەی ڕەخنەسازی لە وێژە و مێژووی وێژە و ڕەوانبێژی، لێکۆڵینەوەیێکی بیردۆزی و بێبەڵگە و نموونە بێت، با پێکەوە هەڵبەستەکەی هەستیاری کورد (کامەران موکری)، کە لە ساڵی ١٩٤٧ بە ناونیشانی (کچەکەی بەرتیلە) دایناوە، شیبکەینەوە و بزانین لە چ ڕوانگەیێکی جیاوازەوە، وێژە و مێژووی وێژە و ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازی تەماشایدەکات:

## کچەکەی بەرتیلە

لامـــــان دایە، دێیـەک بـچــووک
بـــاخـی ڕازاوە، وەکـوو بـــووک
مـــاڵی ئـاغـــا بـە گـەچ سپی
داوێنی گــولی پـــەمــــەیی
بۆنـی خۆش، ئـاوازە و بـەســتـە
کام دەنـگ، بزوێنـەری هەســتـە
ئەیـــاندا لـــە پەردەی دڵم
زۆر خـۆش بـوو بەستە (ئـای گوڵـم)
لە ڕێگـەی کـــانیی کـەلەک بەرد
کـیـــژی ڕوومـەت گـــوڵی بێگـەرد
ئـەهــاتـــە لــەنجە ورد بـۆ ماڵ
سنگ ئـەیلـــەرانەوە دەسـماڵ
لـەگـــەڵ لــــەرینەوەی لـەشا
هــــەڵهێنانی چــاوی کـەشـا
پـەپوولـــەی خۆشەویستیی گیان
ئـەفـــڕین بۆ شینـــایی ئاسـمان
چوومـە زنجێـک تـــارێـک و تەنـگ
دانیشتم مـــەلوول و بێدەنـــگ
دڵتەنـگ بـووم بـۆ کۆمەڵێ گیـــان
کـە بەشـیان خەفەتە، گــــریان

پیرێژنێک هـــات، گـاڵۆک خـوار
بـــەژنی وەکـو کـــۆتـەرەدار
نـــواڕییە ڕووم، بنمـیچی ڕەش
دوا تیشکی زەردی خۆری گـەش
وتی و دەمـــی پـــڕ پێکـەنین
ئەی شـارستانیی ڕوو شــیرین
نـــە پـــارەم هـەیە نـە ماڵت
بـە تۆی لاوی بــکـــەم خـەڵات
گـەر، ناومان بنووسی یەکســەر
ئەتنێمە ســەرچاو، تەپڵی ســەر
ئـەڵێن هــــاووڵات ژمـــاردن
ئەکەن بۆ شەکر بەشـــکـردن
تووبی لاویت، ئەی کـــوڕی جوان
تووبی دڵی پـــڕ لـــە وجـدان
بـــێ بـــەریمـــان مەکـــەن بـرا
چـــاوەڕێین بۆ شـــەکر بـــۆ چـا
لە دوای تاوێک ئەسرین ڕشـــتن
ئـــــاخ هەڵکێشــــانی دڵی من
هاتن بە ڕیز، شەش کچی شەنگ
نیگاریان ورد و ڕەنگـــــاوڕەنـگ
مـــــەمـکی ژێر کـــراسی دڕاو
لە شــــەرما ئەلەرزی بە تـــــاو
شـــیتاڵی جل، وەک هەوری زل
تیـــــادەر ئەکەوت لاڕانی شـــل
پیرێژن نـــواڕییە کچـــــــان
وتی ئەی کوڕ ئەی هێزی گیـــان
هــەڵگرە بـــــەرتیل شۆخی دێ
لەمانە کــــامیانت ئـــــەوێ

* *

که جێم هێشت ئاوایی خـەمگین
گوێم لێبوو، دەنگێکی شـــیرین
بە گـــریانەوە، وەک ســـاوا
ئەڵێ "ئەی شۆخەســـوار" توخوا
بـــەرتیلیش نەبم هـــەر بمبە
لـــەم زیـــانەڕزگـــارم کە
چیلکـــە چـنیـــنـــەوە و بژار
نـــانی گـــاڵ و زەبری زۆردار
جوانی ڕووم، بەژن، قژی خـــاو
ئەکوژن، با بێم ئەی کـــوڕی لاو
ئەوسام، ئێستەم بوایە بە ڕاست
ئەو کچە نەشمیلەم ئەخواســـت

## • بەراوردکاری

لە زنجیرەی پێشوودا هۆنراوەیەکی (کامەران موکری)مان خستەبەرچاو، کە تەمەنی ٣١ ساڵەو ناوی (کچەکەی بەرتیلە)یە. ئەوا لەم زنجیرەیەدا دەیخەینە بەر باری هەڵسەنگاندن، هەتا بزانین وێژە و مێژووی وێژە و ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازی چۆن دەڕوانێتە ئەم بەرهەمە و هەر یەکێکیان لە چ سووچێکی زانستی و هونەرییەوە تەماشایدەکەن.

**یەکەم:** جیهانی وێژەی کوردی دەرگای باخچەی خۆی بۆ ئەو هەڵبەستە دەکاتەوە و وەکوو بەرهەمێکی خوڵقێنراو خۆی پێدەڕازێنێتەوە و بواری نەمری خاوەنەکەی، کە کامەران موکرییە دەدات و چۆنێتی سۆز و هەست و ئەندێشە و بیرکردنەوەی ئەو هەستیارە کوردە تۆماردەکات.

**دووەم:** مێژووی وێژەی کوردی لاپەڕەیەکی تایبەتی بۆ ئەو هەڵبەستە تەرخاندەکات و پێنووسی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە دەخاتەکار و وەڵامی چەند پرسیارێکی سەرەکی دەداتەوە: ئایا ئەم بەرهەمە وێژەییەی کامەران موکری چلۆن چەشنێکە لە چەشنەکانی هۆنراوەی کوردیدا؟

لە ڕووی مێژووەوە چ تازمییەکی بەرپاکردووە؟ ئەو دەرفەتەی کە سەردەم و باری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی لەدایکبوونی ئەو هەڵبەستەیە چییە و هەڵوێستی هەستیارەکە خۆی لە ئاستیدا چۆن بووە؟ دوابەوای ئەم پرسیارانە هەموویان مێژووی وێژە دەپرسێ: سەرگوزشتەی ژیانی کامەران موکری چۆن باسکراوە و پەیوەندی ئەم سەرگوزشتەیە بەو هەڵبەستەوە لە ڕووی ڕاستی و ناڕاستییەوە چۆن ساغدەکرێتەوە.

**سێیەم:** ڕەوانبێژی بە پێچەوانەی وێژە و مێژووی وێژە، خۆی لەگەڵ هەڵبەستەکەدا وەکوو بەرهەمێکی خوڵقێنراو، یاخود سەرئەنجامێکی هەستپێکراو و دەرفەتێکی تایبەتی خەریکناکات، بگرە هەموو مەبەستێکی شیکردنەوەی فۆڕمی (ڕوخساری) هەڵبەستەکەیە، بەتایبەتی لە ڕووی سازکردنی لێکچواندن و خوازە و خواستە و درکە و شیکردنەوەی ڕەگەزەکانی ئەم هونەرە وشەسازیانەیە.

**بۆ نموونە:**

ڕەوانبێژی لەو هەڵبەستەی (کامەران موکری)دا، سەرنجدەداتە دەربڕینی (باخی ڕازاوە ـ وەکوو: بووک) باسی ئەوە دەکات، کە (باخی ڕازاوە) لێکچواوە و (بووک) پێ لێچواوە و وشەی (وەکوو) ئامرازی لێکچوواندنە.

هەروەها دەربڕینی (ماڵی ئاغا بە گەچ سپی) درکەیەك شیدەکاتەوە، مەبەست و واتای دووری بەوە لێکدەداتەوە، کە نیشانەی دەوڵەمەندی و دەسەڵاتداری ئاغایە. ڕەوانبێژی جگە لەمە ڕەنگە هۆی جوانی و ناجوانی هەندێك لە دەربڕینەکانی هەڵبەستەکە بخاتەڕوو، بەڵام ئامانجی سەرەکی لەم خستنەڕووەدا، هەڵسەنگاندن و نرخپێدانی نییە، بەڵکو ئەو کارەشی بۆ ڕوونکردنەوەی دەستوورەکانییەتی و چەسپاندنی مەشق و ڕاهێنانە، لەسەر چۆنێتی سازکردنی هونەرەکانی وشەسازییە.

**چوارەم:** ڕەخنەسازی کە هەڵبەستەکەی کامەران موکری دەداتە بەر نەشتەری شیکردنەوەو بە سەرنجێکی گشتی هەوڵی وەڵامدانەوەی دوو پرسیاری سەرەکی دەدات: پرسیاری یەکەم ئەوەیە مەبەستی خاوەن هەڵبەستەکە لە هۆنینەوەی هەڵبەستەکەدا چییەو دیوی ناوەوەی ئەم مەبەستە بە چ هێزێکی ئایدۆلۆجی و دەروونی هەستیارەوە پەیوەندیدارە؟ پرسیاری دووەم لە پرسیاری یەکەم زیاتر ورد دەبێتەوەو دەپرسێ: هەستیار ئەگەر هاتوو لە جێبەجێکردنی مەبەستەکەی بە هەودوو دیوییەوە سەرکەوتووبوو یاخود ناسەرکەوتووبوو، سەرکەوتنەکەی و سەرنەکەوتنەکەی بە چ ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی ناوەڕۆك و فۆڕمی (ڕوخساری) هەڵبەستەکە بووە؟

ڕەخنەساز لە وەڵامدانەوەی ئەم دوو پرسیارە دەرحەق بە هەڵبەستەکەی کامەران موکری،

هەڵبەت پێویستی بە ڕووناکییەك لە زانستی مێژووی ویژەو ڕەوانبێژی هەیە، جگە لەمەش دەبێت لە ڕوانگەی بابەت و واتاکانی هەڵبەستەکەوە تەماشای شێوازو سۆزو ئەندێشەی بکات، چونکە ئەم هەڵبەستە هەروەکوو دیارە لە تەنگوچەڵەمەیێکی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هەڵقوڵاوە. ئەو تەنگوچەڵەمەیەش هەژاری و نادادپەروەری باری ئابووری کۆمەڵەکەمان بوو، کە لە سەردەمی پاشایەتیدا، باڵی ڕەشی بەسەر میللەتەکەماندا کێشابوو.

بە کورتی کامەران موکری لە هەڵبەستەکەیدا وەکوو شاعیرێکی پەیامدارو پێشکەوتووخواز لە مەسەلەی دەربەگایەتی دەکۆڵێتەوە، کە ناوەرۆکێکی ئایدۆلۆجی و بیروباوەڕییە. ڕەخنەساز بەرامبەر بەم چەشنە ناوەڕۆکە زیاتر خەریکی وەڵامدانەوەی پرسیاری هونەری دەبێت، چونکە دڵنیایە کە ناوەڕۆکەکە، ناوەڕۆکێکی سەرکەوتووەو خزمەتی جەماوەر دەکات، بەڵام تا چ ڕادەیەك فۆڕمی ئەو ناوەڕۆکە خوڵقاوو داهێنراوە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ڕەخنەساز سەرنج بۆ تەکنیکی هەڵبەستەکە ڕادەکێشێ و دووپاتیدەکاتەوە، کە کامەران موکری تەکنیکی نووسینەوەی کورتە چیرۆکی گرتۆتەبەرو بە هەموو توانایەکییەوە هێزێکی درامی قووڵی بە ڕووداوەکانی هەڵبەستەکەی بەخشیوەو مەنەلۆگ و دیالۆگی دەمەتەقێیانەی لە گێڕانەوەی هەڵوێستی قارەمانەکانیدا بەکارهێناوە.

هەروەها بە ئەزیەری بەهرەی هونەری خۆی لە شێوازی ڕستەسازی تەقریری و دواندنەوەی دوورخستۆتەوەو بە دەربڕین و داڕشتنی هونەری، بیروڕاکانی دەربارەی ڕژێمی دەربەگایەتی نواندووە و لە لێکچواندن و خواستە و درکەی هونەری و سۆزی ئەندێشەی تایبەتی خۆی لە عاستی لێقەوماوان و هەژاران درکاندووەو توانیویەتی بەم هۆیە هونەرییانە دڵی گوێگرو خوێنەر ڕابکێشێ و لە ڕیزی بەرەی دژ بە کۆنەپەرستی و زوڵم و زۆرداری ڕاپانبگرێت و دژی ئەو ڕژێمە بیانجەنگێنێ، کە ببوو بەهۆی دواکەوتن و نەخوێندەواری و بێدادی لە وڵاتەکەماندا.

## • قۆناغە گشتییەکانی ڕەخنەسازی

لە مێژووی ڕەخنەسازی جیهانیدا ڕاستییەك ساغبۆتەوە، کە دەڵێ: یەکەم ڕەخنەساز لەسەر ئەم زەوییە دوابەدوای یەکەم هەستیار(شاعیر) لەدایکبووە، واتا: لە هەموو میللەتێکدا کە هەستیاری یەکەم هەڵکەوتە، هۆنراوەی هۆنییەوەو بەرهەمەکانی بڵاوکردنەوەو خەڵکی گوێیانلێگرت. لە هەمانکاتدا لە ماوەیێکی کەمدا ڕەخنەسازێکی هاوزەمان و هاوکات و هاونیشتمانی لەدایکبوو، دەستیکرد بە هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەو هەستیارەو ڕوونکردنەوەی لایەنی چاکەو خراپەی بەرهەمەکانی. بێگومان ئەم ڕاستییە مێژووییە قۆناغی یەکەمی چیرۆکی لەدایکبوونی ڕەخنەسازی دەستنیشاندەکات.

ڕەخنەسازی لەم قۆناغەدا بێگومان سادەو ساکارو سەرپێیی بووەو ڕەنگە لە سەرەتادا تاقە وشەیێکی خۆشحاڵی یاخود ناڕەزایی بوویێت ئەمجا وردە وردە پەرەیسەندو خەملاو بە دەربڕینی جۆربەجۆر خۆی نواندو گەیشتە قۆناغێکی تازە کە پێیدەوترێ قۆناغی ڕەخنەسازی بڕیاری

(النقد التقريري).

شاسوارەکانی ڕەخنەسازی لەم قۆناغەدا بەزۆری زمانەوان و ڕێزمان شووناسەکان بوون، کە بە بڕیاری کتومت و دوور لە لێکدانەوە هۆخستنەڕوو و بەرەنگاری هەڵەی زمانی و ڕێزمانی ڕێژەرەکان دەبوون و سەرنجیان بۆ هەڵەکان ڕادەکێشا.

دوابەدوای قۆناغی (ڕەخنەسازی بڕیاری) قۆناغی (ڕەخنەسازی فەلسەفی) بەرپابوو، ئەم قۆناغـە، هەڵبەت هەنگاوێکی فراوانی بەرەو پێشـەوەی تەمەنی ڕەخنەسـازییە، چونکە ڕۆژەکـەی لـە سـەردەمێکدا هەڵهات، کـە ڕێژە وەکوو چالاکییەکی ئادەمیزادانە بەشـداری لە تەنگوچەڵەمەکانی میتا فیزیکی و بوون و کێشەکانی هۆشمەندی و لێکدانەوەی بەرهەمەکانی سـەرنجی ڕادەکێشـا. شانبەشـانی ئـەم قۆناغـە، هەنگاو بەهەنگاو (ڕەخنەسـازی پسـپۆڕ) ڕەگوڕیشـەی خـۆی داکوتـا، ئەمجا لەبەر چەنـد هۆیێکی ئابووری و ڕامیـاری و زانیاری و هونەری ئەم قۆناغە سـنگی خۆی فراوانکرد بۆ گەشەسـەندنی ڕەخنەسـازی و لقوپۆپ هاویشتن.

## • قۆناغی ڕەخنەسازی پسپۆڕ

نزیکترین قۆناغی ڕەخنەسازی لە سەردەمی ڕاپەڕین و سەردەمی هاوچەرخماندا، ڕێبازە گشتییەکانی لە ڕێژەی کلاسیکی و کلاسیکی نوێوە دەستپێدەکەن. ئەوجا لەگەڵ پەیدابوونی ڕێژەی ڕۆمانسی و ڕیالیزمی سۆشیالیستی و پەرناسی و سریالی و ڕەمزی و (اللامعقول)دا، پەرەیانسەندو قەوارەی خۆیان لەیەکترجیاکردەوە. لە دواییدا سوودیان لە پێشکەوتنی زانستەکانی زمان و ڕێزمان و ڕەوانبێژی و دەروون و ئابووری و فۆلکلۆرو میسەلۆگی و کۆمەڵ وەرگرت و بوون بە ڕێبازی جیاواز، کە هەر یەکێکیان ڕێوشوێن و ئاڵا هەڵگری تایبەتی خۆی هەیە.

## • ڕێبازەکانی ڕەخنەسازی[1]

ڕەخنەسـازی جیهانی بەو قۆناغەدا تێدەپەڕێ و بە گوێرەی شـوێن و کات و سروشـتی نەتەوەکان بۆن و بەرامە و ڕەنگی جیاوازی پەیداکرد. مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیش هەر لەبەر ئەم ڕاستییە هەوڵ و تەقەلایان داوە بۆ دەستنیشانکردنی ڕێبازەکانی و شیکردنەوەی هۆیەکانی و جیاکردنەوەی ئامانجەکانی.

---

[1] النقد الأدبي أصوله ومنهجه ل ١٤١ ـ ١٤٢

ئـەم هـەوڵ و تەقەلایەیـان چەنـد ورد و زانسـتی بوویێت نەیتوانیوە شـوورەی پۆلایین بۆ جیاکردنەوەی ڕەخنەسازی لە لای میللەتان بنیاتبنێت و ڕێبازەکانی لە یەکتر بەبێ تێکەڵبوون جیابکاتەوە. پرسیاریش لێرەدا دەپرسێ: بۆچی مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی نەیانتوانیوە بگەنە ئەو ئامانجەیان؟ ئایا وێژە هەرچەندە چالاکییەکی ئادەمیزادانەیە لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی دیکـە جیـاواز نییە؟! یاخود چێژو سـۆزو ئەندێشـە و چۆنێتی بیرکردنەوە لـە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیێکی تر ناگۆڕێن؟ سەردەم و قۆناغێکی مێژوویی لەم سەرزەمینەدا، بەگوێرەی کات و بەسەرهات سەرئەنجامێکی تایبەتی خۆی نییە؟!

ئەم پرسـیارانە و دەیان پرسـیاری لەم تەرزە، ڕوودەکەنە مێژوونووسـەکانی ڕەخنەسـازی و داوای وەڵامیان لێدەکەن. ئێمەش ئەگەر بمانەوێ لێرەدا تەنیا خۆمان بە مێژووی ڕەخنەسازی جیهانییەوە ببەستین، دەتوانین لەگەڵ مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە، کە لەم ڕۆژانەدا دەتوانین چوار ڕێبازی سەرەکی بۆ ڕەخنەسازی دەستنیشانبکەین:

- **ڕێبازی مێژوویی**
- **ڕێبازی هونەری**
- **ڕێبازی دەروونی**
- **ڕێبازی هەمەڕەنگ**

## • ڕێبازی ڕەخنەسازی مێژوویی

ڕێبـازی مێژوویـی لـە ڕەخنەسـازیدا، هەروەکو لـە ناوەکەیەوە دیارو ئاشـکرایە، کەڵك لە مێـژووی گشـتی وەردەگرێـت و بە هۆی لێکۆڵینـەوەی باری ڕامیـاری و کۆمەڵایەتییەوە، ڕەخنەسازە پەیڕەویکەرەکانی بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستانەی خوارەوە هەوڵدەدەن:

١- دەستنیشـانکردنی ڕادەی کارتێکردنـی ژینگـە، واتـا (بیئـە) لـە ژیانـی وێـژەرو بەرهەمەکەی، یاخود ڕەنگدانەوەی بەرهەمی وێژەر لە ژینگەکەیدا و کارتێکردنی لە خەڵکی ئەو ژینگەیە.

٢- سنووردانانی ئەو قۆناغە مێژووییە کە لە ژێر سێبەریدا، چەشنێك لە چەشنەکانی وێژە لەدایکبووەو بە هۆی بواری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەو قۆناغەیەوە پەرەیسەندووەو خەملاوە. وەکو سـنووردانانی قۆناغی لەدایکبوون و خەملاندنی کورتەچیرۆکی کوردی یان ڕێبازی ڕیالیزمی لە پەخشانی فەرەنسیدا.

بپچڕێ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەبێت ئاسۆی بیری فراوانبێت و دەرگای تاقیکراوەکانی ڕەخنەسازە پەیڕەویکەرەکانی هەموو ڕێبازێکی ڕەخنەسازی بۆ کەڵکوەرگرتن بکاتەوە، بە تایبەتی ڕێبازی هونەری لە ڕەخنەسازیدا، کە بناغە جوانیگەرییەکانی زۆر پێویستن بۆ دوورخستنەوەی ئەم ڕێبازە لە مێژووی گشتی و بەستنەوەی بە جیهانی چەژو هونەرەوە. لە هەمان کاتدا، ڕەخنەسازی پەیڕەویکەری ڕێبازی مێژوویی دەبێ ملکەچی زانستی ڕێبازی ڕەوانبێژی و زانستەکانی زمان و ڕێزمان نەبێ، چونکە ئەم زانستانە دەستووری گشتی و زاناکانیان لە یەکالاکردنەوەیاندا تەماشای دەرفەت و سەردەمیان نەکردووە، هەروەها دەبێت ئاگای لە بڕیارە ڕەخنەسازییەکانی تر بێت، کە بەر لە ئەو سەبارەت بە باسەکەی وەرگیراون و بڕیارە تایبەتییەکانی خۆی وەکوو ئەشکێلێکی مێژوویی تەماشابکات. واتە: نابێت دیلی سەرنجە تایبەتییەکانی بێت و دەمارگیری بڕیارەکانی بێت و فەرامۆشی هەموو شتێ بکات.

بەم پێیە دەبێت بە نەشتەری لێکدانەوەو هۆدۆزینەوە، هەموو دیاردەیەك شیبکاتەوە، بە تایبەتی پەیوەندیی نێوانی وێژەرو ئەو ڕەخنەسازانە، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان باسیانکردووە.

ڕێبازی مێژوویی لە ڕەخنەسازیدا سەرەڕای لایەنە چاکەکانی لە کەموکوڕی بەدەرنییەو وەکو ڕێبازێکی بە توانا بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی بە تەواوی تەماشاناکرێ، چونکە هەندێ جار ڕەخنەسازە پەیڕەویکەرەکانی دەکەونە داوی بڕیاری سەرپێیی تەسکەوە، یاخود بە هۆی هەڵچوون و دەمارگیرییەوە بڕیاری گشتی دەدەن و بە وردی هەموو شتێ شیناکەنەوە.

جگە لەمانەش هەڵگری دروشمی ئەم ڕێبازە ڕەخنەسازییە لەگەڵ تەوژمی پەرەسەندنی زانست دەڕوات و هەموو دیاردەیێکی لێکداتەوەو فەرامۆشی بلیمەتی وێژەران دەکات و لە بیری دەچێت، کە ئەو بلیمەتییە دەشێ شوێنەواری ژینگە و سەردەم نەبێ، بەڵکوو ئاوازێکی هەڵکەوتوو بێت و بە چەند قۆناغێك دەرفەت و چەرخی خۆی بەجێهێشتبێت.

## • ڕێبازی هونەری

ڕێبازی هونەری لە ڕەخنەسازیدا هەندێجار بە ڕێبازی (جوانیگەری)ش ناودەبرێ. ئەم دوو ناوە، واتا: (هونەری و جوانیگەری)[1] دوو وشەی هاوواتان، سروشت و ئامانجی ئەم ڕێبازە دەردەبڕن و سەرنجڕادەکێشن، بۆئەوەی ئەم ڕێبازە زیاتر لە تەك فۆڕم و چەشنی وێژەی خەریکدەبێت و پەیڕەویکەرەکانی بەرهەمی وێژەران لە ڕووی وشەسازی و ڕستەسازی و ڕەوانبێژی و تایبەتییەکانی جۆری ئەو بەرهەمە شیدەکەنەوە.

---

1 النقد الأدبي اصول ومنهجه ل١١٠

سەرئەنجام ئەم ڕێبازە ڕەخنەسازییە ڕاستەوخۆ دەمانگەیەنێتە داڕشتن و تەکنیکی دەقەکە. لەبەر تیشکی دەستووری ئەم زانستانە، کە لە زمان و ڕێزمان و ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی و چەشنە وێژەییەکان، کەوابوو ڕەخنەسازە پەیڕەویکەرەکانی ئەم ڕێبازە دەبێت ئاگایان لە دەستووری ئەو زانستانە بێت و پسپۆڕییەکیان تێداهەبێت. بەم جۆرە هەنگاوی ڕاستەقینەی بەکارهێنەری ئەم ڕێبازە دەستنیشانکردنی چەشنی وێژەیی ئەو دەقەیە، کە دەیەوێ لێیبکۆڵێتەوەو هەڵیبسەنگێنێ، واتـا: دەبێت ئـەو دەقە چ چەشـنێك بێت لە هەڵبەسـت، ئەگەر هاتوو هۆنـراوە بوو، یاخود چ جۆرێکە لە جۆرەکانی پەخشان. ئایا کورتەچیرۆکە؟ ڕۆمانە، شانۆگەرییە...تاد، دوابەدوای ئەو هەنگاوە، ڕەخنەساز دەبێت تایبەتییە هەستییەکان و دەربڕینەکانی دەقەکە شیبکاتەوە، ئەوجا لە سـەر بناغەی بەراوردکاری لە چاو ئەو دەسـتوورانەدا، کە بۆ نموونەی بەرزی چەشـنی وێژەی هاودەقەکە ڕەچاوکراون هەڵیبسـەنگێنێ.. وەڵامی پرسیارێکی سـەرەکی بداتەوە، کە دەپرسێ: ئاخۆ ئەم دەقە تا چ ڕاددەیەك وەکوو نموونەی بەرزو سەرکەوتووی دەقە هاوچەشنە وێژەییەکانییەتی..؟

## • بناغەکانی ڕێبازی هونەری

ڕێبازی هونەری بەو هەموو ئەرکەوە، پەیڕەویکەرەکەی لە کارەکەیدا بە ڕەخنەسـازێکی ڕاستەقینە لە قەڵەمنادرێ، ئەگەر ئاگای لەم بناغانەی خوارەوە نەبێ:

**یەکـەم:** کارتێکردنـی دەقەکە لە ڕەخنەسـاز، بۆیە دەبێت ئەم ڕەخنەسـازە خاوەن چێژێکی بەرز بێت و شارەزاییەکی فراوانی هەبێت لە تاقیکردنەوەی ڕەخنەسازی و زانیاری و وێژەیی و زمانیدا، بۆئەوەی بڕیارەکانی زانستیانەبن و خۆی لە شاڵاوی هەڵچوونی کەسی بپارێزێ.

**دووەم:** پشتبەسـتن بە دەسـتوور و زانسـت لە هەموو بڕیارێکدا، بەڵام ڕەخنەسـاز نابێت بە جۆرێکی میکانیکی ئەم دەسـتوور و زانسـتانە بە سـەر دەقەکەدا بسـەپێنێ، بەڵکوو پێویستە خاوەن بەهرەیێکی وێژەیی بێت و لە کێشەکانی هونەردا زیندارو هەستپاراو بێت، چونکە وێژەی ڕاستەقینە خۆی لەخۆیدا سەرچاوەی دەستوور و بنواشەی زانستەکانە. بۆیە ناشێت ئەو دەستوورو بنواشانە (قاعیدانە)، کە زۆر جار دەستکرد و بیردۆزین، بکرێن بە پێوەر بۆ نرخپێدانی بەرهەمی وێژەرە هەڵکەوتووەکان، کە ڕەنگە لە دەستوور لابدەن و لادانەکەیان دەشێ ببێت بە دەستوورێکی تازە. هەرچۆنێك بێت نابێت ئەم ڕاستییە ڕەخنەسازییە وا لە وێژەران بکات، کە دەستووری زمان و ڕێزمانی نەتەوەکەیان پێشێلبکەن و خۆیان بە هیچ بنواشەیێکی ڕەخنەسازییەوە نەبەستن، بە

بیانووی ئەوەی گوایە وێژەری بلیمەت و هەڵکەوتوون، بلیمەتی و هەڵکەوتوویش لە سەرووی هەموو دەستوورو بنواشەی زانستێکەوە دێن.

جا بۆئەوەی زیانی ئەم چەشنە لادانە لە دەستووری زمان و ڕێزمان دەستنیشانبکەین، با سەرنج لە دێڕی یەکەمی هەڵبەستەکەی مامۆستا گۆران بدەین، کە بە ناونیشانی (لاوکی سوور بۆ کۆریا) داینـاوە، مامۆستا گۆران لەم دێڕەدا دەڵێ:

ئاشتی خوازی گـری گـری
کەوتە ژێرپێی درنج پەری

نیوەی دووەمی ئەم دێڕە بێگومان لە ڕووی ڕستەسازییەوە ئاڵۆزو تێکەڵوپێکەڵە، چونکە هونەرەکـەی لـە دەستووری بنیاتنانـی ڕسـتەی ڕەوانـی کـوردی لایـداوە پاڵـدراوی، واتا: (موسنەدی) کە فرمانی (کەوت)ە. پێشخستووەو وشەی (پەری) کە پاڵپشتە دواخستووە، بە گوێرەی ئەو دەستوورە، دەبووایە بیوتبایە:

**(پەری کەوتە ژێر پێی درنج)**

نموونەیێکـی دیکـە بـۆ لادانی ناهونەری لە هۆنینەوەی شـیعردا، با ئـەم دێڕانە بن، کە پارچەیەکن لە هەڵبەستی مامۆستا محەمەد حوسێن بەرزنجی، بە ناونیشانی (هەواڵێکی تریش) داینـاوە، دەبێژێ:

**دایە. دایە**
**شمشێرەکەی**
**لەوبەر دابووتە دەستم**
**فڕێم نەدا**
**شمشێرەکەتم نەفرۆشت**
**نەمدا بە پارە و نان و گۆشت.**

هەروەکـوو لـەم دێڕانـەدا ئاشـکراو ڕوونـە، ئەم هەڵبەسـتە لـە ڕووی چەشـنی وێژەییەوە هۆنراوەیێکی نوێیە، واتا: لە سـەر دەستوورەکانی هۆنراوەی عەرووزی و یاسای دێڕی دووکەرتی و یەکێتی قافیە نەهۆنراوەتەوە. کەوابوو هەسـتیار دەرفەتێکی فراوانی هەبوو بۆ سـازکردنی قافیەو سەروا، کە ئەم دەرفەتەی هەبوو بە هیچ ڕەنگێ مافی ئەوەی نەبوو لە دێڕی یەکەمدا بڵێ:

**دایە..دایە**

**کە کەوتم من**

بە پێشخستنی فرمانی (کەوت)و پاشخستنی بکەر، کە ڕاناوی (من)ە، چونکە ئاشکرایە کە ڕستەسازی کوردی نالّێ: کە کەوتم من. بەڵکوو دەڵێ: من کەوتم. یاخود پێویستی بە ڕاناوی (من) نییەو دەتوانێت هەر بڵێ: کەوتم.

هەروەها دەربڕینی پارەو نان و گۆشت لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە هیچ واتاییکی نییە، کە دوابەدوای دەربڕینی (شمشێرەکەم نەفرۆشت) هاتووە، چونکە کە شمشێرەکەی نەفرۆشت ئیتر نە پارە وەرئەگرێت و نە نان و گۆشت.

## • ڕێبازی دەروونی

زاراوەی دەروون، واتا نەفس، لە کۆنترین قۆناغەکانی مێژووی شارستانی جیهانیدا بەکارهێنراوەو بە زمانە دێرینەکان وەکور زمانی یۆنانی و ڕۆمانی و عەرەبی دەیان کتێب و لێکۆڵینەوە بۆ شیکردنەوەی چەمك و باسکردنی دانراون. لە سەرەتای ئەو مێژووەوە زاراوەی دەروون هەوێنی بیرکردنەوەی فەیلەسوفە یۆنانییەکان بوو، وەکو زینەفۆن و سوکرات و ئیفلاتون و ئەرستۆ.

ئەم فەیلەسوفانە دەروونیان بە گەوهەرو بناغەی بوون و قەوارەی هەستپێکراوی مرۆڤ لەقەڵەمدەداو وەکوو هێزێکی میتافیزیکی و خوایی تەماشایاندەکرد. ئەم چەشنە تێڕوانینە دەربارەی دەروون بەردی بناغەی هەموو باسەکانی ئەو فەیلەسوفە موسڵمانانە بوو، کە لاسایی فەلسەفەی یۆنانیان دەکردەوە، وەکوو: (ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد و فارابی)، واتا: لێکۆڵینەوەی دەروون و باسکردن لە فەلسەفەی یۆنانی و ئیسلامی و سەدەکانی شەشەم و پێنجەمی پێش زایینەوە هەتاکوو سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بابەتێکی میتافیزیکی بوو، بەڵام لە سەرەتای سەردەمی ڕاپەڕینەوە، کە وردە وردە شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپادا جێگای بە ڕژێمی دەرەبەگایەتی لەقکردو زانیاری و زانستی ماددی باڵی بەسەر کۆڕەکانی لێکۆڵینەوەو فێرگەکان کێشا، بابەتی دەروون لە مەیانی تێڕوانینی فەلسەفیانە دەرباز بوو. نۆشدار (پزیشك) و پسپۆڕە ماددییەکان دەستی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیان بۆ درێژکردو خستیانە بەر تیشکی شیکردنەوە لە تاقیگەو کارگە زانستییەکاندا. بەمجۆرە زاراوەی دەروون کە لە سەرەتاوە تێڕوانینێکی میتافیزیکی و فەلسەفی بوو، لەم ڕۆژانەدا بابەتێکی زانستییەو چەندین

ڕێبازو مەدرەسەی جۆربەجۆر لە زاناو پسپۆڕو نۆشدار هاتنەمەیدانەوە.

ڕەخنەسازیش کە بابەتەکەی وێژەیە، وێژەی ڕاستەقینەش کە ئاوازی هەست و نەست و دەروونی وێژەرە، بە کەم و بە زیاد لە درێژترین سەردەمە ژیاری و شارستانییەکانەوە خۆی لە مەسەلەی دەروون نەپچڕاندووەو ڕەخنەسازەکان هەوڵیانداوە، لەبەر ڕووناکی دەروونا بەرهەمەکانی وێژەر هەڵبەسنگێنن، بە تایبەتی ئەرستۆ هەروەکو لەمەودوا دەبینین لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (بیوتیکا - هونەری هۆنراو) دەروونی هەستیار بە سەرچاوەی هۆنراوە دەزانێ و چەشنەکانی هۆنراوەش لەسەر بناغە جۆربەجۆرەکانی دەروونی ئادەمیزاد دابەشدەکات.

ئەمە ڕاستییەکی مێژوویە هیچ کەس ناتوانێ فەرامۆشیبکات، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ بزانین کە سەرەتای سوودوەرگرتنی ڕەخنەسازەکان لە زانستی دەروون و بەرپابوونی ڕێبازی دەروونی بە جۆرێکی زانستیانە لە ڕەخنەسازیدا پاش بڵاوبوونەوەی بیروڕاکانی ( فرۆید) دەربارەی شیکردنەوەی دەروونی ئادەمیزادو لە دەستنیشانکردنی هێزی ناهۆشمەندی ( اللاوعی ) بووە.

فرۆیـد لە بیروڕاکانـی دەربارەی هێزەکانی دەروونی ئادەمیزادو پەیوەندی نێوان بەرهەمی هونەری و هەست و نەستی هونەرمەندا، بڕیاریداوە کە بە هیچ ڕەنگێ لێکۆڵینەوەی هونەرمەند لە ئادەمیزاددا نییە، بەڵکوو لێکۆڵینەوەی ئادەمیزادە لە هونەرمەندا.[1] کەوابوو ئەم زانا بلیمەتە هونەری بە هەموو لقەکانییەوە بە ڕێگایێکی فراوان و بێ کۆسپ و تەگەرە داناوە بۆ گەیشتن بە ناخی دەروونی مرۆڤ و زانینی هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی دیارو نادیاری.

ئـەم بڕیارەی فرۆیـد بە لای ئێمـەوە کلیلێك بوو بـۆ کردنـەوەی دەروازەی لێکۆڵینەوەی دەروون لـە سـەر زانسـت و هونـەری ڕەخنەسـازی و ئەوجـا پەیدابوونی ڕێبـازی دەروونی لەم زانسـت و هونەرەدا. پەیڕەویکەرانی ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسـازیدا وەڵامی سـێ کۆمـەڵە پرسیاردەدەنەوە:[2]

**کۆمەڵە پرسیاری یەکەم:** ڕووداوی داهێنان و خوڵقاندنی کاری وێژەیی چۆن ئەنجامدەدرێ؟ سروشتی ئەم ڕووداوە لە ڕووی دەروونییەوە چییە؟ توخمە هەستییەکان لە کاری وێژەییدا چین و چـۆن لـەم کارەدا ڕەنگیانداوەتـەوە و چ دەورێکیـان لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا گێڕاوە؟ چەند لەم توخمانە لە ناخی دەروونا شاراوەن و چەندیشیان لە دەرەوەی دەروونی ئادەمیزادەوە لێشاویان هێناوە؟ پەیوەندی نێوانی دەروونی وێژەر و دەربڕینە وێژەییەکان چییە؟ تا چ ڕاددەیەك وشەو وێنە هونەرییەکان لە کاری وێژەییدا توانیویانە هێزەکانی دەروونی وێژەر لە سۆزو هەڵچوون و

---

١ النقد الأدبي ل١٧٩

٢ النقد الأدبي اصول ومنهجه ل١١٠

ئەندێشە دەربڕن؟ ناوخۆیی و ڕواڵەتی وێژە چییە؟

**کۆمەڵە پرسیاری دووەم:** تا چ ڕاددەیەك پلەی کاری وێژەیی نیشانەی دەروونی خاوەنەکەیەتی؟ خوێنەری کاری وێژەیی چلۆن هەست بەم نیشانەیە دەکات و دێت بە دەنگییەوە؟ ئایا بە هۆی شیکردنەوەی کاری وێژەیی دەتوانین لە هەنگاوەکانی گۆڕانی دەروونی خاوەنەکەی بگەین؟

**کۆمەڵە پرسیاری سێیەم:** خوێنەر چۆن بە هۆی کاری وێژەییەوە لە بیروباوەڕو هەستی وێژەر دەگەن و لە گەڵیدا دەژین و پەیوەندییەکی ئایدۆلۆجی و سۆزی لە تەکیدا بنیاتدەنێن؟

پەیوەندیی نێوانی وێنە هونەرییەکانی وێژەیی و تاقیکراوە هەستییەکان و ناهەستییەکانی خوێنەرو گوێگر چین؟ هۆیەکانی کارتێکردنی کاری وێژەیی لە خوێنەرەکەیدا چەندیان دەگەڕێنەوە بۆ کارە وێژەییەکەو چەندیان لە دەروونی تایبەتی خوێنەرەکەیەوە هەڵقوڵاون؟

وەڵامدانەوەی ئەم کۆمەڵە پرسیارانە کە پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسازیدا بەرپایانکردوون بە چەشنێکی تەتبیقی دوور لە مشتومڕی بیردۆزی پێویستی بە چەند نموونەیەك لە هۆنراوە هەیە، بۆئەوەی بزانین هەڵگرانی دروشمی ئەم ڕێبازە چۆن شیاندەکەنەوە و لەبەر تیشکی پێوەرە ڕەخنەسازییەکاندا هەڵیاندەسەنگێنن.

جا ئێمەش بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە وامان بە باش زانی، کە دوو هۆنراوەی کوردی لە بابەتێکی هاوبەشدا هەڵبژێرین و بیانکەین بە نموونەی پەیڕەویکراو بۆ ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسازیدا:

هۆنراوەی یەکەم، هەڵبەستی: "هەوری پاییز"ە، کە هەستیاری کوردی نەمر مامۆستا گۆران بۆ وەسف و پیاهەڵدانی بارانی پاییزو ژیاندنەوەی سروشتی پاش هاوین و ماتی پاییز هۆنیویەتییەوە.

هۆنراوەی دووەم تابلۆیێکی ڕەنگینە، هەستیاری نەمری کورد مامۆستا پیرەمێرد، کە بە زمانێکی پاراو و ئەندێشەیێکی بەرزو سۆزێکی داهێنراو وەسفی شاری سلێمانی دەکات پاش بەفرباریێکی زۆر.

ئەوجا با بزانین ڕەخنەسازە پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی دەروونی چۆن ئەم دوو هۆنراوەیە شیدەکەنەوەو هەڵیاندەسەنگێنن. با جارێ دەستبدەینە هۆنراوەکەی مامۆستا گۆران (هەوری پاییز)و لە پێشدا هۆنراوەکە بە تەواوی بخەینە بەرچاوی خوێندەواران.

# هەوری پاییز

له دەریاوە قەتاری هەوری بارڕەشت کەوتە دووی پێشەنگ،
بەسەر سنگی چیادا چۆکی داداوە و کش و بێدەنگ...
بەسەر پاییزی زەردا با بەخوڕ بگری، بە کوڵ بگری،
لە سەر ئاخر گەڵا ئاخر چڵی تەنیایی کوڵ بگرێ!
بە خوڕ بگری، بە کوڵ بگری: بەسەر دەشت و دەری وشکا،
بەسەر داری گەڵا زەردا، بەسەر پووشا، بە سەر دڕکا،
بەسەر چاوەیی کزرا، بەسەر زیخی چەمی دێما،
بەسەر هەر وشکێکا وا لە هاوینی گەرم جێما..
بەڵێ بگری، بە کوڵ بگری، هەتا ئاخر دڵۆپ بگری،
بە گریەی هەوری پاییز با نقوم بێ سینەیی کزری!
بەفر ئاسۆی بڵند بگرێتە چێوەی بلووریی،
لە چەم هەڵسێ خوڕەو هاژەی شەپۆلی ئاوی خوێنینی!
دڵۆپی ساردو فێنک با لە سەر دارو دەوەن بڕژێ،
پەپوولەی زەردی ئاڵتوونی لە سەرلق هەڵوەرێ، بپژێ...
بەڵێ! بگری هەور، بارانی پاییز، بێ وچان بگری،
لە سەر باغچەی کوڵێ وا سیس ئەبێ ئاخر چڵی عومری!
بگرمێنێ، تەپ و نم دابکا، بکاتە شەست، هەرگیز،
نەوەستێ قوڵپی گریانی، نەوەستێ هەورەکەی پاییز؛
تەبیعەت زەردو ژاکاوە، لە حاڵی گیان کەنشتایە،
نیشانەی ماتەمی پاییز لە فرمێسکی درشتایە!

پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسازیدا لە بەر تیشکی بنواشەو بناغەکانی ڕێبازەکەیاندا، دەربارەی ئەم هەڵبەستەی مامۆستا گۆران تێبینی ئەوە دەکەن، کە خاوەنەکەی هیچ وشەیێکی کەسی لە ڕستە و دەربڕین و داڕشتنەکانیدا بەکارنەهێناوە. واتا چەند بە وردی چاو بە ڕاناو و فرمان و ئەو ناوانەدا بخشێنین، کە فەرهەنگی زمانی هەڵبەستەکەیان سازکردووە هیچ وشەیێکی ئەزی (زاتی)، کە دەنگدانەوەی دەروونی مامۆستا گۆران بێت، بەردەستمان ناکەوێ.

هەروەها لە وێنە هونەرییەکانی شێوازی هەڵبەستەکەدا، دەربڕین نییە بە ڕاستەوخۆ یاخود بە ناڕاستەوخۆ هەست و نەست و سۆزو هەڵچوونی تایبەتی و کەسی مامۆستا گۆران دەربارەی بابەتەکەی بنوێنێ.

سەرئەنجام پەیڕەویکەرانی ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسازیدا بڕیاری ئەوە دەدەن، کە ئەم هەڵبەستەی مامۆستا گۆران واتا هەڵبەستی "هەوری پاییز"هیچ پەیوەندییێکی زمانی و واتایی تایبەتی بە دەروونی خاوەنەکەیەوە نییە و نەیتوانیوە هێزەکانی هەستی بدرکێنێ و باری کەسایەتی بنوێنێ و لە تەك خوێنەرەکانیدا هۆگرییەك بنیاتبنێت و کاریان تێبکات و لە گەڵ هونەرەکەیدا سۆزو هەڵچوونێکی هاوبەش بەرپابکات.

ڕەنگـە لێرەدا گوێگر لە خوێندنەوەی هەڵبەستـەکەدا بەربەرچی ئـەو بڕیارە بەوە بداتەوە، کە مامۆستا گۆران لە شێوازی هەڵبەستـەکەیدا، وشـەو وێنەی هونەری مات و خەفەتبارو ڕەشـبینی بەکارهێنـاوە، وەکـو: "هەوری بارەش" و "پاییـزی زەرد" و "گریانی هەوری بارەش" و "داری گەڵا زەرد" و "سەرچاوەی کزر" و "گریانی هەتا ئاخر دڵۆپ" و "لورەلوری بەفر" و "شەپۆلی ئاوی خوێنین" و چەندین دەربڕینی ئاوا.

ئەوجا ئەو گوێگرە بڕیارێك سازبکات و بڵێت ئا ئەو وشە و وێنە هونەریانە دەنگی ناخی دەروونی مامۆستا گۆرانن، ئاوازی هەستکردنی بە زوڵم و زۆری دەرەبەگن لەو سەردەمەی کە دەرەبەگایەتی هەموو شتێکی پێشێلکردبوو. بەڵام ئایا ئەم وشە و وێنە هونەریانە لە هۆنراوەی عەرەبی و فارسی و تورکی و کوردی دێرینەدا هەمیشە بەکارنەهێنراون و دەیان هەستیار بەو زمانانە، کە مامۆستا گۆران شارەزایانە بە ماوەیێکی زۆر سازیان نەکردوون؟! ئەمە پرسیارەو مێژووی وێژەی زمانە ئیسلامییەکانیش وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەداتەوە، کە لێچواندنی باران بە گریانی هەور و دەنگی هەورەتریشقە بە ئاه و ناڵە و تەشخیسی پاییز بە مرۆڤێکی ڕەنگزەرد و وێنە هونەرییەکانی دیکە دەربڕینی هاوبەشن لە نێوان هەستیارەکاندا و ئەوەندە بەکارهێنراون بوونە کلێشەی ساردوسڕو دوور لە سۆزو هەڵچوونی ڕاستەقینە.

بەمجۆرە پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسازیدا لەسەر بڕیارەکەیان سووردەبن و دووپاتیدەکەنەوە، کە مامۆستا گۆران لە هەڵبەستی "هەوری پاییز"دا هەستیارێکی بابەتی و مەوزوعییە و هەموو سەرکەوتنەکەی لە هۆنینەوەی هەڵبەستەکەیدا هەر ئەوەیە، کە توانیوەتی وەکو وێنەگرێك تابلۆێکی فۆتۆگرافی دەربارەی بارانی پاییز دروستبکات و بەس.

لە دوای شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی هۆنراوەکەی مامۆستا گۆران (هەوری پاییز) با بێینە سەر هۆنراوەکەی پیرەمێرد 'کوردی ڕەوان 'بە پێی ڕێبازی دەروونی شیبکەینەوە و هەڵیبسەنگێنین. با جارێ دەقی هۆنراوەکە بخەینە بەرچاوی خوێنەواران:

بەیانی بوو، لە خەو هەستام کە ڕوانیم بەفرە باریوە
سلێمانی ئەڵێی بەڵقیسە، تارای زیوی پۆشیوە
دەمێکە چاوەڕێی بەفرێکی وابووم، موژدەبێ باری
سەرم بەفرە، کەچی هێشتا شەڕە تۆپەڵمە بۆ یاری
لە بیرمە شێرە بەفرینەم ئەکرد سواری دەبووم بێ زین
نسێ بوو، جێگەکەی دەی بەست، دەما تاکو دەمی هاوین
بە بەرگی سپییەوە چەند شۆخە شاخی کۆیژە بیبینە
لە ڕەنگی ئاسمان دڵبەرترە، ئەم سپییە ئەو شینە
ئەڵێن:بەرگی فریشتەی ئاسمان دڵبەرترە ئەم سپییە ئەو شینە
ئەڵێن: بەرگی فریشتەی ئاسمانیش سپییە، وەک بەفرە
فریشتەی ئێمە باڵیە، بەڵام چی بکەین لەگەڵ تەفرە
هەموو پێچە کڵۆی بەفرێک فریشتەی خوای لەگەڵدایە
فریشتە کەوتە ناومان، بۆیە وا ئاشووب و هەڵلایە
ئەوا ساماڵی کرد و ڕۆژهەڵات، کەوتە گڵەزەردە
بەسەر ئەو بەفرەدا تیشکی هەتاو، ئەڵماسی خواکردە
بەسەر گۆنای سپیدا خشڵی زێڕینە بریسکەی دێ
پەری سەر کێوی قافیش هێندە پرچی زەردی خۆی لێ دێ
لەسەر سەریان بەفر توێژاڵی، وێنەی چوڕی شیرە
قەتارەی سەر لق و پۆپی درەختیش سپییە دڵگیرە
چلورەی گوێسەوانە، پلپلەی زیوی کچە کوردە
سەهۆڵ ئاوێنەیە، ئەم پلپلە و ئاوێنەیە وردە
کە پیرێژن سەرو پۆپلەی بە شینی چلە تێک ئاڵا
بەهار دێت، داری پیر دەژێتەوە، دێتە قەد و باڵا

پەیڕەویکەرانی ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسازیدا لە سەر هەمان شێوە دەکەونە شیکردنەوەی هۆنراوەکەی پیرەمێرد، کە هۆنراوەکەی مامۆستا گۆرانیان پێ شیکردەوە و پشت بە تێبینی بەراوردکاری دەڵێن: پیرەمێرد بە پێچەوانەی گۆرانەوە زۆربەی وشەو وێنە هونەرییەکانی ئەزی و کەسین، بەڵگەشیان لەم ڕووەوە ئەوەیە، مامۆستا پیرەمێرد هەرچەند بابەتی هەڵبەستەکەی وەکو بابەتی هۆنراوەکەی مامۆستا گۆران مەوزوعییە، بەڵام لە هەمان کاتدا، ئەم بابەتە مەوزوعییە بە ڕەنگ و بۆن و بەرامەتی دەروونی تایبەتی خۆی سازکردووەو لە ڕوانگەی هەست و نەستی کەسی خۆیەوە، ئەو بەیانییە تەماشای بەفربارینەکەی سلێمانی کردووە.

ئاکامی چۆنێتی ئەم تەماشاکردن و ئەو سازدانە لە وشە کەسییەکانی زمانی هەڵبەستەکەدا بە ڕوونی خۆی دەنوێنێ، بۆیە لە نێو دێڕی یەکەمی هەڵبەستەکە بە دوو ڕاناوی لکاوی کەسی وەسفی باری تایبەتی خۆی کردووەو وتوویەتی:" لە خەو هەستام، ڕوانیم". ئەمجا بە قووڵی خۆشەویستی تایبەتی خۆی لە عاستی (بەفربارین)خستۆتەڕوو و بە دەربڕینی دەمێکە چاوەڕێی بەفرێکی وابووم"ئەم ڕاستییەی چەسپاندووە، سەرەڕای ئەمەش تاسەو ئارەزووی دەروونی وەکو مزگێنییەك بە ڕستەی "مژدەبێت"جاڕداوەو دەستیکردووە بە پیاهەڵدانی خۆی و پیری تەمەنی باسکردووە. دوابەدوای ئەمەش دەستی بە گێڕانەوەی یادگارییە کۆنەکانی کردووە، کە دەڵێ:

لە بیرمە شێرە بەفرینەم ئەکرد، سواری ئەبووم بێ زین
نسێ بوو جێگەکەی ئەی بەست، دەما تاکو دەمی هاوین

ئەم بەڵگانە بێگومان ڕاستییەك دەسەلمێنن، کە دەڵێ: ئەم هەڵبەستەی پیرەمێرد لە وەسفی بەفربارینێك لە شاری سلێمانی دەنگی دەروونی خاوەنەکەیەتی و ئاوێنەیێکی بێگەردی هەست و نەستی بە ئەندێشە و سۆزو هەڵچوونی هونەرەکەی سازکراوە و باشترین نموونەیە بە دەست پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسازیدا بۆ چەسپاندنی وەڵامی هەموو پرسیارەکانیان دەربارەی پەیوەندی نەمری نێوانی هەڵبەست و دەروونی مرۆڤ.

## • ڕێبازی هەمەڕەنگە

لە مێژووی ڕەخنەسازیدا ڕاستییەکی سەرەکی دەربارەی ئامانجی ڕاستەقینەی ڕەخنەسازی لێهاتوو چەسپێنراوە، کە دەڵێ:"ڕەخنەساز لە هەموو تەقەلایەکیدا دەیەوێ بگاتە نموونەی هەرە بەرزو تەواوی وێژە، بۆیە لە جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانیدا، کەموکوڕی بەرهەمە

وێژەییـەکان دەرناخـات و بەس، بەڵکوو کەموکوڕییەکانی ڕێبازە ڕەخنەسـازییەکان دەخاتەڕوو، واتا: ڕەخنەسازی لێهاتوو ڕەخنە لە خۆشی دەگرێت و چاوپۆشی لە هیچ ناتەواوییەك ناكات.

ئەم ڕاستییە سەرەكییە بە تەواوی خۆی لەو تێبینییە ناقایلانەدا دەنوێنێ، کە ڕەخنەسازەکان ئاراستەی ڕێبازە ڕەخنەسازییەکانی خۆیان دەکەن..

بۆ نموونە: ڕێبازی دەروونی لە ڕەخنەسـازیدا هەرچەندە ڕێبازێکی فراوان و چەسـپێنراوە و پەیڕەویکەرەکانی بەرگری لێدەکەن و لە دەوری خڕدەبنەوە، زۆر ڕەخنەساز هەیە ئەم ڕێبازە دەخەنەبەر نەشتەری ڕەخنە و دۆزینەوەی کەموکوڕییەکانی و سەرنجڕادەکێشن، بۆ ئەوەی ئەم ڕێبازە لە کەموکوڕییەوە دوورنییە و کەلەبەری زۆری تێدایە.

لـەم کەلەبەرانـە دەستنیشـانکردنی گرنگـی زانسـتی دەروونە، کە تا ئێسـتا زانسـتێکی پێگەیشتووی سەرکەوتوو نییە و لە توانای گەیشتن بە ناخی دەروونی مرۆڤ بێبەشە، چونکە دەروونی ئادەمیزاد هێزێکی پەنهانی بێسنوورەو شوێنەوارێکی ماددی نییەو زانستی دەروون، کە لەم هێزە پەنهانییە دەکۆڵێتەوە بە هیچ ڕەنگێ لە ڕووی ئەنجامەکانییەوە ناگاتە پلەی ئەو زانستە تاقیکراوانە، کە لە ماددە دەدوێن.[1]

سازکردنی ئەم ڕەخنەیە دەرحەق بە ڕێبازی دەروونی نابێت ئەوە بگەیەنێ، کە ئەم ڕێبازە لە سوود بێبەرییە، بەڵکوو دەبێت ڕاستییەکی دیکە هەڵبهێنجێ، کە دەڵێ: ڕێبازە ڕەخنەسازییەکان هەموویان بـە کەڵـك دێن ئەگەر هاتوو ئامانجیان ڕابەری وێژەران بوو، بەڵام ئەگەر هاتوو بە جۆرێکی بیردۆزەیی و فەلسـەفی پەیڕەویکران دەبن بە کۆت و زنجیرو ئەوپەڕی زیان بە وێژەو وێژەر دەگەیەنن.

سـەرئەنجام نابێت ئەم ڕێبازانە هەموویان فەرامۆشـبکەین، هەروەها ناشێ پەیڕەوی تاقە ڕێبازێکیان بکەین، بەڵکوو دەبێت لە هەر ڕێبازێك چەمکێکی وەربگرین و لایەنە ئیجابییەکەی بخەملێنیـن و ڕێبازێکی هەمەڕەنگە لە ڕەخنەسـازیدا پێکبهێنیـن، کە بناغەکانی ئەمانەی خوارەوەن:[2]

**یەکەم:** بەرهەمی وێژەیی نابێت وەکو ئاکامێکی سروشـتی گشـتی و ژینگەی ماددی لەقەڵەمبدرێ، هەروەها نابێت وەکو ئاوێنەیێکی میکانیکی سەردەمەکەی تەماشابکرێ، چونکە وێژەری ڕاستەنی، کە داهێنەری بەرهەمی وێژەییە دەشێ دەنگێکی نەمرو هەڵکەوتوو بێت، کە هێزی خولقاندنی سروشت و ژینگەو سەردەمێکی تازەی پێسپێردرابێ.

---

١ النقد الأدبي ل١٧٩
٢ النقد الأدبي ل٢٢٠

**دووەم:** ناشێت وێژە بەو جۆرە سەیربکرێ، کە بەری درەختی دەروونێکە و سەرئەنجامی هۆیێکی هەستپێکراو و سنوورکێشراوە.

**سێیەم:** نابێت قاڵبێکی ئاسنینی تەنگەبەر بە هۆی دەستوورەکانی زمان و ڕێزمان و ڕەوانبێژی بۆ وێژە دابتاشرێ و سازبکرێ، بەڵکوو دەبێت بەرهەمی وێژەیی وەکوو ڕاستییەکی داهێنراو شیبکرێتەوەو تایبەتییەکانی بخرێتەڕوو، ئەوجا لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا، بنواشەی ڕابەری بۆ وێژەرە تازە پێگەیشتووەکان دەستنیشانبکرێ.

**چوارەم:** پێویستە لە هەموو لایەنەکانی بەرهەمی وێژەیی بکۆڵرێتەوە و باسی وێژەر و سرووشت و ژینگە و مێژوو بکرێ.

**پێنجەم:** نابێت تایبەتییە جوانییەکانی بەرهەمی وێژەیی فەرامۆشبکرێت، لە هەمان کاتدا، پێیناوێت ڕەخنەساز خۆی لە ناو بابەتە دەروونییەکان و مێژووییەکان و زانستییەکان نقومبکات، بەڵکوو پێویستە وا لە خوێنەوار بکات، کە لە خاکوبا (جەو)ی وێژەردا بژی و تا ڕادەیەك سەرنج لە وێژە وەکوو بەرهەمێکی سرووشت و کۆمەڵ و وەچە و سەردەم بدات.

## • ڕێچکە مێژووییەکانی ڕەخنەسازی

ڕەخنەسازی وەکوو بەرهەمێکی هونەری و زانستی جیهانی، کە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوەو بە کارتێکردنی چەند هۆیێکی ڕۆشنبیری و ئابووری و ڕامیاری پەرەیسەندووە و سەردەم بە سەردەم گۆڕاوە، بێگومان سەرچاوە سەرەکییەکانی لە چەند ڕێچکەیێکی مێژووییەوە هەڵقوڵاون و ڕێگەی ژیانیان گرتۆتەبەر.

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی بۆ دەستنیشانکردنی ئەو ڕێچکە مێژووییانە تێبینییانکردووە، کە هەرچەندە لەسەر ئەم زەوییە لە دێرترین زەمانەوە دەیان شارستانێتی بنیاتنراون، وەکوو شارستانێتی میدی و سۆمەری و بابلی و ئاشووری و میسری و هیندی و یۆنانی و ڕۆمانی و عەرەبی و... هەر یەکێك لەم شارستانییەتیانە لە سەردەمی خۆیدا جیهانی ئادەمیزادیان بە ڕووناکی وێژە و زانیاری ژیاری ڕووناککردۆتەوە، بەڵام ناتوانین بۆ هەر یەکێك لەم شارستانییەتانە ڕێچکەیێکی مێژوویی ڕەخنەسازی جیاواز دەستنیشانبکەین و وەکوو سەرەتایەك بۆ ئەڵقەکانی زنجیرەی ژیانی ڕەخنەسازی پەنجەی بۆ درێژبکەین.

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی بۆ دەستنیشانکردنی ڕێچکە مێژووییەکانی ڕەخنەسازی سێ پێوەری ئایدۆلۆجی و هونەری و سەرچاوەیی دەچەسپێنن:

**پێوەری یەکەم:** ئەم شارستانێتییە دێرینە دەبێت خاوەن فەلسەفە و بیروباوەڕی تایبەتی و هەمیشە کارتێکەر بێت لە جیهاندا.

**پێوەری دووەم:** ئەم فەلسەفە و بیروباوەڕە پێویستە بە هونەری جۆربەجۆر دەربڕابێت و بەرهەمەکانی ئەم دەربڕینە وەکوو سامانێکی نەتەوایەتی تۆمارکرابێت و بۆمان بەجێمابێت و بەبێ دەستکاری و گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕکردن گەیشتبێتە دەستمان.

**پێوەری سێیەم:** بوونی گەنجینەیەك لە وتارو لێدوان و کتێبی ڕەخنەسازی بە زمانی نەتەوەی خاوەن شارستانییەتە دێرینەکە بەو فەلسەفە و بیروباوەڕە ڕەنگکرابێت و لەو هونەرە جۆربەجۆرانەی کۆڵیبێتەوە.

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی لەبەر تیشکی ئەم سێ پێوەرەدا، تەنیا دوو ڕێچکەی مێژوویی ڕەخنەسازی دێرینیان دەستنیشانکردووەو بە بناغە و ڕەگوڕیشەی هەموو ڕەخنەسازییەکی ئەم سەردەمەیان لە قەڵەمداون:

**یەکەمیان: ڕێچکەی ڕەخنەسازی یۆنانی و ڕۆمانی**

**دووەمیان: ڕێچکەی ڕەخنەسازی عەرەبی دێرین**

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی بڕیاری بوونی ئەم دوو ڕێچکە مێژووییانەی ڕەخنەسازی بەوە شیدەکەنەوە، کە هەر یەکێك لە نەتەوەی یۆنان و عەرەب لە کۆنترین سەردەمەوە خاوەن شارستانییەتێکی دێرینن. ئەم شارستانێتییە لە لای یۆنانییەکان لە ڕووی ڕۆشنبیری و ئایدۆلۆجییەوە لە سەر فەلسەفەی میتافیزیکی و فیزیکی دامەزراوەو بیروڕاکانی (عالم المثل) هەتا ئەم ڕۆژگارە، شوێنەواری تایبەتی خۆیان هەیە، هەروەها بیروباوەڕی ئەرستۆ لە کێشە فیزیکییەکان و بابەتە ڕامیاری و ڕەوشتییەکاندا هەمیشە زیندوون.

لەلای نەتەوەی عەرەب ئەم شارستانێتییە لە ژێر سێبەری ئایینی ئیسلامدا گەشاوەتەوەو بەهۆی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.) کەسایەتییەکی تایبەتی بۆ خۆی پەیداکردووەو هەنگاو بە هەنگاو لە سەر دەستی زاناکانی زانستی ئاخاوتن و فەیلەسوفە ئیسلامییەکان پەرەیسەندووە و بووە بە سەرچاوەیێکی گەشاوە بۆ دەیان نەتەوەی موسڵمان هەتا ئەمڕۆ.

هەروەها بە زمانی یۆنانی و بە زمانی عەرەبی لە کۆنترین سەردەمەوە سەدان بەرهەمی وێژەیی تۆمارکراون و بەم دوو زمانە جیاوازە وتارو لێدوان و کتێبی ڕەخنەسازی دێرین نووسراونەتەوەو گەیشتوونەتە دەستمان.

ئەم بڕیارەی مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی لە دەستنیشانکردنی دوو ڕێچکەی مێژوویی

بۆ ڕەخنەسازی جیهانی، نابێت بوونی چەشنە پەیوەندییەك لە نێوانی شارستانێتی یۆنانی و عەرەبی و نەتەوە دێرینەکانی دیکە فەرامۆشبکات، چونکە لە نووسینەوەی مێژووی شارستانێتی یۆنانی سوودی لە شارستانێتی میدی و میسری و سۆمەری و بابلی و شارستانێتییەکانی تر وەرگرتووە: بە دەیان زانای موسڵمان لە کورد و فارس و تورك و هیندی لە بنیاتنانی شارستانێتی عەرەبیدا چالاکانە بەشداریانکردووە.

ئەم ڕاستییە لە هۆنینەوەو ڕێکخستن و ئەڵقەکانی چیرۆکی ڕەخنەسازی ئەم سەردەمەدا، وامان لێدەکات، کە هەر دەبێت بۆ توێژینەوە و ساغکردنەوەی ڕەخنەسازی هەموو نەتەوەیێکی ئەم ڕۆژگارە لەگەڵ ئەو دوو ڕێچکە مێژووییانەی ڕەخنەسازی بڕۆین و لەبەر تیشکیاندا، ڕەنگ و بۆن و بەرامەیێکی ڕەخنەسازی ئەم نەتەوانە یەکالابکەینەوە.

ئەگەر لێرەدا بپرسین بۆچی دەبێت خۆمان بەو دوو ڕێچکە مێژوویە ڕەخنەسازییەوە ببەستینەوە؟

ڕاستییەکانی مێژووی ڕۆشنبیری و شارستانێتی بە سەرسووڕمانێکەوە وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەدەنەوە دەڵێن: ڕەخنەسازی نەتەوەکانی ئەوروپا بۆ نموونە لە بووژانەوەی ڕەخنەسازی یۆنانیدا سەریهەڵدەداوە و ڕەخنەسازە بەناوبانگەکانی ئەم نەتەوانە وەکوو: (شاتۆبریان و مەدام دی ستال) لە سەرەتاوە سوودیان لە کتێبی (بیویتیکا و ریویتیکا)ی ئەرستۆ وەرگرتووە.

ئاخۆ ئەو ڕەخنەسازە کوردانە، کە لە کۆنەوە لەگەڵ زانستی ڕەوانبێژیدا خەریکن و هەندێکیان هەتا ئێستا بە ڕێگاییێکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کەڵکیان لە سامانی ڕەخنەسازی عەرەبی دێرین وەرنەگرتووە؟!

ئەم وەڵامدانەوەیەی ڕاستییەکانی شارستانێتی و ڕۆشنبیری، ڕەنگە سەرئەنجامێکی بیردۆزەیی بێت و هەتا ئێستا هەندێك لە مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی پێی قایلنەبووبن و جێگای مشتومڕیان بووبێت، بۆیە ئێمە هەروەکوو لەمەوبەر بەڵێنماندا، لەگەڵ شیکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەو دوو ڕێچکە مێژووییەی ڕەخنەسازی و لقوپۆپەکانیان دەدوێین، هەتاکو دەگەینە درەختی ڕەخنەسازی نەتەوایەتیمان و لە ژێر سێبەریدا بەرهەمی ڕەخنەسازە کوردەکانمان شیدەکەینەوە.

## • میللەتی یۆنان

لەو دوو ڕێچکە مێژووییانەی ڕەخنەسازی، کە لەمەوبەر دەستنیشانمانکردن، ڕێچکەی مێژوویی یۆنانی کۆنترینیانە، بۆیە لە پێشەوە لەم ڕێچکەیە دەکۆڵینەوەو بە کورتی باسی دەرفەتی پێکهێنان و لەدایکبوونی دەکەین.

پرسیاری سەرەکی لە لێکۆڵینەوەکەماندا بێگومان دەبێت دەربارەی نیشتمان و میللەتی یۆنان بێت.

نیشتمانی یۆنانی ئەو پارچە زەوییەیە، کە لە سێ نیوچە دوورگە پێکهاتووە لە کەرتەی ئەوروپادا. دانیشتوانی ئەم نیشتمانە یۆنانین و لە چەند خێڵ و تیرەی جیاواز لە ڕووی نەریت و فەرمانڕەوایی و کەلەپووری ئایینییەوە پێکهاتووە. ئەم خێڵ و تیرانە بە گشتی بەسەر دوو کۆمەڵەدا دابەشەکرێن:

**کۆمەڵەی یەکەم:** کۆمەڵەی خێڵ و تیرە (دۆریییەکان)ە (doriens)، کە لە ناوچەی

لاکونیادا (Laconic) جێنشینبووبوون و بە ناوی پایتەختی ناوچەکەیانەوە (ئیسپرتە) لە مێژوودا ناوبانگیان دەرکردووەو پێیانگوتراوە (ئەسپارتییەکان).

**کۆمەڵەی دووەم:** کۆمەڵـەی خێڵ و تیرە (ئەکتییـەکان)ە (Acteens)، کە لە ناوچەی (ئەتیـکا)دا Attigue جێگیربووبـوون و بـە نـاوی پایتەختی ئەم ناوچەیەوە، کە (ئەسـینا)یە Athenes ناودەبرێن و بە ناوی (ئەسینییـەکان) لە (ئەسپرتییـەکان) جیادەکرێنەوە.[1]

## • شارستانێتی یۆنانی

لە مێژووی شارستانێتی و ژیاری جیهانیدا ساغبۆتەوە، کە شارستانێتی یۆنانی شاسواری هەموو شارستانێتییە کۆنەکانی ئەمسەرزەوییەیە، جا بۆیە مێژوونووسەکانی شارستانێتی جیهانی شەیدای دۆزینەوەی هۆی سەرەکی ئەم بارە بوونەو لە مێژەوە هەتا ئێستا هەوڵوتەقەلایان داوە بۆ ڕاڤەکردنی ئەم دیاردە ئادەمیزادیانەو پرسیویانە: ئایا ئەم شارستانییە نەمرە بێهاوتایە، بەرهەمی ئاووهەوای مامناوەندی ناوچەی نیشتمانی یۆنانییەکانە؟ یاخود سەرئەنجامی سروشتی ئەم نیشتمانەیە، کە وەکوو پردێکە لە نێوانی نیشتمانی ئەورووپاو وشکانی ئاسیاو لە چیاو دەشتی ڕەنگاوڕەنگ و بە پیت پێکهاتووە؟!

هەندێك لە مێژوونووسەکانی شارستانێتی جیهانی ئەم دوو پرسیارە بەرپادەکەن، چونکە دەڵێن: میللەتی یۆنان لەم سەردەمەی ئێستاماندا وەکوو یۆنانییە دێرینەکان لە هەمان نیشتماندا دەژین و لە باوەشی هەمان ئاووهەوادا بەخۆشی گوزەران دەکەن، کەچی وەکوو باوباپیرەکانیان دەورێکی گرنگ لە شارستانێتی هاوچەرخدا ناگێڕن.

سەرئەنجام ئەم مێژوونووسانە پەنجە بۆ ڕەگوڕیشەی هەرە دێرینی شارستانێتی یۆنانی درێژدەکەن و پشـت بە شـوێنەوارە دۆزراوەکان دەبەسـتن و دەڵێن: لە ناوچەی لاکۆنیاو ئەتیکادا لەگەڵ بەرەبەیانی مێژووی پێشکەوتنی ئادەمیزاددا شارستانێتی پێشکەوتوو بنیاتنراوە، وەکوو شارستانێتی (مینیسییەکان)[2] لە هەزاری چوارەمی پێش زایینییەوە هەتاکوو هەزاری دووەمی پێش زایین، هەروەها شارستانێتی (مینیسییەکان)، کە لە (١٥٠٠- ١٠٠٠)ی پێش زایینی ڕووناکییەکەی هەموو وڵاتی یۆنانی گرتەوە.

مشتومڕی توێژەر و مێژوونووسەکانی شارستانێتی جیهانی لە هەڵبژاردنی هۆی سەرەکی خوڵقێنەری شارستانێتی یۆناندا چەند توندوتیژ بێت ناتوانێ یەکانگیرێت، بەڵام هەمیشە لە

---

١ الأدب اليوناني القديم ل ٧

٢ مدخل الى تاريخ الاغريق وادبهم وآثارهم ل ٨

دستنیشانکردنی مەزنی و گرنگی ئەو شارستانێتییە بەرەنگاری هیچ جیاوازییەك نابێت، چونکە ئەو توێژەرو مێژوونووسانە لە ڕاستییەکدا یەکدەگرنەوە، کە دەڵێن: لە تاریخی هەزارو سەدی پێش زایینییەوە لە ژیانی خێڵایەتی یۆنانیدا دوو ڕووداوی گرنگ هاتنەکایەوە:

**یەکەم:** پەیدابوونی شارو ژیانی شارستانێتی و جێلەقکردن بە ڕژێمی خێڵایەتی و زاڵبوون بە سەر ژیانی لادێی ساکارو کۆمەڵگای لە یەکترپچڕاودا.

**دووەم:** لەناوچوونی ڕژێمی شایەتی و پەیدابوونی ڕژێمی ئەرستۆکراتی، کە بەرەبەرە لەناوچوو، لە جێگایدا ڕژێمی کۆماری بنیاتنرا.

ئاکامی شارستانێتی یۆنانی بە هەموو دیاردەو دەرفەتەکانییەوە پێشکەوتن و داهێنانێکی هونەری بێهاوتا بوو، کە هەر لە سەرەتای پەیدابوونییەوە جۆربەجۆرو هەمەڕەنگ بوو، بەرهەمەکانی ئەم هونەرە لە داتاشینی پەیکەرو وێنەکێشان و ڕازاندنەوەی شارو بنیاتنانی کۆشك و تەلارو شانۆ پێکهاتووە، ئەوجا داهێنانی فۆلکلۆری جۆربەجۆر لە مۆسیقاو هەڵپەڕکێ و خولقاندنی شانۆگەری و پێشکەوتن لە تەکنیکی دەرهێنان، دوابەدوای ئەمانەش بڕینی قۆناغێکی فراوان لە وێژەی بەرز، کە ئاوێنەی لوتکەی هۆشمەندی و سۆزو هەڵچوونە.

## • وێژەی یۆنانی

ڕەخنەسازی و وێژە لە یەکترجیاناکرێنەوەو هەمیشە بە یەکەوە دەژین، بۆیە دەبێت بەرلەوەی لە ڕەخنەسازی یۆنانی بکۆڵینەوە، سەرنجێك لە وێژەی ئەم نەتەوەیە بدەین، وێژەی یۆنانی بەسەر ئەو سەردەمانەی خوارەوەدا دابەشدەکرێ:

**یەکەم:** سەردەمی دێرین یاخود سەردەمی "پێش لاتیکی"[1] تەمەنی ئەم سەردەمە نزیکەی پێنج سەدە دەبێت. لە ساڵی هەزاری پێش زایینییەوە هەتاکو ساڵی پێنجسەدی پێش زایین.

لەم سەردەمەدا زۆربەی چەشنەکانی هۆنراوە لەدایکبوون و خەملاون وەکوو هۆنراوەی ئەلیجی و ئەیامبی و هۆنراوەی گۆرانی. هەروەها لەم سەردەمەدا سەرەتای پەخشانی یۆنانی کەوتەڕوو و وردە وردە هەنگاوینا.

**دووەم:** سەردەمی لاتیکی یاخود ئەتینی، ئەم سەردەمە لە پێنجسەدی پێش زایینییەوە هەتاکوو ساڵی سێسەد و بیستی پێش زایینی خایاند. بە درێژایی ساڵەکانی ئەم سەردەمە شانۆگەری یۆنانی بە هەردوو چەشنەکەیەوە، واتا: شانۆگەری (تراژیدی) و شانۆگەری (کۆمیدی) وردە وردە خۆی چەسپاند. هەتا گەیشتە لوتکەی پەرەسەندن و خەملاندن.

---

١ مدخل الی تاریخ الاغریق وادبهم وآثارهم ل١٠١

**- بەخشانی مێژوویی**
**- پەخشانی دواندمری**
**- پەخشانی دەمەتەقێ و فەلسەفی، ڕێگای پێگەیشتن و پێشکەوتنی بڕی.**

**سێیەم:** سەردەمی هێلین ئەم سەردەمە بەسەر دوو قۆناغدا دابەشدەکرێت:

**قۆناغی ئەسکەندەر:** لە ساڵی سێسەدو بیستی پێش زایینییەوە تا قۆناغی یۆنانی و ڕۆمانی.

**قۆناغی یۆنانی و ڕۆمانی:** لە ساڵی سەد و چل و شەشی پێش زایینییەوە، کە ساڵی هێرشبردنی ڕۆمانییەکانە بۆ سەر یۆنانییەکان، دەستپێدەکات و لە ساڵی پێنجسەد و شەست و پێنجی زایینی، کە ساڵی مردنی "جۆستنیان"ی ئیمپراتۆرە، کۆتاییدێت.

## • سەرەتای ڕەخنەسازیی یۆنانی

ئەگەر بمانەوێ سەرەتاییەکی زانستی بۆ ڕەخنەسازی یۆنانی دەستنیشان بکەین، دەبێت ئەم سەرەتایە لە جەژنەکانی شانۆدا بە دەستبهێنین.

ئەوەی لە مێژووی شارستانێتی یۆنان ساغکراوەتەوە: یۆنانییەکان لە کاتی پەرستنی (دایونیوس) جەژنیان بۆ شانۆ دەگێڕا و ئاهەنگی نواندنیان ڕێکدەخست. لەم جەژنانە دوو جەژنی سەرەکی ناوبانگیان دەرکردبوو:

**یەکەمیان:** جەژنی (لینیا)یە، کە لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەمدا دەکرا.

**دووەمیان:** جەژنی (دایونیسیا)یە، کە لە کۆتایی مانگی ئازاردا ئاهەنگەکان سازدەکران.

شانۆگەرییەکانی ئەم دوو جەژنە لە سەر شانۆی (دایونیسوس)ی مەزندا، کە خوای شانۆگەرییە دەنوێنران.

جەژنی (لینیا) بەتایبەتی بۆ شانۆگەری کۆمیدیا: واتا شانۆگەری گاڵتەوگەپ و ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری تەرخاندەکرا، بەڵام جەژنی (دایونیسیا)ی مەزن هەر بۆ شانۆگەری تراژیدیا، واتا شانۆگەری کوێرەوەری دادەنرا. هەستیاری خاوەن شانۆگەری کۆمیدی یا تراژیدی ئەگەر بیویستایە بەشداری ئاهەنگە شانۆگەرییەکانی ئەم دوو جەژنە بکات، بەر لە هەموو شتێ دەبوایە داخوازییەك پێشکەش بە (ئەرخۆنی پسپۆڕ)[1] بکات، کە چاودێری ئاهەنگەکان و نوێنەری میری بوو.

ئەرخۆنی پسپۆڕ پاش یەکالاکردنەوەی ئەو داخوازییە و قایلبوون بە ناوەڕۆکی ئەو هەستیارە

---

١ مدخل الى تاريخ الاغريق وأدبهم ل٩٧ ـ ٩٨

بڕیاری ئامادەکردنی هەموو شتێکی بۆ نواندنی شانۆگەرییەکە دەدا. بەم جۆرە ئەم هەستیارە لەگەڵ هەستیارەکانی دیکە بەشداری تەڕاتێنی دەکرد. بۆ هەڵبژاردنی هەستیاری سەرکەوتوو، لیژنەیەك (کۆمیتەیەك) لە دە بەرهڤان (حکم) پێکدەهێنرا، هەر یەکێك لەم بەرهڤانانە نوێنەری خێڵێك دەبوو. سەرکەوتنی هەستیارێك لە هەستیارە بەشداریکەرەکانی ئەو تەڕاتێنە بە پێنج دەنگ دەبوو، کە لە ڕێگای (تیروپشك)ەوە واتا: قورعەوە جیادەکرانەوە.

بڕیاردانی بەشداریکردنی هەستیارێك لە تەڕاتێندا لە لایەن ئەرخۆنی پسپۆڕەوە و هەڵبژاردنی شانۆگەرییە سەرکەوتووەکەیەوەو پێنج دەنگ لە دەنگەکانی کۆمیتەی بڕیاردەرەوە.

بێگومان ئەم کارە جۆرێکە لە ڕەخنەسازی، چونکە لە ئەنجامدانیدا، هەر دەبوو ئەرخۆنی پسپۆڕو ئەندامانی کۆمیتەکە شانۆگەرییەکان شیبکەنەوەو هەڵیبسەنگێنن و لایەنەکانی شانۆگەرییە سەرکەوتووەکە بخەنەڕوو، ئەوجا لە تەك شانۆگەرییە سەرنەکەوتووەکاندا بەراوردیبکەن.

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی یۆنان لەو باوەڕەدان، کە ئەم کارە ڕەخنەسازییە تا ڕادەیێکی زۆر هونەری نەبوو، بەڵکوو کارێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بوو، چونکە بە چاودێری میری دەکراو ئەوانەی بەشدارییاندەکرد پسپۆڕو هونەرمەندو هەستیار نەبوون، بەڵکو فەرمانبەر و نوێنەری خێڵەکان بوون. ئەم بیروباوەڕە بێگومان شتێکی ڕاستە و جێگای مشتومڕ نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا نابێت ئەوە لە یادبکەین، کە ئەو کارە ڕەخنەسازە بە جۆرێکی ڕێکوپێك و لەسەر شێوازێکی کۆمەڵی ئەنجامدەدرا و مەبەستە سەرەکییەکەی هاندانی هەستیاران بوو، بۆ خزمەتکردنی جەماوەرو ڕابەریکردنیان بۆ پەیامداری.

ئەم تایبەتیانەش بە لای ئێمەوە هەر لە سەرەتاوە ڕەوشتی ئایدۆلۆجی ڕەخنەسازی یۆنانی نواندووەو ڕێگای پەرەسەندنی لەم ڕووەوە بنیاتناو کەرەسەیێکی ڕەخنەسازیانەی بۆ ئەفلاتوون و ئەرستۆ ئامادەکرد..

## • ڕەخنەسازیی یۆنانی پێش پەیدابوونی بیروڕا ڕەخنەسازییەکانی ئەفلاتوون

هەروەکوو لەمەودوا تێبینیدەکەین بیروڕا ڕەخنەسازییەکانی ئەفلاتوون دەربارەی هونەر بە گشتی و هۆنراوە بە تایبەتی تا بڵێیت سلبی و دژوارن. جا بۆئەوەی لە هۆکانی ئەم هەڵوێستەی ئەفلاتوون بگەین و سەرچاوەی ڕەخنەسازییەکانی دەستنیشانبکەین، دەبێت بە

کورتی دوو کێشەی ئایدۆلۆجی و بیروباوەڕی، کە پەیوەندیان بە هۆنراوەو ڕەخنەسازی یۆنانییەوە هەیە ڕوونیکەینەوە:

**کێشەی یەکەم:** چۆنێتی ڕەنگدانەوەی ئایین و خواناسین لە لای هەستیارە یۆنانییە دێرینەکان: ئەوەی لەم ڕووەوە ئاشکراو ڕوونە هەستیارە یۆنانییە دێرینەکانن، دەورێکی گرنگیان لە ناساندنی خواکان لە بەرگری ئادەمیزاددا گێڕاوە. هەروەها دستێکی باڵایان لە چەسپاندنی بیروباوەڕی ئایینی لای جەماوەر هەبووە، بە پێشکەشکردنی وێنەی ناهۆشمەندی لە مەسەلەی خواناسیندا، بەتایبەتی هەستیارەکانی داستان، واتا: (مەلحەمە)، هۆمیرۆس و هەستیارەکانی هۆنراوەی نەژادی، واتا: (شیعری ئەفسانە) وەکوو: (هسیود)، بۆیە فەیلەسووفە پێشەواکان وەکوو: (زینوفانس و سوکرات) بەرپەرچی ئەو هەستیارانەیان دایەوەو هەڵبەستەکانیان دایە بەر نەشتەری پووچکردنەوەو چەسپاندنی ناهۆشمەندی و پڕوپووچیان.

**کێشەی دووەم:** زاڵبوونی سۆفستاییەکانە بە سەر فێرگە و کۆڕە دواناوەندییەکاندا: دوای زاڵبوونی یۆنانییەکان بەسەر فورسەکانداو ڕزگاربوونی وڵاتەکەیان لە چنگی بێگانەکان دەرفەتی پەرەسەندن و پێشکەوتنیان هاتەکایەوە، بۆیە لە سەرانسەری نیشتمانی یۆنانیدا بە دەیان زاناو هەستیارو هونەرمەندو مێژووناس و نۆشدارو وێنەگرو پەیکەرتاش هەڵکەوتن. دیموکراتییەت باڵی بەسەر هەموو شارەکاندا کێشاو دەمەتەقێ و گفتوگۆ لە دادگاو یاریگاو مەیدانەکانی شاری ئەسینا بە توندوتیژی دەربارەی بابەتە ئایینی و دادگەری و وێژەییەکاندا بەرپابوو.

سەرئەنجام فێربوونی دواندەری (الخطابة) و ڕەوانبێژی (البلاغة) بوو بە پێویستییەکی میللی.

ئا لەم دەرفەتەدا کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیران پەیدابوون و زیاتر کۆڕی مشتومڕیان خۆشکرد و جڵەوی فێرکردنی ڕەوانبێژیان گرتەدەست. ئەم کۆمەڵەش بە (سۆفستاییەکان) ناسرابوون.

هەروەکوو زانراوە سۆفستاییەکان لە فەلسەفەدا، کەسایەتی ئادەمیزادیان دووپاتکردۆتەوەو سەلماندوویانە، کە ئازادی بیرکردنەوەو کردەوە لەم جیهانەدا بنچینەیێکی دانپیانراوەو ڕاستی گشتی نییەو تاقە بەرژەوەندیش هێنانەدی ئارەزووەکانی خاوەن بەرژەوەندە.

هەروەکوو لە دەنگوباسی سۆفستاییەکان و مشتومڕی سوکرات و ئیفلاتوندا لەگەڵیاندا دەردەکەوێ، ئەم کۆمەڵە دەستێکی باڵایان لە ڕەخنەسازیدا هەبووە، بەتایبەتی (بروتاگۆراس و هبیاس و برودیکوس)، کە لە زۆربەی بابەتەکانی دواندەری و زمانەوانی و ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازییان کۆڵیونەتەوە.

**دیاردەی یەکەم:** لێکدانەوەی داستان و هۆنراوە ئایینییەکان لەسەر بناغەی ڕەمزو خوازەو

وێنەی هونەری: سۆفستاییەکان لەم دیاردەیە بەبێ ئەوەی سەرنج لە واتای فەرهەنگی وشە بدەن و پەیڕەوی سروشتی زمان و یاسای هۆشمەندی و لۆجیك لە گواستنەوەی دەربڕین لە واتایەکەوە بۆ واتایێکی تر بدەن، دەستیانکرد بە ڕاڤەکردن و تەئویلی زمانی داستان و هەڵبەستە ئایینییەکان، ئەوجا بە بێ سنوور و بە بێ دەستوور و بە هەوەسی خۆیان، واتایان بەسەر ئەو زمانەدا سەپاند، تا ڕاددەیێکی وا ئیتر هیچ حەقیقی و ڕاستەنییان بۆ زمانی یۆنانی بەجێنەهێشت و واتای نوێیان بۆ وشەکانی ئەم زمانە سازداو داتاشی و گەیشتنە بڕیارێك دەربارەی زمانی ئەو هۆنراوە ئایینیانەو دووپاتیانکردەوە، کە باسکردنی خواکان لە هۆنراوەدا وەکوو ئادەمیزاد کارێکی ڕەمزی و خوازەییە و هەستیارەکانیش مەبەستیان واتای حەقیقی و ڕاستەوخۆی دەربڕینی وشەکانی زمانی ئەو هۆنراوانە نەبووە.

ئەم دیاردەیە لە ڕەخنەسازی یۆنانی، کە بەر لە دوو هەزار و چوارسەد ساڵ بۆمان ماوەتەوە لە سامانی ڕەخنەسازی زۆر نەتەوەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دێرین و هاوسەردەمدا ڕەنگیداوەتەوە، جا بۆئەوەی هەروەکوو بەڵێنمان پێدان ئەڵقەکانی مێژووی ڕەخنەسازی کۆن و هاوسەردەم بهۆنینەوە، سەرنجڕادەکێشین بۆئەوەی کە تەنانەت چەند خوێندەوارێکی کورد، ئا لەم ڕۆژانەدا بەبێ ئاگاداری لاسایی ئەو دیاردە سۆفستاییانە لە ڕاڤەکردن و تەئویلی وشەکانی هەندێ هەڵبەستی دڵداری کوردی دەکەن و بە زۆرەملێ واتای خوازەیی و ڕەمزی بۆ ئەو وشانە دادەتاشن.

نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم کارە، با ئەم پارچەیە بێت لە ئۆپەرێتی (گوڵی خوێناوی) مامۆستا (گۆران)ی نەمر، کە دەڵێ:

**کوڕ:**

بڕوانە، شایی یە، چۆپی یە، لەو ماڵە<br>
گوێ بگرە، زوڕنایە، دەهۆڵە، شمشاڵە

لەم پارچەیەدا زۆر ئاشکراو ڕوونە، کە ئۆپەرێتی (گوڵی خوێناوی) هەڵبەستێکی دڵدارییەو ڕووداوێکی خۆشەویستی سادەو ساکارو دڵگیر دەگێڕێتەوە و وێنەی کچێکی دڵبەر، کە ناز بەسەر دڵدارەکەیدا دەکات، دەنوێنێ.

کەچی هەندێ خوێندەواری کورد سوورن لە سەر ئەوە، کە ئەو ئۆپەرێتە هەڵبەستێکی نیشتمانی و ئایدۆلۆجی شۆڕشگێڕە و مەبەستی مامۆستا گۆران لە کچە دڵبەرەکە نیشتمانە و کوڕە جووتیارە، دڵداریش ڕەمزێکە بۆ میللەتی تێکۆشەرو شۆڕشگێڕ، واتای (گوڵ) ئازادییە

و (باخچەی پاشاش لەوبەر ئاوە)ی ئیمپریالیزم و دەربەگ و کۆنەپەرستان دەخاتەڕوو.

ئەم خوێندەوارانە لە تەئویل و ڕاڤەکردنی ئەو وشە و دەربڕینانەی ئۆپەرێتی (گوڵی خوێناوی)دا، هیچ بەڵگە و قەرینەیێکی زمانی و واتاییان بەدەستەوە نییە، ئەوە نەبێت کە دەیانەوێ ئەو چەشنە دیاردەیە لە ڕەخنەسازی کوردیدا دووپاتبکەنەوە و بەبێ ئەوەی ئاگایان لە سەرچاوەی ئەم دیاردە ڕەخنەسازییە ببێ، لاسایی بکەنەوە بەس.

**دیاردەی دووەم:** یاریکردن بە وشە لە سازدانی دەربڕین و ڕستەدا: ئەم دیاردەیە لە ڕەخنەسازی سۆفستاییەکان، واتا: دیاردەی یاریکردن بە وشە و بەکارهێنانی دەربڕین، دوور لە واتا و مانا فەرهەنگییەکانیانەوە. دووبارە لە ڕەخنەسازی هاوچەرخدا دەنگیداوەتەوە هەستیارە سریالی و ناهۆشمەندییەکانی ڕێبازی پەرناسی ئەورووپی و هەندێ هەستیاری تازەپێگەیشتووی کوردیش لاسایی ئەو دەیاردەیەیان کردۆتەوە بە هەوەسی خۆیان وشەو ڕستە سازدەکەن و بە هیچ ڕەنگێ خۆیان نابەستن بە زمانی جەماوەر و ئامانجیان تێگەیاندنی خەڵکی نییە.

هەرچۆنێك بێت هەر لە سەردەمی سۆفستاییەکان دەیان فەیلەسووف و نووسەری یۆنانی بەرەنگاری ئەم دوو دیاردە ڕەخنەسازییە بوون و بە توندوتیژی وەڵامی سۆفستاییەکانیان دایەوە.

سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ لە ڕیزی یەکەمی ئەو فەیلەسووف و نووسەرانە دێن و هەر یەکێك لەم سێ فەیلەسووفە، لایەنێکی ئەو دوو دیاردەیە بە ئەوپەڕی وردی و زیرەکانەوە، شیکردەوە دایە بەر نەشتەری پووچکردنەوە.

## • سوکرات و ئەفلاتوون

لێرەدا هەڵوێستی سوکرات و ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراوە هەستیاران شیدەکەینەوە، کە کاردانەوەیێکی بیروڕاکانی سۆفستاییەکانە لە نرخپێدانی هونەری هۆنراوە.

لە مێژووی فەلسەفەی یۆنانیدا ساغبۆتەوە، کە ئەفلاتوون شاگردێکی بەوەفای (سوکرات)ە هەموو بیروڕا فەلسەفییەکانی بە ناوی مامۆستا نەمرەکەیەوە، واتا (سوکرات) دەگێڕێتەوە تۆماریاندەکات. بۆیە (سوکرات)ی مامۆستا و (ئەفلاتوون)ی شاگرد هەردووکیان پێکەوە ناودەبرێن و هەڵوێستەکانیان لە یەکترجیاناکرێنەوە.

سوکرات هەروەکوو زانراوە لە سەرەتای ژیانیدا، سۆفستایی بوو، بەڵام وردەوردە دەرکی بە زیانی فەلسەفەی سۆفستاییەکان کردو هەتا گەیشتە باوەڕکردن، بەوەی کە فەلسەفەی سۆفستاییەکان گۆڕستانی هەموو ڕاستی و خێرخوازییەکە.

سەرئەنجام ئەم فەیلەسووفە هەڵکەوتووە، دەستیکرد بە بەرپەرچدانەوەی بیروڕای سۆفستاییەکان و دەمەتەقێی ئایدۆلۆجی لەگەڵیاندا بەرپاکرد بۆ پووچکردنەوەی هەڵوێستە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕەخنەسازییەکانیان.

## • سەرچاوە ڕەخنەسازییەکانی ئەفلاتوون

هەموو بیروڕاکانی (سوکرات) بە هۆی (ئەفلاتوون)ەوە گەیشتوونەتە دەستمان، ئێمەش لێرەدا ئەوەی لەو بیروڕایانە پەیوەندی بە ڕەخنەسازییەوە هەبێ شیدەکەینەوە:

بیروڕا ڕەخنەسازییەکانی ئەفلاتوون لە دوو سەرچاوەی سەرەکیدا تۆمارکراون:

**سەرچاوەی یەکەم:** بەشی یەکەمی کتێبە بەناوبانگەکەی، کە بە ناونیشانی (کۆماری خێرومەند)ە، واتا (الجمهوریە الفاضلە) لە ساڵی سێسەدو حەفتا و سێی پێش زایینی دایناوە.

**سەرچاوەی دووەم:** دەمەتەقێی (ئەیون)ە، کە (ئەفلاتوون) لە گرێی یەکەمی سەدەی چوارەمی پێش زایین، لە دووتوێیدا گفتوگۆی (سوکرات) لەگەڵ شیعرخوانی یۆنانی بەناوبانگ (ئەیون)دا تۆماریکردووە.

## • بناغەی هەڵوێستی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراوە

هەڵوێستی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراوە لە سەر بناغەی بیردۆزەی ئایدیاکان (المثل) دامەزراوە، لەم بیردۆزەیەدا، هەروەکوو لە فەلسەفەی یۆنانیدا ئاشکرایە سێ جیهانی بۆ زانیاری دەستنیشانکردووە.

١- جیهانی ئایدیا: واتا (عالم المثل) کە بارەگای نموونەیی بەرزی ڕاستییەکانە.

٢- جیهانی هەستپێکراو: واتا (عالم المحسوس) کە شانۆی ماددییە، هەموو شتێ لەسەر ئەم زەوییەدا و ئادەمیزادیش بە یەکێك یان زیاتر لە پێنج هەستکارەکانی هەستپێدەکات و لێیتێدەگات.

٣- جیهانی سێبەر: واتا (عالم الظلال) کە هونەرمەندەکان بە هۆی هونەرە جوانەکانیانەوە دروستیدەکەن و دەیهێننە ئەنجام.

## • نرخی هونەری هۆنراوە لە لای ئەفلاتوون

ئەفلاتوون لە بەر تیشکی هێڵە گشتییەکانی ئەم بیردۆزە، گفتوگۆیەك لەگەڵ کابرایەك

بە ناوی (جلوکۆن)ەوە دەربارەی نرخی هۆنراوە بەرپادەکات و دەڵێت:

(ئەی جلوکۆن پاش بیرکردنەوەو وردبوونەوە لەو چاکانەی، کە لە کۆمارەکەماندا چەسپاون، هیچ شتێکی لە تەنگوچەڵەمەی هونەری هۆنراوە زیاتر سەرنجمڕاناکێشێ..

جلوکۆن: ئەوە چییە پەنجەی بۆ درێژدەکەیت؟! تکایە ڕوونیبکەرەوە..

ئەفلاتوون: ئەوەی مەبەستمە، فەرامۆشکردن و فرێدانی هۆنراوەی لاساییکەرەوەیە و گوێڕانەگرتنە بۆ خاوەنەکانی.

لەم گفتوگۆیەدا دوو بڕیاری سەرەکی ئەفلاتوون دەربارەی هۆنراوە ڕووندەبنەوە:

**بڕیاری یەکەم:** دانانی هۆنراوە بە شتێکی بێسوودو کەڵك نەبەخش.

**بڕیاری دووەم:** تەماشاکردنی هۆنراوە وەکوو بەرهەمێکی لاساییکەرەوە و ناڕەسەن.

بڕیاری یەکەم، بێگومان ئاکامی دووەمە، چونکە ئەگەر هاتوو هۆنراوە لاساییکەرەوەو ناڕەسەن بوو، هەڵبەت هیچ سوودێکی نابێت و لە کەڵکگەیاندن بە کۆمەڵ بێبەرییە.

## • چەمکی ئەفلاتوون دەربارەی سروشتی لاساییکردنەوە

ئەفلاتوون درێژە بە باسکردنی چۆنێتی لاساییکردنەوە لە هونەردا بە گشتی دەدات، ئەوجا بە وردی لە سروشتی هۆنراوەی لاساییکەرەوە دەدوێ. جا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییە لە ڕێبازی ئەفلاتوون با پێکەوە گوێ بۆ ئەم دەمەتەقێیەی ئەفلاتوون لە تەك جلۆكۆندا شلبكەین، کە پلەی هونەری نیگارکێشان دەستنیشاندەکات.

**ئەفلاتوون:** ئەی جلۆکۆن لەبەرئەوەی سێ جیهانمان هەیە: جیهانی ئایدیا و جیهانی هەستپێکراو و جیهانی هونەر، هەر دەبێت سێ چەشن لە چەرپایە هەبێت. هەروەها چونکە سێ چەشن لە چەرپایە هەیە ـ بێگومان ـ سێ هونەرمەندی جیاواز، سەرپەرشتی دروستکردنیان دەکەن:

**یەکەمیان:** خوایە، کە چەرپایەی جیهانی ئایدیای خوڵقاندووە.

**دووەمیان:** دارتاشە، کە چەرپایەی جیهانی هەستپێکراوی دروستکردووە،

**سێیەمیان:** نیگارکێشە، کە چەرپایەی سێیەمی بە هۆی هێڵ و ڕەنگەوە سازکردووە.

**جلۆکۆن:** بەڵێ وایە.

**ئەفلاتوون:** ئەی (جلۆکۆن) کە وابوو دەبێت بزانیت، کە چەرپایە خوڵقێنراوەکەی ئایدیایە، چەرپایەیێکی تاقانە و نموونەییە و هیچ کەموکوڕییەکی نییە، چونکە لە لایەن خوڵقێنەرێکی

ڕاستەقینەوەهاتۆتەکایەوە.

**جلۆکۆن:** ئەی دەربارەی چەرپایەی هەستپێکراو، کە دارتاش دروستیکردووە چی دەڵێیت؟!

**ئەفلاتوون:** ئەو چەرپایە چەرپایێکی دروستکراوە، دارتاش لەبەر تیشکی نموونەی بەرزی چەرپایەی جیهانی ئایدیا دروستیکردووە.

**جلۆکۆن:** ئەمە ڕاستە. ئەی نیگارکێش پێی ناوترێ دروستکەر؟!

**ئەفلاتوون:** نەخێر، نیگارکێش پێی ناوترێ دروستکەر.

**جلۆکۆن:** ئەگەر نیگارکێش دروستکەر نەبێت چ پەیوەندییەکی بە چەرپایەوە هەیە؟!

**ئەفلاتوون:** من لەو باوەڕەدام، کە دەتوانین ناوی بە لاساییکەرەوەی ئەو شتانە بەرین، کە خەڵکی تر دروستیدەکەن.

بەم پێیەوە ئەفلاتوون دەگاتە سەرئەنجامێك و دەڵێ: هەموو هونەرمەندەکان لە ڕێگای لاساییکردنەوە، بەڵام بەرهەمی جیهانی هەستپێکراو بە هۆی دەنگدانەوەی نموونە بەرزەکان لە دەروونی دروستکەرەکاندا ئەنجامدراوە، بۆیە ئەم شتانە دوو هەنگاو لە ڕاستی نموونە بەرزەکانەوە دووردەکەنەوە، بەڵام بەرهەمی هونەرمەندەکان لە ڕێگای لاساییکردنەوەی شتەکانی جیهانی هەستپێکراو سازدەکرێن. بۆیە بە هەنگاوێك لەم شتانەوە پچڕاون و بە سێ هەنگاو لە نموونە بەرزەکانی جیهانی ئایدیاوە دووردەکەونەوە. کەوابوو هونەرمەند بەلای ئەفلاتوونەوە هیچ ڕاستییەك بە هۆی هونەرەکەیەوە بەدەستەوەنادا تەنیا ئیشوکاری لاساییکردنەوەی شت و کردەوەیە لە جیهانی هەستپێکراودا.

## • ئەفلاتوون و هونەری هۆنراوە

ئەم سەرئەنجامەی ئەفلاتوون دەربارەی هونەر بە گشتی هەنگاوێکە بۆ بەرهەڵستیکردنی هەستیاران و تەماشاکردنی هۆنراوە بە هەموو جۆرەکانییەوە، وەکوو کارێکی نارەسەن و لە ڕاستی بێبەری. بۆیە بە هەموو توانایەکییەوە هێرشدەباتە سەر شانۆگەری تراژیدیا و هەستیارەکانی و دەڵێ:

هەستیاری تراژیدی هیچ نییە، لاساییکەرەوەیێکی سێ هەنگاو دوور لە ڕاستییەوە نەبێت و هەموو بەرهەمەکانی لاساییکردنەوەی ژیان و کردەوەی قارەمانەکانی چیرۆکەکەیەتی.

ئەفلاتوون بۆ نرخپێدانی لاساییکردنەوەو دەستنیشانکردنی گرنگی هونەرمەندی لاساییکەرەوە دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ هونەر بە گشتی و دەپرسێ: مەبەست لە هونەری

نیگارکێشـان لاسـاییکردنەوەی شـتەکانە هەروەکوو خۆیان یان بە پێی دەرکەوتنیان یاخود بە گوێرەی ڕەسەنی نموونەکانیان لە جیهانی ئایدیادا؟!

ئەفلاتوون خۆی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوەو دەڵێت: هونەری نیگارکێش لەبەرئەوەی بە چاو دەڕوانێتە ئەو شتانەی نیگاریان دەکێشێ، بە هیچ ڕەنگێ ناتوانێ بگاتە گەوهەریان و ڕاستەنییان بدرکێنێ بە ڕواڵەت و لابەلا وێنەیان دەکێشێت و بەس، کەوابوو نیگارکێش بە لای ئەفلاتوونەوە درۆزنەو هونەرەکەی درۆیەو لەبەرئەوەی هەستیاری بە هەمان چاو تەماشاکردووەو هۆنراوەکانی بە هەمان پێوانە پێواوە، دەرهەق بە (هۆمیرۆس)ی شاسواری هەستیارەکانی یۆنان دەڵێ: ئەگـەر گوێیـان لێبوو خەڵکی گوتیان هەسـتیارانی یۆنان و لەسـەرووی هەموویانەوە (هۆمیـرۆس) لـە چاکـە و خراپـەو هەموو بابەتێکـی مرۆڤایەتی و سـەنعەتکاری کاروباری ئاسـمانیدا شـارەزان، چونکە هەسـتیاری سـەرکەوتوو ناتوانێ هۆنراوە دروسـتبکات، هەتاکو زانیارییەکـی تـەواوی لـە بـارەی بابەتەکەی خۆیـەوە نەبێت. ئەوەی ئـەم زانیارییانەی نەبێت هەرگیز نابێت بە هەسـتیار.

ئەگەر گوێمان لەوە بوو پێویسـتە بڵێین: ئەو خەڵکە دەسـتخەرۆکراون و بە جادووگەری هونەر چاوبەستکراون، چونکە هەموومان دەزانین (هۆمیرۆس) بە هۆنراوەکانی هیچ سوودێکی هەستپێکراوی بەو خەڵکە نەگەیاندووەو لە قسەی ڕازاوە بەولاوە هیچ ئاکامێکی نەبووە.

لێرەدا ئەفلاتوون ڕوودەکاتە جلۆکۆن و دەپرسێ: ئەی جلۆکۆن ئایا هەستیارێك دەناسیت کۆشـکێك، یـان تەلارێکـی بنیاتنابێت یاخـود ڕۆژێك لە ڕۆژان لە شـەڕێکدا سـەرکردایەتی لەشـکرێکی کردبێت و بەسـەر دوژمـندا سـەرکەوتبێ؟! ئەمەش نەبێ ئایا هیچ هەسـتیارێك شکدمەبیت وەکوو (سولون) لە یاساداناندا شارەزابێت و لەم ڕووەوە خزمەتی جەماوەرانی کردبێت؟!

**جلۆکۆن:** نەخێر هیچ هەستیارێکی وا ناناسم و لە مێژوودا نەمبیسـتووە هەستیاران کارێکی سوودمەندیان ئەنجامدابێت.

**ئەفلاتوون:** کەوابوو، ئەی جلۆکۆن بوونی هەستیاران لە کۆمارە خێرومەندەکەماندا ئەبێت چی بێت؟!

**جلوکۆن:** بەڕاستی هیچ سوودێکیان نییە ئەوە نەبێت، کە هەندێکیان لە چەند هەڵبەستێکدا بەباشی باسی خواکان دەکەن و ستایشی ئایین سازدەدەن و ڕەوشی قارەمانان دەخەنەڕوو.

ئەفلاتـوون: ئـەی جلوکـۆن، شـت تێکـەڵ مەکە و بـە هەڵەدا مەچـۆ. ئایـا دەزانی ئەو هەسـتیارانەی کـە جارجـار کـردەوەی چـاك لە هەنـدێ لە هەڵبەسـتەکانیان دەنوێنـن، لە چ سەرچاوەیەکەوە ئەوەیان وەرگرتووە؟!

**جلۆکۆن:** نەخێر نازانم ئەو سەرچاوەیە چییە؟!

**ئەفلاتوون:** ئەو سەرچاوەیە خوای هۆنراوەیە، بەڵێ خوای هۆنراوە بابەتی چاك و بیرۆکەی بەرزو پڕ واتاو ناوەڕۆکی سوودبەخش بەهۆی خورپە و ئیلهامەوە دەبەخشێتە ئەو هەستیارانە.

بەم جۆرە ئەم هەستیارانە جگە لە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ئاسمان و زەوی لەوە بەولاوە هیچ ئامێرێکی دیکە نین. ئەوان وەکوو ئەڵقەی ئاسن وان، کە هێزی موگناتیس دەیگرێ و ڕایدەکێشێ و کاریلێدەکات.

**جلۆکۆن:** بەڵێ، وایە، ئەگەر هاتوو کردەوەیێکی چاکیان لێوەشـایەوە ئەو کردەوەیە دیاری خواکانە بۆ خەڵکی سەر ئەم زەوییە.

**ئەفلاتوون:** ئەی جلۆکۆن کەوابوو دەبێت بڕیاری شارەدەری هەستیاران لە کۆمارە خێرەومەندەکەمان بدەین و لەبەر هیچ هۆیێك مافی مانەوەیان لە نێوانماندا نەدەینێ، چونکە ڕەوانییە تاقمێکی وەکوو ئەمانە لە ژێر سێبەری کۆمارە خێرەومەندەکەماندا بحەسێنەوەو عەقڵ و هەست و چێژی هاونیشتمانییەکانمان بە هونەرە چاوبەست و درۆکەیان تێکبدەن.

هەروەکوو لەم دەمەتەقێیەدا بۆمان ڕوونبووەوە، ئەفلاتوون هەڵوێستەکەی دەربارەی هونەری هۆنراوە و هەستیاران لە سەر سێ بناغەی سەرەکی دامەزراندووە:

بناغەی یەکەم: هونەری هۆنراوە کارێکی داهێنراو و خوڵقێنراو نییە، بەڵکوو سەرئەنجامی لاساییکردنەوەی سروشت و جیهانی هەستپێکراوە.

بناغەی دووەم: ئەو لاساییکردنەوەیە، چونکە بە هۆی یەکێك یان پتر لە هەستکەرەکانی هەستیارەوە ئەنجامدراوە، بە هیچ ڕەنگێ ناتوانێ ڕاستی و ڕەسەنیی بابەت و شتەکان بدرکێنێ و بەرهەمەکانی ئەو لاساییکردنەوەیە، کە هەڵبەستن، واقیعی و ڕیالیزمی بن و کەڵکێك بە خەڵکی بگەیەنن.

بناغەی سێیەم: سەرچاوەی هۆنراوەی سوودبەخش و بە کەڵك، خورپە و ئیلهامە لە لایەن خوای هۆنراوەوە.

## • هۆی دەرخستنی ئەم هەڵوێستەی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراوە و هەستیاران

ئەو کەسەی کتێب و دەمەتەقێکانی ئەفلاتوون بخوێنێتەوە، گومان لەوە ناکات، کە ئەم فەیلەسووفە لە بناغەدا هەستیارێکە و بەهرەیێکی بەرزی هەیە لە بەرهەمهێنانی نووسینی

هونەری و تەنانەت بابەتە هۆشمەندی و ڕامیاری و زانستییەکانیش بە شێوازێکی وێژەیی پڕ لە وێنەی هونەری دەنووسێتەوە.

جا بۆیە لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ و دەپرسێ: ئەفلاتوون، کە پەیوەندییەکی سۆزی و هەستی و ئەندێشەیی وەهای هەبێت لەگەڵ جیهانی وێژە و هۆنراوەدا، بۆچی بەو چەشنە تەماشای هونەری هۆنراوەی کردووە و بەو پێوانە بێبەزەییەوە نرخی هەستیارانی دەستنیشانکردووە؟!

## مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی یۆنانی بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دوو دەستەبەشن (تاقمن):

بەشێکیان پەنادەبەنەبەر ڕچۆنێتی بیرکردنەوەی ئەفلاتوون و سەرنج بۆ ڕێبازە ئایدیالیزمییەکەی ڕادەکێشن و دەڵێن: هۆی هەڵوێستەکەی ئەفلاتوون دەرهەق بە هونەری هۆنراوە و هەستیاران لەوە دایە، کە ئەم فەیلەسووفە میسالی بووەو بە چاوێکی سووك ڕوانیویەتییە هەموو چالاکییەکی مرۆڤایەتی، کە گومانی دوورکەوتنەوەی لە جیهانی ئایدیاکانەوە لێکردبێت.

هۆنراوەی یۆنانیش، چونکە چالاکییەکی ئادەمیزادانەیە و لە زۆربەی چەشنەکانیدا، بە تایبەتی چەشنی کۆمیدیا، ژیانی زەحمەتکێشان تۆمارکراوەو هەستیارەکان گاڵتەیان بە چینی ئەرستۆکراتی و دەوڵەمەندو کاربەدەستان کردووەو ئەفلاتوون خۆیشی، چونکە لەم چینە بووە، ڕقی لە هونەری هۆنراوە و هەستیاران هەستاوەو بە گشتی بڕیاری زیانگەیاندنی بەم هونەرە داوەو هەستیارەکانی بە دوژمنی کۆمەڵ داوەتە قەڵەم.

بەشەکەی تریان، بە پێچەوانەی بەشەکەی پێشووەوە لەو بیروڕایەدان، کە هەڵوێستەکەی ئەفلاتوون دەرهەق بە هونەری هۆنراوە و هەستیاران لەوەدا بەدیدەکرێ، کە هۆنراوەی دێرینی یۆنانی بە گشتی و بە جۆرێکی ناهۆشمەندی و نامەعقول وێنەی خواکانی پێشکەشکردووە لە ڕێگای سۆزی تاکییەوە خۆی لە بابەتە ئایینییەکاندا هەڵقورتاندووەو بە زمانی ئەندێشە جیهانی ئایدیاییەکانی تێکەڵ بە جیهانی هەستپێکراوەکان کردووە.

سەرەڕای ئەمەش سۆفستاییەکان، کە لە ڕووی بیروباوەڕەوە دژبەری ئەفلاتوون بوون، هەروەکوو لەمەوبەر وتمان بەرگریان لە هۆنراوەی دێرینی یۆنانی دەکردو هونەری هۆنراویان بە تاقە ڕێگایەك دادەنا بۆ ڕابەری کۆمەڵ و بە دیهێنانی ئامانجە ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکانیان. کەوابوو هەڵوێستی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراوە بەلای ئەم دەستەیەشەوە لە مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی یۆنانی کاردانەوەیەکە، واتا (رد الفعل)ێکە لە هەڵوێستی سۆفستاییەکان دەرهەق بە هۆنراوەی یۆنانی دێرین و نرخپێدانی هەستیاران.

بیروڕاکانی ئەم دوو دەستە بەشە لە خستنەڕووی هۆی هەڵوێستی ئەفلاتوون دەرهەق بە هونەری هۆنراوە و هەستیاران، تارادەیێکی زۆر سەرئەنجامی تێڕوانینێکی هاوچەرخە لە ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی چینەکانی کۆمەڵ بە تایبەتی بیروڕاکانی دەستەی یەکەم، کە هەوڵی ئەومیان داوە لەبەر تیشکی پێوانەی زۆرانبازی چینایەتی لە کۆمەڵدا، هەڵوێستەکەی ئەفلاتوون شیبکەنەوە و بیگێڕنەوە سەر جیاوازی ئابووری و ناکۆکی سروشتی نێوانی چینی زەحمەتکێش و چینی دەستەڵاتداران.

بیروڕای ئێمە لەم تەنگوچەڵەمەیەدا هەڵبەت هەر دەبێت لەسەر بناغەی ڕاستی دامەزرابێت، ڕاستیش بەلای ئێمەوە لە دەقی قسەکانی ئەفلاتووندا بەدیدەکرێت و لە چوارچێوەی خەڵکی سەردەمی ئەفلاتوونەوە هەڵدەقوڵێ، بە واتای ئەوەی مێژوونووسی ڕاستینەی ئەم سەردەمە نابێت بە تێڕوانین و چەمکەکانی سەردەمەکەی ڕووداوەکەی مێژووی دێرینی نزیکەی دوو هەزار و پێنجسەد ساڵ ڕاڤەبکات و بە زۆرەملێ هەموو شتێکی ڕابردووی هەرە کۆن بۆ لای ڕێبازی هاوکاتی خۆی ڕابکێشێت و بەگوێرەی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی ئابووری ئەم چەرخە لێکیبداتەوە.

ئا لەبەر ئەم ڕاستییەدا ئێمە هۆی ڕاستینەی هەڵوێستەکەی ئەفلاتوون دەرحەق بە هونەری هۆنراوە و هەستیاران لە چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەم فەیلەسووفە وا بیردەکەینەوە.

ئاشکرایە کە ئەفلاتوون لە هەڵسەنگاندنی هەموو شتێکدا تاقە پێوانەیکی بەدەستەوە بووە، ئەم تاقە پێوانەیەش بێگومان کێشەی ئابووری و زۆرانبازی چینایەتی و تەنگوچەڵەمەی ڕامیاری نەبووە، بەڵکوو ئەم تاقە پێوانەیە عەقڵ و هۆشمەندی بووە.

بەڵگەمان بۆ چەسپاندنی ئەم ڕاستییە جۆربەجۆرە، جا بۆئەوەی لە کۆڕی هونەری هۆنراوە دوور نەکەوینەوە، با ئەم بەڵگەیە لەدەمەتەقێی (ڤیدرۆس) بهێنینەوە.

ئەفلاتوون لەم دەمەتەقێیەدا، کۆمەڵ بە پێوانەی عەقڵ و هۆشمەندی دابەشدەکات بە سەر چەند چین و دەستەیەکدا:

فەیلەسووفان بە چین و دەستەی یەکەم دادەنێت و هەستیاران پاش سنعەتکاران و کاربەدەستان و هونەرمەندان بە چین و دەستەی پێنجەم دەژمێرێ، چونکە هەروەکوو لەمەوبەر وتمان ئەفلاتوون هۆنراوە بە بەرهەمێکی خورپەیی لەقەڵەمدەدات و بیروڕای وایە، کە هەستیار لە کاتی شیعرهۆنینەوەدا لە هۆش دەکەوێت و حاڵ دەیگرێت و لە جیهانێکی دوور لە واقیعدا دەژی و بەرهەمی نامەعقول و ئەندێشەیی دەهێنێتەکایەوە.

کەوابوو ئەفلاتوون لەم هەڵوێستەدا وەك ڕیالیزمەکان، بە هیچ جۆرێك نەیویستووە هونەر

یا هۆنراوە لە ڕاستییەوە دوور بێت، ئەم ویستەنییەی نەهاتۆتە دی، چونکە هەستیاران بە باڵی ئەندێشە دەفڕن و لە عەقڵ و هۆشمەندی بێبەرین و لە ڕاستییەکانی جیهانی ئایدیاوە پچڕاون.

## • ئاکامی بیروڕاکانی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراوە لە ڕەخنەسازیی جیهانیدا

بیروڕاکانی ئەفلاتوون دەربارەی هونەری هۆنراوە و هەستیاران لە ڕەخنەسازی جیهانیدا، سەرئەنجام و ئاکامی جۆربەجۆری ڕەنگداوەتەوە و بە قووڵی و فراوانی شوێنەواری بەجێهێشتووە، جا ئەم شوێنەوارو سەرئەنجام و ئاکامانە بە ڕێگاییێکی ڕاستەوخۆ بووبن یاخود لە سەر بنواشەی دژواری و کاردانەوە هاتبنەکایەوە. ئەم ئاکام و سەرئەنجام و شوێنەوارانە بە چەشنێکی هەستپێکراو، لەم دوو خاڵەی خوارەوەدا دەردەکەون:

**یەکەم:** بیروڕای ئەفلاتوون دەربارەی سەرچاوەی هۆنراوە، کە وتویەتی ئەم سەرچاوەیە خوای هۆنراوەیە و هەستیار بە ڕێگای خورپە و ئیلهامەوە هەڵبەستەکانی بە دەستدەهێنێ. تا ئەم سەردەمەی هەر دەنگدەداتەوەو کۆمەڵێکی زۆر لە ڕەخنەسازان پەیڕەویدەکەن و هونەری هۆنراوە بە بەهرەیەك لەقەڵەمدەدەن. تەنانەت زۆربەی هەستیارانیش لەو ڕایەدان، کە توانایان بە هۆنینەوەی هەڵبەستدا بە هەموو جۆرەکانی، بەوە ڕشت و ڕێگای بیروڕای هەڵگرانی ئالای ئەم هێزە نادیارەوە پێیان سپێردراوە.

هەستیاری کورد مامۆستا (گۆران) دیارە لەم ڕوانگەیەوە لە هەڵبەستە بەناوبانگەکەیدا (لە درزی پەچەوە) وتویەتی:

دەست و پەنجە و مەچەکێک و نیگایەک..
چی بنووسم؟ خوایە: هێزی ئینشـــایەک..

**دووەم:** ئەفلاتوون کە وتویەتی هۆنراو سێ هەنگاو لە ڕاستییەوە دوورە و هەستیاران ناتوانن حەقیقەت بنوێنن و بگەنە ناخی ڕووداوی هۆشمەندی، ڕەنگی ڕێبازی ڕیالیزمی لە ڕەخنەسازی ئەورووپیدا بە هەموو جۆرەکانییەوە ڕشت و ڕێگای بیروڕای هەڵگرانی ئالای ئەم ڕێبازەی خۆشکرد و یاریدەیدان، کە بڵێن نەك بە هۆنراوە بەڵکوو بە پەخشان، نووسەر دەبێ وێژەرێکی ڕیالیزم و هونەرەکانی پەخشان بە تایبەتی شانۆگەری و کورتەچیرۆك و ڕۆمان ئاوێنەی بێگەردی ژیانی ڕاستینەی کۆمەڵن و نووسەر بە هۆیانەوە دەتوانێ ڕابەری جەماوەر بکات و وشەی پیرۆز وەکوو چەکێکی کاریگەر دژ بە چینی برژوازی و زەوتکەرانی مافی چینی زەحمەتکێشان بەکاربهێنێ.

## • ئەرستۆ و هونەری هۆنراو

ئەرستۆ لە پێناسەی هۆنراوەدا بە ڕواڵەت شوێنپێی ئەفلاتوون هەڵدەگرێ و دەڵێ: "هۆنراوە لاساییکردنەوەی سروشتە"، واتا: شیعر موحاکاتی تەبیعەتە، بەڵام لە هەمان کاتدا مەبەستی ئەرستۆ لەم پێناسەیەدا لە چاو مەبەستی ئەفلاتوون زۆر جودا و جیاوازە، چونکە لاساییکردنەوەی سروشت لە لای ئەفلاتوون بە واتای گواستنەوەی بابەتێك لە سروشتەوە بۆ ناوەڕۆکی هۆنراوە، کەچی لاساییکردنەوە لەبەر تیشکی چەمکی ئەرستۆدا یاسای هونەرەو سەرئەنجامی بەیەکداچوونی دەروونی هەستیارە لەگەڵ گیانی سروشتدا.

کەوابوو ئەرستۆ کە وتویەتی هونەری هۆنراوە لاساییکردنەوەی سروشتە مەبەستی دووبارەکردنەوەی سروشت نییە، بەڵکوو مەبەستی خوڵقاندن و داهێنانێکی تازەیە، کە دەنگدانەوەی بوونە لە قەوارەی هەست و نەست و سۆزو ئارەزوو و ئەندێشەی هەستیاراندا. ڕاستە کە مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی یۆنانی لەسەر مەبەستی ئەرستۆ لەو پێناسەیەدا یەکانگیرنین و مشتومڕیان لە لێکدانەوەی ئەو مەبەستە، تا ئێستا کۆتایی نەهاتووە. بۆ نموونە (باتیەBatteux) و (ولسنج) دەڵێن: "بابەتی لاساییکردنەوە لە لای ئەرستۆ، سروشت و شتە هەستپێکراوەکانە"، بەڵام ئەرستۆ خۆی لە کتێبی بیوتیکادا، هەمیشە دووپاتیدەکاتەوە، کە بابەتی لاساییکردنەوە لە هونەری هۆنراوەدا، کردەوە ڕەوشتە. ئەم لێکدانەوەیەی ئەرستۆ بەلای ئێمەوە تاقە ڕێگایەکە پەردە هەڵماڵین لە ڕووی مەبەستە ڕاستییەکەی دەربارەی مەسەلەی لاساییکردنەوە: بە واتای ئەوەی ئەم ڕەخنەسازە فەیلەسووفە بە هیچ ڕەنگێ بیروڕای ئەوە نەبووە، کە هەستیاران ئامێرێکن بە دەستی سروشتەوە لە وێنەکێشانی ڕواڵەتی شتە هەستپێکراوەکان بە جۆرێکی میکانیکی.

بەڵگەش بۆ چەسپاندنی ئەم بۆچوونەمان ئەوەیە، کە ئەرستۆ لە داهێنانی هۆنراوەدا، سێ ڕەگەزی سەرەکی دەستنیشانکردووە:

**١- ڕەگەزی (ئەیثوس)[1] واتا خوڵقاندن**

**٢- ڕەگەزی (باثوس)، واتا: هەڵچوون - انفعال.**

**٣- ڕەگەزی کردار.**

ئەم سێ ڕەگەزە هەڵبەت ئەوە دەگەیەنن، کە هەستیار لە بەرهەمهێنانی هۆنراوەدا ئاکامێك دەخوڵقێنێت و لەکاتی خوڵقاندنیشدا، ملکەچی هەڵچوونێکەو لە سەرچاوەی کردارێکەوە بیرۆکە و ناوەڕۆکەکەی خۆی هەڵدەهێنجێ.

---

١ فن الشعر ل٨

## • سەرچاوەی هۆنراوە لە لای ئەرستۆ

هەروەکوو لەمەوبەر وتمان سەرچاوەی هۆنراوە لە لای ئەفلاتوون خوای هۆنراوەیە، کە بە هۆی خورپە و ئیلهامەوە هەڵبەست دەبەخشێتە هەستیارەکان، بەڵام ئەرستۆی هەستیار خۆی وەکوو ئادەمیزادێك بە سەرچاوەی هۆنراوە دەزانێ، بۆیە ئەم فەیلەسووفە لە ئارەزووی ئادەمیزاد دەربارەی هۆنراوە دەکۆڵێتەوە و دەڵێت: سەرچاوەی هۆنراوە ئارەزوویێکی زگماکییە و لە بوون و قەوارەی ئادەمیزاددا.

ئەم ئارەزووە زگماکییە هێزێکی بێسنوورە پاڵ بە ئادەمیزادەوە دەنێ بۆ لاساییکردنەوەی سروشت. هەروەها هۆنراوە لە حەزکردنی زگماکی ئادەمیزادەوە هەڵدەقوڵێ، کە حەزکردنێکە لە زانین و تێگەیشتن و خۆشیبینین لە تریە (ئیقاع) و ڕێکی.

## • چەشنەکانی هۆنراوە لە لای ئەرستۆ

لەو ئارەزووە زگماکیانەی ئادەمیزاد، واتا: ئارەزووی لاساییکردنەوەو ئارەزووی تێگەیشتن و ئارەزووی حەزکردن و زانین و ئارەزووی خۆشیبینین لە تریە و ئاواز لە سەرەتاوە لە لای میللەتان، هۆنراوەی سەرپێیی (ارتجالي) پێکهاتووە"لەدایکبووە". ئەوجا وردەوردە هۆنراوەی سەرپێیی بە گوێرەی دەروونی هەستیارەکان گۆڕاوەو پەرەیسەندوو جۆربەجۆر بوو.

ئەرستۆ لەبەر تیشکی بناغەی دەروونی هەستیاراندا، هۆنراوە بەسەر چوار جۆردا دابەشدەکات، کە هەردوو جۆریان لە ڕەگەزدا پێکەوە لکاو و لە یەکتر هەڵقوڵاون.

١- هۆنراوەی جوێن و هەجوو: ئەم چەشنە هۆنراوەیە لە دەروونی هەستیاری بەدخوو و شەرمەندەوە هەڵقوڵاوەو وردەوردە پەرەیسەندووەو جۆرێکی دیکەی لێجیابۆتەوە، کە هۆنراوەی کۆمیدیایە.

٢- هۆنراوەی ستایش و مەدح: کە سەرچاوەکەی دەروونی هەستیاری خواناس و خێرومەندە، ئەم جۆرە هۆنراوەیە لەبەر تیشکی یاسای پەرەسەندندا گۆڕاوە و چەشنێکی دیکەی لێوەشاوەتەوە، کە هۆنراوەی تراژیدیایە.

هۆنراوەی تراژیدیا بە لای ئەرستۆوە پۆپەی قۆناغەکانی لەدایکبوون و گۆڕان و پەرەسەندنی جۆرەکانی هۆنراوەیە، بۆیە گرنگییەکی زۆری دەداتێ و بە وردی لێیدەکۆڵێتەوە و شوێنەوارەکانی شیدەکاتەوە و دەڵێ: شوێنەواری تراژیدیا لە ڕێگای بەزەیی و ترسەوە، دەروونی تەماشاکەران لەم دوو سۆزە پاکدەکاتەوە.

ئەرستۆ لە دەستنیشانکردنی ئەم ئەرکەی تراژیدیا زاراوەی (کاثارسیس)[1]ی گریکی بەکاردەهێنێ.

مێژوونوس و ڕەخنەگری بەناوبانگ (هاردی) لە شیکردنەوەی واتاکانی ئەم زاراوەیە دەگاتە بڕیارێك و دەڵێ: مەبەستی ئەرستۆ لە کاتارسیس، واتا فیسۆلۆجییەکەیەتی. بە مانای ئەوە تراژیدیا بە هۆی ڕووداوە سامناك و دڵتەزێنەکانییەوە کار لە دەروونی تەماشاکەران دەکات، ئەگەر هاتوو دڵڕەق و پیاوخراپ بوون بەزەییان دەجولێنێ و دڵیان نەرمدەکات و ڕێگای چاکەیان پیشاندەدات. هەروەها ئەگەر هاتوو بە جەرگ و دڕندە بوون هەستی ترسیان دەبزوێنێ و لاوازییان دەخاتە جەرگەوە، وایان لێدەکات کە ملکەچی یاسا بن و مافی لێقەوماوان بدەنەوە.

کەوابوو هونەری هۆنراوە بە گشتی و هۆنراوەی تراژیدیا بە تایبەتی لە لای ئەرستۆ پەیامێکی هەیە و سوود بە کۆمەڵ دەبەخشێت و هەستیاران ئەرکێکی گرنگیان کەوتۆتە سەرشان و دەتوانن ڕابەری میللەتەکەیان بکەن.

ئەم بیروڕایەش بێگومان جیاوازییەکی دیکە لە نێوانی ئەرستۆی شاگرد و ئەفلاتوونی مامۆستا دەخاتەڕوو، چونکە هەروەکوو لەمەوبەر گوتمان ئەفلاتوون ڕای وابوو، کە هونەری هۆنراوە نەك بێکەڵکە و بەس، بەڵکوو زیانبەخشە و هەستیاران لە دەستخەڕۆییکردنی جەماوەر بەولاوە هیچ دەورێکی دیکەیان نییە.

## ● هونەری لاساییکردنەوە لە ئەفلاتوونەوە بۆ ئەرستۆ

مەسەلەی لاساییکردنەوە، واتا (محاکاة) لە ڕەخنەسازی هاوچەرخدا بناغەی بیردۆزییەکە "تیۆرییەکە".

ڕەخنەسازەکان چونکە پێوانەی هەڵسەنگاندنی هونەر بە گشتی و هۆنراوە بە تایبەتی ڕاددەی دووركەوتنەوە یاخود نزیکبوونەوەی هونەرمەندەکانە لە بابەتە هونەرییەکانەوە. جا لەبەرئەوەی بیرۆکەی لاساییکردنەوە لە سەر دەستی ئەفلاتووندا لەدایکبووە لە دواییدا ئەرستۆ وەریگرتووە بە چەشنێکی دیکە بۆی چووە و لێیکۆڵیوەتەوە، پێویستە لێرەدا بزانین جیاوازی ئەفلاتوونی مامۆستاو ئەرستۆی شاگرد لەم مەسەلەیەدا چییە؟

١- ئەفلاتوون لە مەسەلەی لاساییکردنەوەدا، هونەرەجوانەکان و هونەرە بەسوودەکان بە یەك چاو تەماشادەکات. واتا: نیگارکێش کە خاوەنی هونەرێکی جوانە و دارتاش کە سازکەری بەرهەمێکی بەسوودە بە لای ئەفلاتوونەوە لە مەسەلەی لاساییکردنەوەی سروشتدا

---

[1] فن الشعر ل٤٩

هیچ جیاوازییەکیان نییە، بەڵام ئەرستۆ بەر لە هەموو شتێك جیهانی هونەرەجوانەکان، کە نیگارکێشان و پەیکەرتاشین و ئاوازدانان و شیعرهۆنینەوەن لە جیهانی هونەرە بە سوودەکاندا، وەکوو دارتاشی و ئاسنگەری و پینەدۆزی و دوورمانکردن و ...هتد جیادەکاتەوە و بە هیچ ڕەنگێ تێکەڵیانناکات. تەنانەت هونەرەجوانەکانیش لە یەکترجودادەکاتەوەو هێڵی وردی نێوانیان دادەنێت. بۆ نموونە ئەرستۆ لەم ڕووەوە دەڵێت:

هەرچەندە نیگارکێش لاسایی سروشت دەکاتەوەو هەستیاریش لە هەمان بابەت بەهرەو خوربەی خۆی وەردەگرێت، بەڵام هۆی لاساییکردنەوەی هەستیار ئاسمان و ڕێسمانە، چونکە نیگارکێش بە هێڵ و بە ڕەنگ و سێبەرو قەوارە لاسایی لایەنێك لە لایەنەکانی سروشت دەکاتەوە، کەچی هەستیار لە ڕێگای زمان و تربە و ئاوازەوە لاساییکردنەوەکەی دەردەبڕێ.

٢- ئەفلاتوون بەرهەمی لاساییکردنەوەکەی سروشت لە هونەردا بە ئاکامێکی ناتەواو و پڕ لە کەلەبەر لە قەڵەمدەدات، چونکە بەلای ئەمەوە ئەم بەرهەمە چەند وردەکارو چەسپ (محکم) بێت. سێ هەنگاو لە ڕاستی نموونەیی بابەتەکەیەوە دوورە.

کەچی ئەرستۆ هونەر بە تەواوکەری سروشت دادەنێ، هەستیارانیش بە هەڵگرانی دروشمی داهێنانی سروشتێکی تازە تەماشادەکات و بیروڕای وایە، کە هونەری هۆنراوە پەیامی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و سروشتی، پێسپێردراوە. کەوابوو: ئەرستۆ لێرەدا وەستایانە تۆوی ڕیالیزمی ئیشتیراکی لە ڕەخنەسازی جیهانیدا وەشاندووەو توانیویەتی دوو هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر پێوانەی خزمەتکردنی کۆمەڵ بە هۆی هونەری هۆنراوەوە بۆ ڕەخنەسازان بچەسپێنێ.

## • بناغەکانی شانۆگەری لە لای ئەرستۆ

هەروەکوو لە سەرگوزشتەی ژیانی ئەرستۆدا چەسپاوە، ئەم فەیلەسووفە نەمرە[1] لە سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا هەڵکەوت و توانی جڵەوی ڕۆشنبیری و شارستانێتیی یۆنانی بگرێتەدەست.

ڕۆشنبیری و شارستانیەتیش لەم سەدەیەدا گەیشتبووە لوتکەی خەملاندن و پەرەسەندن و بە سەدان کتێبی جۆربەجۆرو بە هەزاران دیوان و شانۆگەری بە زمانی یۆنانی لەبەردەستی شاسواری ئەم سەردەمەدا، واتا ئەرستۆ کۆببوونەوە.

ئەرستۆ لە کتێبەکانیدا سوودی لەم سامانە وەرگرت و دەستیکرد بە شیکردنەوەی بەرهەمە هەمەڕەنگەکانی ئەم سامانە، سەبارەت بە شانۆگەری، کە هونەری بەوزی یۆنانییە، ئەرستۆ

---

١ اصول النقد الأدبي ل٩ - ١٠

سێ بناغەی پێکەوەلکاوی بۆ شانۆگەری سەرکەوتوو دەستنیشانکرد:

**یەکەم:** بناغەی یەکێتی بابەت، شانۆگەری چ تراژیدیا بێ یان کۆمیدیا دەبێت بابەتێکی سنووردار و یەکگرتوی هەبێت و هەستیاری خاوەن ئەم شانۆگەرییە، پێویستە لە سنووری بابەتەکەی دەربازنەبێت و لابەلا دەم لە بابەتی دیکە بژەنێ، بەڵکوو دەبێت خۆی ببەستێ بە یەکێتی بابەتەکەیەوە و بە قووڵی هەموو لایەنەکانی بدرکێنێ و ڕووداو و کەسەکانی شانۆگەرییەکە بە ئەوپەڕی وردەکارییەوە، تەماشاکەران لە مەبەستی خۆی بگەیەنێ و ئەنجامی شانۆگەرییەکەی بەدیبهێنێ.

**دووەم:** بناغەی یەکێتیی کات، ئەم بناغەیە لە سەر بیرۆکەیەك دامەزراوە کە دەڵێ: ڕووداو و کەسایەتییەکانی شانۆگەری بۆئەوەی ڕیالیزمی بن و هۆشمەندانە تەماشاکەرەکان پێی قایلبن، دەبێت ئەو کاتە بە سەرەتایەك و کۆتاییەك سنوورکێشرابێت.

**سێیەم:** بناغەی یەکێتی شوێن، واتا: شانۆگەری چۆن بابەتەکەی دەبێت یەك بێت و کاتەکەی یەکگرتوو بێت، هەروەها دەبێت شوێنی ڕووداوەکان و جێگای کەسایەتییەکانی یەك بێت.

مێژوونووسەکانی شانۆگەری یۆنانی و جیهانی لە ڕاڤەکردنی مەسەلەی بناغەکانی شانۆگەری لەلای ئەرستۆ یەك نین و هەموویان لەو بیروڕایەدا نین، کە ئەرستۆ ئەم سێ بناغەیەی دەستنیشانکردووە بۆ شانۆگەری، هەندێك لەو مێژوونووسانە بڕوایان وایە، کە ئەرستۆ تەنیا بناغەی یەکێتی بابەتی بۆ شانۆگەری سەرکەوتوو چەسپاندووە بە هیچ ڕەنگێ ڕای وا نەبووە، کە هەستیاری شانۆگەری دەبێت خۆی بە یەکێتی کات و بە یەکێتی شوێنەوە ببەستێتەوەو دوو کۆت و زنجیر بخاتە ملی خۆی.

ئێمە لەم بیروڕایەداین، کە بۆچوونی ئەم مێژوونووسانە ڕاست و دروستە، چونکە یەکێتی کات و یەکێتی شوێن هیچ پەیوەندییەکی هونەرییان بە داڕشتن و تەکنیکی شانۆگەرییەوە نییە و پەیوەندیکردنیان زۆر زەحمەتە و ڕەنگە هیچ هەستیارێك نەتوانێ لە نووسینەوەی شانۆگەریدا بیانهێنێتەدی. سەرەڕای ئەمەش ئێمە لەو بڕوایەداین، کە مەبەستی ئەرستۆ لە بوونی یەکێتی بابەت لە شانۆگەریدا بەربەرەکانێکردنی سۆفستاییەکان بووە، چونکە هەروەکوو لەمەوبەر وتمان ئەم دەستەیە واتا (سۆفستاییەکان) دروشمی بەرەڵڵاییان لە هەموو شتێکدا هەڵگرتبوو، خۆیان بە هیچ دەستوورو بنواشە و یەکێتییەکەوە نەدەبەستەوە.

جا ئەرستۆی فەیلەسووف[1] مامۆستای یەکەمی مەنتیق (لۆجیك) بە توندوتیژی

---

١ دراسات في النقد الأدبي ل٧٥

بەریەرەکانێی ئەو بەڕەڵلاییەی سۆفستاییەکانی کردووە، لە هەموو بابەتەکانی ڕێزمان و زمان و ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازی و ڕامیاری و خوو و ڕەوشتدا، لێیان چووە سەنگەرەوە بۆ هەموو ئەو بابەتانە سنوورو دەستووری داناوە.

## • بیردۆزەکەی ئەرستۆ دەربارەی زمان

گرنگترین هەڵوێستەکانی ئەرستۆ لە ڕەخنەسازیدا، بیردۆزەکەیەتی (تیۆرەکەیەتی) دەربارەی زمان، چونکە ئەم فەیلەسووفە لەم بیردۆزەدا بە ئەوپەڕی وردییەوە زمانی شیکردۆتەوەو لە بەر تیشکی ڕێبازێکی زانستیدا لە دەنگ و ڕستە و دارشتنی گشتی کۆڵیوەتەوەو ئەرکی ئەم دیاردە ئادەمیزادییەی لە میانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و هونەریدا دەستنیشانکردووە.

ئەم بیردۆزەی ئەرستۆ دەربارەی زمان ڕەنگە لە سەرەتاوە کاردانەوەیەك بوویێت لە دژواری سۆفستاییەکان، کە زمانیان بە کۆمەڵە دەنگێك دانابوو، کە لە یاددا دەنگدەدەنەوەو هیچ سەرچاوەیێکی هۆشمەندییان نییە و هیچ ئەرکێکی دەستنیشانکراویان لێناوەشێتەوە.

بەڵێ: ڕەنگە لە سەرەتاوە ئەم بیردۆزە وا بوویێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێت بزانین، کە سەرئەنجامی لێکۆڵینەوەیێکی زانستی بووە، لە سەردەمی خۆیدا قوتابخانەیێکی زمانی بنیاتناوەو بۆ باسکردنی لە ڕووی فۆنەتیك و ڕستەسازی و زاراوەسازی و وشەسازی، جگە لە شیکردنەوەی لایەنەکانی زمانی هونەری، کە سەرئەنجام ئەم شیکردنەوەیەو ئەو باسکردنە بوون بە هۆی پەیدابوونی زۆربەی زانستەکانی زمان، بە جۆرێکی وا دەتوانین بڵێین تەنانەت لەم چەرخەدا زاناکانی زمان بە هەموو لایەنەکانییەوە سوود لە بیردۆزەکەی ئەرستۆ وەردەگرن و لە زۆربەی بابەتە زمانییەکاندا شوێنپێیهەڵدەگرن.

ئەرستۆ لە سەرەتای بیردۆزەکەیدا دەربارەی زمان پێناسەی ئاخاوتن دەکات و دەڵێت: ئاخاوتن لەلای ئادەمیزاد ئەرکێکی تەنییە بە هۆی کۆئەندامێکەوە ئەنجامدەدرێ و بناغەیێکی سروشتییە بۆ چاکە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەوە.

ئەرستۆ لەم پێناسەیەدا هەروەکوو دیارە ئاخاوتن بە دیاردەیێکی کۆمەڵایەتی لەقەڵەمدەدات، هەرچەندە لە هەنگاوی یەکەمدا وەکوو چالاکییەکی میکانیکی کەسی تەماشایدەکات. مەبەستی ئەم فەیلەسووفەش لەم تێڕوانینەدا بەستنەوەی زمانە بە بزووتنەوەی مێژووی کۆمەڵەوە، بۆئەوەی هیچ کەسێك مافی تێکدانی نەبێت و دەرفەتی ئەوەی نەبێت بە هەوەسی خۆی ڕاڤەیبکات و بۆ ئامانجێکی تایبەتی بەکاریبهێنێت.

ئەم مەبەستەی ئەرستۆ لە تەماشاکردنی ئاخاوتن بە ئاشکرا لە شیکردنەوەی وشەدا دەردەکەوێ، کە بەردی بناغەی زمانە.

**جا بزانین ئەم فەیلەسووفە چلۆن لە وشە دەکۆڵێتەوە:**

## • ئەرستۆ و وشە

ئەرستۆ لە باسکردنی وشەدا دەڵێت: بناغەی ئاخاوتن وشەیە، وشەش بزووتنەوەیێکی دەنگییە، ئەم بزووتنەوە دەنگییەش، کە لە پیت و بڕگە پێکهاتووە، بزووتنەوەیێکی عەقڵی و هۆشمەندییە.

ئەرستۆ لە سەر هەمان ڕایەڵ بیروڕاکان بنیاتدەنێت و لە باسکردنی وشەدا بەردەوامدەبێت و دەڵێت: وشە نیشانە و ڕەمزێکە بۆ واتای شتێك، یاخود بیرۆکەیەك، بۆیە ئەو نیشانە و بیرۆکەیە، کە وشەیە دەنگی دەروونی ئادەمیزادە.

جووڵانەوەی زمان کە بەرهەمەکەی وشەیە بۆ دەروون، بارێکی کەسی نییە، بەڵکوو یاساکانی لەلایەن کۆمەڵەوە دانراون و لەبەر تیشکی دەستووردا چەسپێنراون.

سەرئەنجام دەتوانین بە وشە بیربکەینەوە و بە هۆی وشە بەڵگەکانمان بگەیەنینە خەڵکی و پێی قایلببین.

ئەرستۆ ئا بەو پێوانە هۆشمەندی و دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە وشە بە گرنگترین توخمەکانی زمان دادەنێت و زیاتر دەڵێت: وشە ئاکامی تاقیکردنەوەی ئادەمیزادە لە هەست و نەست و دەروونی ئادەمیزاد و کۆمەڵدا تۆمارکراوە.

## • سنووری وشە لە لای ئەرستۆ

ئەرستۆ لە فراوانکردنی ئاسۆی وشەدا بە سنووری چالاکی کەسیدا تێناپەڕێ بۆ سنووری کۆمەڵ و بەس، بەڵکوو زیاتر ئەو سنوورە فراواندەکات هەتاکوو وشە دەکاتە میراتێکی هاوبەش بۆ گشت مرۆڤایەتی.

بەڵگەشمان لە چەسپاندنی ئەم ڕاستییە لەوەدا دەردەکەوێ، کە ئەم فەیلەسووفە لە جیاوازی نێوانی بێژە (لفظ)و وشە (کلمة) دەکۆڵێتەوەو دەڵێت: ڕستە وتراوەکان، واتا: بێژەکان نیشانە و ڕەمزن بۆ دەربڕینی بارەکانی دەروونی ئادەمیزاد، بەڵام وشە نووسراوەکان وێنەن بۆ تۆمارکردنی بێژەکان.

وشە نووسراوەکان لە لای میللەتان یەکنین، بەڵکوو لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی دیکەوە جیاوازن، بگرە تەنانەت لە لای میللەتێکی تایبەتی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی ترەوە باری جیاواز دەنوێنن.

بەڵام بارە دەروونییەکان لە لای هەموو نەتەوە و میللەتەکانی ئەم سەرزەمینە یەکن و هیچ جیاوازییەکی ڕاستینە لە نێوانیاندا بەدیناکرێ.

چونکە ئەم بارە دەروونیانە سەرئەنجامی چەند هۆیێکی سروشتی و مرۆڤایەتی هاویەشن.

نموونەی ئەرستۆ بۆ سەلماندنی ئەم بیروڕایانە وشەی (شوان)ە.

وشەی (شوان) کە نیشانە و ڕەمزە بۆ شتێکی هەستپێکراو، بێژەکەی لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی تر یەك نییە، بەڵکوو هەندێك لە دەنگەکانی ئەم بێژەیە لە زارێکەوە بۆ زارێکی تر لە زاراوەکانی میللەتێکی تایبەتی دەگۆڕێ.

بەڵام واتای (شوان) و تایبەتییەکانی و چۆنێتی لە ژیانی مرۆڤدا یەکن و لە دەروونی ئەندامەکانی گشت مرۆڤایەتی و میللەتان هەستێکی یەکگرتووی ناجیاواز بەرپادەکات و بارێکی نەستی و ویژدانی بێجیاواز دەنوێنێ.

سەرئەنجام ئەرستۆ لەم شیکردنەوەیەی وشەدا، دەگاتە بڕیارێك و دەڵێت: وشە واتاییێکی جیهانی هەیە و زمانیش، کە لە وشە پێکدێت نیشانە و ڕەمزی بیری ئادەمیزادە.

ئا بەم پێیە زمان لە لای ئەرستۆ، ئادەمیزاد لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە. زمان و بیریش پێکەوە یەکانگیرن، بەبێ وشە نە بیر دەردەبڕدرێ نە زانیاری دێتەکایەوە.

## • زمان و هۆشمەندی لە لای ئەرستۆ

زاراوەی (لۆجۆس) لە فەرهەنگی یۆنانیدا بە دوو واتا هاتووە:

- واتای یەکەم، بێژە (لفظ)ە.
- واتای دووەم، زمانە. بە هەموو توخمەکانییەوە لە دەنگ و وشە و ڕستەوە هەتاکو داڕشتن و شێوازی گشتی.

ئەرستۆ وەکوو فەیلەسووفێکی خاوەن بیروڕای تایبەتی لە کتێب و وتارەکانیدا زاراوەی (لۆجۆس) بە واتای (عەقڵ) بەکاردەهێنێت و شانبەشانی واتای هۆشمەندی و بیرکردنەوە دەیسازێنێ.

ئەرستۆ لەم کردەوەیەدا وای نەویستووە، کە لە سنووری زمانی نەتەوەکەی دەربازێت

و بە هەموسی خۆی واتای تازە بەسەر ئەو زاراوەیەدا بسەپێنێ، چونکە هەروەکوو زانراوە ئەم فەیلەسووفە بە ئەوپەڕی وردییەوە پەیرەوی زمان و یاساکانی مەنتیقی کردووە، بەڵکوو مەبەستی ڕاستینەی لەوەدا، ئەوەبووە، کە پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانی زمان و عەقڵ و هۆشمەندیدا بنیاتبنێت و وشەیێکی تاقانە بۆ ئەم واتایە بەکاربهێنێت، بۆئەوەی هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا بە خەیاڵی کەسدا نەیەت.

سەرئەنجام زاراوەی (لۆجۆس) لە لای ئەرستۆ بۆ واتای وشە و زمان و عەقڵ چەسپاوە و بووە بە ئەڵقەیێکی پەیوەندی نێوانی ئاخاوتن و بیرکردنەوە.

ئاکامی ئەم کارەی ئەرستۆ هەروەکوو دیارە تەماشاکردنی زمانە وەکوو ئاوێنەیێکی ڕاستینە بۆ ڕاستی و خێرومەندی و ڕەفتاری چاك.

## • ڕستە و ڕاستی لە لای ئەرستۆ

ئەرستۆ هەرچەندە وشەی بە ئاوێنەی ڕاستی داناوە، چونکە نیشانە و ڕەمزێکە بۆ شتی هەستپێکراو، بەڵام لەم ڕوانگەیەوە تەماشای ڕستەی نەکردووە، بۆیە لەم ڕووەوە دەڵێ:

هەروەها زمان لەم بوارەدا پێویستە وشەکانی ڕوونبن و ڕستەکانی ڕەوانبن و لە ئاڵۆزی و بەیەکاچوون بێبەرببن.

جا کە زمان بەو چەشنە بوو ئەرك و ئامانجی بنیاتنانی پەیوەندی چاکە و برایەتییە لە نێوان ئەندامەکانی کۆمەڵدا، یاخود گەیاندنی زانیاری و زانست یان پەروەردەکردن و ڕابەرییە یاخود بەخشینی لەزەت و خۆشییە بە تایبەتی لە هونەری وێژەدا.

## • ڕێبازی ئەرستۆ بۆ هەڵسەنگاندنی زمان

ئەرستۆ پاش ئەوەی ئەرك و ئامانجی زمانی دەستنیشانکرد و پێوانە جیاکەرەوەکانی زمانی ڕاست لە زمانی دەستخەڕۆ چەسپاند، ڕێبازێکی سازکرد بۆ هەڵسەنگاندنی زمانی پەیامدار لە وێژەو لە زمانی ڕاست و درۆ لە هەڵە لە زانست و زانیاریدا.

ئەم ڕێبازەش لە سەر ئەم بناغانەی خوارەوەدا دامەزراوە:

١- شیکردنەوەی ڕستەکانی زمان بۆ وشەکانیان و دەستنیشانکردنی واتای ئەم وشانە بە گوێرەی فەرهەنگ و چۆنێتی بەکارهێنانی خەڵکی و زاناو وێژەرە ڕاستینەکان.

٢- یەکالاکردنی نیشانەکان، کە نیشانە و ڕەمزن بۆ بیرۆکە و دەربڕین لە باری هۆشمەندی

و دەروونی و کۆمەڵایەتی.

٣- شیکردنەوەی ئەم ناوەڕۆکانە، کە لە زماندا نوێنراون، چ بیرۆکە بن، چ شتی باری دەروونی بن.

ئەم شیکردنەوەیەش تەنیا پشت بە مەنتیق و لۆجیك و "ڕستە کەرەسەی ئاخاوتنە" لەبەر تیشکی پێوانەی عەقڵ و هۆشمەندیدا بە پێچەوانەی وشەوە دێت، چونکە بەرهەمی بیرکردنەوەیە و کارێکی عەقڵی و هۆشمەندییە لە تەك ڕاستی شتەکاندا، کە وشە دەربڕاندەخات و دەربڕاندەبڕێ جیاوازی هەیە. بۆیە ڕستە دەشێ ڕاست بێت و دەشێ درۆ بێت، بە گوێرەی مەبەستی دوێنەر، کە سازکەری ڕستەیە.

## • ئەرک و ئامانجی زمان

ئەرستۆ لەبەر تیشکی ئەو سێ پێوانەیەدا دەستدەکات بە شیکردنەوەی ئەرك و ئامانجی زمان و دەستنیشانکردنی چۆنێتی ئەنجامدانی ئەو ئەرك و ئامانجە و دەڵێ: زمان لە هەموو کۆڕێکدا دەبێت هۆیەك بێت بۆ دەربڕین و درکاندنی بارێك کە لە ڕاستیدا ڕوویداوە، یاخود دەشێت ڕوویدات. بۆیە پێویستە زمان لە نواندنی ڕووداوێك، کە نەبووە یان هەرگیز نابێت بپارێزرێ و دووربخرێتەوە.

ئنجا ئەم کۆڕە کاروباری ڕۆژانە بێت یان جیهانی ویژە بێت. ڕاستی شتەکان ببەستێ، بەڵکوو لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە سەرنج لە واتای وشەکان بدات، چونکە وشەکان لە ئاخاوتندا بەردی بناغەی ڕاستین.

مەبەستی ئەرستۆ لە هەڵسەنگاندنی ڕێبازی زماندا، بەرپەچدانەوەی سۆفستاییەکان بوو،کە هەروەکوو لەمەوبەر وتمان یارییان بە واتای ڕستەکان دەکردو بەبێ سنوور زاراوەی نوێ باویان دادەتاشی و بە زۆرەملێ بێژمیان بۆ واتای تازە بەکاردەهێنا و پەیڕەوی هیچ بنواشەیێکیان نەدەکرد لە سازدانی ڕستە و شێوازدا.

بەڵگەشمان بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستەی ئەرستۆ ئەوەیە، کە ئەم فەیلەسووفە جگە لە باسکردنی وشەو پێناسەی زمان و لێکۆڵینەوەی زمان و دەستنیشانکردنی ئەرك و ئامانجی زمان و چەسپاندنی بناغەکانی ڕێبازی هەڵسەنگاندنی زمان لە بیردۆزەکەی بە ئەوپەڕی وردییەوە دەستی بە یەکالاکردنی خوازە لە زمانی ویژەییدا کرد، بە تایبەتی دەستنیشانکردنی چۆنیەتی گواستنەوەی وشە لە واتای حەقیقی و ڕاستینەوە بۆ واتای خوازەیی و مەجازی.

## • بناغەکانی گواستنەوەی وشە لە واتای حەقیقییەوە بۆ واتای مەجازی

ڕوونکردنەوەی بناغەکانی گواستنەوەی وشە لە واتای حەقیقییەوە بۆ واتای مەجازی (خوازە)، ئەرستۆ نموونە لە هۆنراوەی یۆنانی دەهێنێتەوەو واتای وشە خوازەییەکان شیدەکاتەوە بەپێی ئەم چوار خاڵانەی خوارەوە:[1]

**یەکەم:** نموونەی گواستنەوەی وشە لە واتای حەقیقییەوە بۆ واتای خوازەیی، لەبەر تیشکی ڕەگەزو جۆر، ئەوەیە کە دەوترێ "کەشتییەك لێرەدا وەستاوە" وشەی (وەستاوە) خوازەیە، چونکە کەشتی ناوەستێ، بۆیە واتای حەقیقی ئەم خوازەیە (لەنگەرگرتن)ە، پەیوەندی نێوانی (وەستان) و (لەنگەرگرتن) لە ڕووی واتاییەوە پەیوەندی بە ڕەگەز و بە جۆرەوەیە، چونکە (لەنگەرگرتن) جۆرێکە لە (وەستان).

**دووەم:** نموونەی گواستنەوەی وشە لە واتای حەقیقییەوە بۆ واتای خوازەیی لە بەر تیشکی جۆرو ڕەگەز ئەوەیە، کە وتراوە، بەڵێ: تا لێرەدا تەنگوچەڵەمەی زمان وەکوو چالاکییەکی کەسی دەستپێدەکات، چونکە دوژمنەر لە ڕێگای ڕستەسازییەوە دەتوانێ بە ڕەش بڵێ سپی و بە سپی بڵێ ڕەش و بە پێچەوانەی ڕاستییەوە لەبەر چەند هۆیەك و جێبەجێکردنی مەبەستێکی تایبەتی مافی ئەوە بە خۆیدەدات، کە درۆ بکات و خوێنەرو گوێگرەکانی دەستخەڕۆبکات، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ بزانین، کە ڕاستی هەر ڕاستییە و ڕەسەنی شتەکان ناگۆڕێن و ڕستەسازی دوور لە ڕاستی و ڕەسەنی شتەکان چەند ڕەوانبێژو زمانلووس و هونەرمەند بێت ناتوانێ بە هۆی ڕستە درۆکانییەوە ڕاستی لێڵ بکات و ڕەسەنی شتەکان قەڵب بکات.

ئەرستۆ زیاتر لە سەر ئەم بابەتە دەڕوات و دووپاتیدەکاتەوە، کە تەنگوچەڵەمەی زمان لەوەدایە: زمان بە هۆی ڕستەوە ڕەنگە دەربڕینی ڕاستینەی خاوەنەکەی نەبێت، چونکە هەموو کەسێك بیروڕای تایبەتی خۆی بە چەشنێکی ڕاست دەرنابڕێ.

جا بۆ دەستنیشانکردنی ڕاستگۆکان و جیاکردنەوەی ئاخاوتنی درۆ لە ئاخاوتنی ڕاست و دروست، دەبێ سێ پێوانەی یەکانگیر بەکاربهێنین:

**پێوانەی یەکەم:** ڕاستی شتەکانە، کە بە یەکێك لە هەستکارەکان یا خود بە هۆی تاقیکردنەوەوە دەتوانین پەیڕەویبکەین.

---

[1] فن الشعر ل٥٩

**پێوانەی دووەم:** یاسای لۆجیك، دەستوورەکانی مەنتیقە، کە زانا و پیاوچاکان لەسەری یەکن و هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا دەربارەی ئەم پێوانەیە بەدیناکرێ.

**پێوانەی سێیەم:** بەرژەوەندی کۆمەڵ و قازانجە بنەڕەتییەکانی میللەتە.

"ئۆدسمیۆس هەزاران کاری بە نرخی کردووە" دەربڕینی وشەی (هەزاران) لەم نموونەیەدا خوازەیە بۆ واتای وشەی (زۆر) سازکراوە. ئەم سازکردنە بۆیە ڕەوایە، چونکە واتای (هەزاران) جۆرێکە لە واتای وشەی (زۆر) و وشەی (زۆر) ڕەگەزە، واتا: جنسە و دەربڕینی هەزاران دەگرێتەوە.

**سێیەم:** نموونەی گواستنەوەی وشە لە واتای حەقیقییەوە بۆ واتای خوازەیی لەبەر تیشکی جۆربەجۆر ئەوەیە، کە وتراوە: "بە شیری مس ژیانی لێسەند". لەم نموونەیەدا وشەی (سەند) بە واتای پچڕاندن هاتووە، چونکە (پچڕاندن) جۆرێکە لە (سەندن). مەبەست لە هەر دوو وشەش واتا: سەندنی ژیان و پچڕاندنی ژیان بەهۆی شیرەوە، کوشتنە.

**چوارەم:** نموونەی بناغەی لێکچواندن، واتا: (تشبیە) جۆربەجۆرن و هەموویان لە سەر بنواشەی ( قاعدە) ڕاددەن، واتا: (نیسبەت)، لە نێوانی ڕاددەی وشەی دووەم و بۆ ڕاددەی وشەی یەکەم، وەك ڕاددەی وشەی چوارەمە بۆ ڕاددەی وشەی سێیەم، چونکە هەستیاری وا وشەکان لە دەربڕینی خوازەییدا بەکاردەهێنێ، کە وشەی چوارەم لە بری وشەی دووەم هاتووە، وشەی دووەم لە جێگای وشە چوارەم سازکراوە.

هەندێ جاریش پەیوەندی بە وشە گواستراوەکەوە هەیە و دەخرێتە سەر واتا خوازەییەکە.

جا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بناغەیە ئەرستۆ دەڵێ: "ڕاددەی نێوانی - پێك - و وشەی (دیونیس)واتا: خوای مەی، هەمان ڕاددەیە لە نێوانی وشەی (قەڵغان) و وشەی (ئەرس)، واتا: خوای جەنگ".

بۆیە هەستیاری یۆنانی لەبەر تیشکی ئەم بناغەیەدا دەتوانێ دەربڕینی خوازەیی سازبکات و وەسفی پێك بەوە بکات، کە قەڵغانی (دیۆنیس)ە.

**نموونەیێکی دیکە:**

ئەوەیە کە ڕاددەی نێوانی وشەی (پیری) و وشەی (ژیان)، هەمان ڕاددەیە لە نێوان وشەی (شەو) و وشەی (ڕۆژ)دا.

سەرئەنجام هەستیار دەتوانێ لە جیاتی وشەی (پیر) دەستەواژەی (تاریکایی ژیان) یان (ئاوابوونی ژیان) بەکاربهێنێ.

ڕەنگە هەندێ لە ڕەخنەسازان توانج لەم ڕێبازە بگرن و سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشن، کە

ڕێبازێکـی لۆجیکـی ڕووتە و لە سـەر زانسـتی مەنتیقێکی وشـك بنیاتنـراوە، ئەگەر هاتوو وێـژەر پەیڕەویکـرد، ئەوا توانای خوڵقاندنی وێنەی هونەری لە دەربڕینەکانیدا دەسـتی خۆی دادەمرکێنێ.

بـەڵام ئـەم جـۆرە ڕەخنەسـازانە دەبێ بزانن، کە ئەم ڕێبـازە ڕەنگدانەوەیێکی دژوارییە لەو دەرفەتەوە هەڵقوڵاوە، کە زمانی وێژە بە هۆی سۆ فستاییەکانەوە ئاڵۆزاو ببوو، سەرەڕای ئەمەش بناغەکانی ئەم ڕێبازە لە هەموو سەردەمێکدا سۆزێکی زانسـتیانە بۆ سازکردنی وێنەی هونەری و واتای خوازەیی لە جیهانی وێژەدا سازدەکات و دەربڕینی ئەدەبی لە گێرەشێوێنی دەپارێزێ و ڕێگای بەدیهێنانی ئەرکی سەرشانی وێژەران، کە پەیوەندیکردنە بە جەماوەرەوە خۆشدەکات.

جگە لە ئەرسـتۆ لە ڕەخنەسـازی یۆنانیدا دوو شاسـواری تری یۆنانی بەناوبانگ هەن، ئەوانیش بریتین لە هۆراس و لۆنیجیلۆس.

## • ڕەخنەسازیی عەرەبی

بێگومان ڕەخنەسازی عەرەبیش لاپەڕەیێکی ڕەنگینە لە مێژووی ڕەخنەسازی جیهانیدا، چونکە تایبەتە بە نەوەی عەرەب و ژینگەی عەرەبی و شارستانێتیی ئیسلامی.

هیوادارین لەبەر تیشکی تایبەتی ئەم ڕەخنەسازییە عەرەبییە بتوانین بەراوردێك لە نێوان ڕۆشنبیری ڕۆمانی، کە بەردی بناغەی ڕۆشنبیری و تێڕوانینی میللەتە ئەوروپییەکانە لەم سەردەمەداو ڕۆشنبیری عەرەبی ئیسلامی، کە هێڵێکی تایبەتی پێکدهێنێ بۆ ڕۆشنبیری نەتەوەی عەرەب و نەتەوە موسڵمانەکان لە کۆنترین سەردەمی مێژوویانەوە هەتاکو ئەمڕۆ بەرپابکەین.

هیوادارین دوابەدوای تەواوکردنی شیکردنەوەی ڕەخنەسازی عەرەبی دەرفەتی ئەوەمان هەبێت، کە باسی ڕەخنەسازی ئەورووپی بکەین، ئەوجا بێینەوە سەر ڕەخنەسازی نەتەوەکەمان بۆ دەستنیشانکردنی ڕێڕەوی مێژووی ئەمری و ڕوونکردنەوەی تایبەتییەکانی و پەردە لەڕووی

مێژوو و داهاتووی هەڵماڵین.

## • نەتەوەی عەرەب و هونەری هۆنراوە[1]

زانای بەناوبانگی فەرەنسی پرۆفیسۆر (تین) لە سروشت و ئەرکی هۆنراوە لە ژیانی گشت میللەتاندا وتوویەتی: "هۆنراوەی هەموو میللەتێك بەرهەمی ژینگەیە و ئەرکی پێویست لە ڕووی تەنگوچەڵەمەی ئابووری و ئایدۆلۆجی و کۆمەڵایەتییەوە بەجێدەهێنێ".

جا ئەگەر ئەم وتەیە پێویستی بە بەڵگە هەبێت، ئەوا هۆنراوەی عەرەبی بەتایبەتی لە سەردەمی جاهیلیدا باشترین بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەم وتەیە، چونکە هەروەکوو لە مێژووی ڕۆشنبیری عەرەبیدا ساغبۆتەوە، هۆنراوەی عەرەبی لەسەردەمی جاهیلیدا تاقە زانستی نەتەوەی عەرەب بووە و پیاوماقووڵانی ئەم نەتەوەیە، هۆنراوەیان وەکوو تۆمارگەیێکی فراوان تەماشاکردووە؛ بۆ تۆمارکردنی مێژووی باب و باپیرانیان و نەخشکردنی نەریت و خوو و ڕەوشتیان و چەسپاندنی هەموو چالاکییەکی بیری و شارستانێتی.

بۆیە لە کۆنترین مێژووی نەتەوەی عەرەبەوە دەگێڕنەوە، کە ئەگەر هاتوو لە خێڵێکی عەرەبیدا، هەستیارێك (شاعیرێك)هەڵکەوت و ناوبانگی دەرکرد، ئەوا ئەندامانی ئەو خێڵە بە پیاو و ژن و پیر لاو و منداڵەوە ئاهەنگ دەگێڕن و مەڕ سەردەبڕن و هەروەکوو چۆن لە ئاهەنگی شایی و زەماوەندا دەکرێ، کۆڕی هەڵپەڕکێ دەبەستن و لە سەر ئاوازی تەپڵ و سەمتوور گۆرانی دەبێژن. ئەوەی شارەزای ئەرکی هۆنراوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەی عەرەب نەبێت، ڕەنگە بپرسێ ئەم هەموو گرنگیپێدانەی شاعیر لە چییەوە هاتووە؟

مێژوونووسەکانی وێژەی عەرەبی وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە و دەڵێن: "هەستیار لە ژیانی کۆمەڵایەتی عەرەبیدا، شاسواری خێڵەکەی بووە لە دووتوێی هەڵبەستەکانیدا کردەوەی پیاوماقووڵەکانی خێڵەکەی تۆمارکردووە و لە مەیدانی ڕمبازی و زۆرانبازیدا سەرگوزشتەی ئازایەتی خێڵەکەی خوێندۆتەوەو بەرگری لە ئەندامانی خێڵەکەی کردووەو سەرئەنجام وەك پارێزەرێك بۆ خێڵەکەی و نەتەوەکەی گشت ئەرکێکی سەرشانی خۆی بەدیهێناوە".

## • لەدایکبوونی ڕەخنەسازی عەرەبی

هەروەکوو هەمیشە دووپاتمانکردۆتەوە لەدایکبوونی ڕەخنەسازی هەر نەتەوەیەك، بەندە

---

[1] النقد الأدبي. احمد امين ل٤١٩

بە لەدایکبوونی هۆنراوەی ئەو نەتەوەیە. جا ئەگەر بمانەوێ بزانین هۆنراوەی عەرەبی لە چ کاتێکدا لەدایکبووە، دەبێ بزانین بەر لە هەموو شتێك لە چ سەردەمێکدا پەیدابووە.

مێژوونووسەکانی هۆنراوەی عەرەب نەیانتوانیوە سەرەتاییێکی مێژووی سەردەمی پەیدابوون و لەدایکبوونی هۆنراوەی عەرەبی دەستنیشانبکەن. هۆی ئەم نەتوانینەش لەوە هاتووە، کە نەتەوەی عەرەب لە سەردەمی جاهیلیدا، کە سەردەمی پێش پەیدابوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە بەدەگمەن هۆنراوەی شاعیرەکانی تۆمارکردووە. ئەم بارە بێگومان بواری توێژەرەکان نادات بۆ دەستنیشانکردنی قۆناغی سەرەتای لەدایکبوونی هۆنراوەی عەرەبی.

هەرچەندە هەندێك لەو توێژەرانە لەو باوەڕەدان، کە هۆنراوەی عەرەبی لە سەرەتای پەیدابوونییەوە بە هونەری "ڕەجەز"[1] دەستیپێکرد. هونەری ڕەجەزیش جەشنێکی سادەیە لە هۆنراوەی عەرەبی، کە کێش و ئاوازەکەی لە تەك تریەی حوشتردا لە کاتی ڕۆیشتندا دەگونجێ و ناوەڕۆکەکانی بە زۆری گۆرانی کارکردن و بابەتەکانی بۆ خەمڕەوێنی و ماندوونەکردن دەهۆنرێنەوە. دوابەدوای هونەری ڕەجەز وردەوردە هونەری (قەسیدەی عەرەبی) لەدایکبوو، کە کێشەکانی جۆربەجۆرن و قافییەکانی لەسەر یەکێتیی دەنگی (روي)؛ واتە دوا دەنگ و سەر و بۆری ئەم دوا دەنگە لە وشەی کۆتایی ڕێڕەوی قەسیدەکە چەسپێنراوە.

مێژووی سامانی هونەری ڕەجەز و قەسیدەی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا لە سەدو پەنجا ساڵ پێش پەیدابوونی ئیسلام تێناپەڕێ، واتە تەمەنی کۆنترین هۆنراوەی عەرەبی چ ڕەجەز چ قەسیدە، لە سەدو نیوێك پێش ئیسلام زیاتر نییە.

مێژوونووسەکانی وێژەی عەرەب لێرەدا پرسیارێك بەرپادەکەن و دەپرسن: "ئایا ئەم کۆنترین هۆنراوەیەی عەرەبی، کە تەمەنەکەی تەنیا سەد و پەنجا ساڵ بەر لەوەی ئایینی ئیسلام پەیدابێت یەکەم بەرهەمە لە باخچەی شیعری عەرەبیدا؟

ئەو مێژوونووسانەی وێژەی عەرەبی تێبینیدەکەن، کە کۆنترین هۆنراوەی عەرەبی بەو تەمەنە هۆنراوەیێکی پێگەیشتووە لەڕووی ناوەڕۆك و ڕوخسار و کێش و قافییەوە هیچ کەموکورییەکی تێدا بەدیناکرێ. جا ئەم ڕاستییە، ڕاستییێکی دیکە لە مێژووی هۆنراوەی عەرەبیدا، لە شێوەی پرسیارێك ڕوومان تێدەکات و دەڵێ: ئایا دەشێ هۆنراوەی عەرەبی لە سەرەتای لەدایکبوونییەوە ئاوا بە تەواوی و بە پێگەیشتویی هاتبێتەکایەوە؟!

تاقیکردنەوەی میللەتان وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەدەنەوە، کە نەخێر هۆنراوەی عەرەبی لە سەرەتای لەدایکبوونییەوە ئاوا بە تەواوی و پێگەیشتویی نەهاتۆتەکایەوە. بەڵکوو یاسای

---

[1] النقد الأدبي، أحمد أمين، ل ٤٣٥

پەرەسەندنی هەموو دیاردەیێکی ماددی و مەعنەوی ئەوە دەسەلمێنێ، کە هۆنراوەی عەرەبی وەکوو هۆنراوەی هەر میللەتێکی دیکە لە سەرەتای لەدایکبوونییەوە ساکارو سادە و بە کەموکوڕییەوە هاتۆتەکایەوە، ئەوجا قۆناغ بە قۆناغ و بە هۆی چەند کارتێکردنێکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری پەرەیسەندووە و گۆڕاوە هەتاکو گەیشتۆتە پلەی تەواوی و پێگەیشتن.

هەروەها تاقیکردنەوەی میللەتان ئەوە دەسەلمێنێ، کە ڕەخنەسازیی ڕابەری لە سەرووی ئەو هۆیانەوە دێت، کە ببوونە ئاکامی گۆڕانی باری هۆنراوەی گشت میللەتان لە سادەیی و ساکاری و کەموکوڕییەوە بۆ باری تەواوی و پێگەیشتن، سەرئەنجامی ئەم ڕاستیانە دەربارەی مێژووی ڕەخنەسازی عەرەبی، ئەوەیە کە ئەم ڕەخنەسازییە بێگومان تەمەنی دەگەڕێتەوە سەردەمی سەرەتای لە دایکبوونی هۆنراوەی ئەم نەتەوەیە.

سەرەتای ئەم سەردەمەش نەزانراوە و بڕواش ناکەین بە ئاسانی بزانرێ. بەڵام لە هەمان کاتدا هەموو مێژوونووسێکی ویژەی عەرەبی لەو بڕوایە دایە، کە تەمەنی بەهیچ جۆری لە تەمەنی ڕەخنەسازیی یۆنانی کۆنتر نییە، چونکە ڕەخنەسازیی یۆنانی بەر لە زایین بە نزیکەی هەشت سەد ساڵ لە شانۆگەری و گفتوگۆو کتێبی جۆربەجۆر تۆمارکراوە، زۆربەی سەرچاوەی ئەم تۆمارکردنە لەم ڕۆژانە گەیشتوونەتە دەستمان.

## • شوێن و بەشداریکەرەکان لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا

لە مێژووی گشتی عەرەبیدا ساغبۆتەوە، کە خێڵە عەرەبەکان لە سەردەمی جاهیلییەوە لە چەند بازاڕێکدا وەکوو بازاڕی (عوکاز)و (زولمەجاز) کۆدەبوونەوە بۆ گۆڕینەوەی شمەك و کڕین و فرۆشتن، کۆڕیان دەبەست و هەستیار و دوێنەرانیش ئەو دەرفەتەیان بە هەل دەزانی، دەستیاندەکرد بە خوێندنەوەی هەڵبەستەکانیان، هەروەکوو لەمەوبەر گوتمان ئاوێنەیەك بوون بۆ هەموو چالاکییەکی خێڵایەتی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی. هەروەها لە مێژووی گشتی عەرەبیدا ساغبۆتەوە، کە لەو بازاڕانەدا پیاوماقوڵانی خێڵەکان و دوێنەران و سەرکردەکان بەشداریاندەکرد. لە گوێگرتن و تێبینی نواندن دەربارەی هەڵبەستی شاعیرەکان. ئەم تێبینی نواندن و گوێگرتنە هەڵبەت هەوێنی لەدایکبوونی ڕەخنەسازی عەرەب بووە، چونکە لەم ڕووەوە دەگێڕنەوە کە پیاوماقوڵانی خێڵی قورەیش حەوت هەڵبەستیان هەڵدەبژارد. هی حەوت شاعیری بەناوبانگ لە پاشان بە ئاوی زێڕ لەسەر ئاوریشم دەیاننووسییەوەو بە دیوارەکانی کەعبەدا هەڵیاندەواسین. ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو هەڵبەستانە بە نازناوی (معلقات) ناویانگیان دەردەکرد، هەتا

ئەمرۆ بە نموونەی شیعری بەرزی عەرەبی لە هەموو سەردەمێکدا لەقەڵەمدەدرێن.

ئەم هەڵبژاردنە بێگومان کارێکی ڕەخنەسازییە، چونکە هەموو هەڵبژاردنێك لەسەر بناغەی جیاکردنەوەی بەرهەمی چاك لە بەرهەمی خراپ ئەنجامدەدرێ. هەروەها دەگێڕنەوە، کە لە وەرزی بازاڕی عوکازدا خێوەتێکی سوور بۆ نابیغەی زوبیانی، کە شاعیرو دەمڕاستی خێڵی زوبیان بوو، هەڵدەدرا. شاعیرە تەڕاتێنکەرەکان ڕوویاندەکردە ئەو خێوەتە و لەبەردەمی ئەو شاعیرە بەناوبانگەدا هەڵبەستیان دەخوێندەوەو داوای هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانیان لێدەکرد. نابیغەش وەکوو حەکەم و بەرهەڤانێك بڕیاری چاکە و خراپەی هەڵبەستی شاعیرەکانی دەدا.

هەندێ لەو هەستیارانە هەروەکوو دەگێڕنەوە بە بڕیاری نابیغە قایلنەدەبوون و بەریەچیان دەدایەوە، ئەوجا نابیغەش دەستی بە ڕوونکردنەوەی ئەو هۆیانەی کە پاڵیان پێوەنابوو بۆ وەرگرتنی بڕیارەکەی، کە بێگومان پەیوەندیان هەبوو بە لایەك لە لایەکانی هەڵبەستەکەوە، دەکرد چ لەڕووی وشە و واتاوە چ لەڕووی کێش و قافییەوە. کەوابوو شوێنی ڕەخنەسازی عەرەبی بازاڕو جێگای شوێنە گشتییەکان بوو، بەشداریکەرەکانی ئەو ڕەخنەسازییەش پیاوماقوڵانی خێڵەکان و دەمڕاست و هەستیارەکان بوون.

## • چەشنەکانی ڕەخنەسازی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا

لەو تەمەنەی ڕەخنەسازی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا، کە دووسەد و پەنجا ساڵی خایاندووە، هیچ کتێبێك یان هیچ نووسراوێك لە بابەتی ڕەخنەسازیدا دانەنراوە. ئەوەی لەم ڕووەوە بە دەستمان گەیشتووە چەند گێڕاوەیێکی دەماودەمییە و بەس. جا ئێمە گەر بمانەوێ بە وردی ئەم گێڕانەوە دەماودەمییانە شیبکەینەوە، دەتوانین سێ چەشنی ڕەخنەسازی عەرەبی لەو سەردەمەدا دەستنیشانبکەین:

**یەکەم:** ڕەخنەسازی لابەلایە، کە دێڕە هۆنراوە لە سوچی تەنگەبەری وشە و واتاوە هەڵدەسەنگێنێ و بڕیاری چاکە و خراپەی شاعیران دەدات. نموونەیەك لەم چەشنە ڕەخنەسازییە ئەوەیە، کە دەگێڕنەوە هەستیاری بە ناوبانگی عەرەبی (المتلمس) وتویەتی:

وقد اتناسى الهم عند احتضاره
بناج عليه الصيعرية مكـدم

**واتە: خەفەت بە سواربوونی نێرە حوشترێك دەڕەوێنم، کە نیشانەی (الصيعرية) بە ملیەوەیەتی.**

"طرفـه"ی شـاعیر کـه گوێی لەم دێـڕە هۆنراوەیە بوو، ڕەخنەی لـه خاوەنەکەی گرت و گوتی: (المتلمس) لەم دێڕەدا مێینەی حوشتری بە وەسفی نێرینەی حوشتر لە قەڵەمداوە، چونکە نیشـانەی (الصیعریة) تایبەتە بە مێینەی حوشـتر نەك نێرینە، کەوابوو (طرفە) لەم تێبینییەدا ڕەخنە لە تاقە وشەیێکی ئەم دێڕە هۆنراوەیە دەگرێت و سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە خاوەنەکەی لە واتەی ئەو وشەیەدا هەڵەیکردووە.

**دووەم**: ڕەخنەسـازی بەراوردکارییە، کە لەبەر تیشـکی لێکدانەوەی بەرهەمەکانی چەند هەستیارێك و چەند بەراوردکاری لە نێوانیاندا دەکات و هێڵی جیاکەرەوەی شێوازی هەر یەکێك لەو شـاعیرانەدا دەخاتەڕوو: نموونەمان بۆ ئەم چەشـنە لە ڕەخنەسـازی عەرەبی سـەردەمی جاهیلییەوە ئەوەیە، کە دەگێڕنەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان شاعیران: (الزبرقان کوڕی بدر و المخبل السعدی و عبـدە کـوڕی ئەلتەیـب و عەمـری کوڕی ئەلئەهـتەم) لە کۆڕێکـی خواردنەوەدا بەرەنـگاری یەکتـر بـوون و هـەر یەکێکیان بەرهەمی هۆنراوەی خۆی بە چـاك زانی و دەمی عەیبلێگرتنی کردە هەڵبەستی ئەوی تریان. لە دواییدا بڕیاریاندا شیعرناسێك بکەنە ڕەخنەساز، ڕەخنەسـازەکە وتی: ئەی شـاعیران هەریەکێك لە ئێوە تایبەتی خۆی هەیە، هۆنراوەی عەمر وەکوو ئاوریشم وایە قەد دەکرێت و بەبێ چرچی بڵاودەکرێتەوە، واتە بەرهەمەکانی ئەم شاعیرە ناسـك و سـووك و ڕەوانـن، بـەڵام "الزبرقـان" لە هۆنینەوەی شـیعردا وەکوو کابرایـەك وایە، کە گۆشتی مەڕی چاك وەربگرێت و لەگەڵ گۆشتی خراپدا تێکەڵیبکات، واتە بەرهەمەکانی "الزبرقان" چەند بە پێزبن لە هەڵبەستی لاواز و ناتۆکمە بێبەری نییە، کەچی شیعری "مەخبەل" وەکوو ئەستێرەی ئاسمان وایە، کە خوای گەورە دەیبارێنێتە سەر ئەوانەی خۆی هەڵیاندەبژێرێ، واتە هەڵبەستەکانی ئەم شاعیرە پایەبەرزو ئەندێشە فراوان و بەتامن، بەڵام شیعری "عبدە" وەکوو کونەبێکی سفت و پتەو وایە ئەوەی تێیدایە ڕایدەگرێت و نایداتەوە. بەمانای ئەوە هەڵبەستەکانی ئەم شاعیرە هیچ کەموکوڕییەکیان نییە و لە هەموو ڕوویێکەوە تەواون.

**سێیەم**: ڕەخنەسازی ڕەوانبێژییە: واتە (نقد بلاغی)، ئەم چەشنە لە ڕەخنەسازی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا، بێگومان لەڕووی زاراوەو ڕێبازەوە بە جۆرێکی ڕێکوپێك سەریهەڵنەهێنابوو، چونکە زانسـتی ڕەوانبێژی لەو سـەردەمە دێرینەدا هێشـتا بنیاتنەنرابوو، بۆیە نموونەمان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم چەشنە ڕەخنەسازییە عەرەبییە بەدەگمەن دەستدەکەوێ.

لەم نموونانە بڕیاری نابیغەی زوبیانی، کە حوکمی شاسواری ئافرەتە شاعیری بە ناوبانگی عەرەب "الخنساء"ی داوە و لەچاو (حەسسانی کوڕی سابت) بە سەرکەوتووی لە قەڵەمداوە. دەگێڕنەوە کە (حەسسانی کوڕی سابت) ئەو بڕیارەی نابیغەی بیست پێی قایلنەبوو و داوای

بەڵگەی لێکرد، نابیغەش ئەم دێڕەی حەسسانی شیکردەوە، کە دەڵێ:

لنا الجفنات الغر يلمعن في الضحي

واسيافنا يقطرنا مـن نجـــدە دمـا

واتـە: ئێمـە بەرچـاو فراوانیـن و میوانـداری دەکەیـن و ئازایـن و دێیـن بەدەنگ هەموو بانگەوازێکی یارمەتیخوازەوە. نابیغە لەم واتایەدا لە سازدانی دەربڕینە ڕەوانبێژییەکانییدا عەیبی دۆزییەوە و وتی: ئەی حەسسان تۆ دەبێژیت: (لنا الجفنات الغر) واتە مەنجەڵمان هەیە، کە پەڵە پەڵە سپییە. باشتر ئەوەبوو کە بڵێیت مەنجەڵمان سەراپا سپین، چونکە وشەی (الغر) بە مانای پەڵەیەك لە سپێتی دێت و وشەی سپی لە پەڵەی سپێتی ڕەوانترە بۆ موبالەغە باشتر دەستدەدات. هەروەها دەڵێیت (يلمعن) واتە دەدرەوشێتەوە، چاکتر ئەوەبوو کە بتوتایە (يشرقنا) واتا وەکوو هەتاو شەوق دەدەنەوە. ئەی حەسسان لە پێهەڵدانی شمشێرەکانتان دەربڕینی (اسياف) ئەوە دەگەیەنێ، کە ژمارەی شمشێرەکانتان کەمە، چونکە داڕشتنی (افعال)بۆ کۆکردنەوەی کەم بەکاردێت، کە لە ژمارەی (نۆ)تێناپەڕێ، حەق بوو بڵێیت (سيوفنا)کە بۆ کۆکردنەوەی زۆری لە کۆتایی نەهاتوو سازدەکرێ، یاخود وشەی (يقطرنا)کە بە واتەی دڵۆپەدڵۆپە هاتووە لە جێگەی خۆیدا نییە، دەبوو بتوتبایە (يجرينا)، کە ئەوە دەگەیەنێ شمشێرەکانتان خوێنی دوژمنیان وەکوو لافاو لەبەردەڕوات.

## • تایبەتییەکانی ڕەخنەسازی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا

ئەگەر بەوردی لە هەموو تێبینییە ڕەخنەسازییە عەرەبییەکانی سەردەمی جاهیلی بکۆڵینەوە و بە نیازی ئەوەی تایبەتییەکانی ئەم تێبینییانە دەستنیشانبکەین، دەتوانین بڵێین: ڕەخنەسازی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا، ڕەخنەسازییەکی ساکار و کەسی بووە و بەهیچ ڕەنگێ لەبەر تیشکی ڕێبازێکی ئایدۆلۆژی یاخود بنواشەیێکی هونەری ئەنجامنەدراوە، بەڵکوو ئاکامێکی سەرپێیی بووە، خاوەنەکانیان بە پێی بۆچوونی تایبەتی خۆیان و لەبەر هەڵچوونێکی ئەزی ئاراستەیان کردووە.

ئەم تایبەتیانەی ڕەخنەسازی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلیدا ڕاستییەکی مێژووییمان بۆ ڕەچاودەکەن، کە دەڵێ: مێژووی ڕەخنەسازی عەرەبی بەر لە پەیدابوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام هیچ بناغەیێکی فەلسەفی و هونەری نەبووە.

سەرئەنجام مێژوونووسەکانی ئەم ڕەخنەسازییە لەو باوەڕەدان، کە ڕەخنەسازی ڕاستینەی عەرەب لە کۆڕی ڕاڤەکردن و باسکردنی ئیعجازی قورئاندا لەدایکبووە و هەنگاو بەهەنگاو

لەتەك پەیدابوونی زانستەکانی زمانی عەرەبی کە پەیوەندییەکی پتەویان بە لێکدانەوەی وشە و واتا و وێنەی هونەری قورئانەوە هەیە بەرەو پێشەوە ڕۆیشتووە و سامانی نەتەوەیی عەرەب لەم بابەتە گرنگەدا پێکیهێناوە.

## * ڕەخنەسازی عەرەبی لە بەرەبەیانی سەردەمی ئیسلامدا

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی عەرەبی، کاتێ بەرەبەیانی سەردەمی ئیسلامی، کە نزیکەی چل ساڵ دەبێت فەرامۆشدەکەن و بە هیچ ڕەنگێ هەوڵی ئەوە نادەن، کە لەبەر تیشکی قورئانی پیرۆزدا، فەرموودەکانی پێغەمبەر و وتەی جێنشینەکان و دەمڕاستەکانی ئەم سەردەمە، سروشتی ڕەخنەسازی عەرەبی یەکالآیکەنەوە، بۆ ئەوەی بزانن ئەم سروشتە چۆن بووە و کارتێکردنی گۆڕانی کۆمەڵی عەرەبی بە هۆی پەیدابوونی ئایینی ئیسلامەوە لە ڕەخنەسازی عەرەبیدا چلۆن بووە؟

بەڕاستی ئەم فەرامۆشکردنە جێگای سەرسوڕمانمانە، چونکە ئێمە لەو باوەڕەداین، کە ڕەخنەسازی ڕاستینەی نەتەوەی عەرەب لە چوارچێوەی قورئانی پیرۆزدا لەدایکبووە و کەسایەتییەکی سەربەخۆی بۆ خۆی پەیداکردووە و بەهۆی چەند تایبەتییەکی هونەری و ئایدۆلۆجییەوە دەستنیشانکراوی گرتۆتەبەر، کە بەڕاستی ڕێگاییێکی جیاوازە لە چاو ڕەخنەسازی یۆنانی و ڕۆمانی.

ئەم ڕەخنەسازییە هەرچەندە بە کتێب و وتار تۆمارنەکراوە، بەڵام لە هەمان کاتدا بوونێکی کارای هەبووە لە پەرەپێدانی وێژەی عەرەبی ئەو سەردەمەدا و لە چەند چەشنێکی جۆربەجۆردا خۆی نواندووە.

## * چەمکی هۆنراوە لە قورئانی پیرۆزدا

ئەگەر بە وردی بە دوای شیعر و شاعیر واتە هۆنراوە لە قورئانی پیرۆزدا بگەڕێین، بۆ ئەوەی بزانین چەمکی هۆنراوە چییە و ئایینی ئیسلام چۆن تەماشای دەستیاردەکات، چەند ئایەتێکی پیرۆز بەدەستدەهێنین، کە لە سروشتی شیعر و پایەی شاعیران لە کۆمەڵدا دەدوێن.

لەم ئایەتانە ئایەتی ژمارە شەست و نۆیە لە سورەتی یاسین، کە باسی پەیوەندی پێغەمبەر بە شیعرەوە دەکات و دەڵێت: (وما علمناه الشعر وما ينبغي له) واتە: ئێمە پێغەمبەرمان فێری هۆنینەوەی شیعر نەکردووە و بۆی نالوێ، کە ببێ بە شاعیر.

ئەوەی بە لای ئێمەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا مەبەست بێت، ڕستەی (وما علمناه الشعر) یە، چونکە ئەم ڕستەیە چەمکی هۆنراوە لە تێڕوانینی قورئانەوە بە وردی دەچەسپێنێ. ئەم چەمکەش بێگومان بیردۆزمێکی تایبەتییە لە مەسەلەی سەرچاوەی ئەم هونەرەدا.

جا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بیردۆزمیە دەبێت باش لە وشەی (علم) وردبینەوە، کە قورئانی پیرۆز لە وەدەستهێنانی شیعردا بەکاریهێناوە.

ئەم وشەیە بە هەموو واتاکانییەوە ئامرازی (ما) کە ئامرازێکی نەفییە ئەوە دەگەیەنێ، کە هۆنراوە لە تێڕوانینی قورئانی پیرۆزدا زانست و زانیارییەکە و خوای گەورە بە هیچ جۆرێك پێغەمبەری فێری شیعر نەکردووە.

ئەم تێڕوانینە هەڵبەت ئەوە دەسەلمێنێ، کە هۆنراوە لە ئایینی ئیسلامیدا نەخورپەیە و نە بەهرە و شاعیرانیش لە ئاسمانەوە هونەرەکەیان وەدەستناهێنن.

ئا لەبەر تیشکی ئەم چەمکەدا بۆمان ساغدەبێتەوە، کە چەمکی شیعر لە ڕەخنەسازی یۆنانی و ڕۆمانیدا لە چاو چەمکی شیعر لە ڕەخنەسازی عەرەبی و ئیسلامیدا ئاسمان و ڕێسمانە و لە نێوانی هەردووکیاندا سێ جیاوازی سەرەکی بە ئاشکرا خۆیان دەنوێنن:

**یەکەم:** شیعر لە ڕەخنەسازی یۆنانی و ڕۆمانیدا کە بە هۆی دەمەتەقێکانی ئەفلاتون و کتێبی (بیوتیکای) ئەرستۆ و کتێبی هونەری هۆنراوەی (هۆراس)ەوە چەمکەکەی چەسپاوە و سەرئەنجامی هێزێکی میتافیزیکییە و شاعیران بە ڕێگای خورپە و بەهرەوە وەریدەگرن، بەڵام ئەم شیعرە لە ڕەخنەسازی عەرەبی ئیسلامیدا، کە چەمکەکەی لە قورئانی پیرۆزدا سازکراوە، زانست و زانیارییە و هیچ پەیوەندییەکی بە ئاسمان خوای گەورەوە نییە، بەڵکوو چالاکییەکی ئادەمیزادانەیە و وەکوو هەموو دەستکەوتێکی سەر ئەم زەمینە بۆ مرۆڤ هەیە فێرببێت.

**دووەم:** شیعر کە لە ڕەخنەسازی یۆنانی و ڕۆمانیدا ئاکامی خورپە و بەهرەیە یاخود سەرئەنجامی دەروونی ئادەمیزادە، مرۆڤ بە هۆی فێربوونەوە بە چنگی ناهێنێ، کەچی ڕێگای فێربوونی شیعر لە ڕەخنەسازی عەرەبی ئیسلامیدا زانستەکانی زمان و ڕەوانبێژییە و هەموو مرۆڤێك ئەگەر هاتوو توانای فێربوونی ئەم زانستانەی هەبوو، ئەوا بە ئاسانی دەتوانێ ببێ بە شاعیرێکی هەڵکەوتوو.

**سێیەم:** بابەتەکانی شیعر لە ڕەخنەسازی یۆنانی و ڕۆمانیدا یان لە ئاسمانەوە هەڵدەقوڵێ هەروەکوو ئەفلاتوون دەڵێ یاخود پەیوەندییان بە دەروونی شاعیرەوە هەیە، هەروەکوو ئەرستۆ دووپاتیکردۆتەوە، بەڵام بابەتەکانی شیعر لە ڕەخنەسازی عەرەبی ئیسلامیدا لە ناو جەرگەی کۆمەڵەوە لێشاودەهێنن و شاعیران چەند پەیوەندییان بە کۆمەڵەکەیانەوە بەهێزبێت، ئەو بابەتانە

لـە بۆتـەی تایبەتـی تاقیکردنەوەی خۆیاندا سـازدەکەن و دووبارە بە هـۆی هونەرەکەیانەوە بە کۆمەڵەکەیانەوە پێشکەشی دەکەن.

هێڵـی سـەرەکی ئـەم جیاوازییە لەوە خـۆی دەنوێنێ، کە ئایینی پیرۆزی ئیسـلام وەکوو چالاکییەکی رۆژانەی ئادەمیزاد تەماشای هونەری هۆنراوەی کردووە.

چالاکی رۆژانەی ئادەمیزادیش لە فەلسەفەی بێگەردی ئایینی ئیسلامدا، سەرچاوەکەی واقیع و بوونی کۆمەڵە. بە مانای ئەوەی ئادەمیزاد لە کۆمەڵەکەیدا دەژی و بە گوێرەی بڕوا و تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەڵوێستێکی دەبێت و رەفتاری کەسایەتی خۆی نەخشەدەکێشێ. سـەرئەنجام ئەم ئادەمیزادە بەرانبەر بە هەڵوێست و رەفتارەکەی لێپرسـراو دەبێت و بە تەرازووی کێشـی کردەوەکانییـەوە نرخیپێدەدرێ. واتە : ئەگەر هاتـوو کردەوەکانی چاك و خێرخواز بوون، ئەوا بە چاوی رێزەوە تەماشـادەکرێت و هەرچی لێدەوەشـێتەوە بە سـوودمەند لە قەڵەمدەدرێت، بـەڵام ئەگـەر هاتـوو کردەوەکانی خراپ و زیانبەخش بوون ئیتر بەرادەی خراپە و زیانەکانی پشتی تێدەکرێت و کۆمەڵەکەی هیچ پلەیێکی ناداتێ. ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنانەی مرۆڤ لە فەلسـەفەی ئایینی ئیسـلامدا بە رِوونی لە دابەشـکردنی شـاعیران بەسـەر دوو دەسـتەدا دەردەکەوێ:

لـە سـوورەتی (الشـعراء) قورئانـی پیرۆز بە چوار ئایـەت لە کردەوەی شـاعیران دواوە و لەبەر تیشـکی هەڵوێسـتی رۆژانەیاندا دابەشیکردووە و وتویەتی: (والشعراء يتبعهم الغاوون، الم تر انهم في كل واد يهيمون، وانهم يقولون ما لا يفعلون، الا الذين امنوا وعملوا الصالحات وذكروا الله كثيرا وانتصروا من بعد ما ظلموا وسيعلم الذين ظلموا اى منقلب ينقلبون)[1] واتە: شاعیران دوو دەستەن، دەستەیەکیان ئەو هەستیارە پیاو خراپانەن، کە رابەرایەتی پیاوخراپان دەکەن و بەرهەمەکانیان هەڵپەرستی و دووڕوویی دەنوێنن، دەستەکەی تریان بە پێچەوانەی دەسـتەی یەکەمەوەن، خاوەن بڕوا و تێکۆشەر و پیاوچاکن.

## • پێوانەی قورئانی پیرۆز لە دابەشکردنی شاعیراندا

ئەگەر بە وردی لەو چوار ئایەتە کە باسی شاعیرانی کردووە وردبینەوە، بۆمان ساغدەبێتەوە، کە قورئانی پیرۆز چەند پێوانەیێکی ناوەڕۆکی و رِوخساری و سەرچاوەیی چەسپاندووە و لە بەر تیشکیاندا شاعیرەکانی دابەشکردووە. قورئانی پیرۆز بۆ دەستنیشانکردنی شاعیرە خراپەکان سێ پێوانەی جۆربەجۆری چەسپاندووە:

---

١ سورة الشعراء، الاية ٢٢٧

**پێوانـەی یەکـەم:** لە جەماوەری شـاعیرە خراپەکانەوە هەڵهێنجـراوە، کە قورئانی پیرۆز بە نازناوی (الغاوون) وەسفیانەکات، واتە ئەوانەی پیشەیان ڕابواردن و لە خشتەبردنی خەڵکییە.

**پێوانـەی دووەم:** پەیوەنـدی بە هەڵوێسـتی شـاعیرە خراپەکانەوە هەیە، کە هەڵوێسـتێکی هەڵپەرست و بێبڕوا و هەمیشە گۆڕاو و لەگەڵ دەرفەت ئاوازژەنە.

**پێوانـەی سـێیەم:** لـە ڕادەی گونجاوی ڕەفتاری شـاعیرەکان لە تـەك بەرهەمەکانیاندا وەرگیراوە. ئەو ڕادەیە لە سـەر هیچ بارێك لەنگەری خۆی ڕانەگرتووە، چونکە ئەوەی ئەو شـاعیرە خراپانـە لەبەرهەمەکانیانـدا دەیڵێن و بە وشـەی ڕازاوە ڕێکیدەخـەن دژواری کردەوەی ڕۆژانەیانە و لەچاو ڕەفتارەکانیاندا، ئاسـمان و ڕێسـمانە. کەوابوو شـاعیرە خراپەکان لە بەر تیشـکی ئەم سـێ پێوانەیەدا هەڵگری دروشمی چینێکی خراپن و کۆمەڵێکی هەڵپەرستن و لەبەرهەمەکانیاندا درۆدەکەن و تاقیکردنەوەیێکی ڕاستینەیان لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا نییە، یاخود بە زاراوەی ئەم سەردەمەمان، ئەو شاعیرانە پەیامدارنین. واتە مولتەزیم نین و بە هۆی هونەرەکەیانـەوە نـەك خزمەتـی کۆمەڵەکەیـان ناکەن و بـەس، بەڵکوو خراپەدەکەن و ڕەوشـتی بەدخوانە بڵاودەکەنەوە و ڕابەری پیاوخراپان دەکەن و دژ بە خێرەوەمەندان و چاکەکەران دەجەنگن.

## • پێوانەکانی جیاکردنەوەی شاعیرە پەیامدارەکان

ئایەتە پیرۆزەکانی سـوڕەتی (الشـعراء) هەروەکوو دیتمان بڕیاری خراپە بەسـەر هەموو شاعیراندا نادات، بەڵکوو شاعیرانی چاك و پەیامدار واتە: مولتەزیم. لە شاعیرانی خراپ و بێ پەیام لەبەر تیشکی چوار پێوانەی ئایدۆلۆجی و ڕەفتاری و تێکۆشانی و ڕۆشنبیرییەکەدا، جیادەکاتەوە.

**پێوانەی یەکەم:** مەسەلەی بڕوایە کە بە ڕستەی (امنوا) چەسپێنراوە. بە گوێرەی پێوانەی بڕوای شاعیرە پەیامدارەکان لە قورئانی پیرۆزدا ستایشکراون. ئەوەی لەم مەسـەلەیەدا جێگای سەرنجڕاکێشانە، ڕستەی (امنوا) ڕستەیێکی فراوانە، بە هیچ تەواوکەرێك سنووری نەکێشراوە و شاعیرە خاوەن بڕواکان بەو شتەی بڕوایان پێهێناوە دەستنیشاننەکراون.

سەرئەنجام ڕەخنەسازی هاوچەرخ دەتوانێ بڵێ: مەسـەلەی "بڕوا" لەم پێوانەیەدا وا فراوانە بۆ هەموو شوێن و کاتێك دەستدەدات و دەتوانرێ بوترێ بڕوای شـاعیرانی پەیامدار جۆربەجۆرە، بڕوا بە ئایین و نەتەوە و میللەت و مرۆڤ و هەموو بابەتە خێرمەندەکان دەگرێتەوە.

پێوانەی بڕوا لە بابەتی ڕەخنەسازیدا هەڵبەت پەیوەندی هەیە بە مەسەلەی ئەو فۆڕمە

هونەرییەوە. کە ناوەڕۆکە بڕواییەکەی دەگەیەنێتە خوێندەواران. ئەم پەیوەندییەش هەروەکوو ساغبۆتەوە لەوەدا دەردەکەوێ، کە شاعیری خاوەن بڕوا بە بابەتەکەی بە شێوازێکی ڕەوان و بە پێز و هونەری بڕواکانی دەردەبڕێت و بەبێ سەنعەتکاری دەستکرد لە دڵ و هەست و نەستییەوە، سۆزەکانی بە ئەندێشەیێکی بەرز و دارشتنێکی ڕەوانبێژییەوە دەردەبڕێ، کەوابوو پێوانەی بڕوا لە جیاکردنەوەی شاعیرە پەیامدارەکاندا، پێوانەیێکی ناوەڕۆکی و ڕوخساری گرنگە. کە قورئانی پیرۆز لە جیهانی ڕەخنەسازیدا بەر لە هەزار و چوارسەد ساڵ بە شتێکی وا چەسپاندوویەتی، کە بە هۆیەوە دەتوانین بڵێین، ئەم پێوانەیە بەردی بناغەی ڕێبازی پەیامداری هاوچەرخە لە ڕەخنەسازی جیهاندا.

**پێوانەی دووەم:** کردەوەی چاکەیە کە شاعیرە پەیامدارەکان لە شاعیرە خراپەکان جیادەکاتەوە. ئەم پەیامە بە لای ئێمەوە بانگەوازێکی کۆمەڵایەتییە بۆ هاندانی شاعیران بۆ خزمەتکردنی میللەت و تێکۆشانی سەخت لە پێناوی جێبەجێکردنی گشت ئامانجەکانی، هەروەها دروشمێکی ئایدۆلۆجییە، داوا لە هەستیاران دەکات، کە گۆشەگیرنەبن و هەروەکوو ئێستا دەڵێن: لە کۆشکی خەیاڵدا نەژین، بەڵکوو دەبێت لە بۆتەی کار و تێکۆشاندا قاڵببن و هەنگاوبەهەنگاو دەگەڵ جەماوەراندا تێبکۆشن.

سەرئەنجام ئەم پێوانەیە ئەوە دەگەیەنێ، کە کارکردنی شاعیران مەرجێکی سەرەکییە بۆ ئەنجامدانی هۆنراوەی نرخێندراو لە جیهانی ڕەخنەسازیدا.

**پێوانەی سێیەم:** یادکردنەوە و باسکردنی خوایە، ئەم پێوانەیە دووبارە هەستیاران بەرامبەر بە بابەتی سوودبەخش لێپرسراودەکات و داوای ئەومیان لێدەکات. کە دەبێت هەمیشە لە یادکردنەوەی خوای مەزن بن و ملکەچی ڕەوشتی چاك و کردەوەی چاك و جێبەجێکردنی فەرموودەکانی بن، لە پێناوی خزمەتکردنی مرۆڤدا.

**پێوانەی چوارەم:** پێوانەی تاقیکردنەوەیە، کە بە دەربڕینی (وانتصروا من بعد ما ظلموا) سنووری ڕاکێشراوە. ئەم پێوانەیە بە لای ئێمەوە ئەوە دەگەیەنێ، کە شاعیری پەیامدار خاوەنی تاقیکردنەوەیێکی واقیعی بێت و لە تێکۆشاندا تەجروبەیێکی ستەمکاری چەشتبێت و ماوەیەك ژێردەست بوویێت و دوای ئەم ماوەیە بە چەکی تێکۆشان و فیداکاری سەرکەوتبێت.

تا بەم چوار پێوانەیە، شاعیر لە ئایینی ئیسلامدا دەبێت بە شاعیری ڕاستەقینە، کە شایەنی ڕێزلێگرتن و ستایشە. ئیتر بابەتی هەڵبەستەکانی ئەم شاعیرە هەرچی بێت، لە نرخی کەمناکاتەوە، ئەگەر بێت و بابەتەکەی لە بڕواکەیەوە هەڵقوڵابوویێت و خاوەنەکەی تێکۆشەر و خوانـاس و تەجروبەدار بوویێت. ئەم مەرجانەش هەڵبەت هەرچەندە لە قورئانی پیرۆزدا بە

کورتی هاتوون، بەڵام بە لای ئێمەوە دەستوور و بنواشەی پتەون. مێژوونووسی ڕەخنەسازی ڕاستینە دەتوانێ شیانبکاتەوە و لەبەر تیشکی فەلسەفەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا لەگەڵ ڕێچکەی ڕەخنەسازی یۆنانی و ڕۆمانی و ئەورووپی هاوچەرخدا بەراوردیانبکات و بگاتە ئاکامێکی زانستی، کە دەڵێ: دروشمی شیعر بۆ میللەت، شاعیر بۆ هەڵگرتنی ئاڵای خەبات و پەیامداری لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا، بۆ تێکۆشان دژ بە ستەمکاران. ئا ئەم دروشمە لە قورئانی پیرۆزەوە دەستپێدەکات، نەك لە شوێنێکی دیکەوە.

## • پێغەمبەر (د.خ.) و هۆنەری هۆنراوە:

جێگای مشتومڕ نییە ئەگەر بڵێین پێغەمبەر (د.خ.) قوتابی قوتابخانەی قورئانی پیرۆزە و هەڵگری هەموو دروشمەکانییەتی و تەنیا بە هۆی ئەوەوە هەموو شتێك لەم کتێبە پیرۆزەدا ڕوونکراوەتەوە. سەرئەنجامی ئەم ڕاستییە ئەوەیە پێغەمبەر (د.خ.) بێگومان دەربارەی هونەری هۆنراوە و شاعیران هەمان هەڵوێستی قورئانی پیرۆزی هەبووە. ئەمە ڕاستییەکی مێژووییە، کەچی هەندێك لە مێژوونووسەکانی جیهانی ئەم ڕاستییە فەرامۆشدەکەن و دەڵێن: پێغەمبەر (د.خ.) دژ بە هەموو هەستیاران ڕەفتاریکردووە و هونەری هۆنراوەی بە چاوێکی بێنرخپێدان تەماشاکردووە. هەموو بەڵگەشیان بۆ چەسپاندنی ئەم بیروڕایە ئەوەیە، کە گوایە پێغەمبەر (د.خ.) لە باسی شیعردا فەرمویەتی: (لئن یمتلئ جوف احدکم قیحا حتی یریه خیرا له من ان یمتلئ شعرا)[1] واتە: ئەگەر بێت و دڵ و دەروونی یەکێك لە ئێوە پڕبێت لە زوخاو و دابڕزێ بۆی، لەوە باشترە پڕبێت لە شیعر.

ئەم بەڵگەیە بە هیچ جۆرێك بەر لێشاوی فەرموودەکانی دیکەی پێغەمبەر(د.خ.) ناکەوێ، لە ستایشی شاعیران و هونەری هۆنراوە خۆی ڕاناگرێ. هەروەها لەتەك هەڵوێستەکەی قورئانی پیرۆزدا ناگونجێت، سەرەڕای ئەمەش بە دەیان بەڵگەی مێژووییمان هەیە سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەر (د.خ.) شاعیری تایبەتی خۆی هەبووە و خەڵاتی هەستیارانی کردووە و لە مزگەوتە پیرۆزەکەیدا کۆڕی شیعر بۆ بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلام و ڕیسواکردنی کافرەکان گێراوە.

سەرەنجام ئێمە لەو باوەڕەداین، کە پێغەمبەر (د.خ.) لەبەر تیشکی پێوانەکانی قورئانی پیرۆزدا تەماشای هۆنراوەی کردووە و ڕێبازی ڕەخنەسازی لەم ئارایەدا گرتۆتەبەر. جا بناغەکانی ئەم ڕێبازە چین و باری شاعیران بە هۆیەوە چلۆن بووە؟ لەمەولا لێیدەدوێین.

---

[1] المسند ج٨، ص١٨

## • پێوانەی پێغەمبەر (د.خ.) لە هەڵسەنگاندنی هونەری هۆنراوەدا

ئەگەر بە وردی لەو فەرمووداندەی پێغەمبەر (د.خ.) بکۆڵینەوە، کە باس لە سروشتی شیعر دەکەن، بۆمان ساغدەبێتەوە کە پێغەمبەر (د.خ.) لەبەر تیشکی پێوانەیێکی بیری و ئایدۆلۆجی هونەری هۆنراوەی هەڵسەنگاندووە. ئەم پێوانەیە هێڵە گشتییەکانی لەودا دەردەکەون، کە پێغەمبەر (د.خ.) هونەری هۆنراوەی بە چەشنێك لە چەشنەکانی ئاخاوتنی مرۆڤ لەقەڵەمداوە. ئاخاوتنیش دەشێت خێرەمەند و چاك بێت و دەشێت شەڕمەند و خراپ بێت، بۆیە پێغەمبەر (د.خ.) لەم ڕووەوە فەرموویەتی: (انما الشعر کلام، فمن الکلام خبیث و طیب)[1] واتە، هونەری هۆنراوە ئاخاوتنێکە هەندێك لە ئاخاوتنیش خراپە و هەندێکیش چاکە. پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە: بە چ پێوانەیەك ئاخاوتنی خراپ لە ئاخاوتنی چاك جیادەکرێتەوە. فەرموودەیێکی بەنرخ لەسەر فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.) وەڵامی ئەم پرسیارەمان بۆ دەداتەوە و دەڵێ: (انما الشعر کلام مؤلف فما وافق الحق منه فهو حسن، وما لم یوافق الحق منه فلا خیر فیه)[2] واتە: شیعر ئاخاوتنێکی هەڵبەستراوە، ئەوەی لەم ئاخاوتنە حەقپەرست بێت، چاك و بەهادارە، بەڵام ئەوەی لە ڕێگای حەق لایدابێت خراپە و لە سوود بێبەرییە.

کەوابوو شیعر بۆ ئەوەی نرخی هەبێت، دەبێت بەرگری لە حەق بکات. حەقیش وەکوو زاراوەیێکی ئایینی و بیری و ئایدۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و .. هەموو لایەنە باشەکانی ژیان دەگرێتەوە. واتە پشتگیری لە لێقەوماوان و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خواپەرستی و دادوەری و ڕاپەڕین لەڕووی پێشێلکەرانی مافی مرۆڤ لە گوزەرانێکی خۆش و ژیانێکی بەختیار و هەموو بنەڕەتییەکی میللی و نیشتمانی و مرۆڤایەتی.

سەرئەنجام پێوانەی پێغەمبەر (د.خ.) لە هەڵسەنگاندنی هونەری هۆنراوەدا پێوانەیێکی پەیامدارییە، ئەم پێوانەیەش هەروەکوو ئاشکرایە لەسەر بناغەی ئایەتە پیرۆزەکانی سورەتی (الشعراء) لە ستایشی شاعیرە موڵتەزیمەکاندا دامەزراوە، بەڵام ئایا ئەم پێوانەیە مەسەلەی ڕوخسار (فۆڕم)ی هونەری لە هۆنراوەدا فەرامۆشدەکات؟ یاخود گرنگی بە ڕوخساریش دەدات، هونەری هۆنراوە هەرچەند چەشنێکە لە چەشنەکانی ئاخاوتن، بەڵام لە هەمان کاتدا لایەنێکی هونەری هەیە.

---
۱ المسند ج۱، ص۱۴
۲ المسند ج۱، ص۱۴

## • مەسەلەی فۆرم لە هونەری هۆنراوەدا و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.)

گومان لەوەدانییە کە مەسەلەی فۆرم و ناوەڕۆك لە سەردەمی زێرینی ئیسلامدا بەوردی باس نەکراوە و هیچ زاراوەیێکی ڕەخنەسازی لەم ڕووەوە وەکوو زاراوەی (المضمون والشکل) ناوەڕۆك و ڕوخسار بەرچاوناکەوێ. ئەمە ڕاستییەکە هیچ کەس ناتوانێ دانیپێدانەنێ، بەڵام لە هەمان کاتدا چەند فەرموودەیێکی پێغەمبەرمان (د.خ.) بە دەستگەیشتووە، کە بە جۆرێکی گشتی لەم مەسەلەیەدا خۆیان ئاشکرادەکەن و زۆر یان کەم لێیدەدوێن. وەکوو ئەم فەرموودەیە، کە دەڵێ: (ان من البیان لسحرا وان من الشعر لحکمة)[1] واتە: هەندێ ڕوونبێژی هەیە کە وەکوو جادوگەری وایە و هەندێ شیعریش هەیە، کە پڕ لە ئامۆژگاری و هۆشمەندییە.

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (د.خ.) بە لای ئێمەوە، لە بەشی یەکەمیدا پەنجە بۆ کارلێکردنی ڕوونبێژی درێژدەکات، کە بەزاراوەی ئێستامان ڕوخسار (فۆرم)ی دەقی هۆنراوەیی دەگرێتەوە. بە مانای ئەوەی ئەگەر هاتوو ڕوخسار و فۆرمی دەقێکی هۆنراوەی ڕوونبێژ بوو، واتە: وشەکانی ڕەوانبوون و ڕستەکانی بە چەشنێکی مەحکەم ڕێکخرابوون و بە وێنەی هونەری سازکرابوون، ئەوا وەکوو جادوگەرێ کار لە گوێگر و خوێنەوار دەکات و جڵەوی هەست و نەستی دەگرێتە دەست.

لە بەشی دووەمی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (د.خ.) مەسەلەی ناوەڕۆك خۆی دەنوێنێ، کە باسی هەندێ حیکمەت و ئامۆژگاری و هۆشمەندی لە هەندێ شیعردا دەکات.

ئەم باسکردنەش هەڵبەت لە جیهانی ڕەخنەسازی هاوچەرخماندا بە زاراوەی ناوەڕۆك لەقەڵەمدەدرێ، کە مانا و بیرۆکە و سۆز و ئەندێشە دەگرێتەخۆی. هەرچۆنێك بێت ئێمە نامانەوێ، لەم شیکردنەوەیەی فەرموودەکەی پێغەمبەر (د.خ.) بە زۆرەملێ چۆنییەتی بیرکردنەوەی ڕابردوو ڕابکێشین بۆ چەمکەکانی هاوچەرخمان، بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانین ئەم فەرموودە بەنرخە فەرامۆشبکەین، یاخود ڕوکەشانە بە سەریدا تێپەڕین و شوێنی ڕاستەقینەی خۆی لە ڕەخنەسازیدا دەستنیشاننەکەین، چونکە ڕێبازی مێژووی زانستی بە هیچ جۆرێ لێماننابوورێ ئەگەر بێت و ئەو هەڵەیە بکەین.

---

[1] المسند ج١، ص ١٤

سەرئەنجام ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (د.خ.) بنواشەیێکی گشتییە و ڕووناکی دەخاتە سەر مەسەلەی ڕوخسار و ناوەڕۆک لە ڕەخنەسازی سەردەمی زێرینی ئیسلامدا.

## ❁ نەمریی هونەری هۆنراوە لە ژیانی نەتەوەی عەرەبدا

لە ڕەخنەسازی جیهانی هاوچەرخماندا، بابەتێکی هونەری و بیری دەربارەی کاتی شیعر و نەمری، هەمیشە جێگای مشتومڕ و لێکدانەوەی ڕەخنەسازانە. ئەم بابەتە زۆر جار لە وێنەی پرسیارێکدا لایەنەکانی شیدەکرێنەوە، کە دەپرسێ: ئایا شیعر سەرئەنجامێکی کاتییە، کە لە سەردەمی منداڵی نەتەوایەتی وەکوو پێویستییەکی سۆزی ڕەواجی دەبێت و بازاڕی گەرمدەبێت. ئەوجا لەتەك هەنگاوەکانی پێگەیشتنی نەتەوە و پەرەسەندنی وردەوردە کزدەبێت و ڕەواجەکەی لاوازدەبێت و هەتاکو ئیتر بازاڕی نامێنێ؟ یاخود بە پێچەوانەی ئەم بارە شیعر ناکامێکی بیری و سۆزی و هۆشمەندییە، هەمیشە لەگەڵ نەتەوە دایە، چ لە قۆناغی تازەی سەرهەڵدانیدا و چ لە قۆناغی پێگەیشتن و چوونەناوەوەی شارستانێتی؟ پێغەمبەر (د.خ.) بەر لە نزیکەی هەزار و چوارسەد ساڵ لەم بابەتە دواوە و بیروڕای خۆی لە ئاستیدا چەسپاندووە، بەم فەرموودەیەی کە دەڵێ: (لاتدع العرب الشعر حتى تدع الابل الحنين) واتە: نەتەوەی عەرەب هەرگیزاوهەرگیز دەست لە هۆنینەوەی شیعر هەڵناگرێ هەتاکو حوشتر لە سۆزنواندن دەکەوێ. بێگومان حوشتریش لەم خوو و ڕەوشتە ناکەوێ. کەوابوو شیعر لای نەتەوەی عەرەب نەمرە و لە سەردەمێکی تایبەتیدا ناگەشێتەوە بۆ ئەوەی لە سەردەمێکی دیدا کزیێت و دابمرکێتەوە، بەڵکوو ئاوێنەی ژیانی نەتەوەی عەرەبە و لە قۆناغی ژیانی خێڵایەتی و لە قۆناغی ژیانی شارستانێتیدا.

## ❁ ئەرکی هۆنراوە لە تێڕوانینی پێغەمبەر (د.خ.)

فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.) کە بەو جۆرە لە شیعر دواون و نرخیانپێداوە و وەکوو بەرهەمێکی ژیانی هەمیشەیی لەقەڵەمیانداوە، دەبێت بزانین ئەم هەڵوێستە گرنگە لە چییەوە هاتووە و لەسەر چ بناغەیەك دامەزراوە؟

فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.) دیسانەوە دێتەوە بیر ئەم پرسیارە و بە ڕوونی وەڵامیدەدەنەوە، لەم فەرمودانە ئەمەیە کە دەڵێ: (الشعر كلام من كلام العرب جزل، تتكلم به في بواديها وتسل

بە الضغائن من بینها)[1]. ئەم فەرمووده بەنرخە هەروەکوو ئاشکرایە، لە باسی ئەرکی هۆنراوە لە ژیانی نەتەوەی عەرەبدا دەکۆڵێتەوە و دوپاتیدەکاتەوە، کە نەتەوەی عەرەب لە هەموو قوژبنێکی وڵاتەکەیاندا بە شیعر دەدوێن. ئەم هونەرە بۆ لە ناوبردنی ڕقی کەسی و دووبەرەکی خێڵایەتی بەکاردەهێنرێت، واتە: شیعر ئەرکێکی کۆمەڵایەتی هەیە، بۆیە وەکوو هۆیەك تەماشادەکرێ بۆ چاندنی چاکە و بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی و نەهێشتنی ناکۆکی نێوان ئەندامانی نەتەوەی عەرەب.

سەرئەنجام بە زاراوەی ئەم سەردەمەمان شیعر لە تێڕوانینی پێغەمبەر (د.خ.) پەیامی هەیە و شاعیر مرۆڤێکی پەیامدارە. ئەم سەرئەنجامە هەڵبەت کلیلی تێگەیشتنی ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ.) لە ڕەخنەسازیدا. دەدا بە دەستمانەوە و بناغەکانی ئەم ڕێبازەمان بۆ ڕووندەکاتەوە.

## ● بناغەکانی ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ.) لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا

بانگەوازی پێغەمبەر (د.خ.) بۆ پەیامداری لە هونەری هۆنراودا، ڕێبازەکەی ڕووندەکاتەوە و بناغەکانی دەچەسپێنێ کە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** نابێت شیعر وەکوو چالاکییەکی ئادەمیزادانە بە گشتی بدرێتە بەر نەشتەری فەرامۆشکردن و دانپێدانەنان، بەڵکوو دەبێت بە پێوانەی چاکە و خراپە هەڵبسەنگێنرێ. واتە: ئەو بەرهەمە هۆنراوەیەی کە چاك و سوودمەندە بە چاوی ڕێزلێگرتن تەماشابکرێت و ئەوەی لە سوود و چاکە بێبەرییە نرخی پێنەدرێت و پشتی تێبکرێت.

**دووەم:** شیعر وەکوو هونەرێك، ناوەڕۆك و واتا و بیر نییە و بەس، بەڵکوو لەگەڵ ئەمەشدا فۆڕم و ڕوخسار و ڕوونبێژییەکی کارا و ڕابەریکەرە.

**سێیەم:** شاعیران پەیامدارن و لە هۆنینەوەی شیعردا ئەرکێکی گرانیان بەسەر شانەوەیە.

ئەم ڕێبازەی پێغەمبەر (د.خ.) لە ڕەخنەسازیدا لە سەرچاوەی قورئانی پیرۆزەوە بناغە گشتییەکانی وەرگرتووە و بە گوێرەی پێویست لەبەر تیشکیدا شیعری سەردەمی جاهیلی و سەردەمی سەرەتای پەیدابوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی یەکاڵاکردۆتەوە و هەڵیسەنگاندوون. ئەم ڕێبازە بە داخەوە لە مێژووی ڕەخنەسازی عەرەبیدا بە چەشنێکی فراوان و زانستی باس نەکراوە، بگرە تا ڕاددەیێکی زۆر مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی عەرەبی فەرامۆشیانکردووە.

ئەم کردەوەیە بە لای ئێمەوە جێگای سەرسوڕمانە، چونکە ئەڵقەییێکی گرنگی لە زنجیرەی ڕەخنەسازی عەرەبی پچڕاندووە و دەرفەتی ئەوەی داوە، کە بوترێ: ڕەخنەسازی عەرەبی دێرین،

[1] العمدة ج١، ص١٥

گەلێ تەنگەبەرە و بەزۆری لە چەند مەسەلەیێکی ڕەوانبێژی مەشقی ڕووکەشی پێکهێناوە و نەتەوەی عەرەب بابەتەکانی پەیامداری، واتە: ئیلتیزام و مەسەلەکانی دەقی شیعری و دەستنیشانکردنی سروشتی هونەری هۆنراوە و دەیان بابەتی ئاوا لە ڕەخنەسازی ئەورووپییەوە وەرگرتووە، یاخود بە دەربڕینێکی تر هەندێ میژوونووسی ڕەخنەسازی عەرەبی لەم سەردەمەدا، بیروڕایان وایە کە نەتەوەی عەرەب ڕەخنەسازییەکی ڕاستینەیان وەکوو نەتەوەی یۆنانی نییە، بۆیە لەم سەردەمەدا لاسایی نەتەوە ئەورووپییەکان دەکاتەوە و ڕێبازی جۆربەجۆری لێوەردەگرێ. ئەم بڕیارە بەلای ئێمەوە بوختانێکە و ئەم بوختانەشیان لە نەزانینەوە هەڵبەستووە، یان لەبەر مەبەستێك پڕوپاگەندەی بۆ کراوە.

جا بۆ کردنەوەی ئەم مەسەلەیە و دەرخستنی ڕاستی، ئێمە زیاتر لەسەر ئەم باسە دەڕۆین و شوێنپێی پەرەسەندنی ئەم ڕێبازە لە لای جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ.) هەڵدەگرین، بۆ ئەوەی بزانین جێنشینەکان چلۆن لەسەر ئەو ڕێبازە ڕۆیشتوون و بە چ پێوانەیەك شیعریان هەڵسەنگاندووە و لەتەك شاعیراندا ڕەفتاریان نواندووە.

## • چەند تێبینییەکی ڕەخنەسازی لە لای جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ.)

ئەگەر میژوونووسی ڕەخنەسازی عەرەبی هەوڵی کۆکردنەوەی تێبینییە ڕەخنەسازییەکانی جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ.) بدات. دەتوانێ چەند دەقێکی لابەلا کۆبکاتەوە، ئەم چەند دەقە ئەگەر لەبەر تیشکی هەڵوێستی ئەو جێنشینانە دەرحەق بە شاعیران شیبکاتەوە دەتوانێ بە ئاسانی بگاتە بڕوایەك کە دەڵێ: جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ.) هەرچەند خەریکی چەسپاندنی دەوڵەتی ئیسلام بوون و لەتەك ڕامیاریدا خەریکی کاروبار بوون، بە جۆرێکی فراوان دەستیان لە ڕابەری شاعیران هەڵنەگرتبوو، یاخود بە جارێك پشتیان نەکردبووە هونەری هۆنراوە، بەڵکوو پشتیان بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.)بەستبوو، لەبەر تیشکی بناغەکانی ڕێبازە ڕەخنەسازییەکەیدا بەشداری کۆڕی خوێندنەوەی شیعریان دەکرد و تێبینی ڕەخنەسازییان ئاراستەی شاعیرە جاهیلییەکان و شاعیرە هاوچەرخەکان دەکرد. بۆ نموونە لەم ڕووەوە دەگێڕنەوە، کە جێنشین (ئەبوبەکر- ڕ.خ.) شاعیرە جاهیلییەکانی هەڵسەنگاندووە و بڕیاریداوە کە (نابیغە) لە هەموویان باشتربووە. کە لێیانپرسی بۆچی (نابیغە) لە هەموویان باشتربوو؟ لە وەڵامدا

وتی:[1] چونکە هەڵبەستەکانی نابیغە ناسك و ڕەوانن و کێش و سەروای هۆنراوەکانی سووك و ئاوازدارن و لەڕووی بیرۆکەوە وەکوو دەریا ناوەڕۆکەکانی قووڵن.

لەم بڕیارەی جێنشین (ئەبوبەکر- ڕ.خ.) دەردەکەوێ، کە پێوانەی هونەری لەتەك پێوانەی بیری بە جووتە لە هەڵسەنگاندنی شیعردا بەکاردەهێنرا، بە مانای ئەوەی خاوەنی ئەم بڕیارە ڕەخنەسازییە، کە جێنشینێکی موسوڵمان بوو، بە چاوی بڕوایێکی ئایینی نەیڕوانییە شیعری پێش پەیدابوونی ئیسلام، بەڵکوو لەسەر بناغەییێکی هونەری و بیری، کە فۆڕم و ناوەڕۆك دەگرێتەوە، دانی بە پلەی بەرزی ئەو شاعیرە جاهیلییەدا نا.

## • جێنشین عومەر (ڕ.خ.) و ڕەخنەسازی

ئەم بناغە هونەری و بیرییە زیاتر لە بەر دەستی جێنشین (عومەر)دا ڕەگی لە زەمینەی ڕەخنەسازی عەرەبیدا داکوتاوە و پەرەیسەندووە، بەڵگەشمان بۆ چەسپاندنی ئەم تێبینییە ئەوەیە جێنشین (عومەر) لەبەر ئەوەی ماوەی فەرمانڕەواییەکەی زۆر بوو. پتر دەرفەتی ئەوەی هەبوو خەریکی شیعر و شاعیران بێت و جڵەوی ڕابەریکردنیان بگرێتەدەست.

ئەم ڕاستییە لەوەدا خۆی دەنوێنێ، کە کتێبە مێژوویی و ڕەخنەسازییەکانی نەتەوەی عەرەب پڕن لە تێبینییە ڕەخنەسازییەکانی ئەم جێنشینە. لەو تێبینیانە ئەوەیە، کە دەگێڕنەوە: (جێنشین (عومەر - ڕ.خ.) ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕوودەکاتە شیعرخوانێکی هۆنراوەی جاهیلی و وتی: هۆنراوەی باشترین شاعیرەکانتانم بۆ بگێڕەرەوە.....)

شیعرخوانەکە بە سەرسوڕمانێکەوە پرسی: ئەو شاعیرە دەبێت کێ بێت؟ جێنشین (عومەر) لە وەڵامدا وتی: ئەم شاعیرە کە باشترین شاعیرە (زوهەیری کوڕی سەلما)[2]یە. شیعرخوانەکە پرسی: زوهەیری کوڕی سەلما بەچی بووە بە باشترین شاعیرمان؟! جێنشین (عومەر) وتی: بەوەی کە شێوازەکەی ئالۆزنییە و وشەی گران و نەزانراوی بە کارنەهێناوە، کە ستایشی پیاوێکی گەورەی کردووە ئەو سیفەتە ڕاستیانەی، کە بەڕاستی تێیدابوون خستوونییەتییەڕوو.

لەم دەمەتەقێیە بۆمان ساغدەبێتەوە جێنشین (عومەر) پەنجەی ڕاکێشاوە بۆ چەند لایەنێکی فۆڕمی و ناوەڕۆکی لە شیعری شاعیری بەناوبانگی جاهیلی (زوهەیری کوڕی سەلما)، کە ناوبانگی بەوە دەرکردووە هەمیشە لە هەڵبەستەکانیدا بایەخی بە لایەنی حیکمەت و ئامۆژگاری داوە.

---

١ العمدة ج١، ل٧٨

٢ الشعر والشعراء لابن قتيبة ج١، ل ٧٦

## • جێنشین عومەر و پەیامداری لە شیعر

جێنشـین عومەر جگە لە تێبینییە ڕەخنەسـازییەکانی دەرحەق بە شـاعیرە دێرینەکانی نەتەوەی عەرەب خەریکی هەڵسـەنگاندنی بەرهەمە هۆنراوەییەکانی سـەردەمی خۆشـی بووە و بە توندوتیژی سـزای ئەو شـاعیرانەی داوە، کە شـیعریان لە بابەتی زیانبەخش و بێسـوودەدا هۆنیوەتەوە. نموونەیەك بۆ ئەم هەڵوێستە ئەوەیە، کە لە سەردەمی جێنشین (عومەر) شاعیرێك هەبوو بەناوی (الحطیئە) ئەم شاعیرە ناوبانگی بە شیعری هەجوو دەرکردبوو هونەرەکەی بۆ هەڕەشەکردن لەوانەی یارمەتیان نەداوە بەکاردەهێنا.

دەگێڕنـەوە کـە ئـەم شـاعیرە ڕۆژێ لـە ڕۆژان هەجووی پیاوێکی موسـڵمانی کرد، کە ناوی (الزبرقان)بوو. الزبرقان چوو بۆ لای جێنشین (عومەر) شکاتی لە ناوبراو کرد، جێنشین چەنـد شـاعیرێکی شیعرناسـی کـرد بە بەرهەڵان و (حەکـەم) و داوایلێکردن کـە ڕادەی هەجو لەو هەڵبەستەی (الحطیئە) دەربارەی الزبرقان دەستنیشانبکەن. شیعرناسەکان هاتن بە دەنگ داواکارییەکەی جێنشین (عومەر)ەوە و وتیان ناوبراو بەچەشنێکی خراپ هەجووی ( الزبرقان) ی کردووە. جێنشـین (عومەر) کە گوێی لە بڕیاری بەرهەڵانەکان بوو فەرمانی حەپسـکردنی (الحطیئە)ی دا.

ئەگەر بە وردی لەم حیکایەتە وردببینەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە جێنشـین (عومەر)ئەم شاعیرەی خستەزیندان و ڕێگای هەجووی خەڵکی بێتاوانی لێگرت. جێنشین (عومەر)وەکوو فەرمانڕەوایەك ڕای وا بوو، کە شاعیر بۆ شیعر نییە و شاعیر نابێت بڵێ من شیعر دەهۆنمەوە و دەبێت لەم کارەدا سەربەستبم. بەڵکوو بیروڕای وا بوو کە شیعر ئەگەر هاتوو زیانبەخش بوو دەبێت خاوەنەکەی سزابدرێت.

## • جێنشین عومەر و مەسەلەی پەیامداری لە هونەری هۆنراوەدا

ئەو حکایەتخوانانەی کە باسی حەپسکردنی (الحطیئە) لە لایەن جێنشین (عومەر)دەکەن، دەگێڕنەوە کە ئەم شاعیرە پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر حەپسکردنەکەیدا، هەڵبەستێکی لە ستایشی جێنشین عومەر و سکاڵاکردنی حاڵی خۆی هۆنییەوە. جێنشین عومەر کە گوێی لە هەڵبەستەکەی گرت ناردی بە دوای دا و لێیپرسی: تۆ بۆچی هەجووی خەڵکی دەکەیت؟ ناوبراویش لە وەڵامدا وتی: لەبەر پارە. جێنشین عومەر کە گوێی لەم بیانووە بوو، وتی: باشە

لەمەولا مووچەیەکت بۆ دەبڕمەوە، بۆئەوەی بیانووت نەمێنێ. سەرئەنجام هەروەکوو دەڵێن جێنشین عومەر بەو جۆرە توانی زمانی جوێندان و هەجوو لە دەمی ئەو شاعیرە ببڕێ.

گومان لەوەدا نییە کە ئەم حیکایەتە ئەوە دەردەخات، کە مەسەلەی ڕەخنەسازی لە سەردەمی جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ.) ڕەنگی بابەتێکی ڕامیاری و ئایدۆلۆجی وەرگرتبوو. ئەم ڕەنگە بە لای ئێمەوە لەبەر تیشکی ڕێبازەکەی پێغەمبەر (د.خ.) لەم کۆڕەدا داڕێژراوە تا ڕاددەیەك، کە دەتوانین لەگەڵیدا بڵێین: زۆربەی کێشەکانی پەیامداری واتە (التزام) و ڕابەری شاعیرەکان بە چەشنی (التزام) لەو سەردەمە زێڕینەی ڕەخنەسازی عەرەبی سەریاندەرهێناوە و چارەسەرکراون، بەڵام تاچ ڕاددەیەك ئەم ڕێبازە دوای سەردەمی جێنشینەکانی پێغەمبەر (د.خ.) پەیڕەویکراوە؟ ئەمە پرسیارێکە دەبێت بە وردی وەڵامیبدەینەوە.

## • ڕەخنەسازی عەرەبی دوابەدوای سەردەمی جێنشینەکان

ئەم ڕێبازە ڕەخنەسازییە، کە وتمان لەبەر دەستی پێغەمبەر (د.خ.)بناغەکانی چەسپاون و لەسەردەمی جێنشینەکان لە مەیدانی مەشق و تەتبیقدا پەیڕەویکراوە، دەتوانین بە ڕێبازێکی ڕەخنەسازی ئایدۆلۆجی و بیری ناویببەین. کەوابوو ئەم ڕێبازە بە هیچ جۆرێك ڕێڕەوێکی گۆشەگیر و لابەلا نەبووە، چونکە لە کۆڕی ژیاندا شوێنپێیهەڵگیراوە و بۆ چارەسەرکردنی لادانی هەندێ شاعیر لە ڕێگای خزمەتکردنی کۆمەڵ لە هەڵبەستەکانیاندا بەکارهێنراوە. جا لێرەدا دەبێ بپرسین: ئایا ئەم ڕێبازی ئایدۆلۆجی و بیرییە لە ڕەخنەسازی عەرەبیدا پاش سەردەمی جێنشینەکان و دامەزراندنی فەرمانڕەوایی ئەمەوییەکان لە ساڵی چلی کۆچییەوە هەتا ساڵی ١٣٢ کۆچی ڕێنوێنی ڕەخنەسازان بووە ؟! یاخود فەرامۆشکراوە تا ڕاددەیێکی زۆر زمانەوان و زاناکانی ڕەوانبێژی و دانەری کتێبە ڕەخنەسازییەکان پشتگوێیانخستووە و هەرودکوو نەبوویێت کەسیان نەچووە بە لایەوە.

ئەگەر بە وردی چاوێك بە سامانە فراوانەکەی نەتەوەی عەرەب لە ڕەخنەسازی دێرینەدا بخشێنین، بۆمان دەردەکەوێ کە هیچ ڕەخنەسازێکی موسڵمان بە چەشنێکی ئامانجدار و فراوان ئەو ڕێبازە ڕەخنەسازییەی نەگرتۆتەبەر.

بەڵێ، ڕاستە کە لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا چەند کۆمەڵێکی ڕامیاری و ئایینی وەکوو (الخوارج) و شیعەکان و زوبیرییەکان لە کۆڕی شیعردا، شاعیری تایبەتی خۆیان هەبوو، شاعیرەکانیان هۆنراوەی ئایدۆلۆجی و بیریان دەهۆنییەوە و چەند سەرکردەیێکی ئەم کۆمەڵانە لە

مەیدانی هەڵسەنگاندنی شیعردا پێوانەی ناوەڕۆکیان بەکاردەهێنا، بەڵام ئاکامی ئەم بزووتنەوەیە لە جیهانی ڕەخنەسازی عەرەبیدا کاتی و سەردەمی بوو. هەروەها لە کتێب و وتاردا بە جۆرێکی ڕێکوپێك و بە شێوەی لێکۆڵینەوە تۆمارنەکراوە، بگرە تا ڕاددەیێکی زۆر بە چاوی لایەنگیری و کۆمەڵی لە قەڵەمدەدرا.

سەرئەنجام وەکوو بزووتنەوەیێکی ڕەخنەسازی بەرهەمی نەبوو. جا بۆ ئەوەی زیاتر لە پچڕانی ئەو ڕێبازە ئایدۆلۆجی و بیرییە لە زنجیرەی ڕەخنەسازی عەرەبیدا بۆمان دەربکەوێ، بابزانین ئەم زنجیرە ڕەخنەسازییە پاش ئەم ڕێبازە چلۆن ئەڵقەکانی داڕێژراون؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لێرەدا دەتوانین بڵێین: ئەڵقەکانی ڕەخنەسازی عەرەبی دوابەدوای ئەو ڕێبازە ڕەخنەسازییە لە دوو کۆڕدا دامەزراون.

یەکەمیان: کۆڕی زانا ئایینییەکانە.

دووەمیان: کۆڕی مامۆستاکانی زمان و ڕەوانبێژی دانەری کتێبە ڕەخنەسازییەکانە.

## • ڕەخنەسازی عەرەبی لە کۆڕی زانا ئایینییەکاندا

ئەو تویژەرانە کە لە ئایینی ئیسلامدا پسپۆڕن تێبینیدەکەن کە ئەم ئایینە پیرۆزە جگە لە لایەنە ئاسمانییەکانی ڕژێمێکی فراوان و تەواوە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی. ئەوەی ئادەمیزاد لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە دەبێت بۆ ڕۆژی قیامەت و کاروباری ڕۆژانە بژی و لایەنی خوایی لە لایەنی خۆشگوزەرانی نەپچڕێنی، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو توێژەرانە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشن، کە تەنانەت لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (د.خ.) دەستەیەك لە موسڵمانان لەو فەلسەفەیە تێنەگەیشتون و وایاندەزانی، کە خواپەرستی لە ئایینی ئیسلامدا گۆشەگیری و دەستهەڵگرتنە لە خۆشگوزەرانی ژیان.

ئەم دەستەیە لەبەر چەند هۆیێکی رامیاری و کۆمەڵایەتی وردەوردە لە کۆمەڵگای ئیسلامدا بزووتنەوەیێکی وشکەسۆفیانەیان بەرپاکرد. ئەم بزووتنەوەیە سەبارەت بە ڕەخنەسازیی عەرەبی هەڵوێستێکی دژ بە شیعر و شاعیران خۆی نواند. بەڵگەی پشتگیریکەرەکانی ئەم بزووتنەوەیە بە تەنیا هەر ئەوەیە، کە لە سورەتی (الشعراء) چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بە خراپی باسی شاعیرانی کردووە، بەڵام بێگومان بەڵگەیێکی ڕاست و دروست نییە، چونکە هەروەکوو دیتمان ئایەتەکانی سوورەتی (الشعراء) بە گشتی شاعیرانی بە چاوی سووك تەماشانەکردووە، بەڵکوو ستایشی ئەو شاعیرانەی کردووە، کە خاوەن بڕوان و کاری چاکە

دەکەن و یادی خوا دەکەنەوە و خەبات دژی هەموو خراپەیەك دەکەن. ئەمە ڕاستییەکە ناتوانرێت بکرێت بە ژێر لێوەوە، کەچی هەندێ کەس لە کۆڕی زانا ئایینییەکاندا پەیڕەوی ئەو ڕاستییەیان نەکردووە و هێرشیان بردە سەر شاعیران و هونەری هۆنراوە و دایاننە بەر نەشتەری پووچکردنەوە.

ڕەخنەسازی عەرەبی لەم سووچە مێژووییەوە، هەڵوێستێکی ناهونەری دژ بە زمانی هۆنراوە، کە وێنەی هونەرییە تۆماردەکات. لاپەڕەکانی ئەم تۆمارکردنە تەنانەت بە پێنووسی هەندێ زمانەوان و ڕێزماننووسی عەرەبیش نووسرانەوە، یەکێك لەمانە (سیبویە)، کە بە دامەزرێنەری زانستی ڕێزمانی عەرەبی ناودەبرێ.

ئەم زمانەوانە واتە سیبویە وێنەی هونەری، کە بڕبڕەی زمانی هۆنراوەیە بە درۆ لەقەڵەمداوە و وتویەتی: (دەربڕین هەیە هەرچەندە لە ڕووی ڕستەسازییەوە ڕاست و ڕەوایە، بەڵام لە ڕووی واتاوە درۆیە، هەروەکوو دەڵێن: چیاکەم هەڵگرت و ئاوی دەریاکەم خواردەوە)[1].

کەوابوو سیبویە دەڵێ: هەموو دەربڕین و ڕستەیەکی خوازەیی هەرچەندە لەسەر دەستووری زمان ڕۆیشتبێت و بە پێچەوانەی دارشتنی زمانی نەهاتبێ درۆیە و لەگەڵ هۆشمەندی لۆجیکدا ناگونجێ.

جا لێرەدا ڕەنگە بۆ هەندێ لە مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی هەبێت کە بڵێن: ئەم بڕیارەی سیبویە هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە هەڵوێستە ئایینییەکەی ئیسلامەوە دەرهەق بە دەستەی هەستیارە خراپەکارەکانەوە نییە، چونکە ئایەتەکانی سوورەتی (الشعراء) باسی خوازەی نەکردووە. ئەم دەستە شاعیرانەی لەبەر شێوازی هونەری بە خراپ دانەناون، بەڵکوو ئەو بڕیارە لە سەرچاوەیەکی یۆنانییەوە هەڵقوڵاوە، بەڵام ئەم بۆچوونە ڕاست نییە، چونکە بە دەیان زانا لە کۆڕی ئایینیدا سوورن لەسەر ئەوەی، کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (د.خ.) خوازە نەهاتووە و شێوازی زاراوە بە وێنەی هونەری لە مێژووی ڕەوانبێژی عەرەبیدا. ئاشکرایە کە ئەو زانا موسڵمانانە ئینکاری بوونی خوازەیان کردووە و سووربوون لەسەر ئەوەی کە خوازە لە ڕاستییەوە دوورە و بەرهەمی ئەفسانە و ئەندێشەی پووچە.

ئەوجا لەبەر ئەوەی ئەو زانایانە هیچ بەڵگەیێکی زمانی و ڕەوانبێژییان بەدەستەوە نەبووە بۆ چەسپاندنی بیروڕاکەیان، هەر دەبێت بڵێن: ئەم بیروڕایە لە هەڵچوونێکی مەزهەبییەوە سەرچاوەی هەڵقوڵانی هێناوەتەدەست.

ڕاستە کە کوڕی (حەزم) لەم زانایانە هەوڵیداوە، کە بە هەندێ بەڵگەی زمانی و پشت بە مەنتیق و ئینکاری بوونی خوازە لە قورئانی پیرۆز و شوێنەوارە ئایینییەکاندا بسەلمێنێ، بەڵام

---

١ الکتابە بەرگی یەکەم ٧/

هەوڵدانەکەی بە هیچ ڕەنگێ لەسەر بناغەیێکی زمانی و ڕەوانبێژی ڕاستینە بنیاتنەنراوە. ڕەنگە لێرەدا، پێویستمان بە شیکردنەوەی نموونەیەك هەبێت لە کاری یەکێك لەو زانایانە، بۆ ئەوەی بزانین چلۆن کۆششیانکردووە لە پێناوی چەسپاندنی هەڵوێستەکەیان دەربارەی خوازە، بۆیە ئێمەش لەم ڕووەوە بە کورتی باسی هەڵوێستی کوڕی (تیمییە) دەکەین، کە لە ساڵی حەوت سەد و بیست و هەشتی کۆچی مردووە.

کوڕی تیمییە، کە زانایێکی ئایینی و خاوەن شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی و بیریە هاتە کۆڕی ڕەوانبێژی و دەربارەی خوازە بەرەنگاری ئەم پرسیارانە بووەوە، ئایا لە زمانی عەرەبیدا (وشە) هەیە یاسادانەری ئیسلام، واتە (مشرع) لە واتا ڕاستینەکەیەوە، کە مانای حەقیقییە، گواستبێتەوە بۆ واتایێکی نوێ، کە واتایێکی مەجازییە؟ یاخود لەو زمانەدا وشەیێکی وا هەیە لە یاسای ئیسلامدا واتە: لە (شریعة)دا بە واتا ڕاستینەکەی هاتبێت و هیچ دەستکارییەکی نەکرابێت، بەڵام لە هەمان کاتدا یاسادانەری ئیسلام زیادەی خستبێتە سەر ئەحکامی ئەو وشانە و بە واتایێکی فراوانتر بەکاریهێنابێت؟ ئایا یاسادانەری ئیسلام هەروەکوو خەڵکی چۆن بە گوێرەی نەریت و عورف، واتای وشە دەگۆڕن و دەستکاریدەکەن، ئەم وشانە لە چاوی زانستدا خوازەن و لە چاوی نەریتی یاسادانەری ئیسلامدا ڕاستینە و حەقیقین.

کوڕی تیمییە وەڵامی ئەم پرسیارانەی داوەتەوە و وتویەتی: یاسادانەری ئیسلام واتە (مشرع) بە هیچ جۆرێك ئەم وشانە وەکوو وشەی (زەکات، کوفر، سجود) لە واتای ڕاستینە و حەقیقییەوە نەگواستۆتەوە بۆ واتایێکی خوازەیی و مەجازی. هەروەها بە هیچ ڕەنگێ دەستکاری ئەم چەشنە وشانەی نەکردووە، بگرە لە چوارچێوەیێکی تایبەتیدا بەکاریهێناون.

## • بناغەکانی کوڕی تەیمییە لە ئینکاری بوونی مەجازدا

سەرئەنجام کوڕی تەیمییە لەم بیروڕایەیدا کێشەیێکی زانستی لەگەڵ ئەوانەی دەڵێن خوازە لە هەموو بەرهەمێکی وێژەییدا هەیە و بەرپابووە و ئەم بناغانەی خوارەوەی ڕەچاوکردووە.

**یەکەم:** وشە خۆی لەخۆیدا نەحەقیقەتە و نەڕاستینە و نەخوازە و مەجازە.

**دووەم:** هیچ بەڵگەیێکی مێژوویی و زمانیمان بە دەستەوە نییە، کە بە هۆیەوە بتوانین بڵێین: ئەم واتایە وشەی حەقیقی و ڕاستینەیە و وشە، کە لە قۆناغێکی تایبەتیدا تەنیا بۆ ئەو واتایە بەکارهێنراوە، بەڵکوو ئەگەر هاتوو وشەیەك لە واتایەك زیاتری هەبوو، واتاکانی پێکەوە پێوەی دەلکێن و ناتوانین بڵێین: ئەم واتایە تازەیە ئەوەی دییان کۆنە.

**سێیەم:** واتای خوازەیی وشەیەك ڕاستەوخۆ دەرناکەوێت و بەبێ بەڵگە و قەرینە کەس ناتوانێ بڵێ ئەم واتایەی وشەی خوازە و مەجازە و حەقیقەت نییە.

**چوارەم:** واتای وشە تەنیا لە ڕستەدا دەکرێتەوە و ئەو وشانەی کە لەگەڵیدا لە ڕستەکەدا هاتوون ئەو ڕوونکردنەوەیە سازدەکەن. بۆ نموونە: کەوابوو ئێمە ناتوانین بڵێین وشەی (گوڵ) خوازەیە یان حەقیقەتە، ئەگەر هاتوو ئەم وشەیە بە تەنیا نووسرابووەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو لە ڕستەیەکدا بەکارهێنرابوو دەتوانین بە هۆی وشەکانی دیکەی ئەو ڕستەیەوە بڕیاری خوازەیی یان حەقیقەتی وشەی گوڵ بدەین. بۆ نموونە: وشەی (گوڵ) لە ڕستەی (لەگەڵ گوڵەکە قسەم کرد) وشەیێکی خوازەییە، بەڵام لە ڕستەی (لە باخەکەدا گوڵ هەیە) وشەی (گوڵ) حەقیقەتە.

کوڕی تەیمییە لە بەر تیشکی ئەم چوار بناغەیەدا سەرئەنجامێکی زمانی و ڕەوانبێژی سازدەکات، کە دەڵێ: وشە وەکوو بێژەیەك خۆی لەخۆیدا نە خوازەیە و نەحەقیقەتە و زاناکانی ڕەوانبێژی هەڵەیێکی گەورەیان کردووە، کە وشە بەسەر حەقیقەت و مەجازدا دابەشدەکەن.

کوڕی تەیمییە بە پێی ئەم سەرئەنجامە بڕیارێکی دی سازدەکات و دەڵێ: سروشتی هەموو وشەیەك لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (د.خ.)، بەو وشانەوە بەستراونەتەوە، کە لە ڕستەدا واتاکانیان دەردەخەن، بۆیە هیچ وشەیێکیان خوازە نییە، بەڵکوو حەقیقین.

ئەم هەڵوێستەی کوڕی تەیمییە لە کۆڕێکی ئایینیدا ڕەگوڕیشەی چەسپاندووە و ئاکام و ڕەنگدانەوەی هەڵوێستێکی دیکەیە، کە هەندێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵێکی مەزهەبی وەریانگرتبوو لە تەئویل و ڕاڤەکردنی دەقە ئایینییەکان بۆ پشتگیریکردنی بیروڕا تایبەتییەکانی خۆیان. ئەمە ڕاستییەکە لە مێژووی بیری کۆمەڵە ئایینی و مەزهەبی، موسڵمانەکاندا ڕوون و ئاشکرایە و لە کۆڕی ڕەخنەسازی عەرەبیدا وەکوو ڕێبازێك دەنگینەداوەتەوە، هەرچەندە سەرئەنجامەکەی لەوەدا بەدیدەکرێت، کە بە هۆیەوە چەند زانایێکی موسڵمانی بلیمەت دژ بە هونەری خوازە هەڵوێستیان نواند و خۆیان لە باسکردنی زمانی هونەری پچڕاند.

## • ڕەخنەسازی عەرەبی لە کۆڕی زاناکانی ڕێزمان و زمانەوانیدا

هەرچەندە لە سەردەمی جاهیلیدا، زمانی ئەدەبی یەکگرتوی نەتەوەی عەرەب، تا ڕادەیەك پێکهاتبوو و زۆربەی ئەدیبانی خێڵە عەرەبییە شێوە جیاوازەکان بەو زمانە ئەدەبییە بەرهەمیان سازدەکرد و لە بازاڕە گشتییەکاندا وەکوو بازاڕی عوکاز و زولمەجاز بۆ جەماوەر دەیانخوێندەوە،

بەڵام هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز بە زمانی خێڵی قورەیش و چەند خێڵێکی دیکە لە ناوچەی حیجاز وای لەو زمانە ئەدەبییە کرد، کە بە ڕاستی ببێ بە زمانێکی نەتەوەیی عەرەبی.

ئەوەی لەم مەسەلە زمانییە پەیوەندیی بە ڕەخنەسازیی عەرەبییەوە هەبێت، لایەنی پێویستی خەڵکییە بە شەرح و ڕاڤەکردنی کۆمەڵێك لە وشە و دەربڕینی زمانی قورئانی پیرۆز. ئەم پێویستییە بێگومان، لەوەوە هاتووە، کە خەڵکی یان ڕاددەی ڕۆشنبیریان نزم بوو یان زار و شێوەی ئاخاوتنیان لەتەك زمانی قورئانی پیرۆزدا جیاواز بوو. مێژووی زانستی ڕاڤەکردنی زمانی قورئان ساغیدەکاتەوە، کە پێغەمبەر (د.خ.) چەند هاوەڵێکی وەکوو: (عومەری کوڕی خەتتاب) و (ئیمامی عەلی) و (زەیدی کوڕی سابت) دەهاتنە دەنگ. ئەو پێویستییە هەرچی وشە و دەربڕینی گران لە قورئانی پیرۆزدا هەستپێدەکرا لە لایەن خەڵکییەوە ڕاڤەیان دەکرد و بە شێوازێکی ئاسان ڕوونیاندەکردەوە.

ئەم کارە هەروەکوو ئاشکرایە هەنگاوێك بوو لە کۆڕی پەیدابوونی زانستی زمانی عەرەبی، بە تایبەتی لە ڕووی فەرهەنگزانی و ساغکردنەوەی وشەوە.

ئەم کۆڕە هەروەکوو مێژووی زمانی عەرەبی باسیدەکات وردەوردە فراوان بوو و بە دەیان پیاوماقووڵ و شیعرخوان بەشدارییان تێداکرد. بەتایبەتی کۆمەڵێکی زۆر لەو نەتەوانەی کە بوون بە موسڵمان وەکوو: کورد و فورس و ڕۆم و حەبەشی و ئەو نەتەوانەی کە عەرەبییان نەدەزانی، لەبەر کاروباری فەرمانڕەوایی و ئایینی پێویستیان بە تێگەیشتن لە زمانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ.) هەبوو. شانبەشانی زانستی زمانی عەرەبی، کە بەو چەشنە هاتەکایەوە وردەوردە لەبەر هەمان هۆ ڕێزمانی عەرەبیش لەدایکبوو.

زانستی زمانی عەرەبی و ڕێزمانی عەرەبی لە چەسپاندنی بنواشە و دەستوورەکانیان کەرەستەی خۆیان جگە لە تایبەتییەکانی قورئانی پیرۆز لە شیعری عەرەبی وەرگرت. بۆیە زاناکانی ئەم دوو زانستە دەستیانکرد بە کۆکردنەوەی شیعری عەرەبی سەردەمی جاهیلی و لەبەر تیشکی ڕێبازێکی بەراوردکاری وشە گرانەکانی زمانی قورئانی پیرۆزیان ڕاڤەکرد.

ئەم بزووتنەوەیە کە لە مێژووی زانستەکانی زمانی عەرەبیدا، بە ناوی کۆکردنەوە و تۆمارکردنی زمانی عەرەبی ناودەبرێ، هەوێنی لەدایکبوونی ڕێبازێکی دیکەی ڕەخنەسازی عەرەبییە.

## • ڕەخنەسازی عەرەبی پاش سەردەمی جێنشینەکان

هەروەکوو وتمان لەبەر چەند هۆیێکی ئایینی و زمانی و ڕامیاری لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆزەوە وردەوردە ڕێزمانی عەرەبی و زانستی زمانی عەرەبی پەیدابوون. بەشداریکەرانی کۆڕی ئەم دوو زانستە لە شیعرخوێنان و کۆکەرەوانی کەلەپووری عەرەبی سەردەمی جاهیلی و قورئانخوێنەکان و زاناکان، دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوەی هۆنراوەی عەرەبی و بەراوردکاری هەڵبەستە بەرزەکانی لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، بۆ ئەوەی بێهاوتایی و ئیعجازی ئایەتەکانی ئەم کتێبە پیرۆزە پایەبەرزە بخەنەڕوو. هەروەها لە سروشتی دارشتنی زمانی عەرەبی لە ئەدەبیاتی ئەم نەتەوەیەیان دەکۆڵییەوە، بە نیازی چەسپاندنی ڕێزمانی قورئانی پیرۆز و دوورخستنەوەی خەڵکی لە بە هەڵە خوێندنەوەی قورئان و تێنەگەیشتنی ئایەتە پیرۆزەکانی.

ئەگەر ئاکامەکانی ئەم بزووتنەوەیە کۆبکەینەوە و پەیوەندی بە ڕەخنەسازی عەرەبییەوە دەستنیشانبکەین بۆمان دەسەلمێ، کە ئەم ڕەخنەسازییە ڕەنگ و بۆنێکی تایبەتی وەرگرتووە. ئەم ڕەنگ و بۆنە لە چاو ڕێبازە ئایدۆلۆجی و بیرییەکەی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە سەر دەستی پێغەمبەر (د.خ.) و جێنشینەکاندا سروشتێکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەم سروشتە بە گوێرەی دەقە ڕەخنەسازییەکان لەم تایبەتیانەی خوارەوەدا خۆی دەنوێنێ:

**یەکەم:** ئەم ڕەخنەسازییە بە زۆری بایەخیدەدا بە دەستوورەکانی ڕێزمان و دارشتن و سازکردنی زمانی ڕەوان و پاراوی دوور لە گرێ وشە و واتای.

**دووەم:** بەکارهێنانی وشەی فەرهەنگی زمانی نەتەوایەتی عەرەبی، کە بە (الفحص) ناودەبرێ و خۆدوورخستنەوە لە سازکردنی وشەی ناوچەیی و دەربڕینی خێڵایەتی.

**سێیەم:** ڕازانەوەی زمانی ئەدەبی و وێژەیی بە وێنەی هونەری لە لێکچواندن و خوازە و خواستە و درکە.

**چوارەم:** پەیڕەویکردنی یاساکانی عەرووزی عەرەبی لە ڕێکخستنی کێش و سازکردنی سەروادا.

ئەم سروشتەی ڕەخنەسازی عەرەبی هەروەکوو لە تایبەتییەکانیدا دەردەکەوێ، ئەوە دەگەیەنێ کە ڕەخنەسازیی عەرەبی پاش سەردەمی پێغەمبەر (د.خ.) و جێنشینەکانی بەتایبەتی ڕێبازێکی دی پێکهێنا. ئەم ڕێبازە هەڵبەت لە چاو ڕێبازە ئایدۆلۆجی و بیرییەکەی ڕەخنەسازیی عەرەبی سەردەمی پێغەمبەر (د.خ.)و جێنشینەکان جیاوازییەکی قووڵ و فراوانی هەیە.

بە لای ئێمەوە ئەم جیاوازییە لەبەر تیشکی نموونەکانیدا پێویستی ئەوە دەکات، کە بە ناوی ڕێبازی ڕەخنەسازی فۆڕمی ناوببرێ، چونکە پەیڕەویکەرەکانی ئەم ڕێبازە بایەخیان بە وشە و ڕستە و داڕشتنی گشتیی وێژەی عەرەبی دەدا.

بێگومان ئەم ڕاستییە نابێت ئەوە بگەیەنێ، کە هەڵگرانی دروشمی ئەم ڕێبازە ڕەخنەسازییە بە هیچ ڕەنگێ نەدەچوون بە لای ناوەڕۆکی دەقی وێژەییەوە، بەڵێ نابێت ئەم ڕاستییە ئەوە بگەیەنێ. یاخود گوێگر وا تێبگات، چونکە هەروەکوو لەمەودوا دەبینین پەیڕەویکەرانی ئەم ڕێبازە بەزۆری یان بەکەمی دەمیان دەژەنییە باسی واتای دەقە هەڵسەنگێنراوەکان، بەڵام پێوانەیان لەم سووچەوە مەسەلەی بیروباوەڕی پەیامداری نەبوو، بەڵکوو هەموو هەوڵێکیان ئەوە بوو وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە، کە دەڵێت: ئایا ئەو دەقە هەڵسەنگێنراوانە لەڕووی فۆڕمەوە، واتاکەی باش و جێی ڕەزامەندییە، یاخود خراپ و شایستەی سەرزەنشتییە؟

پێوانەی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش هەروەکوو گوتمان لە تێڕوانینێکی بیری و ئایدۆلۆجییەوە هەڵنەقولاوە.

## • ژینگەی ڕەخنەسازیی عەرەبی

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی لەسەر ئەوە یەکن، کە ڕەخنەسازیی عەرەبی سەردەمی ئەمەوییەکان بە گوێرەی ژینگەی وڵاتە عەرەبییە جۆربەجۆر و تایبەتییەکانی جیاوازن.

ئەوجا لەبەر تیشکی ئەم بیروڕایەدا، ڕەخنەسازیی عەرەبی ئەم سەردەمە بەسەر سێ چەشندا دابەشدەکەن:

**یەکەم: ڕەخنەسازیی ژینگەی حیجاز**

**دووەم: ڕەخنەسازیی ژینگەی شام**

**سێیەم: ڕەخنەسازیی ژینگەی عێراق**

بناغەی سەرەکی ئەم دابەشکردنەی ڕەخنەسازیی عەرەبی، بەلای ئەو مێژوونووسانەوە، جیاوازی بابەت و سروشتی هۆنراوەی عەرەبییە لەو ژینگانەدا، چونکە ئەم مێژوونووسانە

تێبینیدەکەن کە هۆنراوەی عەرەبی لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا، تایبەتییەکانی لە ڕووی بابەت و مەبەستەوە لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیێکی دیکە دەگۆڕێ، ئەم بناغەیە بە لای ئێمەوە هەرچەندە ڕوون و ئاشکرا و هەستپێکراوە و بەئاسانی لەبەر تیشکی نموونەی هۆنراوەییدا بەرچاودەکەوێ. بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی جەوهەری و بنەڕەتی نییە. بۆیە ئێمە لێرەدا ڕامان وایە، کە ڕەخنەسازیی عەرەبی سەردەمی ئەمەوییەکان بەرهەمێکی یەکگرتووە و چەند تایبەتییەکی گشتیی خۆی هەیە، لەمەوپێش لەبەر ئەم چەند تایبەتییە گشتییانەدا، ڕێبازەکەمان بە ناوی ڕێبازی فۆرمییەوە ناوبرد.

هەرچۆنێك هۆی جیاوازی ئێمە و مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە چۆنییەتی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە هاتووە: ئێمە بە سەرنجێکی گشتی تەماشای چالاکی گشتی هەموو نەتەوەیەك دەکەین و لە بزووتنەوەی شارستانی و بیری هەر نەتەوەیەك دەڕوانینە بەرهەمەکانی.

مەبەستی سەرەکیمان لە شوێنپێهەڵگرتنی ئەم دوو ڕێچکەیە، ڕوونکردنەوەی هێڵە وردەکانی بوون و قەوارەی ڕەخنەسازیی عەرەبییە، بۆ ئەوەی بتوانین لە ئاوێنەی ئەم هێڵانەدا کەسایەتیی ئەم ڕەخنەسازییە شیبکەینەوە و ڕێبازەکانی بخەینەڕوو، ئەوجا دەستبکەین بە باسکردنی بەرهەمی ئەو ڕەخنەسازە عەرەب و موسڵمانانە، کە شوێنەواری گرنگ و کاریگەرییان لەم مەیدانەدا بەجێهێشتووە. بە واتایێکی ڕوونتر ئەوەی ئێمە تێبینیدەکەین، نەتەوەی عەرەب، نەتەوەییێکی یەکگرتووە و وڵاتەکەی هەرچەندە جۆربەجۆر و ڕەنگاوڕەنگە. بەڵام زەمینەیێکی ڕۆشنبیری و هونەری یەکدیگیری هەیە، کەچی زۆربەی مێژوونووسەکانی عەرەبی بە چاوێکی ناوچەیی و خێڵایەتی ڕوانیویانەتە ڕۆشنبیریی عەرەبی و درەنگ گەیشتوونەتە ئەو دابەشکردنە ناوچەییەی ڕەخنەسازیی عەرەبی.

سەرئەنجام ئێمە لەم لێدوانەماندا، دەربارەی ڕەخنەسازیی عەرەبی هەردوو ڕێچکەکە دەگرینەبەر:

- ڕێچکەی تێڕوانینێکی گشتی، کە بیروڕای تایبەتی خۆمانە.
- ڕێچکەی تێڕوانینێکی ژینگەیی، کە ڕێبازی زۆربەی مێژوونووسەکانی عەرەبە، وەکوو د. تەها حوسێن، ئەحمەد ئەلشایب، ئەحمەد ئەمین.

## • رەخنەسازیی عەرەبی لە ژینگەی حیجازدا

ژینگەی حیجاز ناوچەییکی فراوانە لە نیمچە دورگەی عەرەبی، کە لە شاری مەککە و مەدینە و تایف و بیابانی نەجد پێکهاتووە. ئەم ژینگەیە لە پاش بڵاوبوونەوەی ئاییـنی ئیسلام، ئەو خاك و زەوییانەی، کە ئیمپراتۆرییەتی رۆمییەکان و ساسانییەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، وەرگرتەوە و کەوتەوە ژێر رکێفی ئیسلام.

لە رووی شارستانی و ئابوورییەوە شارەکان هەنگاوی باشیان بەرەو پێشکەوتن نابوو، چینێکی دەوڵەمەندیان تێدا پەیدابوو. ئەم چینە دەوڵەمەندە بە هۆی ئەو پارە زۆرەوە، کە بە چنگیان هێنا و بە هۆی دەزگا و خزمەتکار، خۆی بە بنیاتنانی کۆشك و تەلار و رابواردن و ئاهەنگگێڕان خەریککرد. سەرئەنجامی ئەم بارە کۆمەڵایەتییە، کە فەرمانڕەوا ئەمەوییەکان لە شامدا بە مەبەست ڕێوشوێنی پەرەسەندنیان بۆ تەختەدەکرد، ئەوە بوو ئەم ژینگەیە سەرەڕای پێشکەوتنی لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە بزووتنەوەییکی هونەری لە ناو خەڵکەکەدا پەیدابوو.

مێژوونوسەکانی وێژەی عەرەبی لەم بزووتنەوەیە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشن، کە دوو چەشنی تازە لە هەڵبەستی دڵداری بە جۆرێکی بنەڕەتی سەریاندەرهێنا:

**یەکەمیان:** هەڵبەستی (دڵداری ماجنە)، واتە باسکردنی ڕابواردنی هەستیارەکان لەگەڵ دڵدارەکانیاندا و پەردەهەڵماڵین لە رووی کردەوەکانیان، لەم کۆڕەدا بە چەشنێك، کە خوو و ڕەوشت ڕێگای نەدەدا.

**دووەمیان:** هەڵبەستی دڵداری عوزری، کە بە ناوی خێڵی عوزرەوە ناویانگیدەرکرد. ئەم چەشنە دڵدارییە بە پێچەوانەی دڵداری ماجن، ڕەوشتبەرز و فیداکاری لە ڕێی عەشق و حەزکردندا بە جۆرێکی بێگەرد دەگێڕایەوە.

مێژوونووسی وێژەی عەرەبی لە باسکردنی ئەم دوو چەشنە دڵدارییە لە هۆنراوەی ژینگەی (حیجاز)دا سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشن، کە رەخنەسازان دەورێکی گرنگیان لە خەملاندن و پەرەسەندنی ئەم بزووتنەوە هۆنراوەییەدا گێڕاوە.

ئەم سەرنجڕاکێشانە هەروەکوو دەقە ڕەخنەسازییەکان دەیسەلمێنن ڕاست و ڕاستینەیە، چونکە لە کۆڕی گۆرانیبێژان و شیعرخوێندنەوەدا، کە لە کۆشك و تەلاری بنەماڵەکانی ژینگەی حیجازدا دەبەسترا، ڕەخنەسازان تێبینی ڕەخنەسازیان ئاراستەی هەستیارەکانیان دەکرد.

ئەم تێبینییە ڕەخنەسازیانە لە سەرچاوەی چەشەیێکی کەسی دەوڵەمەندانەوە هەڵدەقوڵان،

کە ئاکامی ژینگەی حیجازی دەوڵەمەند و خۆشگوزەران بوو. بۆیە بەزۆری تایبەتییەکانی ئەم ڕەخنەسازییە بایەخی دەدا بە وشەی سووک و ڕەوان و کێشی کورت و قافییەی ئاوازدار و ڕەخنەی توندی ئاراستەی ئەو هەستیارانە دەکرد، کە دەربڕینی لادێییانەیان سازدەکرد و وشەی قورس و گران و وشکیان بەکاردەهێنا و عەرووزی درێژیان لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا دەگرتەبەر، کە لە ئاوازی گۆرانیبێژیدا ناگونجێت.

ئەم تایبەتیانەی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە ژینگەی حیجازدا هەروەکوو دیارە لەگەڵ فۆرمی هۆنراوەدا مامەڵەی دەکرد و خەریکی وشە و ڕستە و دارشتن بوو، بە دەگمەن لە ناوەڕۆکی هۆنراوەی دەکۆڵییەوە. ئەم دەگمەنییەش دووبارە پەیوەندی بەو واتایانەوە هەبوو، کە بیری ئەرستۆکراتی چینی دەوڵەمەندی ژینگەی حیجاز پەسندیدەکردن و بە پێوانەی نوکتەبازی و قسەینەستەقی خەمڕەوێن و بیرۆکەی ڕابواردنانە، هەڵیدەسەنگاندن.

## • ژینگەی شام

زاراوەی شام لە مێژووی جوگرافیای وڵاتی عەرەبی ئەو ناوچە عەرەبییانە دەگرێتەخۆی، کە لە چنگی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پاش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام ڕزگارکران. ئەم ناوچانە لە کاتی دامەزراندنی فەرمانڕەوایی ئەمەوییەکان لە ساڵی چلی کۆچیدا بوو بە پایتەختی گشت وڵاتی عەرەبی ئیسلامی و هەر لە سەردەمی موعاوییەوە ئیتر بارەگای ئیسلامی لە مەدینەوە بۆ ئەم ژینگەیە گوێزرایەوە.

لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییە مێژوویەدا مێژوونووسەکانی وێژەی عەرەبی دووپاتیدەکەنەوە، کە هونەری ستایش (مەدح) لە ژینگەی شامدا زاڵبوو بە سەر گشت هونەرەکانی هۆنراوەی عەرەبی و بازاڕی ئەم هونەرە تا دەهات گەرمتردەبوو. ڕەخنەسازیش هەروەکوو وتومانە تا ڕاددەیێکی زۆر ڕەنگی ژینگەکەی وەردەگرت و هەنگاوەکانی لەگەڵ بزووتنەوەی چۆنییەتی وێژە لە دەوروپشتیدا جووتدەکات. ئنجا بۆیە دەقە ڕەخنەسازییەکانی ئەم ژینگەیە، کە بە زۆری لە جێنشینە ئەمەوییەکان وەکوو موعاوییە و عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان و دەمڕاستی خێڵەکان وەشاونەتەوە. ئەو ڕاستییە ڕووندەکەنەوە و بەڵگەی دەستپێکراومان بە دەستەوە دەدەن.

سەرئەنجام ئێمە دەتوانین پشتببەستین بەم ڕاستییە و تایبەتییەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە ژینگەی شامدا، بەم چەند خاڵانەی خوارەوە بخەینەڕوو:

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی جێنشینە ئەمەوییەکان لە خێڵی قوڕەیش بوون و خێڵی قوڕەیشیش

هەروەکوو لە سەردەمی جاهیلییەوە ناسراو و ناوداربوون، لە ڕووی ڕەوانبێژی و ڕەوانکاری (فصاحە)ی زمانەوە، پلەیێکی بەرزی بێهاوتایان هەبوو. هەمیشە پێوانەیەکی زمانی عەرەبی ڕەوان و پاراو و ڕوونبێژ و بەهێزیان بەکاردەهێنا بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵبەستی ستایش و بە هیچ ڕەنگێ هەڵبەستیان پەسەندنەدەکرد، ئەگەر بهاتایە خاوەنەکەی دەربڕینی شارستانێتی و وشەی بێهێزی بەکاربهێنابایە.

**دووەم:** جێنشینە ئەمەوییەکان هەروەکوو لە مێژووی ڕامیاری ئەم سەردەمەدا زانراوە دوژمنیان زۆر بوو، هەمیشە لەگەڵ چەند کۆمەڵێکی ڕامیاری و ئابووری و خێڵایەتی لەبەربەرەکانێدابوون. بۆیە ئەم جێنشینانە پێوانەی واتایی تایبەتی لە ستایشیاندا بەکاردەهێنا و هەستیارانیش بۆ ئەوەی هەڵبەستە ستایشییەکانیان جێگای ڕەزامەندی بێت، پەیڕەوی ئەو پێوانەیەیان دەکرد و ستایشی جێنشین و میر و فەرمانڕەواکانیان بە دادپەروەری و ئازایەتی و سوارچاکی و دەستبڵاوی و نەژادڕەسەنی دەکرد.

**سێیەم:** لەبەرئەوەی دانیشتووەکانی ژینگەی شام بەزۆری عەرەب بوون و سەلیقەی قسەکردنیان بە عەرەبی ڕەوان لاواز نەببوو، بزووتنەوەی ڕێزمانی عەرەبی و زانستی زمان لەم ژینگەیەدا بە چەشنێکی قوتابخانەیی بەرپا نەبوو. ئاکامی ئەم ڕاستییە لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا ئەوە دەردەخات، کە ڕەخنەسازان لە ڕێگای تێبینی کەسی و چەشەی تایبەتییەوە هەڵبەستی هەستیارانیان هەڵدەسەنگاند. بە مانای ئەوەی ڕەخنەسازیی ئەم ژینگەیە ڕەخنەسازییەکی مەنهەجی و ڕێبازی نەبوو، بەڵکوو بەرهەمی چالاکی کەسی بوو، هەرچەندە لە هەمان کاتدا بەشێك بوو لە بەرهەمەکانی ڕێبازی فۆرمی ڕەخنەسازیی عەرەبی. چونکە هەروەکوو لەو خاڵانەی سەرەوە دەرکەوت بەشداریکەرەکانی ئەم ڕەخنەسازییە بە زۆری گرنگییان بە دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی دەدا.

## • ژینگەی عێراق

کە لە مێژووی ڕۆشنبیریی عەرەبی ئیسلامیدا، ناوی عێراق دەهێنرێ، یەکسەر یادی شاری بەسرە و کوفە دەکرێتەوە، کە لە سەردەمی جێنشین (عومەر)وەکوو دوو لەشکرگا بنیاتنران. ئەوجا وردەوردە پاش پەرەسەندنی ئایینی ئیسلام لە ناوچەکە و بەرپابوونی بزووتنەوەی زانستی و ڕۆشنبیریی عەرەبی ئیسلامی بوون بە دوو مەڵبەندی ئێجگار گرنگی ئەم بزووتنەوەیە. لە هەمان ژینگەدا شاری (واست)و شاری (بەغدا) یەکەمیان لە کۆتایی فەرمانڕەوایی

ئەمەوییەکان و دووەمیان لە سەرەتای فەرمانڕەوایی عەباسییەکان، واتە لە ساڵی (١٤٥)کۆچی بنیاتنران و کەوتنەخۆ بۆ وەرگرتنی زانا و هونەرمەند و ڕۆشنبیرە عەرەبە موسڵمانەکان.

باسکردن لە ژینگەی عێراق و لەو بزووتنەوە زانستی و ڕۆشنبیرییە، کە گێڕاویەتی هەڵبەت زۆر دەخایەنێ، بەڵام ئەوەی لەم باسە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ڕەخنەسازیی عەرەبییەوە هەبێت، ئەم خاڵانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** پەیدابوونی دوو ڕێبازی ڕێزمانی، واتە دوو مەدرەسەی نەحوی (واژناسی) کە بە ناوی شاری بەسرە و کوفە ناویانگیانەرکردووە.

ئەم دوو ڕێبازگە ڕێزمانییە بە چەشنێکی زانستی دەستوورەکانی ڕێزمان و زمانی عەرەبییان چەسپاند. ڕەخنەسازیی عەرەبیش لە کارەکەیدا پشتی بەو دەستوورانە دەبەست لە هەڵسەنگاندنی زمانی وێژەیی، بە هۆی بەڵگەکانییەوە بڕیاری هەڵە و ڕاستی بەکارهێنانی وشە و سازکردنی ڕستە و دارشتنی گشتی دەدا. بەم جۆرە مەسەلەی هەڵسەنگاندنی زمانی هۆنراوە لە سووچی بیروڕای کەسییەوە ڕزگاربوو، لەسەر بناغەیێکی زانستی بەرزبووەوە و خۆی چەسپاند.

**دووەم:** لە نزیکی شاری بەسرەوە بە چەند فەرسەخێك بازاڕی (المربد) لەسەر تەرزی بازاڕی (عوکاز)ی سەردەمی جاهیلی پەیدابوو. ئەم بازاڕە جگە لە چالاکییە ئابوورییەکەی، کۆڕی خوێندنەوەی شیعر لە مەڵبەندەکەیدا دەبەسترا و هەستیاران بەرهەمی هۆنراوەیان پێشکەش بە ئامادەبووەکانی ئەم بازاڕە دەکرد. لە مێژووی وێژەی عەرەبیدا زانراوە، کە ئەو بەرهەمە هونەرییانە بە زۆری هونەری (نقائض) بوون. ئەم هونەرەش لە دوو هەڵبەستی جوێندان و هەجوو پێکهاتووە:

**یەکەمیان:** هەستیارێك بۆ هەجووی هەستیارێکی دی دەیهۆنێتەوە.

**دووەمیان:** هەستیاری هەجووکراو بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هەڵبەستە لەسەر هەمان کێش و قافیە هەڵیدەبەستێت.

ئەم هونەرە خۆی لە خۆیدا چەشنێکە لە ڕەخنەسازی، چونکە خاوەنەکانی هەستیارن و بابەتی ڕەوانبێژی بەرزیی پلەی هونەرییان بە سەرچاوەی خۆهەڵکێشان و توانجگرتن تەماشادەکرد. بۆیە بە ناوبانگترین هەستیارانی هونەری نەقائز وەکوو (جەریر) و (فەرەزدەق) و (ئەختەل) و (راعی نومەیری) بە ڕەخنەساز لەقەڵەمدەدرێن جگە لە پشتگیرییکەرەکانیان، کە بەرگریان لە هەستیارانی هەڵبژاردەی خۆیان دەکرد و توانجی ڕەخنەسازییان ئاراستەی هەستیاری دوژمنیان دەکرد. ئەم بزووتنەوە هۆنراوەییە سامانێکی زۆری لە ڕەخنەسازیی

عەرەبی پێکهێنا و بازاڕی (المربد)ی کرد بە بارەگایەك بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی هونەری هۆنراوە.

**سێیەم:** ژینگەی عێراق لە دێرینترین سەردەمەوە بە هۆی شاری (جندی سابوور) و کەنیسەکان و شانشینگای (منازرة) و (تەیسەفۆن) پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ شارستانێتی و ڕۆشنبیریی یۆنانی و ڕۆمانی و میدی و ساسانی بنیاتنا. جا کە ئایینی ئیسلام و ڕۆشنبیریی عەرەبی لەم ژینگەیەدا ڕەگوڕیشەی داکوتا و پەخشبووەوە چەشنە زۆرانبازییەکی ئایدۆلۆجی و بیری پەیدابوو.. مزگەوتی شاری بەسرە بە زۆری شانۆی ئەم زۆرانبازییە بوو، کە لە ئاکامە ڕەخنەسازییەکانی سەلماندنی بێهاوتایی و ئیعجازی قورئانی پیرۆزە.

زانا موسڵمانەکان لەم کۆڕەدا بە هەموو توانایەکیانەوە چاکی لێکۆڵینەوە و توێژینەومیان لێکرد بەلادا، لە هەموو ڕوویێکەوە جوانکاری و ڕەوانبێژی و بەرزی واتا و بیرۆکەی قورئانی پیرۆزیان ڕاگەیاند. ڕێبازیشیان لەم کارە گرنگەدا بەراوردکردنی قورئانی پیرۆز بوو لەگەڵ هەموو نموونەیێکی بەرزی وێژەی عەرەبی و کتێبە ئایینییەکانی وێژەی نەتەوەکانی تر. بەرهەمەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا تابڵێی بە پیت و فراوان بوو، بە تایبەتی لە ڕووی ناوەڕۆك و بیروباوەڕی مێژووی بیرییەوە.

**چوارەم:** لە ساڵی (١٣٢)ی کۆچییەوە، کە ساڵی ڕوخانی فەرمانڕەوایی ئەمەوییەکان و دامەزراندنی عەباسییەکانە، بە چەشنێکی ڕێکوپێك بزووتنەوەی وەرگێڕان دەستیپێکرد. ئەم بزووتنەوەیە هەرچەندە بەر لەم ڕێکەوتە چالاکی هەبوو، بەڵام چالاکییەکەی کەسی و پچڕپچڕ بوو. بۆیە دەتوانین بڵێین وەرگێڕان وەکوو بزووتنەوەیێکی زانستی و ئامانجدار لە سەردەمی جێنشینە عەباسییەکان کەوتە گەڕ. بەتایبەتی لە سەردەمی جێنشین (مەئموون) کە دامەزرێنەری (بیت الحکمة)یە.

لە سەردەمی ئەم خەلیفەیەدا وەرگێڕانی کتێبی هەمەڕەنگ لە زمانی یۆنانی و سریانی و هیندی و میدییەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی دەستیپێکرا. ڕاستە کە زۆربەی کتێبە وەرگێڕدراوەکان، کتێبی زانستی بوون، بە تایبەتی لە بابەتی نۆشداری و بیرکاری ئەندازەیی، بەڵام هەروەکوو لە سەرچاوەکاندا دەردەکەوێ، بیروڕای یۆنانی و هیندییەکان لە زانستی ڕەوانبێژیدا، کران بە عەرەبی هەر لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچییەوە (ئیسحاق کوڕی حەنین) کتێبی (بیوتیکا)ی ئەرستۆی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی.

## • بابەت و سەرچاوە ڕەخنەسازییەکانی نەتەوەی عەرەب

ئەگەر چاوێك بە ناوەڕۆك و فەهرەسی دەستخەت و کتێبە چاپکراوە دێرینەکانی نەتەوەی عەرەبیدا بخشێنین، لە سەرەتای دانانیانەوە بۆمان ساغدەبێتەوە، کە نەتەوەی عەرەب سامانێکی زۆریان هەیە لە کتێب و نامیلکە و وتاری ڕەخنەسازی و بابەتی ئەم سامانە بە پیت و جۆربەجۆرە.

جا بۆ ئەوەی بە چەشنێکی گشتی ناسۆی ئەم سامانە دەستنیشانبکەین و لە ناوەڕۆکەکەی بگەین، وامان بەباش زانی، کە لەم خاڵانەی خوارەوە بابەت و سەرچاوە ڕەخنەسازییەکانی نەتەوەی عەرەب یەکالابکەینەوە:

**یەکەم: سەرچاوە گشتییەکان:**

لە سەرەتای مێژووی دانانی کتێب بە زمانی عەرەبی، هەندێ نووسەری عەرەب نەخشەی دانانی کتێبی گشتیان گرتەدەست، کە لە (ئینسکلۆپیدیا)ی ئەم سەردەمە دەچن. ئەم کتێبە

گشتیانە بابەتەکانیان هەمەڕەنگ و جۆربەجۆرن، لە مێژووی گشتی و تایبەتی دەدوێن و دەقی وێژەیی تۆماردەکەن و هەندێ دەستووری زمان یەکالآدەکەنەوە و چەند سەرنجێکی ڕێزمانی دەچەسپێنن. هەروەها سەرنجی ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژی ئاراستەی دێڕە هۆنراوە و پارچە پەخشان دەکەن، کەوابوو ئەم چەشنە کتێبانە هەرچەندە بە تایبەتی بۆ ڕەخنەسازی دانەنراون، بەڵام هەروەکوو بینیمان لە بابەتی ڕەخنەسازی بێبەری نین. باشترین نموونە بۆ ئەم کتێبانە، کتێبی (البیان و التبین) و (الحیوان)ە، لە دانانی (الجاحظ). هەروەها کتێبی (الکامل)ە، لە نووسینی (المبرد) و کتێبی (العقد الفرید)کە کۆکەرەوەکەی (کوڕی عبد ربە)یە.

**دووەم: کتێبی بێهاوتایی و ئیعجازی قورئان:**

ئەم کتێبانە هەروەکوو گوتمان لە بێهاوتایی و ئیعجازی قورئانی پیرۆز دەکۆڵنەوە و بەرزیی ئایەتەکانی لە چاو دەقە وێژەییەکان لە ڕووی ڕەوانبێژی و ڕوونبێژییەوە دەسەلمێنن: بە مانای ئەوەی ئەم کتێبانە لە بابەتی ڕەخنەسازیی بەراوردکاری دەکۆڵنەوە، وەکوو کتێبی (نظم القران) ی (الجاحظ)و کتێبی (اعجاز القران)ی (باقلانی) و کتێبی (دلائل الاعجاز)ی (الجرجانی) و (النکت فی اعجاز القران)ی (الرمانی).

**سێیەم: کتێبی ڕەخنەسازیی پسپۆڕ:**

ئەم کتێبانە بە تایبەتی لە بابەتی ڕەخنەسازیدا دانراون، وەکوو کتێبی (طبقات الشعراء) ی (کوڕی سلام الجمحی)و کتێبی (الشعر والشعراء)ی (ابن قتیبە)و کتێبی (نقد الشعر) ی (قدامەی کوڕی جەعفەر)و کتێبی (الموازنە)ی (ئامێدی) و کتێبی (الوساط بین المتنبی وخصومە)ی (علی الجرجانی).

## ● یەکەم: کوڕی سەلامی جومەحی

هەروەکوو لە سەرگوزشتەی کوڕی سەلامی جومەحی دەردەکەوێ، ئەم نووسەرە لە ساڵی (١٣٢)کۆچیدا، ماڵئاوایی لەم دنیایە کردووە، واتە: لە سەردەمێکدا ژیاوە کە سەرەتای لەدایکبوون و پێگەیشتن و خەملاندنی شارستانێتی و ڕۆشنبیریی عەرەبییە، چونکە لەو کاتە بزووتنەوەی وەرگێڕان و دانانی کتێبی هەمەچەشنە بە زمانی عەرەبی لە گەڕدابوو و هەموو هۆیەکانی بۆ ئامادەکرابوو، کە بگاتە لوتکەی بەرهەمهێنان و ئەنجام بە دەستەوەدان.

کوڕی سەلامی جومەحی هەروەکوو باسدەکرێ زمانەوان و مێژوونووس و ڕەخنەساز بوو، لە کۆڕی زانستی زمانی عەرەبی و مێژووی جاهیلی و ئیسلامی و ڕەخنەسازیی و هەڵسەنگاندن و هۆنراوەی کتێبی بەنرخ و سوودبەخشی داناوە. گەوهەری ئەم کتێبانە کە پەیوەندییێکی ڕاستەوخۆی بە لێدوانەکەمانەوە هەیە کتێبی (طبقات الشعراء)یە، واتە: کتێبی چینە هەستیارەکان.

## • پێوانەی کوڕی سەلامی جومەحی لە دابەشکردنی هەستیارەکاندا

لە خوێندنەوەی کتێبی چینی هەستیاراندا دەردەکەوێ، کە کوڕی سەلامی جومەحی هەستیارە جاهیلییەکانی بەسەر دە چیندا دابەشکردووە و هەروەها هەستیارە ئیسلامییەکانیش بەسەر هەمان ژمارەدا پۆلێنکردووە و لە هەر چین و دەستەیەکدا چوار هەستیاری دستنیشانکردووە. نووسەری ناوبراو لەم ڕێبازە چینایەتییە، هەڵبەت بە گوێرەی بەرهەمی هەستیارەکان کارەکەی ئەنجامداوە و بڕیاری ڕاددەی بەرزیی هەر هەستیارێکی داوە. پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە پێوانەی ئەم ڕەخنەسازییە دەبێت چی بێت و لە بەر چ هۆیەك ئەم هەستیارەی پێشخستووە و ئەوەی دی دواخستووە؟

کوڕی سەلامی جومەحی خۆی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، بەوەی ئەو لە دابەشکردنی هەستیارەکان بەسەر چینی پلەی جیاواز و دەستەی جۆربەجۆر لە ڕووی بەرزیی ڕاددەی هەستیارییەوە سێ پێوانەی گرتۆتەبەر:

**پێوانەی یەکەم:** زۆری ژمارەی هەڵبەست و پارچە هۆنراوەی هەستیارانە.

**پێوانەی دووەم:** جۆربەجۆری و هەمەڕەنگیی بابەتی هەڵبەست و پارچە هۆنراوەی هەستیارانە.

**پێوانەی سێیەم:** پلەی بەرزیی هەڵبەست و پارچە هۆنراوەی هەستیارانە،

لە ڕووی وشەسازی و ڕەخنەسازی و دارشتنی گشتی و ناوەڕۆکەوە، ئەگەر کتێبەکەی کوڕی سەلامی جومەحی بخوێنینەوە بۆ ئەوەی بزانین تا چ ڕاددەیەك ئەم سێ پێوانەیەی بەکارهێناوە و لە مەیدانی پراکتیکدا چلۆن نرخی هەستیارەکانی لەبەر تیشکی مەسەلەی چینایەتیدا هەڵسەنگاندووە، بۆمان ساغدەبێتەوە، کە ئەم ڕەخنەسازە تەنیا پێوانەی زۆری هەڵبەست و پارچە هۆنراوەی هەستیارەکانی بەکارهێناوە و دوو پێوانەکەی دی تا ئەندازەیێکی زۆر فەرامۆشکردووە. بەڵگەشمان بۆ چەسپاندنی ئەمڕاستییە ئەوەیە: کوڕی سەلامی جومەحی لە باسکردنی (الاسود کوڕی یەعفەر)دا دەڵێ: ئەم هەستیارە تاقە هەڵبەستێکی پایەبەرزی هەیە. ئەگەر بهاتایە و هەڵبەستێکی دیکەی ببووایە، پێشمدەخست و پلەیێکی بەرزم دەدایە.

هەروەها تا ڕاددەیێکی زۆر پێوانەی بەرزی بەرهەمی هەستیارەکانی پشتگوێخستووە و چۆنێتی هونەری هەڵبەستی لە چاو هەمەچەشنەیی بابەتدا، فەرامۆشکردووە. بۆ نموونە (جمیل بثینە) کە هەستیارێکی پایەبەرزی دڵدارییە لە چینی شەشەمی هەستیارە ئیسلامییەکاندا داناوە و (کوثر عزە) لە چینی دووەم، هۆی پێشخستنی (کوثر عزە) و پاشخستنی (جەمیل)

تەنیا ئەوەیە، کە (جەمیل) هەرچەندە لە ڕووی هونەرییەوە لە (کوثر عزە) پایەبەرزترە، بەڵام لە ڕووی جۆربەجۆریی هۆنراوەوە تەنیا لە بابەتی دڵدارییەوە بەرهەمی هەیە، کەچی (کوثر عزە) جگە لە بابەتی دڵداری، هەڵبەستی ستایش و پێهەڵدان و هەجووی هۆنیوەتەوە. ئەم تێبینییەمان هەڵبەت ئەوە دەگەیەنێ، کە کوڕی سەلامی جومەحی وەکوو ڕەخنەسازێك لە مەسەلەی دابەشکردنی هەستیاران لەسەر پلەی هونەری چینی ڕاستینەدا، ڕێبازێکی سەرکەوتووی نەگرتۆتەبەر و تاڕاددەیێکی فرە وەکوو مێژوونووسێکی وێژەی عەرەب، کارەکەی ئەنجامداوە. ئەمە ڕاستییەکە بەڵام ئایا ئەم ڕاستییە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەم ڕەخنەسازە هیچ لایەنێکی ڕەخنەسازیی ڕاستینەی پەیڕەونەکردووە؟

## • چەمکی ڕەخنەسازیی لای کوڕی سەلامی جومەحی

ڕەخنەسازیی عەرەبی وەکوو لەمەوبەر لێیدواین ساغبۆتەوە بە زۆری لە هەڵچوونێکی کەسییەوە سازدەکرا و ڕەخنەساز لە هەڵسەنگاندنی دەقی وێژەییدا پشتی بە چەشە و چەژەی تایبەتی خۆی دەبەست. بۆیە لە ئاکامدا ئەم ڕەخنەسازییە لە کۆڕی زمان و ڕێزماندا، تا سەدەی دووەمی کۆچی زانستی نەبوو.

ئەم دۆخەی ڕەخنەسازیی عەرەبی بە ڕای ئێمە لەسەر دەستی کوڕی سەلامی جومەحیدا چارەسەرکرا و لە گۆشەی هەڵچوونی کەسی و چەشەی تایبەتییەوە ڕزگارکرا، ئەم ڕەخنەسازە عەرەبە توانی لەسەر ئەم دوو بناغەیەی خوارەوە چەمکێکی زانستی بۆ سازبکات:

بناغەی یەکەم مەشق و ڕاهێنان و پراکتیکە، کوڕی سەلامی جومەحی لەبەر تیشکی ئەم بناغەیەدا سەلماندوویەتی، کە ڕەخنەسازی دەبێت لە نرخشوناسی وێژەدا، خاوەن مەشقێکی فرە بێت و لەگەڵ خوێندنەوەی وێژەراندا ڕاهاتبێت و لە کۆڕی ڕەخنەسازاندا پراکتیکی بێ شوماری هەبێت، بە مانای ئەوەی هیچ کەسێك ناتوانێ لە خۆیەوە گورزی توانجگرتن و ڕەخنە و پلارهاویشتن بگرێ بە دەستەوە و بڕیاری چاکە و خراپەی دەقی وێژەیی بدات. بۆیە کوڕی سەلامی جومەحی لەم ڕووەوە دەگێڕێتەوە، کە کابرایەك بە ڕەخنەسازی بە ناوبانگی عەرەبی (خلف الاحمر)ی وت: ئەگەر هاتوو دڵم نووسا بە دەقێکی وێژەییەوە و لەزەتم لێبینی و پێی قایلبووم، ئیتر چ تۆ و چ هاوڕێ ڕەخنەسازەکانت دەرحەق بەو دەقە هەرچی بڵێن بە لامەوە گرنگ نییە و باکم پێی نییە. (خلف الاحمر) بە کابراکەی وت: باشە با وابێت، بەڵام ئەگەر هاتوو بیرێکی قەڵبت لە بەر جوانی ڕووکەشەکەی پەسندکرد و پارەشووناس بەو لیرەیە

قایلنەبوو، ئایا پەسندکردنەکەت هیچ سوودێکی بۆت دەبێت و لیرە قەڵبەکە بە هۆی ناشارەزایی تۆوە دەبێت بە لیرەیێکی ساغ؟!

کوڕی سەلامی جومەحی بەو ڕیوایەتە دەڵێ: ڕەخنەسازیی هەڵبەت کارێکی کەسی نییە، بەڵکوو ئاکامی تاقیکردنەوەی خاوەن خێر و پراکتیکە.

سەرئەنجام ئەم ڕەخنەسازە بلیمەتە بناغەی دووەمی چەمکی ڕەخنەسازی لەبەر ڕۆشنایی زانست بنیاتدەنێت و دووپاتیدەکاتەوە، کە هۆنراوە پیشەسازییەکە لە پیشەسازییە بە ناوبانگەکان. بۆیە ئەو کەسەی لەم پیشەسازییە دەکۆڵێتەوە، دەبێت پشت بە زانست و زانیاری ببەستێ. کوڕی سەلامی جومەحی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بناغەیە، نرخشووناسی دەقی هۆنراوەی لەگەڵ زانینی چەشنەکانی دارخورما و هەڵسەنگاندنی مرواری و دۆزینەوەی تایبەتییەکانی (کانە بە نرخەکاندا) بەراوردەکات و دەڵێت: ئەو کەسەی چاکی ڕەخنەسازی بەلادا دەکات، پێویستە شارەزایی پیشەسازیی هۆنراوە بێت و بزانێ ئەم بەرهەمی وشەیە چلۆن دێتەبەر و توخم و ڕەگەزەکانی چین و بەچەند قۆناغدا تێدەپەڕن، بۆ ئەوەی بوون و قەوارەیێکی یەکگرتوو پێکبهێنن

کوڕی سەلامی جومەحی لەم دوو بناغەیەی چەمکی ڕەخنەسازی، ڕەنگە زیاد لە ڕادە ڕۆیشتبێت و شوێنەواری هونەر و چەشەی فەامۆشکردبێت، چونکە ڕەخنەسازی بە زانست و تاقیکردنەوە و جۆرەکانی دیکەی زانیاری لە قەڵەمداوە، بەڵام دەبێت بزانین کە هۆی دەربازبوونی لەو ڕاددەیە لەوە هاتووە، کە ڕەخنەسازیی عەرەبی لە کۆڕی زمان و ڕێزمان و هەڵچوونی مەزهەبی لە سەردەمەکەدا کەوتبووە داوی سەرنجی کەسی نازانست و تووشی گێرەشێوێنییێکی بێسنوور ببوو.

## • توێژینەوەی دەقی وێژەیی لە کتێبی چینە هەستیارەکاندا

باشترین سەرنجی ڕەخنەسازی لە کتێبی چینە هەستیارەکاندا، ڕەنگە توێژینەوە و تەحقیقی دەقی وێژەیی بێت، چونکە خاوەنی ئەم کتێبە گرنگە کوڕی سەلامی جومەحی بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕەخنەسازیی عەرەبیدا سەرنجی زانا و وێژەرانی ڕاکێشا بۆ دیاردەی وێژەی ساختە و بەدرۆهەڵبەستراو و هۆیە جۆربەجۆرەکانی ئەم دیاردەیە، کە ڕامیاری و ئایین و ئابووری و خێڵایەتین خستەڕوو و دووپاتیکردەوە، کە ڕەخنەسازی بەر لەوەی دەقی وێژەیی هەڵبسەنگێنێ پێویستە دڵنیابێت لەوەی ئەو دەقە هی خاوەنەکەیەتی و بە درۆ بە زمانییەوە دانەنراوە و قەڵب

و ساختە نییە.

ئـەم کارەی کـوڕی سـەلامی جومەحـی بە قوولّـی لە جیهانی ڕەخنەسـازیی عەرەبیدا، دەنگیدایـەوە و سـەرئەنجامێکی زانسـتی هێنایەبەرهـەم، وەکـوو (دکتـۆر تەهـا حوسـێن ) و (مەرگریۆس) ئەم سەرئەنجامەیان کرد بە بیانوو، بڕیاری ئەوەیان دا، کە سەردەمی جاهیلی دروستکراوە و دەقەکانی ساختەن.

## ● دووەم: کوڕی قوتەیبەی دەینەوەری

کوڕی قوتەیبەی دەینەوەری لە سـالّی (٢١٣)کۆچی لەدایکبووە و لە سـەرەتای سـالّی (٢٧٦) کۆچیدا مالّئاوایی لەم جیهانە کردووە و بەرهەمی جۆربەجۆری لە فقە و شەریعەتی ئیسلامی و میژوو و زانستەکانی زمان و ڕەخنەسازی بۆ بەجێهێشتووین.

ئەم بەرهەمە جۆربەجۆرانە، کە هەموویان دەربارەی زمانی عەرەبی نووسراونەتەوە، پلەییکی بەرزیان بۆ کوڕی قوتەیبەی دەینەوەری لە جیهانی شارستانێتی و ڕۆشـنبیریی ئیسـلامیدا سـازکردووە، بە تایبەتی بەرهەمە ڕەخنەسـازییەکەی، کە بە ناوی (الشـعر و الشـعراء) واتە: هۆنراوە و هەستیارەکان داینـاوە.

کوڕی قوتەیبەی دەینەوەری لە پێشەکی کتێبەکەیدا، باسی بابەت و ناوەڕۆکی دانراوەکەی دەکات و سـەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشـێ، کە لە دووتوێی ئەم کتێبەدا، باسـی ژیانی هەستیارانی سەردەمی جاهیلی و ئیسلامی دەکات و بیروڕای زاناکان دەربارەیان تۆماردەکات، وشە گران و دەربڕینە ڕەوانبێژییەکانیان ڕاڤەدەکات و لایەنی چاکەی هەلّبەستەکانیان دەستنیشاندەکات و هەرچی توانج و عەیبلێگرتن هەبێت دەربارەیان دەیانخاتەڕوو. هەروەکوو لەم ناوەڕۆك و بابەتانەدا دەردەکەوێ، کتێبی (هۆنراوە و هەسـتیارەکان) هەمووی لە کۆڕی ڕەخنەسـازی ناکۆلّێتەوە و دانراوێکی پسـپۆڕ بە هەلّسـەنگاندنی هۆنراوە و هونەرمەندەکانی نییە، بەلّکوو بەرهەمێکی گشتی لە ویژە باسکەرە. بۆیە دەتوانین بلّێین ئەم کتێبە لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت:

یەکەم: ئەم بەشـە کە لە پێشـەکی کتێبەکە پێکهاتووە، تایبەتە بە بابەتی ڕەخنەسـازی، چونکە لە پێوانەی هۆنراوەی پەسەندکراو دەکۆلّێتەوە و بەوردی مەسەلەی زۆرانبازی لە نێوانی نوێخوازی و پشتگیریکردن لە کۆنیدا شیدەکاتەوە و چەشنەکانی هۆنراوە دەستنشیاندەکات.

دووەم: ئەم بەشە لێکۆلّینەوەیێکی فراوانە لە ژیان و بەسەرهاتی کۆمەلّێك لە هەستیاران، کە دەتوانین بە لێکۆلّینەوەیێکی میژووی ویژەی لە قەلّەمبدەین، چونکە بە شێوەیێکی ساکار

لە سەرگوزشتەی هەستیارە باسکراوەکان و تۆمارکردنی چەند نموونەیەك لە هەڵبەستەکانیان پێکهاتووە.

## • چەشنەکانی هۆنراوە لە چەمکی کوڕی قوتەیبەدا

هۆنراوە هەروەکوو لەم سەردەمەماندا ساغبۆتەوە بەرهەمێکی یەکگرتووە. ئەگەر لەبەر هۆیێکی فێرکردن سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشین، کە لە ڕەگەزی ناوەڕۆك و لە ڕەگەزی فۆڕم پێکهاتووە، بە هیچ ڕەنگێ ناتوانین ئەم دوو ڕەگەزە یەکدیگیرە لە یەکتر بپچڕێنین.

سەرئەنجام هیچ ڕەخنەسازێکی هاوچەرخی پسپۆڕ بۆی نییە چەشنەکانی هۆنراوە لەسەر مەسەلەییێکی ڕەگەزی بژمێرێ، بەڵام کوڕی قوتەیبە ئەم ڕوانگەیەی فەرامۆشکردووە، یان ڕەنگە هەر بیری لێنەکردبێتەوە. بۆیە کە باسی لایەنە چاکەکانی هۆنراوەی کردووە، بڕیاری ئەوەی داوە، کە ئەم لایەنانە بە گوێرەی ڕەگەز و چەشنەکانی هۆنراوە چوار جۆرن:

**یەکەم:** هۆنراوە هەیە وشەکانی جوانن و واتاکەشی جوانە، ئەم چەشنانە بەزرترین نموونەی هۆنراوەن.

**دووەم:** هۆنراوە هەیە وشەکانی هونەری و ئاوازدار و ڕەوانن، بەڵام واتاکانی هیچوپووچن.

**سێیەم:** هۆنراوە هەیە واتاکانی سوودمەند و بەکەڵك و باشن، بەڵام وشەکانی لاواز و نارەوانن.

**چوارەم:** هۆنراوە هەیە نە وشەکانی باشن و نە واتاکانیشی بەکەڵکن.

کوڕی قوتەیبە لەم دابەشکردنەی هۆنراوە بە گوێرەی وشە و واتا، هەرچەندە بۆ هەرچەشنێك نموونەی جۆربەجۆر لە هۆنراوەی عەرەبی دەهێنێتەوە، بەڵام ڕێبازێکی زانستی لە شیکردنەوە و یەکالاکردن و سەرنجی ڕەخنەسازی ئاراستەکردن ناگرێتەبەر، بەڵکوو بەسەردێڕ چەشنەکە دەستنیشاندەکات و نموونەکانی تۆماردەکات، بۆیە بە لای ئێمەوە ئەم کارە چەند سەرنجێکی ڕووکەشییە و بۆ مەبەستی تێبینی ڕواڵەتی نووسیوەتەوە و بە هیچ ڕەنگێ بەرهەمی مێشکی ڕەخنەسازێکی خاوەن ڕێباز نییە.

## • پێوانەی کوڕی قوتەیبە لە دەستنیشانکردنی هۆنراوەی پایەبەرز

کوڕی قوتەیبە هەرچەندە لە شیکردنەوەی ڕەگەزەکانی هۆنراوە و چەسپاندنی پێوانەی هەڵسەنگاندنی هەر ڕەگەزێك لەو ڕەگەزانە سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام لە بابەتی دەستنیشانکردنی هۆنراوەی پایەبەرزدا، تا ڕاددەیێکی زۆر ڕێبازێکی هونەری و زانستی گرتۆتەبەر، چونکە

لەم ڕووەوە پێوانەیێکی ڕەخنەسازیی هونەرمەندانەی سازکردووە و وتویەتی: بڕوا ناکەم هیچ ڕەخنەسازێکی خاوەن زەین و تەجروبەدار، هەستیارێك لە هەستیارە دێرینەکان لەبەر زۆری هەڵبەستەکانی پێشبخات. بە تایبەتی ئەگەر هاتوو ڕێگای لاساییکردنەوە و بە هەڵەداچوونی نەگرتبووبەر، چونکە پێوانەی زانستی باشیی هەڵبەستەکانی ئەو هەستیارمیە، نەك زۆریی هەڵبەستەکانی و دێرینی سەردەمەکەی.

هەروەها لە هەمان ڕوانگەوە دووپاتیدەکاتەوە، کە هەستیاری چاك و هۆنراوەی پایەبەرز نەبەستراوە بە سەردەمێکی تایبەتییەوە، واتە: هەستیاری دێرین هۆی باشییەکەی ئەوە نییە. چونکە لە سەردەمێکی دێریندا ژیاوە و بەس، یاخود هەڵبەستی کۆن لە بەر مێژووە کۆنەکەی بە هەڵبەستێکی پایەبەرز لە قەڵەمنادرێ. لە هەمان کاتدا هەستیاری هاوچەرخ بە چاوێکی بێفەرانە تەماشاناکرێ، لەبەر ئەوەی لەگەڵمان دەژی و هاوکات و هاوشوێنمانە، بە هەمان شێوە پێوانەی بەرهەمی هۆنراوەی تازە نابێت بڕیاری خراپ و ناهونەری بەسەردا بسەپێنرێ، بە بیانووی ئەوەوە کە لە مێژووی ورێژەدا تەمەنی کورتە. کوڕی قوتەیبە لێرەدا بەرەنگاری پرسیارێك دەبێت، کە لێیدەپرسی بۆچی نابێت پێوانەی دێرینی و کۆنی لە دەستنیشانکردنی پایەی هۆنراوەی هەستیاراندا بەکاربهێنرێت؟! ئەم ڕەخنەسازە خۆی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ: هۆی فەرامۆشکردنی دێرینی و کۆنی لەوەوە هاتووە، کە خوای مەزن بەهرەی هونەری تەنیا نەداوە بە هەستیارە دێرینەکان و هەستیارە هاوچەرخەکانی لێبێبەشبکات، بەڵکوو ئەم بەهرەیە بەخشندەیێکی هەمیشەییە بۆ هەموو کات و زەمانێك، بۆیە هەستیاری دێرین دەشێ باش بێت و دەشێ خراپ، هەروەها هەستیاری هاوچەرخ ڕەنگە پایەبەرز بێت و ڕەنگە لە کارەکەیدا هیچ نرخێکی هونەری نەبێت. جگە لەمە سیفەتی دێرین و کۆن شتێکی مەزن نییە و سیفەتی تازەش بارێکی هەمیشەیی نییە، ئەوەی ئەمڕۆ بە دێرین و کۆن لە قەڵەمدەدرێ، لە کاتی خۆیدا بە تازە و نوێ ناوبراوە و ئەوەی ئێستا بە چاوی تازە و نوێ تەماشادەکرێ. لە داهاتوودا دەبێت بە دێرین و کۆن. کوڕی قوتەیبە هەروەکوو لەم بڕیارانەدا ئاشکرایە زیرەکانە بەشداری لە زۆرانبازی نەمریی نێوانی کۆن و نوێدا دەکات و هەڵوێستێکی هونەرمەندانە و زانستی دەنوێنێ. ئەم هەڵوێستەش هەڵبەت دەستکەوتێکی گرنگە بۆ مێژووی ڕەخنەسازیی عەرەبی، چونکە ڕێبازێك تەختدەکات بۆ ڕەخنەسازیی عەرەبەکان، ڕێنوێنییاندەکات لە پێناو ڕێخۆشکردنی بزووتنەوەی نوێخوازی لە هونەری هۆنراوەدا دەیسەلمێنێ کە هەستیار بۆی هەیە بگاتە لوتکەی هونەر لە هەموو کات و شوێنێکدا، ئەگەر هاتوو خاوەن بەهرە بوون، بەڵام دیسانەوە دەبێت لێرەدا بپرسین: ئایا کوڕی قوتەیبە لە مەسەلەی نوێخوازی و تازەکردنەوەی

هۆنراوەدا هەموو سنوورەکانی شکاندووە و ڕێگای بۆ هەستیاران بەرەڵلاکردووە یان بە پێچەوانەوە سنووری کێشاوە و چەند کۆسپ و تەگەرەیێکی لەم کۆڕەدا چاندووە؟!

## • کوڕی قوتەیبە و سەرچاوەی هۆنراوەی ڕاستینە[1]

کـوڕی قوتەیبـە لـە کتێبەکەیدا (ادب الكاتب) وەڵامی ئەم پرسـیارە بـە ڕوونی دەداتەوە و دەڵێ: سـەرچاوەی هۆنراوەی ڕاسـتەقینە و شـێوازی پێگەیاندنی هەستیاری خاوەن بەهرە، تەنیا بە هۆی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ.) و وتار و دواندنی جێنشین و دەمڕاسـتە موسـڵمانەکان و سـامانی هۆنراوەی عەرەبی سەردەمی جاهیلی و ئیسلامی بە دەستدەهێنرێ و چەشەی بەهەرمهێنانی هەڵبەست بەوە تێکدەدرێ، ئەگەر هاتوو داواکەرەکەی خۆی خستە داوی زانسـتە بێگانە وەرگێڕاوەکان، وەکوو زانستی مەنتیق و لۆجیك و فەلسەفە.

کەوابوو کوڕی قوتەیبە دەرگای ڕۆشنبیریی ناعەرەبی و ناموسڵمانی بەتوندی لە ڕووی هەستیاراندا دادەخات و بواری ئەومیان ناداتێ، کە ڕۆشنبیریی نەتەوەکانی دی موتوربەبکەن و بیکەن بە سەرچاوەی هەڵبەست هۆنینەوە.

سـەرئەنجام نوێخوازی و تازەکردنەوەی هۆنراوە لە لای کوڕی قوتەیبەدا سـنووری هەیە و لەسـەر بناغەیێکی تایبەتی دەمەزراوە. ئەم سـنوورەش لە سـامانی ڕۆشـنبیریی موسـڵمان دەرنەبازنەبووە و بناغەکەشی خۆ پاراستنە لە هەموو شوێنەوارێکی بێگانە.

ئـەم ڕایـەی کـوڕی قوتەیبە بە لای ئێمـەوە لە ڕووی بیردۆزییەوە، ڕێبازێکی ڕاسـت و ڕەوایـە، چونکـە هەمـوو نەتەوەیەك دەبێت کەسـایەتیی خۆی بپارێـزێ و لە هیچ بۆتەیێکی بێگانەدا خۆی نەتوێنێتەوە. بۆیە ئێمە لەو بڕوایە داین، کە ئەم ڕەخنەسازە بە هۆی بیروڕاکەیەوە شوێنێکی تایبەتی لە جیهانی ڕەخنەسازیی عەرەبیدا بۆ خۆی داگیرکردووە.

## • سێیەم: قودامەی کوڕی جەعفەر

ئەم ڕەخنەسازە، لە ساڵی (٢٧٥)کۆچی لەدایکبووە و لە ساڵی ٣٣٧کۆچیشدا ماڵئاوایی لەم جیهانە کردووە. لە کۆڕی زمانی عەرەبی و نووسینی دیوانی میری، پایەیێکی بەرزی هەیە و لە مەیدانی ڕەخنەسازیدا کتێبی (ڕەخنەسازیی هۆنراوە - نقد الشعر)ی بۆ بەجێهێشتووین.

ئـەم کتێبـە لـە مێژووی ئەدەبیاتی عەرەبیدا، جێگای مشـتومڕی نووسـەرە عـەرەب و ڕۆژهەڵاتناسـەکانە. هەندێك لەم نووسەرانە ڕایان وایە، کە کتێبی (نقد الشعر) سەرئەنجامی

---

[1] واتە، ڕاستەقینە

تەئسیر و کارکردنی ڕەخنەسازیی یۆنانییە لە چەشە و ڕەخنەسازیی عەرەبی. هەندێکی دیکەیان لەمە زیاتر دەڕۆن و دووپاتیدەکەنەوە، کە ( قودامەی کوڕی جەعفەر) لە کتێبی (ڕەخنەسازیی هۆنراوە)دا چاوی لە ئەرستۆ کردووە و شوێنپێی کتێبە بە ناوبانگەکەی (بیوتیکا) واتە (فن الشعر)ی هەلگرتووە. ئێمەش لەم مشتومڕەدا هەڵبەت دەبێت کتێبەکە شیبکەینەوە و پوختەی ناوەڕۆکەکەی لەگەڵ بیرۆکەکانی ئەرستۆ بەراوردبکەین، ئەوجا ڕاستی زانستی خۆمان بخەینەڕوو.

## • پێناسەی هۆنراوە لە نێوان ئەرستۆ و قودامەی کوڕی جەعفەردا

بیرۆکەی ڕەخنەسازیی سەرەکی لە کتێبی (بیوتیکا)ی ئەرستۆ و (نقد الشعر)ی قودامەی کوڕی جەعفەر پێناسەی هۆنراوەیە، چونکە ئەم دوو ڕەخنەسازە لە بەر تیشکی چەمکی شیعر و پێناسەکەیدا لایەنەکانی دی ئەم هونەرە شیدەکەنەوە و پێوانەکانی نرخپێدانیان دەچەسپێنن. جا با لە هەنگاوی یەکەمی ئەم لێدوانەماندا بزانین ئەرستۆ چلۆن پێناسەی هۆنراوەی کردووە.

ئەرستۆ لە کتێبی بیوتیکادا، شیعر بەوە پێناسە دەکات، کە هونەری لاساییکردنەوەی سروشتە. بێگومان ئەم پێناسینە لە تێڕوانینی فەلسەفییەوە سازکراوە، چونکە لە مەسەلەیێکی گشتییەوە، کە سەرچاوەی شیعرە، ئەم هونەرە دەستنیشاندەکات و ڕێگای سازکردنی دەخاتەڕوو ئەوجا ڕەگەزەکانی یەکالادەکاتەوە، کەچی قودامەی کوڕی جەعفەر لە ڕوانگەیێکی هەستپێکراو و تەنگەبەرەوە دەڕوانێتە هونەری هۆنراوە و پێناسەکەی دەچەسپێنێ و دەڵێ: "شیعر ئاخاوتنێکە کێش و قافیەی هەیە و واتایەك دەبەخشێ".

ئەم پێناسەیەی شیعر لە لای قودامەی کوڕی جەعفەر هەروەکوو ئاشکرا و دیارە لە گۆشەیێکی ڕواڵەتییەوە دەڕوانێتە شیعر، کە مەسەلەی ڕەگەزەکانییەتی و ئەم ڕەگەزانەش چوارن:

١- ڕەگەزی وشە و ڕستە داڕشتنە، کە بە زاراوەی (الکلام - ئاخاوتن)سەرنجمان بۆ ڕادەکێشێ.

٢- ڕەگەزی کێشە، کە شیعر لە پەخشان جیادەکاتەوە و ئاوازی ئەم هونەرە دەخاتەڕوو.

٣- ڕەگەزی سەروایە، واتە قافییە، کە پەخشانی ڕستە کۆتایی پێهێنراو بە دەنگی دووبارەکراوە، واتە (نەسری مەسجوع) لە هەڵبەست جیادەکاتەوە، چونکە سەروا (قافیە) لە هەڵبەستدا کۆمەڵە دەنگێکە، دەنگە کۆتاییەکانیان بە گوێرەی یاسایێکی تایبەتی لە کۆتایی

هەموو دێڕێکی هەڵبەستەکە دووبارەدەکرێتەوە و دەوترێتەوە.

٤- ڕەگەزی واتایە، هەموو شیعرێك دەبێت واتای هەبێت و لە بابەتێك بدوێت. ئەم ڕەگەزەش بێگومان ڕستە و دارشتنی کێشی ئاوازدار لە ئاخاوتنی کێش و سەرواداری خاوەن واتا جودادەکاتەوە.

قودامەی کوڕی جەعفەر لە پێناسەی شیعردا ڕەخنەسازێکی ڕواڵەتییە، بە پێچەوانەی ئەرستۆوە، کە لە بیرۆکەیێکی ئایدیالیستی و میسالییەوە دەچێ بۆ پێناسەی شیعر و یەکالاکردنەوەی ڕەگەزەکانی. ئیتر نازانین بۆچی ئەو نووسەرانە سوورن لەسەر ئەوەی قودامەی کوڕی جەعفەر شاگردی ئەرستۆیە و لە دانانی کتێبەکەیدا چاوی بڕیوەتە بیوتیکا؟!

هەرچۆنێك بێت ئێمە ڕامان وایە، کە ئەرستۆ و قودامەی کوڕی جەعفەر لە جیهانی ڕەخنەسازیدا، ئاسمان و ڕێسمانن و هیچ پەیوەندییێکی ڕاستەوخۆ لە نێوانیاندا بەدیناکرێت.

## ● کەموکوڕی پێناسەکەی قودامە دەربارەی شیعر

پێناسەکەی قودامە دەربارەی هونەری شیعر، کە وتمان لە تێڕوانینێکی تەنگەبەر و ڕواڵەتییەوە سازکراوە، هەرچەندە تەمەنی لە هەزار و سەد ساڵ زیاتر دەبێت، بەداخەوە تا ئێستا باڵی بەسەر زۆربەی کۆڕە ڕەخنەسازییەکانماندا کێشاوە و بە دەگمەن ڕەخنەساز دەبینیت خۆی لە کۆت و زنجیری چوار ڕەگەزەکەی ئەو پێناسەیە ڕزگارکردبێت.

بێگومان ئێمە ناڵێین شیعر ئاخاوتن نییە و نابێ کێش و قافییەی هەبێت و واتایەك نەبەخشێت، بەڵام دەپرسین، کە سنووری کێش و قافیەی شیعر چییە؟ ئایا هەر عەروزەکەی فەراهیدی و ئەخفەشە یاخود لەو عەرووزە تێدەپەرێت و مۆسیقا و ئاوازی بوون و سروشت دەکات بە سەرچاوەی ئەمریی خۆی، تریە و ئیقاعی لە هەڵچوون و دەمارگیری شاعیرەوە وەردەگرێ؟ یاخود واتای شیعر هەردەنگی عەقڵ و هۆشمەندی و مەنتیقە یان لەمە قووڵترە و خوریە و ئیلهام لە هەست و نەستی (لاوعی) هونەرمەندەوە وەدەستدێنێ؟!

ئەمانە پرسیارن، وەڵامەکانیان بە ڕای ئێمە دیار و ئاشکران و سەرەڕای ئەم وەڵامانەش ئێمە تێبینیدەکەین، کە قودامە سێ ڕەگەزی گرنگی شیعری فەرامۆشکردووە:

**ڕەگەزی یەکەم:** سۆز و هەڵچوونی شاعیرە، کە تاقە سەرچاوەی کێش و قافیەیە، هەموو لایەنە ئاوازبەخشەکانی هەڵبەستە.

**ڕەگەزی دووەم:** ئەندێشە و خەیاڵە، کە کارگەی سازکردنی زمانی شیعرە، بە هۆی هێزە

پەنهانییەکەیەوە، وێنەی هونەری هەڵبەت لە خوازە و درکە و خواستە و لێکچواندن دێتەبەرهەم.

**ڕەگەزی سێیەم:** کە ڕەگەزێکی بنەڕەتییە. تەجروبە و تاقیکردنەوەی هەستیارە. ئەم ڕەگەزە هەڵبەت ماک و مایەی خوڵقاندنی هونەری شیعرە و شاعیر تەنیا لە بەر هێزی کاریگەریی سۆز و هەڵچوونی دەجووڵێ و هەڵبەست دەهێنێتەئەنجام.

## • پێوانەکانی قودامە لە هەڵسەنگاندنی هۆنراوەدا

قودامەی کوڕی جەعفەر پاش ئەوەی پێناسەی هۆنراوەی پێشکەشکرد. ڕەگەزەکانی شیکردەوە و دەستیکرد بە چەسپاندنی پێوانەکانی هەڵسەنگاندنی هۆنراوە، کە بە گوێرەی ڕەگەزی وشە و واتا و کێش و قافیە جۆربەجۆرن. ئەم ڕەخنەسازە لە پێشەکی یەکالاکردنەوەی ئەو پێوانانە، بڕیارێك دەربارەی پلەی هۆنراوە دەچەسپێنێ و دەڵێ: هۆنراوە سێ پلەی هەیە:

**پلەی یەکەم: هۆنراوەی بەرز و باڵا**

**پلەی دووەم: هۆنراوەی مامناوەندی**

**پلەی سێیەم: هۆنراوەی نزم و بێنرخ**

ئەم بڕیارە هەڵسەنگێنەرە بە لای ئێمەوە بڕیارێکی ڕەخنەسازی نییە. چونکە هۆنراوە بۆ ئەوەی هونەری و ڕاستینە بێت. هەر دەبێ پلەکەی بەرز و باڵا بێت. بەڵام ئەگەر هاتوو پلەکەی مامناوەندی و نزم بوو، ئەوا ئیتر هۆنراوە نییە. ئەمە ڕاستییێکی ڕەخنەسازییە. کەچی قودامە لە تیشەکەیدا کارە ڕەخنەسازییەکەی ئەنجامنادات، بەڵکوو دوای ڕێبازی دابەشکردنی ڕووکەشی دەکەوێت و هەر خەریکی چەسپاندنی چەشن و جۆر دەبێت. بۆیە پێوانەکانیشی لە هەڵسەنگاندنی هۆنراوەدا یەکدیگیر و یەکگرتوو نین.

بە گوێرەی چوار ڕەگەزەکەی هۆنراوە بەسەر چوار بەشدا دابەشدەبن. ئەم دابەشبوونە دووبارە بە لای ئێمەوە وا لە پێوانەکان دەکات، کە لە ڕاستی هونەری هۆنراوە بپچڕێن و توانای هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەسازی هۆنراوەیان نەبێت. سەرەڕای ئەوەش هەر پێوانەیەك لەو چوار پێوانەیە لە هەڵسەنگاندنی ڕەگەزەکەیدا سەرنەکەوتووە. چونکە خۆی لەگەڵ ڕەگەزەکەیدا خەریکدەکات و لە ڕەگەزەکانی دی دادەبڕێ. بۆ نموونە پێوانەی هەڵسەنگاندنی وشە بڕیاری ئەوە دەدا، کە وشەی هۆنراوەی پلە بەرز و باڵا پێویستە سازگەی دەنگەکانی ئاسان و سووك بن و قەوارەکەیان لە گوێدا قورس و گران نەبێت و لە چەمکی گوێگردا ڕاستەوخۆ ناسراوبن. بەڵام ئەم پێوانە و وشەسازییە بە هیچ ڕەنگێ سەرنج لە واتای هۆنراوە نادات. لە کاتێکدا ڕستە و واتا

لە یەکتر جیانابنەوە. بگرە هەردووکیان پێکەوە ئاوێتەیەك پێکدەهێنن و هەمیشە یەکلیگرن. هەروەها پێوانەی واتاش پێوانەیێکی ڕووکەش و سادەیە، چونکە بە چەشنێکی پچڕاو واتای هۆنراوە لە چوارچێوەی بابەتەکانی شیعردا، کە ستایش و هەجوو و شیوەن و دڵداری هەڵنسەنگێنێ و وەکوو بەرهەمێکی عەقڵی و هۆشمەندی لەقەڵەمددا، بۆیە سنوورێکی پۆلاییین بۆ واتاکانی هەر بابەتێك لە بابەتەکانی هۆنراوە بنیاتدەنێ. بۆنموونە، لە واتای ستایشدا دەڵێ: هەستیار دەبێت بۆ ئەم بابەتە هۆنراوەییە باسی ئازایەتی و زیرەکی و دەستبڵاوی و دادپەروەری ستایشکراو بکات، کەچی ئێمە دەزانین واتا لە هۆنراوەدا سنووری نییە و ناتوانرێ بنواشەی دەستکردی بۆ دابنرێ، چونکە واتا لە هۆنراوەدا دەنگی تاقیکراوەیێکی خودی کەسی هەستیارەکە لە هەستیارێکەوە بۆ هەستیارێکی دیکە و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی دەگۆڕێ.

هەرچۆنێك بێت کتێبی (نقد الشعر)ی قودامە لە ڕوانگەی ڕەخنەسازیی هاوچەرخمانەوە نرخێکی ئەوتۆی نییە، بەڵام بۆ سەردەمی خاوەنەکەی کارێکی ڕێك و پێك و مەنتیقییە و سوودە ڕاستینەکەی لەوە دایە، کە توانیویەتی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە چوارچێوەی باسی پەرشوبڵاو ڕزگاربکات و لەبەر تیشکی ڕێبازێکی ڕێکخراودا ئەنجامبدات.

## • چوارەم: کوڕی تەباتەبای عەلەوی

کوڕی تەباتەبای عەلەوی ناوی (محەمەدی کوڕی ئەحمەد)ە، لە ڕەخنەسازیی دێرینی عەرەبیدا بە شاسواری ڕەخنەسازەکانی سەدەی چوارەم لە قەڵەمدەدرێ، چونکە لە ساڵی (٣٢٢) کۆچی مردووە و کۆمەڵێك لە قوتابی و موریدی بەجێهێشتووە، کە شوێنپێیانهەڵگرتووە و شوێنەوارە ئەدەبی و ڕەخنەسازییەکەیان پاراستووە. کتێبە ڕەخنەسازییەکەی ئەم ڕەخنەسازە، کە (عیار الشعر)ە، واتە: پێوانەی هەڵسەنگاندن و نرخپێدانی هۆنراوە.

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی دێرین ئەم کتێبە بەوە پێناسەدەکەن، کە پوختەی بیروڕا ڕەخنەسازییە بێگانەکانە و لە چوارچێوەی چێژ و ڕۆشنبیریی عەرەبیدا پێشکەشکراوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە کوڕی تەباتەبای عەلەوی لە کتێبی (عیار الشعر)دا، ڕەخنەسازێکی جیهانیی سەردەمەکەیەتی، خۆی نەکردووە بە دیلی تەوژمی ڕۆشنبیریی بێگانە. هەروەها مێشك و زمین و چەشەی تایبەتی لە گۆشەی ڕوانگەی عەرەبیدا ڕانەگرتووە، بەڵکوو بە چاوێکی کراوە و ئاسۆیێکی فراوان کەڵکی لە سەردەمەکەی وەرگرتووە و پردێکی شارستانێتی لە نێوان شارستانێتیی یۆنانی و ڕۆمانی و فارسی و عەرەبیدا بنیاتناوە.

## • کوڕی تەباتەبای عەلەوی و بناغەکانی سازکردنی هەڵبەست

بیرۆکەی بنەڕەتی لە کتێبی (عیار الشعر)دا چۆنییەتی سازکردنی هەڵبەستە. کوڕی تەباتەبای عەلەوی لەم کۆڕەدا هەڵبەست وەکوو پارچەیێکی قوماش و نیگارێکی دروستکراو تەماشادەکات یاخود با بڵێین ئەم ڕەخنەسازە شیعر بە چەشنێك لە چەشنەکانی پیشەسازی لە قەڵەمدەدات، بۆیە لە سەرەتای کتێبەکەیدا لە بناغەکانی سازکردنی هەڵبەست دەدوێت و هەنگاوەکانی لەدایکبوونی بەرهەمی هەستیار شیدەکاتەوە و دەکۆڵێتەوە و دەڵێ: هەستیار بۆ ئەوەی هەڵبەستێکی سەرکەوتوو بهۆنێتەوە، دەبێت ئەم هەنگاوانە هەڵبگرێ:

١- هەستیار دەبێت لە مێشکیدا، ئەم واتایانە پوختە هەزمبکات، کە دەیەوێ بیانکات بە بابەتی هەڵبەستەکەی، ئەوجا وشەی گونجاو بۆ ئەو بابەتە هەڵبژێرێ و قافیەی پێویست دەستنیشانبکات و دەریای عەرووزی ویستراو بگرێتەبەر، واتە هەستیار وەکوو پیشەساز لە سەرەتای کارەکەیدا پێویستە کەرەستەی سازکردن و دروستکردنی هەڵبەستەکەی ئامادەبکات، کە واتا و وشە و قافیە و کێشە.

٢- هۆنینەوەی دێڕەکانی هەڵبەستەکەی بە گوێرەی کەرەستە ئامادەکراوەکەی بەبێ ئەوەی لەم هەنگاوەدا، هەستیار خۆی ببەستێ بە مەبەستی هەڵبەستەکەی و ڕێکخستنی دێڕەکان و پەیوەندیی بابەتی نێوانیان. واتە: لەم هەنگاوەدا هەستیار هێشتا هەر کەرەستەکان ڕێکدەخات و دێڕە هۆنراوەی جیاجیا بنیاتدەنێ، وەکوو جۆلاً کە لەم قوناغەیدا هەر پەت ڕایەڵدەکات و تەختەی چنراوەکەی ئامادە دەکات.

٣- دەستکردن بە بژارکردنی دێڕە هۆنراوەکان بە هەڵسەنگاندنی وشە و واتاکانیان و نرخێدانی کێش و قافیەکەیان و ئەنجامدانی ئەم هەنگاوە لەبەر تیشکی چێژ و چەشەی هەستیار و تێڕوانینی هونەریی. بە مانای ئەوەی هەستیار لەم هەنگاوەدا وەکوو ڕەخنەسازێك کارەکەی خۆی هەڵدەسەنگێنێ و بە وردەکاری کۆتایی هەڵبەستەکەی سازدەکات.

ئەم بیروڕایانەی کوڕی تەباتەبای عەلەوی لە چۆنییەتی لەدایکبوونی هەڵبەستدا، هەڵبەت بیرۆکەیێکی عەمەلی و پراکتیکییە و ڕەنگێکی دوور لە مشتومڕی ئەزەری و بیردۆزەیی بە ڕەخنەسازیی عەرەبی دەبەخشێ. ئەم کردەوەش بە لای ئێمەوە هێڵی جیاکەرەوەی دێرینی عەرەبی لە ڕەخنەسازیی یۆنانی و ڕۆمانی دەخاتەڕوو، بڕیاری گشتی کارتێکردنی ڕەخنەسازە یۆنانییەکان لە ڕەخنەسازە عەرەبەکان بەربەرچ دەداتەوە، چونکە هەروەکوو دەزانین بۆ نموونە: هۆنراوە لە چەمکی ئەفلاتووندا خوربە و ئیلهامە و هەڵبەست دیارییێکی خوای

هۆنراوەیە بۆ هەستیار، کەچی کوڕی تەباتەبای عەلەوی لەم چەمکە بێبەرییە و شیعر وەکوو پیشەسازییەك تەماشادەکات و هەستیاریش بە لایەوە سازکەرێکی کارزانە لە کەرەستەی ئاخاوتن و ئاواز و ترپەی سازکراو وەکوو جۆلا و نیگارکێش هەڵبەست دروستدەکات.

## • کوڕی تەباتەبای عەلەوی و یەکێتیی بابەت لە هەڵبەستدا

بنواشەی سەرەکی لە ڕەخنەسازیی عەرەبی بەر لە کوڕی تەباتەبای عەلەوی یەکێتی و سەربەخۆیی دێڕی هۆنراوەیە لە هەڵبەستدا، واتە: هەستیاری هونەرمەند و پایەبەرز لە پێوانەی ئەم بنواشەیەدا ئەوەیە، کە دەتوانێ دێڕی یەکگرتوو، سەربەخۆ بە واتا و وشە و قافیە لە دێڕەکانی دی هەڵبەستەکە سازبکات. کەوابوو: هەڵبەستی پەسەندکراو دەبێت لە بابەتی جۆربەجۆر بدوێ و دێڕەکانی لە یەکترپچڕابن و هەر دێڕێکیان وەکوو پەندێکی پێشینان لە هەموو ڕوویێکەوە سەربەخۆبێت، کەچی کوڕی تەباتەبای عەلەوی بە پێچەوانەی ئەم بنواشەیە بیروڕای ئەوەیە، کە یەکێتیی بابەت مەرجێکی سەرەکییە بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵبەستی سەرکەوتوو. هەستیار دەبێت پەیڕەوی ئەم مەرجە بکات و دێڕەکانی هەڵبەستەکە وا سفت و پتەو پێکەوە بهۆنێتەوە، گوێگر و خوێندەوار وا بزانن، کە هەڵبەستەکەی لە قەوارەدا وشەیێکی یەکگرتووە.

ئەم بیروڕایەی ڕەخنەسازەکە هەڵبەت لەوەوە هاتووە، کە هەڵبەست پارچە قوماش و نیگارێکی سازکراوە، هەستیار لە کارگەی مێشك وریایی (وعي)دا سازیدەکات. بۆیە هەر دەبێت بە سفتی و پتەوی پارچەکانی یەکبخات و بە ئەڵقەی پەیوەندیی جۆربەجۆر بیانبەستێتەوە.

ئەم بیروڕا ڕەخنەسازییە، ڕەنگە دەنگدانەوەی بنیاتنانی هەڵبەستی عەرەبی بێت، کە لە قەوارەدا بابەتەکانی جۆربەجۆرن و دێڕەکانی پچڕپچڕن، بەڵام کوڕی تەباتەبای عەلەوی ڕەخنەسازێکی هۆشمەندە و مەنتقییە، تێبینی وایە کە شیعر بەرهەمێکی سەرپێیی (ارتجالي) نییە، بەڵکوو ئاکامێکی عەقڵیی و هەستپێکراوە.

## • کوڕی تەباتەبای عەلەوی و مەسەلەی ڕاستگۆیی لە هۆنراوەدا

کوڕی تەباتەبای عەلەوی لە دووتوێی کتێبەکەیدا هەمیشە مەسەلەی ڕاستگۆیی لە هۆنراوەدا دووپاتدەکاتەوە و دەڵێ: هەستیار پێویستە لە بابەت و واتای هەڵبەستەکانیدا ڕاستگۆ بێت، واتە: دەبێت بیرۆکە و ناوەرۆکی وا بهۆنێتەوە، کە بە ڕاستی لە ژیانیدا ڕووداو بن و بە چەشنێکی واقیعی لەگەڵیاندا ئاشنایی هەبێت. بە مانای ئەوەی ئەگەر هاتوو ستایشی

کەسێکی کرد، دەبێت ئەو کەسە شایانی ئەو ستایشە بێت و هەستیاریش خۆی بڕوای بە ستایشەکە هەبێت. هەروەها ئەگەر هاتوو پێویست بوو هەجووی کابرایەك بکات، دەبێت ئەو ڕەوشتە ناپەسندانەی بخاتەڕوو، کە بە حەقیقەت لەو کابرایەدا هەبن و بە هیچ ڕەنگێ نابێ بەدرۆ هەڵیانبەستێ، تەنانەت لە پێهەڵدان و وەسفیشدا دیسان هەستیار دەبێت بێ زیاد و کەم شتەکە دەربخات و خۆی لە موبالەغە و وەسفی هەستپێنەکراو دووربخاتەوە.

کوڕی تەباتەبای عەلەوی مەسەلەی ڕاستگۆیی لە هۆنراوەشدا دووپاتدەکاتەوە و دەڵێ: هەستیار پێویستە لێکچواندن و خواستە و خوازە و هۆیەکانی دیکەی زمانی هونەری بە چەشنێکی وا سازبکات، کە لەتەك سروشتی ڕاستی شتەکاندا بگونجێ و نابێت بە شێوازی ئەفسانەیی و وەهم و داستانی ڕەسەنیبوون تێکبدات و وێنەی ناهۆشمەندی دەستکرد دروستبکات.

مەبەستی ئەم ڕەخنەسازە لە دووپاتکردنەوەی ڕاستگۆیی هەستیار لە بابەت و واتا و زمانی هونەریدا بەو چەشنە تێگەیاندنی گوێگر و خوێنەرە، چونکە ئەم ڕەخنەسازە لەو باوەڕەدایە ئەگەر هاتوو هەستیار لە هەڵبەستەکانیدا ڕاستگۆ بوو، دەتوانێ جڵەوی عەقڵ و هەست و نەستی گوێگر بگرێتەدەست و ڕابەریی بکات، بۆیە هەمیشە دەڵێ: وشەی ڕاست بە بێسنوور لە دڵەوە دەچێت بۆ دڵ.

کوڕی تەباتەبای عەلەوی بە لای ئێمەوە، کە بەو چەشنە لە چۆنییەتی لەدایکبوونی هەڵبەست دواوە و هەمیشە مەسەلەی راستگۆیی لە هۆنراوەدا دووپاتکردۆتەوە، چەمك و مەفهومێکی تازەی بۆ هونەری هۆنراوە چەسپاندووە. ئەم چەمك و مەفهومەش ئەوەیە کە شیعر چەشنێکە لە چەشنەکانی پیشەسازی و بە هیچ ڕەنگێ ئاکامی خوڕبە و ئیلهام نییە. ئەم بیروڕایە وەنەبێ لە جیهانی ڕەخنەسازیی عەرەبی دێریندا بێسەروشوێن دەنگیدابێتەوە، بەڵکوو چەکەرەیکرد و سەوزبوو و پەرەیسەند و لقوپۆپی هاویشت، بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە (ابو هلالی عسکری) دوابەدوای ئەم ڕەخنەسازە لە بابەتی ڕەوانبێژیدا کتێبێکی بە ناوی (الصناعتین)داناوە. مەبەستی پیشەسازیی هۆنراوە و پیشەسازی پەخشانە.

## • نوێخوازی لە هۆنراوەی عەرەبیدا

لـە مێـژووی ڕێژەی عەرەبیدا چەسپاوە، کە هۆنراوەی سـەردەمی جاهیلییەت لە ڕووی وشەسازی و وێنەی هونەری و بنیاتنانی هەڵبەستەوە، بووە بە نموونەی بەرز. ڕەخنەسازەکان لە بەر تیشکی ئەم نموونەیەدا، سـەردەم بە سـەردەم بەرهەمی هەسـتیارەکانیان هەڵسـەنگاند و بـە گوێـرەی ڕاددەی پەیوەندیـی ئـەم بەرهەمانـە بەو نموونەیەوە بڕیـاری چاکە و خراپەیان دەدا. هۆیەکانی ئەم هەڵوێستە ڕەخنەسازییە جۆربەجۆرن: هەندێکیان لەوە هاتوون، کە زمانی هۆنـراوەی سـەردەمی جاهیلییـەت بە ڕەوانتریـن زمانی عەرەبی لە قەڵەمـدەدات. هەندێکی تریان دەگەڕێنەوە سەر هەڵوێستی ڕامیاری جێنشینەکانی سەردەمی ئەمەوی، کە بە چاوی گومانەوە دەیانڕوانییە هەموو ڕووداوێکی تازەبابەت.

سـەرئەنجام ئەم بارە زمانی و ڕامیارییە، بەرپابوونی دیاردەی کۆنی ڕێبازییە لە ژیانی هۆنراوەی عەرەبیدا، کە بە قووڵی هەستیارە عەرەبەکانی سەردەمی ئەمەوی بۆ ماوەی سەدەیەک

توند توند خۆیان لەگەڵ ڕەوتی هۆنراوەی دێرینی عەرەبیدا بەستەوە و هیچ دەرفەتێکی نوێخوازییان بۆ بەرپانەکرد.

سەرئەنجام ئەم هەستیارانە هیچ تازەکردنەوەیێکیان لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا ئەنجامنەدا. ئەمە ڕاستییێکی مێژووییە، بەڵام تا چ ڕاددەیەك کۆت و زنجیری ئەو دیاردەیە بەو چەشنە لە گەردنی داهێنانی هەستیاراندا ماوە؟

بزووتنەوەی مێژوو وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەداتەوە، کە گۆڕانی بنەڕەتی کۆمەڵگای عەرەبی لە سەردەمی عەباسییەکاندا لە ڕووی بیروڕای سیاسی و باری ئابووری و پەیوەندیی بە نەتەوە دێرین و هاوسەردەمە بێگانەکانەوە هۆیێکی کاریگەر بوو، لە پێناوی کزبوونی دیاردەی ڕێبازی کۆن لە هۆنراوەی عەرەبیدا و شلکردنی کۆت و زنجیرەکانی.

بۆیە هەر لە سەرەتای ئەم سەردەمەوە دیاردەی نوێخوازی لە بنیاتنانی هەڵبەستی عەرەبیدا وردەوردە شەوقیدایەوە و کون و قوژبنی سامانی دێرینی هۆنراوەی عەرەبی ڕووناککردەوە.

سەرکردەی هەستیارانی ئەم دیاردە نوێخوازییە ( أبو نواس )ە، کە لە سەرەتای هەڵبەستێکیدا دەڵێ:

صفه الطلول بلاغه القــدم

فأجعل صفاتک لابنة الكرم

واتە: پێیاهەڵدانی کەلاوە و پاشماوەی ماڵ و خێوەت، ڕەوانبێژیی کۆنی ڕێبازەکانە، دە تۆش پیاهەڵدانەکانت بۆ (مەی)و خواردنەوە بێت.

(ئەبو نەواس)ی هەستیار، بەم بانگەوازە ڕەخنەسازییە ڕەخنە لە داڕشتنی قەوارەی هەڵبەستی عەرەبی سەردەمی جاهیلییەت دەگرێ، کە بە وەسف و پیاهەڵدانی کەلاوە و شوێنەواری هەوارگەی خۆشەویست دەستیپێدەکرد و داوای لە هەستیارەکانی سەردەمەکەی دەکرد، کە وەسفی کۆڕی خواردنەوە و شوێنی ڕابواردن لە سەرەتای هەڵبەستەکانیان بکەن.

ئەم بانگەوازە ڕەخنەسازییە هەڵبەت هاوارێکی بێسەروشوێن نەبوو. بگرە دەتوانین بڵێین دەنگدانەوەیێکی واقیعی و پێویستی بوو، بۆیە تێبینیدەکەین، کە زۆربەی هەستیارەکانی سەردەمی عەباسی لە نموونەی هەڵبەستی سەردەمی جاهیلی و ئەمەوی لایاندا و بە گوێرەی چەشە و چێژی کۆمەڵگا تازەکەیان هەڵبەستیان بنیاتدەنا و ڕەخنەسازە هاوسەردەمەکانیان بەم گۆڕینە ڕازینەبوون، بەڵام پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئایا ئەم گۆڕینە گۆڕانێکی قووڵ و سەرەکییە لە شێوازی هۆنراوەدا یاخود دەستکاریکردنێکی ڕووکەشی و سادەیە؟

ئەوەی بە وردی بەرهەمی هەستیارەکانی سەدەی دووەم و نیوەی سەدەی سێیەمی

کۆچی بخوێنێتەوە بۆی دەسەلمێ، کە ئەم هەستیارانە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لاسایی هەستیارە دێرینەکانیان دەکردەوە و چاویان لە واتاکانیان دەبوو و زۆربەی ئەم واتایانەیان دەکرد بە هەوێنی دارشتنی واتا تایبەتییەکانیان. جا بۆ ئەوەی لەم ڕاستییە بگەین و بزانین ڕادەی ئەم لاساییکردنەوەیە چەندە و چۆنییەتییێکی چلۆنە ؟ نموونەیەك لە هۆنراوەی سەردەمی جاهیلییەت و ئەم سەردەمەی عەباسی لەبەر تیشکی ڕێبازی بەراوردکاری شیدەکەینەوە.

نابیغەی زوبیانی لە واتای داواکردنی لێبوردن لە (النعمان)ی پاشای مەنازرە وتوویەتی:

فإنک کاللیل الذی هو مدرکی

و ان خلت ان المنتأی عنک واسع

**واتە: تۆ ئەی پادشا وەکوو شەو وایتە کە هەر دەمگیتێ و ناتوانم لە چنگت ڕزگاریبم هەرچەندە بە خەیاڵ وام زانیوە کە نێوانی من و تۆ فراوان و بەرینە.**

**هەستیاری سەردەمی جاهیلی (سلم الخاسر)لە سەر هەمان ڕێچکە بە جێنشینی عەباسی (المهدی) وتووە:**

وأنت کالدهر مبثوثا حبائلــه

والدهر لاملجأ منه ولا هرب

و لو ملکت عنان الریح أصرفه

من کل ناحیه ما فاتک الطلب

**واتە: تۆ وەکوو گەردوون وایتە کە داوەکانی پەرشوبڵاون، گەردوونیش نە جێگای هەیە لێیپارێزێ نە دەرفەتی ڕاکردن لە چنگی شکەبرێ. ئەگەر هاتوو جڵەوی (با)م بە دەستەوە بێت و توانای غاردانم بە هەموو لایەکدا هەبێت، ناتوانم لە کەوتنە ژێردەستت دەربازبیم.**

لەم دوو نموونەیەدا ئاشکرایە کە هەستیاری سەردەمی عەباسی (سلم الخاسر) واتای ئەم دوو دێڕەی لە دێڕەکەی هەستیاری سەردەمی جاهیلییەت بە دەستکارییێکی کەمەوە وەرگرتووە. پادشای مەنازرە لە دەستەڵاتداریدا وەکوو شەوە، جێنشینی عەباسی وەکوو گەردوونە، سەرئەنجامی حاڵی هەردوو هەستیار یەك شتە، کە ملکەچی و بێدەستەڵاتی و ژێردەستییە.

ئەم ڕادەیە لە لاساییکردنەوەی هەستیارە دێرینەکان بەلای ڕەخنەسازە کۆن ڕێبازەکانەوە تاقە بواری گۆڕانی ناوەڕۆکی هۆنراوەبوو. هەستیارەکانی سەردەمی عەباسی بە بیروڕای ئەم ڕەخنەسازانە مافی ئەوەیان نەبوو، کە لەم بوارە دەرچن و ئەو ڕادەیە بەجێبهێڵن، بەڵکوو پێویستبوو لەسەر شانیان کە هەر لەو جوغزەدا بسوڕێنەوە و هەنگاوی تازە لە گۆڕانی شێوازی

هونەری شیعری دێرین هەڵنەگرن. ئەم بیروڕایە، بێگومان تێڕوانینی هەستیار و ڕەخنەسازە نوێخوازەکان نەبوو، چونکە ئەمانە بە پێچەوانەی ڕەخنەسازە کۆن ڕێبازەکان بڕوایان وابوو، کە هەستیار پێویستە بە دەم باری ژیانی تازەوە بێت و بە ئەوپەڕی سەربەستییەوە دەستکاری هەموو لایەنەکانی هۆنراوە بکات. لە واتا و ئەندێشە و سۆزەوە هەتاوەکوو ڕەگەزەکانی فۆرمی هۆنراوە لە وشە و وێنەی هونەری و ڕستە و دارِشتنی گشتی.

ئا بەم جۆرە زۆرانبازێکی توندوتیژ لە نێوان کۆن ڕێبازەکان و نوێخوازەکاندا پەیدابوو. نوێنەری ئەم زۆرانبازییە لە هەستیارەکان (أبو تمام) بوو و هەڵگری دروشمی ڕەخنەسازە کۆن ڕێبازەکان (ابو قاسمی ئامێدی)بوو، لایەنگری نوێخوازەکان لە کۆڕی ڕەخنەسازەکاندا (ابوبکر الصولی)بوو.

## • سروشتی نوێخوازی لە هۆنراوە و ڕەخنەسازیی عەرەبیدا

هەرچەندە نوێخوازی لە سازکردنی شێوازی هۆنراوەی عەرەبی لە سەرەتای سەدەی دووەمەوە، لە سەردەستی چەند هەستیارێکی موسڵمان و عەرەب وەکوو (بەشار کوڕی بورد) و (موسلیم کوڕی وەلید) سەریهەڵدا، بەڵام وەکوو شۆڕشێکی ڕێبازی، ئەنجامدەرەکەی (ئەبو تەممام)ە، کە لە سییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچیدا مردووە. ئەبو تەممام لەم جۆرە نوێخوازییەدا بە چەشنێکی بنەڕەتی فەرهەنگی، وێنەسازی و دارِشتنە ڕوونبێژییە عەرەبییەکانی گۆڕی و لە سەر بناغەیێکی تازە لێکچواندن و خوازە و خواستە و درکەی نوێی سازکرد. بۆ نموونە: ئەم هەستیارە بەوە قایل نەبوو، کە وەکوو هەستیارە دێرینەکان دەربڕینی هونەریی ساکار و ئەندێشەی هەستپێکراو بەکاربهێنێ، بەڵکوو بەوپەڕی توانایەوە، بە دوو باڵی تیژ و ئەندێشەی قووڵ و داهێنراو شتی بێگیانی کرد بە گیانلەبەر و بیرۆکەی مەعنەوی لە قەوارەی هەستپێکراودا نواند و دەستکاری پەیوەندییەکانی واتای وشەی فەرهەنگی و خوازەی کرد.

سەرئەنجام لە هەڵبەستەکانی ئەم هەستیارە، گەردوون دەستی هەیە و ڕۆژگار ملکەچی ستایش کراو دەبێت و زەوی سکاڵای دڵی خۆی بۆ هەور دەکات و باخچە عاشقی شەونمە و دەیان دەربڕینی هونەری وا کە لەمەوبەر لە شێوازی هۆنراوەی عەرەبیدا بەرگوێنەدەکەوتن.

ڕەخنەسازەکانی سەردەمی ئەبو تەممام لە ئاستی ئەم چەشنە نوێخوازییە بوو بوون بە دوو چەشنەوە:

**بەشی یەکەم:** بە سەرکردایەتی (ابوبکر الصولی)خاوەنی کتێبی (اخبار ابو تمام) واتە

سەرگوزشتەی ئەبو تەممام، کە بە کردەوەی ئەبو تەممام قایلبوون و هەڵبەستەکانیان بە بەرهەمێکی سەرکەوتوو تەماشادەکرد و پشتگیرییان لێدەکرد.

**بەشی دووەم:** بە ڕابەری (ئەبو قاسمی ئامێدی) خاوەنی کتێبی (الموازنە بین ابو تمام و البحتري)، ئەم ڕێبازەی ئەبو تەممامیان بە توندی بەرپەرچدایەوە و سەرنجی خەڵکیان بۆ ئەوە ڕاکێشا، کە ئەم هەستیارە لە (عمودی) شیعری عەرەبی لایداوە و زمانی هونەری نەتەوەیی عەرەبی تێکداوە و کارەکەی بە هیچ ڕەنگێ هۆنراوە نییە، بەڵکوو هۆنراوەی ڕاستینە نموونەی هۆنراوەی (بوحتری)یە، کە لە سەر شێوازی کەلەپووری هۆنراوەی عەرەبی هەڵبەست دەهۆنێتەوە و هۆنراوەی وا سازدەکات جەماوەر لێیتێدەگات و زاناکان چێژی لێوەردەگرن.

ئەم دیاردەیە لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا زۆرانبازی نێوان کۆنیی ڕێباز و نوێخوازی دەنوێنێ، هەرچەندە لە جیهانی ڕەخنەسازیی دێرینی عەرەبیدا زۆری نەخایاند و بەرهەمی جۆربەجۆری نەهێنایە دی، بەڵام ئێمە بەوە ڕادەیدەکەین، کە سەرەتایەك بوو بۆ مەسەلەی چۆنییەتی وێنەی هونەری لە زمانی هۆنراوەدا، کە هەندێك لە ناشارەزاکانی مێژووی ڕەخنەسازیی جیهانی وایان دەزانی ئەم دیاردەیە تەنیا لە ڕەخنەسازیی ئەورووپیدا بەرپابووە و لە سەردەستی سریالییەکاندا ئەنجامدراوە.

## • ڕەخنەسازی و مەسەلەی دزیی وێژەیی

ئامانجی سەرەکی هەموو ڕەخنەسازێك لە لێکۆڵینەوەی دەقێکی وێژەیی و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژەران، دەستنیشانکردنی ڕادەی داهێنان و ڕەسەنییە لەو بەرهەم و دەقانەدا، چونکە وێژەری ڕاستینە لە ڕوانگەی ڕەخنەسازیی زانستییەوە ئەو هونەرمەندەیە، کە توانای خوڵقاندنی هەیە و توانییەتی هەنگاوێکی تازە لە پێش وێژەرانی بەر لە خۆی هەڵبگرێ. ئەم ئامانجەی ڕەخنەسازی هەڵبەت مەسەلەی (دزیی وێژەیی) دەکات بە باسێکی بنەڕەتی لە باسەکانی ڕەخنەسازیدا، بۆیە ئەم باسە مەیدانێکی فراوانە لەبەر دەستی ڕەخنەسازەکان بۆ بەرپاکردنی بەراوردکارییەکی ورد لە نێوان وێژەرەکاندا، بە نیازی دەستنیشانکردنی پەیوەندیی بیری و فۆرمی یان بڕیاردانی تازەکردنەوە یاخود لاساییکردنەوە، لە لای ئەو وێژەرە یان ئەوی دیکەیان.

لە مێژووی ڕەخنەسازیی عەرەبیدا لە مێژە ئەم بابەتە خراوەتە بەر تاوی لێکۆڵینەوە و دەمەتەقێ و بە گوێرەی مەبەستی ئەوانەی لێیانکۆڵیوەتەوە یەکێك لەم سێ زاراوانە بەکارهێنراون:

**یەکەم:** زاراوەی دزیی وێژەییە، کە بەکارهێنەرەکانی لە ڕەخنەسازەکان بە ئەوپەڕی

توندوتیژییەوە ویستوویانە پەردە لەسەر وێژەرە لاساییکەرەکان هەڵبماڵن و توانجی ناخوڵقاندن و جووینەوەی بەرهەمی وێژەرەکانی بەر لەوانیان تێبگرن.

**دووەم:** زاراوەی وەرگرتنە، کە ڕەخنەسازە دادپەروەرەکان بۆ دەستنیشانکردنی پەیوەندیی نێوان وێژەران بەکاریانهێنا و دەیانویست ڕاستییەك دووپاتبکەنەوە، کە دەڵێ: لەسەر ئەم زەوییەدا، وێژەر نییە لە هەموو ڕوویێکەوە سەربەخۆ بێت و لە بەرهەمە وێژەییەکانی بەر لە خۆی پچڕابێتە بەڵکوو هەمیشە وێژەران کارلەیەکتردەکەن و هەر یەکەیان تا ڕاددەیەك لەوی دی بیرۆکەیەك یان دەربڕینێك وەردەگرێ. زاراوەی (وەرگرتن) کە زاراوەی (الاخذ)ی عەرەبییە و وەرگێڕراوەتە سەر زمانی کوردی، جگە لەو زاراوەیە زاراوەیێکی دیکەش بە زمانی عەرەبی هەیە، کە هاوواتایەتی و بریتییە لە زاراوەی (السلخ) بە کوردی واتە (داماڵین).

ئەم دوو بابەتە، واتە: (وەرگرتن) و (داماڵین) پێکەوە هێڵێکی زانستیان لە بابەتی پەیوەندیی وێژەیی نێوانی وێژەرەکاندا ڕاکێشاوە و ئەم بابەتەیان لە چوارچێوەی توانجگرتن و بوختانکردنەوە دەربازکردووە بۆ ئاسۆیێکی هونەری فراوان.

سەرئەنجام چەند کتێبێکی زانستی لەم ڕووەوە دانران کۆنترین کتێب بە زمانی عەرەبی کتێبی (دزییەکانی هەستیاران)ە، واتە (سرقات الشعراء)، کە دانەرەکەی (عبدللە کوڕی المعتز)ە، لە ڕەخنەسازەکانی سەدەی سێیەمی کۆچییە. دوابەدوای ئەم کتێبە کۆمەڵێکی زۆر لە دانراو و وتار هاتنەبەرهەم، دیارترینیان کتێبی (دزییەکانی ئەبو تەممام)ە، دانانی (ئەحمەد کوڕی تاهیر)ە. هەروەها کتێبی (دزییەکانی بوحتری لە ئەبو تەممام) لە نووسینی (بشر کوڕی تمیم)ە

## • چەشنەکانی پەیوەندیی لە نێوان وێژەرەکاندا

بۆ ئەوەی لە مەسەلەی (دزیی وێژەیی) بگەین و سنووری جیاکەرەوەی بخەینەڕوو، پێویستە بزانین کە وێژەرەکان چەند چەشنێکن:

**چەشنی یەکەم: خورپە وەرگرتنە**

لەم بارەدا وێژەرێك دێت بەرهەمی وێژەرێکی دی دەخوێنێتەوە و بە هۆی خوێندنەوەکەیەوە، بیرۆکەیێکی تازە لە دڵ و دەروونیدا هەڵدەقوڵێ و دەستدەکات بە ئەنجامدانی ئەم بیرۆکەیە لە بەرهەمێکی نوێدا. بێگومان ئەم چەشنە بە دزیی وێژەیی دانانرێ، چونکە بەرهەمە خورپەییەکەی زادەی بیر و هەست و نەستی خاوەنەکەیەتی و لە ئەنجامی لێکدانەوە و

خوڵقاندنی تایبەتییەوە هاتۆتە بەرهەم.

**چەشنی دووەم:** وەرگرتنی هێڵە گشتییەکانی بەرهەمێکی وێژەییە لە داستانێ یاخود لە ڕووداوێکی وێژەییەوە.

ئەم چەشنەش دووبارە بە دزیی وێژەیی لە قەڵەمنادرێ، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو خاوەنەکەی بە جۆرێکی داهێنراو هەزمی داستان و ڕووداوە مێژووییەکەی کردبێت و بۆن و ڕەنگی کەسایەتیی خۆی پێببەخشێت و بە وشە و دەربڕین و وێنەی هونەریی خوڵقاو ئەنجامی دابێت.

**چەشنی سێیەم: چوونەڕیزی ڕێبازێکی وێژەییەوە.**

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە وێژەر ئەندامێك بێت لە قوتابخانەیێکی وێژەیی و هەڵگری دروشمێك بێت، کە لە ژێر سێبەرەکەیدا کۆمەڵێك لە وێژەران خڕبوونەتەوە و کاریان لە یەکتر کردووە، ئەم چەشنەش دیسان (دزیی وێژەیی) نییە، چونکە ئەو کۆمەڵە وێژەرانە بیرۆکەی هاوبەشیان لە نێواندا هەیە و بۆ ئامانجێکی هونەری و ئایدۆلۆژی دەستنیشانکراو تێدەکۆشن. سەرئەنجام ئەم وێژەرانە هەر دەبێت کارلەیەکتربکەن و هەر یەکەیان لە وی دی وەربگرێت و بەرهەمی وێژەییان لە ڕووی ناوەڕۆك فۆرمەوە بە جۆرێکی گشتی لە یەکبچن.

**چەشنی چوارەم:** دزیی وێژەییە، کە نیشانەکەی ئەوەیە، وێژەرێك (بە نیازی دیزە بەدەرخۆنە) بە بێ دەستکاری بیرۆکەیێکی دەستنیشانکراوی وێژەرێك وەربگرێت یاخود شێوازێکی تایبەتی لە یەکێکی دیکە ڕاپێچبکات و بەبێ ئەوەی دان بەم کارە دابنێ و سەرنجی بۆ ڕابکێشێ بیکات بە ژێر لێوەوە و ئیدیعای ئەوە بکات، کە زادەی بیری تایبەتی خۆیەتی و بەرهەمی خوڵقێنراوی هەست و نەستیێتی.

## • چەند بنواشەیەک بۆ جیاکردنەوەی بەرهەمی هاوبەش و دزیی وێژەیی

وێژەرانی نەتەوەیەك لەبەرئەوەی سەرچاوەی ڕۆشنبیرییان یەکە و هەموویان لەبەر دەستی سامانێکی میللی یەکگرتوو پێدەگەن و مێشك و هەستیان زاخاوەدرێتەوە، هەر دەبێت بەرهەمەکانیان لە ڕووی زمان و دارشتن و نەریتی گشتییەوە تا ڕاددەیەك لە یەکبچن. ئەم ڕاستییە هەڵبەت چەند بنواشەیەك ڕەچاوەکات و بۆ دەستنیشانکردنی بەرهەمی هاوبەش، کە دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوە

دەستنیشانیانبکەین:

**یەکەم:** واتای گشتی و بیرۆکەی هاوبەش، کە بە درێژایی مێژوو لە نێوانی ئەندامانی نەتەوەیەکدا دەچەسپێن و دەبنە میراتێکی میللی.

**دووەم:** پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ناوەڕۆکی چەشنەکانی فۆلکلۆر، کە دیسانەوە سەرچاوەیێکی میللی پێکدەهێنن و دەبنە موڵکی جەماوەر.

**سێیەم:** وشـە و دەربڕینـی وێژەیـی، کـە بە درێژایـی قۆناغەکانی وێـژەی نەتەوەیەك لە بابەتەکانی هۆنراوە و پەخشاندا سازکراون و فەرهەنگێکی هونەری گشتییان دروستکردووە.

ئەم بنەواشانە هەروەکوو دیارە مەیدانی پەیوەندیی هاوبەش لە نێوانی وێژەرانی نەتەوەیەکدا بە بەرفلاوانیی و بێسنوور دەهێڵنەوە، بۆیە ڕەخنەسازەکان لە ئاستیاندا دووپاتیدەکەنەوە کە ئەگەر هاتوو بیرۆکەیێکی هاوبەشیان وەرگرت و بە شێوازێکی داهێنراو دەربڕی، ئیتر ئەو واتا گشتییە و بیرۆکە هاوبەشە دەبێت بە بەرهەمی تایبەتی خۆی و بە موڵکی کەسی دەژمێردرێ.

ئەم سـەرنجەی ڕەخنەسـازان بێگومان ئەوە دووپاتدەکاتەوە، کە واتا و فەرهەنگی وشـە و دەستووری زمان و کێش و ئاوازی هۆنراوە لە بەر دەستی گشت وێژەراندا، کەرەستەی هاوبەشن، بەڵام ئەوەی شەقڵێکی تایبەتی دەبەخشێت بەم کەرەستەیە شێوازە، واتە (اسلوب).

شێوازیش لە ڕەخنەسازیدا وێنەی هەستپێکراوی تاقیکردنەوەی تایبەتی وێژەرە، بە مانای ئەوەی وێژەر لە ژیانیدا بەرەنگاری بابەتێکی گشتی دەبێت لە واتا و بیرۆکە. ئەم بەرەنگارییە ئەگەر هاتوو ڕاستەقینە بوو لە تاقیکردنەوەکەیدا، کە بۆتەیێکی کەسییە، ناوەڕۆکێك لە واتا و سۆز و هەڵچوون و ئەندێشە بەرپادەکات و ئەم ناوەڕۆکەش لە ڕێگای فۆڕمێکی گونجاوەوە شـێوازێکی تایبەتی دەخوڵقێنێ. ئا ئەم شـێوازە نیشـانەی بلیمەتی وێژەرە و سـەرئەنجامی بەرهەمێکی تایبەتییە، کە ئەگەر هاتوو وێژەرێکی دیکە دەستی بۆ درێژکرد، بە وێژەرێکی دز دادەنرێ و کارەکەشی بە وێژەیێکی دزراو دادەنرێ.

## • زۆرانبازی نێوانی ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژی

گومان لەوەدا نییە، کە ڕەخنەسازیی عەرەبی بەر لە پەیدابوونی ڕەوانبێژی لەدایکبووە، چونکە هەر وەکو دووپاتمانکردۆتەوە ڕەخنەسازیی لەگەڵ هاتنەکایەوەی وێژە چەکەرەدەکات و هەنگاو بە هەنگاو سەوزدەبێت و پەرەدەسێنێت و لقوپۆپ دەهاوێژێ. ئەم ڕاستییەش لە ڕووی مێژووی زانستەکانی زمان و وێژەوە ئەوە دەگەیەنێ، کە ڕەخنەسازیی عەرەبی لە ڕەوانبێژیی عەرەبی کۆنتر و شوێنپێی دیارتر و قووڵترە، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕەوانبێژیی عەرەبیش هەر لە سەرەتای هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆزەوە سەرەتایێکی بۆ خۆی دامەزراند، چونکە هۆیەك بوو لەو هۆیانەی لێکدانەوەی دەربڕینی جوان و وێنەی هونەری لە ئایەتە ڕوون و ڕەوانەکانی ئەم کتێبە پایەبەرزە.

مێژووی ڕەوانبێژیی عەرەبی دەیسەلمێنێ، کە یەکەم کتێبی زانست لە کۆڕی ڕەوانبێژیی عەرەبیدا نووسراوەکەی (ئەبو عوبەیدە)یە، کە بە ناونیشانی (مجاز القران)ە، واتە: خوازەی

قورئـان داینـاوە. جـا ئەگـەر زانیمان (ئەبو عوبەیدە) لە دەوروبەری چارەکی یەکەمی سـەدەی سـێیەمی کۆچـی ماڵئاوایـی لەو دنیایە کـردووە، دەتوانین بڵێین کۆنترین کتێبی ڕەوانبێژیی عەرەبـی، لەگـەڵ کۆنتریـن کتێبی ڕەخنەسـازیی عەرەبی، کە کتێبی (طبقات الشـعراء)ی دانراوی (کوڕی سەلامی جومەحی) هاوسەردەمن.

ئـەم هاوسـەردەمییەی بەرهەمـی ڕەوانبێژی و ڕەخنەسـازی چەشـنە زۆرانبازییـەکی لە نێوانیـاندا بەرپاکرد. نیشانەی ئەم زۆرانبازییـەش لەوەدا خۆی دەنوێنێ، کە ڕەخنەسازی تایبەت بوو بە هەڵسەنگاندنی وێژە و نرخپێدانی وێژەران. کەچی ڕەوانبێژی لە بناغەدا تەرخانکرابوو بۆ سەلماندنی ئیعجاز و بێهاوتایی قورئانی پیرۆز. بە مانای ئەوەی ڕەخنەسازی زانستێکی دنیایی بوو، بەڵام ڕەوانبێژی زانستێکی ئایینی بوو.

ئەم ڕاستییە هەڵبەت لە سەرەتای مێژووی ڕەخنەسازیی عەرەبی و ڕەوانبێژیی عەرەبی جێگای مشتومڕ نییە، بەڵام وردەوردە زاناکانی ڕەوانبێژی خۆیان لە کۆڕی وێژە گەیاند و دەستیانکرد بە بەراوردکاری نێوانی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز و نموونەی بەرزیی هۆنراوەی عەرەبی، بە نیازی سەلماندنی بەرزیی ئەو سورەتانە و نزمی بەرهەمی هەستیارە هەرە گەورەکانی نەتـەوەی عـەرەب. سـەرئەنجام تێبینیدەکەین کـە لە کتێبی (مجاز القـران) نموونەی هۆنراوە هێنراوەتەوە بۆ ڕوونکردنەوەی چەشنەکانی خوازەی قورئانی. ئەم کارە کە ئەنجامدەرەکەی (ئەبو عوبەیدە)یە، بناغەی ڕێبازی زانستەکانی ڕەوانبێژیی عەرەبی دامەزراند و دەرفەتی ئەوەیان بۆ خۆشکرد، کە چۆن بۆ بنواشە و دەستوورەکانی ڕەوانبێژیی نموونە لە قورئانی پیرۆز دەهێننەوە، هەروەها بۆیان هەیە، کە نموونەش لە هۆنراوە و پەخشانی عەرەبی بچەسپێنن. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایێکی دیکەشەوە، ڕەخنەسازەکانی سەدەی چوارەم و سەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی وەکوو: ( قودامەی کوڕی جەعفەر، ئەبو ئەلقاسمی ئامیدی، عەبدولعەزیز ئەلجورجانی ) لە کتێبە ڕەخنەسازییەکانیاندا دەستیانکرد بە سوودوەرگرتن لە زانست و ڕەوانبێژی و شیکردنەوەی شێوازە ڕوونبێژییەکان لەو هەڵبەستانەی کە لێیاندەکۆڵییەوە و هەڵیاندەسەنگاندن.

سەرئەنجام ڕەوانبێژیی عەرەبی لە کۆتایی سەدەی چوارەمی کۆچییەوە دەستیخستەناو ڕەخنەسـازیی عەرەبییـەوە و هەوڵـی مەیدان پێچۆڵکردنی دا. شاسـواری ئـەم کردەوەیە (ئەبو هیلالی عەسکەرییە)، کە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٣٩٤ی کۆچیدا کتێبێکی بە ناونیشانی (الصناعتین) واتە: دوو پیشەسازییەکە، پیشەسازی شیعر و پیشەسازی پەخشان، دانا.

ئەگەر بەوردی کتێبی (الصناعتین) بخوێنینەوە تێبینیدەکەین، کە دانەرەکەی لە چەند بارێکدا شوێنپێی ڕەخنەسازەکانی بەر لە خۆی هەڵگرتووە، بۆ نموونە: لە بابەتی وشە و واتای هۆنراوە و پەخشان سوودی لە بیردۆزەکەی (کوڕی قوتەیبە) دەربارەی جۆرەکانی هۆنراوە وەرگرتووە. لە مەسەلەی دەستنیشانکردنی هەڵە و کەموکوڕی هەستیارەکان چاوی بڕیوەتە تێبینییەکانی (ئەبو قاسمی ئامێدی) لە هەڵسەنگاندنی هەڵبەستەکانی (ئەبو تەممام) دا. هەروەها تا ڕاددەیێکی زۆر کەڵکی لە بیروڕاکانی (عەبدولعزیز ئەلجورجانی) دەربارەی زمانی هۆنراوە و پێویستی سازکردنی وشەی سووك و ڕەوان و دوور لە گرانیی واتا و ئاڵۆزی ئاواز وەرگرتووە، ئەمە لە لایەکەوە لە لایێکی دیکەوە، ئەبو هیلالی عەسکەری لە کتێبەکەیدا، باسە ڕەوانبێژییەکانی (کوڕی المعتز) لە کتێبە بە ناو بانگەکەیدا (البدیع)ی کرد بە هەوێنی بابەتە ڕەوانبێژییەکان و هەوڵی ئەوەی دا، کە چەشنی تازە لە هونەری ڕستەسازیی عەرەبی بدۆزێتەوە و شییانبکاتەوە و پێناسەیان بۆ دابنێ، سەرئەنجام ئەم هەوڵەی بەرهەمەکەی ئەوە بوو، کە سی

و پێنج چەشن لە هونەری وشەسازی دەستنیشانبکات.

ئەبو هیلالی عەسکەری لەم سەرئەنجامەدا بۆ یەکەم جار لە لێکچواندن و خوازە و خواستە و درکە و ڕەگەزدۆزی و تیباق و تێهەڵکێش و چەشنەکانی دیکەی زانستی ڕەوانبێژی کۆڵییەوە و بۆ هەر چەشنێك نموونەی زۆری لە ئایەتە پیرۆزەکان و وێژەی عەرەبی دێرین و هاوسەردەمی هێنایەوە.

هەرچۆنێك بێت ئەم کتێبەی ئەبو هیلالی عەسکەری، واتە: کتێبی (الصناعتین) هەروەکوو لە بابەتەکانییەوە دیار و ئاشکرایە، کتێبێکی ڕەخنەسازیی ڕووت نییە، هەروەها بە دانراوێکی تایبەت بە ڕەوانبێژی ناژمێردرێ، بەڵکوو بەرهەمێکی هاوبەشە لە نێوانی ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازی، بۆیە مێژوونوسەکانی وێژەی عەرەبی ئەم کتێبە بە قۆناغی گۆڕانی ڕەخنەسازیی عەرەبی لە زانستی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی وێژەوە بۆ زانستی ڕەوانبێژی دادەنێن.

## • زانایێکی بلیمەت لە کۆڕی ڕەوانبێژیی عەرەبیدا

ئەبو هیلالی عەسکەری کە ڕەخنەسازی تێکەڵ بە ڕەوانبێژی کرد، مێژوونوسەکان بەوە پلەی زانستی دەستنیشاندەکەن، کە هۆیێکی سەرەکی بوو لە کزبوونی ڕەخنەسازیی عەرەبی و وەشاندنی تۆوی پەیدابوونی ڕەوانبێژیی عەرەبیی رووکەش و وشك و مەنتیقی. هەروەها ئەم مێژوونوسانە ڕاستییەك دووپاتدەکەنەوە، کە دەڵێن: ئەو چەشنە ڕەوانبێژییە عەرەبییە ئەگەر هاتوو لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا بە تەواوی بوونی بێسوود و زیانبەخشی خۆی بە سەر لێکۆڵینەوەی وێژەیی نەسەپاندبێ. هۆی ڕاستەقینەی ئەم دۆخە پەیدابوونی زانایێکی بلیمەتە لە کۆڕی ڕەوانبێژی عەرەبیدا. ئەم زانا بلیمەتەش (عەبدولقاهری جورجانی)یە، کە لە ساڵی (٤٧١)ی کۆچیدا مردووە.

عەبدولقاهر جورجانی کە بەو چەشنە باسکراوە بە ڕاستی توانیویەتی لە هەردوو کتێبە بە ناوبانگەکانی (دلائل اعجاز) واتە: (بەڵگە بێهاوتاکانی قورئان) و (اسرار البلاغة) واتە: (نهێنییەکانی ڕەوانبێژی) بیردۆزێکی زانستی لە لێکۆڵینەوەی ڕەگەزەکانی شێوازی وێژەییدا بخوڵقێنێ.

ئەم بیردۆزە بە بیردۆزی (نظم) ناودەبرێ. کورتەکەشی ئەوەیە: شێوازی هونەری بەرز نە بە وشە و نە بە واتایە، هەروەها نە بە ڕوخسار(فۆرم) و نە بە ناوەڕۆکە، بەڵکوو بەرپاکردنی

چەشنە پەیوەندییەکی هۆشمەندی و چەشمییە لە نێوان وشە و واتادا، لە بەر تیشکی بناغەکانی ڕێزمان دادەنرێ. سەرئەنجام شێوازەکانی ڕوونبێژی واتە: (اساليب البيان) هیچ پەیوەندییەکیان بە واتا و وشە و ڕستەوە نییە، بگرە ئاکامی (نظم) و هۆنینەوەی زمانە.

ئەم بیردۆزەی عەبدولقاهری جورجانی بە داخەوە نەیتوانی ڕەوانبێژیی عەرەبی لەو بارە ڕزگاربکات، کە سەرەتاکەی لە سەردەستی ئەبو هیلالی عەسکەریدا دامەزراوە، بەڵکوو ئەم سەرەتایە تەشەنەیکرد و ڕەگوڕیشەی لە سەر دەستی (سەکاکی)دا، کە دانەری کتێبی (مفتاح العلوم)ە بە چەشنێکی کۆتایی داکوتا.

سەکاکی لەم کتێبەیدا ڕەوانبێژیی عەرەبی لە چەشەی هونەری و شیکردنەوەی دەقی وێژەیی دوورخستەوە و لە چوارچێوەی هۆدەرخستنێکی مەنتیقی و تێڕوانینی فەلسەفی بە وشکی و ڕواڵەتی خزاند.

سەرئەنجام دوابەدوای سەکاکی زاناکانی ڕەوانبێژی عەرەبی جگە لە کورتکردنەوە یان درێژەپێدانی کتێبی (مفتاح العلوم) هیچ بەرهەمێکیان پێشکەشنەکرد، بەڵام ئەم دۆخە ڕەنگە هەتا ئەم ڕۆژانەش چارەنووسی زانستی ڕەوانبێژی بێت، نەك بە زمانی عەرەبی بەڵکوو بە زمانی زۆربەی نەتەوە موسڵمانەکان بە گشتی و نەتەوەی کورد بە تایبەتی.

ئەم چیرۆکەی ڕەخنەسازیی عەرەبی و ڕەوانبێژیی عەرەبی هەڵبەت پرسیارێك بەرپادەکات کە دەپرسێت: لە کوێوە دەست بە بەرپاکردنی ڕەخنەسازییەکی ڕاستینە بکەین؟

مێژوونوسەکانی ڕەخنەسازیی عەرەبی و ڕەخنەسازیی کوردی بێگومان ڕایان وا نییە، کە لەو دۆخەی ڕەوانبێژیی عەرەبییەوە ئەو کارە ئەنجامدەدرێ، بەڵام دووبارە بەداخەوە زۆربەی ئەم مێژوونوسانە ڕایان وایە، کە ئەم کارە بە لاساییکردنەوەی ڕەخنەسازیی ئەورووپی ئەنجامدەدرێ، ڕەخنەسازیی کوردی لەم مەسەلەیەدا هەرچۆنێك بێت، با جارێ گەشتەکەمان لە گەڵ ڕەخنەسازیی ئەورووپیدا بکەین، ئەوجا ڕای خۆمان لەم ڕووەوە دەچەسپێنین.

زاراوەی ئەورووپا کە لە بناغەدا ناوی وشکانییەکە لە وشکانییەکانی ئەم سەرزەمینە، لە جیهانی شارستانێتی و ڕۆشنبیریدا بووە بە نازناوی هەموو چالاکییەکی نارۆژهەڵاتی. بۆ نموونە کە دەڵێن: ڕەخنەسازیی ئەورووپی بە زۆری مەبەستمان بەرهەمی نەتەوە ڕۆژئاواییەکانە، چ ئەورووپی بن چ ئەمریکی، بگرە هەندێ جاریش میللەتەکانی کەنەدە و ئوستراڵیا و ژاپۆنیش دەگرێتەخۆی. هۆی سەرەکی فراوانی سنووری زاراوەی ئەورووپا لەوەوە هاتووە، کە ئەم ناوچەیە بە گشتی و ئیتاڵیا و فەڕەنسا بە تایبەتی لە سەدەی دوانزەمی زایینییەوە، کە سەرەتای سەردەمی ڕاپەڕینە، چالاکانە توانی جڵەوی پەرەسەندن و پێشکەوتنی جیهان بگرێتەدەست و لە کۆڕی زانست و زانیاری و ڕامیاری و هونەر و گشت لایەنەکانی دیکەی ژیان، بزووتنەوەیێکی بە گوڕ بەرپابکات، کە وەکوو هەتاو لە هەموو قوژبنەکانی جیهاندا شەوقیدایەوە و ڕابەری میللەتانی سەر ئەم زەوییەی کرد.

مێژوونووسەکانی ڕۆشنبیریی ئەورووپا سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشن، کە باری پێشکەوتنی

میللەتانی ئەم ناوچەیە لەسەر بناغەی بووژاندنەوەی شارستانێتی و ڕۆشنبیریی ئەغریقی و ڕۆمانییدا دامەزراوە، بۆیە ئەم مێژوونووسانە دووپاتیدەکەنەوە، کە ڕەخنەسازیی ئەورووپی بە هەموو ڕێبازەکانییەوە لە بناغەدا لە سەرچاوەی ڕەخنەسازیی ئەم دوو نەتەوە دێرینەوە، واتە: نەتەوەی یۆنانی دێرین و نەتەوەی ڕۆمانەوە هەڵقولاوە. ئەم دووپاتکردنەوەیە چەند جێگای مشتومڕ بێت، گومان لەوە دا نییە، کە یەکەم ڕێبازی ڕەخنەسازیی ئەورووپی بە لاساییکردنەوەی کتێبەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆ و هۆراس و لۆنجیلیۆس لەدایکبووە، ئەم ڕێبازە ڕەخنەسازییەش ڕێبازی (کلاسیزم)ە.

## • ڕێبازی کلاسیزم لە هۆنراوەدا

زاراوەی کلاسیزم ناوبانگێکە بۆ ڕێبازێکی تایبەتی لە هۆنراوەی نەتەوە ئەورووپییەکاندا. هەروەها ئەم نازناوە بۆ ڕێبازێکی تایبەتی لە ڕەخنەسازیدا بەکاردەهێنرێت، کە ڕەخنەسازەکانی بە هۆی کتێب و وتار و لێکدانەوە بەرپایانکرد، چونکە هەروەکوو دەزانین هەموو بزووتنەوەیەکی ڕەخنەسازیی ڕاستینە دەبێت بە هۆی لەدایکبوونی ڕووداوێکی وێژەیی.

ئەنجا بۆ ئەوەی بزانین لە سروشتی ڕێبازی ڕەخنەسازیی کلاسیزم بگەین و بزانین بناغەکانی چین، ڕەخنەسازە خاوەن دروشمەکانی بۆ چ ئامانجێکی هونەری و ئایدۆلۆجی تێدەکۆشن؟ پێویستە لە سەرەتادا بزانین زاراوەی کلاسیزم لە چییەوە هاتووە؟

زاراوەی کلاسیزم لە وشەی "کلاس"ی لاتینییەوە داڕێژراوە، وشەی "کلاس"یش لە فەرهەنگی ئەم زمانەدا واتا ڕاستینەکەی لە سەرەتاوە کۆمەڵە کەشتییەک بووە، لە پاشان بوو بە واتایێکی خوازەیی بۆ (پۆل)ی خوێندن بەکارهێنراوە، لە دواییدا بووە بە زاراوەیێکی ڕەخنەسازی بۆ پیاهەڵدانی چەشنێکی هۆنراوە بەکارهێنرا، کە چەند تایبەتییەکی فۆرمی و ناوەڕۆکی و ئایدۆلۆجی خۆی هەیە.

ڕێبازی کلاسیزم لە وێژە و ڕەخنەسازیدا لە ڕووی سەردەمی لەدایکبوونییەوە بە کۆنترین ڕێبازە ڕەخنەسازییە ئەورووپییەکان دەژمێردرێ، چونکە لە سەرەتای سەدەی پانزەمی زایینییەوە، کە چەرخی ڕاپەڕین و بووژانەوەی زانستییە لە ئەورووپادا سەریهەڵدا و ڕابەری هەستیارانی کرد و لە میانی ڕۆشنبیریی هونەردا ئەرکی خۆی بەجێهێنا.

ئەم ڕێبازە بۆ یەکەم جار لە ئیتاڵیادا، زۆربەی بناغەکانی خۆی چەسپاندووە، ئەمەش بە هۆی کۆچکردنی زانا ڕۆمانییەکانەوە بوو، کە پاش ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتییەکەیان و نەمانی

(قوستەنتینە) ڕوویانکردە شارەکانی (ڤینیسیا)و (ڕۆما) و کەلەپووری ڕۆشنبیریی دێرینی یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا برد و لەم نیشتمانە تازەیاندا دەستیانکرد بە بووژانەوە و بڵاوکردنەوەی ئەم کەلەپوورە نەمرە.

ئەمە ڕاستییەکی مێژووییە، هەرچەند جێگای مشتومڕی توێژەران نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم توێژەرانە وڵاتی فەرەنسا بە شوێنی لەدایکبوونی ڕێبازی کلاسیزم لە قەڵەمدەدەن. فەرەنساییەکانیش خۆیان لە سەر ئەمە سوورن و دەڵێن: ڕاستە کە ڕێبازی (کلاسیزم) یان (کلاسزم)ی نوێ بەر لە پەیدابوونی لە فەرەنسا بە سەد ساڵ لە ئیتاڵیا ڕەواجی هەبووە و بازاڕی گەرم بووە، بەڵام ناوچەی "ئەمیکا"، کە بەشێکە لە خاکی فەرەنسا شاری ئەسینای پایتەختی دێرینی ئەغریقییەکان دەگرێتەخۆی، بۆیە خۆیان بە میراتگری شارستانێتی و ڕۆشنبیریی ئەسینا دادەنێن.

کێشەی شوێنی لەدایکبوونی ڕێبازی کلاسیزم بۆ یەکەم جار هەر کوێ بووبێ، واتە ئیتاڵیا بێت یان فەرەنسا، ئەم ڕێبازە بەرهەمی بووژاندنەوەی کتێبەکانی (ئەرستۆ و هۆراس و لۆنجیلیۆس )ە و ڕەخنەسازە هەڵگرەکانی دروشمی کلاسیزم لە ئیتاڵیا و فەرەنسا خۆیان بە شاگردی ڕەخنەسازە ئەغریقی و ڕۆمانییەکان دادەنێن. بۆ نموونە ڕەخنەسازی کلاسیزمی فەرەنسی بەناوبانگ (بوالۆ)، کە لە کتێبە بە ناوبانگەکەی هۆراس: "نامەیەك لە بۆ خێزانی بیزۆ" هەموو بیرورا ڕەخنەسازییەکانی وەرگرتووە، هەروەها کتێبە بە ناوبانگەکەی ئەرستۆ بیوتیکا[١]، کە لە ساڵی (١٤٩٨)زایینی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی لاتینی و ساڵی (١٥٠٣) زایینی بە زمانی یۆنانی بڵاوکراوەتەوە و کتێبەکانی دی ئەم فەیلەسوفە یۆنانییە لە ساڵی ١٦١٣ی زایینییەوە لەگەڵ کتێبەکەی هۆراس و کتێبە بە نرخەکەی لۆنجیلیۆس لە ڕەوانبێژیدا خرانە بەر دەستی خوێنەر و ڕووناکبیران و مامۆستاکانی ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژی، وەکوو: (ڤیدیا و سکالیجر و کاستلفترو)، کە بەڕاستی بە دامەزرێنەری بناغە بنەڕەتییەکانی ڕێبازی کلاسیزم ناودەبرێن، چونکە ئەم زانایانە دەستیانکرد بە ڕاڤەکردنی ئەو ئەغریقی و ڕۆمانیانە، کە مێشکی قوتابیانیان پێ زاخاودەدایەوە و وایان لە چێژ و چەشەی سەردەمەکەیان دەکرد، کە لەگەڵ چێژ و چەشەی ئەغریق و ڕۆمانییەکان بگونجێ.

ئەوجا لە بەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا دەتوانین بڵێین: ڕەخنەسازیی فەرەنسی بە ناوبانگ (کوللتیە) لە دواندەری و لێکۆڵینەوە و وانەکانی لە فێرگە بەناوبانگەکەیدا (خواکانی هۆنراوە) هەروەها (کوواس)ی ڕەخنەساز لە پێشەکییەکانیدا دەربارەی داستانە پیرۆزەکانی و ڕەخنەساز

١ المذاهب الأدبية الكبرى في فرنسا ـ تأليف: فليب فان تيغيم ترجمة: فريد انطونيوس. ص٣٩ ـ ٤٢

(دیمیە) جێنشینی (ڕونسار). ئەمانە هەموویان لە تاقە سەرچاوەیەکەوە بیروڕا ڕەخنەسازییەکانیان وەردەگرت، کە کتێبی بیوتیکای ئەرستۆیە.

## • میان و ئامانجی ڕێبازی کلاسیزم لە ڕەخنەسازیدا

لەبەرئەوەی ساغبۆتەوە کە ڕەخنەسازە کلاسیزمەکان شوێنپێی ئەرستۆ کەوتوون لە هەڵسەنگاندنی هۆنراوە و دەستنیشانکردنی سروشتی ئەم هونەرە. دەبێت ئەوە بخەینە بیری خۆمان، کە ئەم ڕەخنەسازە تەنیا شانۆگەری (تراژیدی و کۆمیدی)بە هۆنراوە داناوە و بەچاوی ڕێزەوە هەر سەیری ئەم دوو چەشنە هۆنراوەیەی کردووە. سەرئەنجام ڕەخنەسازە کلاسیزمەکان هەروەکوو مامۆستاکەیان لە شانۆگەری تراژیدی و کۆمیدی دەکۆڵنەوە و بە تاقە چەشنی هۆنراوە لە قەڵەمیدەدەن و چەشنەکانی دیکەی هۆنراوە فەرامۆشدەکەن.

کەوابوو: هۆنراوەی کلاسیزم بە چەمکی ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان تراژیدییە یان کۆمیدییە، واتە: هەر هۆنراوەی شانۆگەرییە. ئەمە لە ڕووی مەیدانی ڕەخنەسازیی کلاسیزمییەوە، بەڵام لە ڕووی ئامانجی ئەم ڕێبازەوە: ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان بە ڕادەی یەکەم بۆ چەسپاندنی دەستوور و بنواشەی ڕەخنەسازی تێدەکۆشن و لایەنی ڕازاندنەوە و ڕەوانبێژی لە شێوازی هۆنراوەدا، تا ڕادەیێکی زۆر فەرامۆشدەکەن. بۆیە ئەم ڕەخنەسازانە ڕایان وایە کە ڕەخنەسازیی ڕاستینە وەکوو ئەندازیاری ڕاستینە چۆن گرنگی بە بناغە و قەوارە و ڕێکخستنی کۆشکە بنیاتنراوەکە دەدات و ڕازاندنەوەی کۆشکەکە و بۆیەکردنی ژوورەکانی بە کارێکی سەرەکی دانانێت. ئەمیش دەستووری هۆنینەوەی شانۆگەری و پلانی ڕێکخستنی پارچەکانی و هۆنینەوەی ڕووداوەکانی، لە شیرینکاری و ڕەوانبێژی و ڕازاندنەوەی واژەیی بە گرنگتر دادەنێ.

## • بنەڕەتی لاساییکردنەوە

کۆنترین و گرنگترین بنەڕەتی ڕێبازی لاساییکردنەوە لە ڕەخنەسازیدا، لاساییکردنەوەی هەستیارە دێرین و کۆنەکانە. بۆیە دەبینین ڕەخنەسازە یاسادانەرەکانی ئەم ڕێبازە، وەکوو: (پلیادییەکان) ئەم بنەڕەتە ڕەخنەسازییە دووپاتدەکەنەوە و هۆیە پێویستییەکانی دەخەنەڕوو و دەڵێن: هۆنراوەی ڕەسەن خۆی لە خۆیدا لاساییکردنەوەی سروشت و بوونە، کەوابوو: بوون و سروشت لە هۆنراوەی ڕەسەنی دێریندا خۆی دەنوێنێ.

سەرئەنجام کە هەستیارانی هاوچەرخ هۆنراوەی ڕەسەنی دێرین لاسایدەکەنەوە، بە ڕێگایێکی ناڕاستەوخۆ لاسایی سروشت و بوون دەکەنەوە، کە لە وێنەییێکی جوان و پڕ کەماڵدا ڕەنگیداوەتەوە. هەروەها هۆنراوەی دێرینی ڕەسەن جێگای ڕەزامەندی گشت نەوەکانە و هەموو وڵاتەکان بەم بەرهەمە ناسراوانە قایلن. ئەوجا هەستیاری تازە گەر بیەوێ ئەم قایلبوونە و ئەو ڕەزامەندییە هەمیشەییە وەدەستبهێنێ، پێویستە لاسایی ئەو بەرهەمانە بکاتەوە.

بنەڕەتی لاساییکردنەوە ڕەنگە لە سەرەتای پەیدابوونی ڕێبازی کلاسیزمەوە هەنگاوبەهەنگاو بووبێت، بەڵام وردەوردە لەم بارە خۆی دوورخستەوە و زۆربەی ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان لە سەدەی شانزەیەمی زایینییەوە لە مەسەلەی لاساییکردنەوەدا دروشمی هەڵبژاردنیان بەرزکردەوە، بۆ نموونە: ڕەخنەسازی کلاسیزمی فەرەنسی "دوبینیاک" لەم ڕووەوە وتوویەتی: "دەمەوێ پێشنیازبکەم، کە دەبێ هۆشمەندانە لەو نموونە بەرزانەی هەستیارە دێرینەکان کەڵك وەربگرین."[١]

کەوابوو: لاساییکردنەوە، وەکوو ڕێبازێکی داهێنان و خوڵقاندن لە هۆنراوەدا پێویستە بە تیشکی عەقڵ و هۆشمەندی هەستیارەکان بیگرنەبەر و نابێت بەبێ زەین هەنگاو بهاوێژین.

ئەم بنەڕەتەی ڕێبازی ڕەخنەسازیی کلاسیزم ڕاستییەك دەرحەق بە چۆنییەتی ئەنجامدانی بەرهەمی هۆنراوە دەچەسپێنێ، ئەم ڕاستییەش ئەوەیە هەستیار، بە عەقڵ و هۆشمەندی دەبێت لاسایی هەستیارە دێرینەکان بکاتەوە. بۆ ئەوەی شانۆگەری سازبکات، پێویستە ئەم هەستیارە فێری دەستوور و بنواشەی هۆنینەوەی هۆنراوەی دێرین ببێت.

هەستیاری ترازیدی بەناوبانگ (هاردی) کە لە ساڵی ١٦٢٦ زایینیدا مردووە، ئەم ڕاستییە ڕووندەکاتەوە و دەڵێ: ئەوەی وا بیردەکاتەوە، کە ئارەزووی هۆنینەوەی هۆنراوە بەبێ زانست و زانیاری هەستیاری هەڵکەوتوو دروستدەکات، بێگومان بە چەوتی بیردەکاتەوە، بۆیە ناشێت لە نێوان ڕێگای توانای زگماکی و ڕێگای فێربوون و بەدەستهێنانی دەستوور و بنواشەی دروستکردنی شانۆگەری ڕێگای ئارەزووی زگماکی هەڵبژێرین، ئەگەر بمانەوێ شاکارێکی تەکنیکی و پتەو سازبکەین[٢]، یاخود بە دەربڕینێکی دی دروستکردنی هۆنراوە بە خوربە و بەهرە و ئارەزووی سروشتی وەدەستناهێنرێ، بەڵکوو بە توانای فێربوون و ڕاهێنان و پراکتیك، کە ڕێگای زانست و زانیاری بەرهەمی شاکاری سەرکەوتوو ئەنجامدەدرێ.

سەرئەنجام بنەڕەتی لاساییکردنەوە لای ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان لە سەر سێ بناغە چەسپێنراوە:

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥ ـ ٤٦.

- بناغەی هەڵبژاردن
- بناغەی هۆشمەندی و عەقڵ
- بناغـەی زانست و فێربوون

## بنەڕەتی شانۆگەریی ئامانجدار

ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان هەموویان لەو ڕایە دان، کە بەرهەمی هۆنراوەیی پێویستە جوان و لەزەتبەخش بێت، بەڵام ئایا ئەو پێوانەیە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەم ڕەخنەسازانە بڕوایان وابوو، کە نابێت هۆنراوە ئامانجدار و هەڵگری پەیامێکی کۆمەڵایەتی بێت؟!

(کۆرنیل)ی ڕەخنەسـازی بە ناوبانگی کلاسـیزم، وەڵامی ئەم پرسـیارە دەداتەوە و دەڵێ: پێویستە لە سەرەتادا بزانین چلۆن بە هۆی هۆنراوە لەزەت بە تەماشاکەر ببەخشین، بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا بتوانین فێریان بکەین. بە واتای ئەوەی شاسواری ئەم ڕێبازە ڕەخنەسازییە هەر لە ساڵی ١٦٦٠ ی زایینییەوە بنەڕەتی هۆنراوەی ئامانجدار و خاوەن پەیامی چەسپاندووە، بەڵام لە هەمان کاتدا بە دووپاتکردنەوەی مەسـەلەی ئەرکی هۆنراوە لە لەزەتبەخشـیندا پرسـیارێك بەرپادەکات، کە دەپرسێ: ئایا هۆنراوەی شانۆگەری ئەرکی پەیامداری خۆی بە ڕەنووسکردنی بەدخووەکان جێبەجێدەکات و لەم ڕووەوە بە گوێرەی یاسا بەناوبانگەکەی ئەرستۆ لە بزواندنی هەستی ترس و بەزەیی تەماشاکەران، وێنەی کردەوەی خراپ و ئارەزووی پووچەڵ دەنوێنێ؟

زۆربەی ڕەخنەسـازە کلاسـیزمییەکان لەو باوەڕەدان، کە یاسای بزواندنی بەزەیی و ترسی تەماشـاکەران کارێکـی ڕوون نییـە، بـۆ ئەوەی هەسـتیاران ئەنجامیبدەن و بەهۆیـەوە ئەرکی کۆمەڵایەتی هۆنراوە بەجێبهێنن، کەوابوو: دیسانەوە دەبێت بپرسین ئایا بەدیهێنانی ئەم ئەرکە بە چەسـپاندنی ئامۆژگاری و قسـەی نەسـتەقی ڕابەریکەری تەماشـاکەران و خوێنەرانی شانۆگەری دەتوانرێ جێبەجێبکرێ؟

ئـەم ڕێگایـە بـە هیچ ڕەنگێ شـێوازێکی هونەری نییە، بگرە ئەگەر هاتوو هەسـتیار پەیڕەویکرد دەبێت بە دواندەر و ئامۆژگاریکەر و لە کۆڕی هونەری ڕاستەقینە دووردەکەوێتەوە. ئەگەر ئەمدوو ڕێگایە بە کەڵکی هۆنینەوەی تراژیدی ئامانجدار و خاوەنی پەیامی کۆمەڵایەتی نەیەت دەبێت ئەو ڕێگایە پەسەندکراوە چی بێت؟

لە سەدەی شانزەیەمی زایینیدا ڕەخنەسازە کلاسیزمە بلیمەتەکان وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەدەنـەوە، کـە شـانۆگەری دەتوانێ ئەرکی کۆمەڵایەتی خۆی بە ڕێگاییێکی ناڕاسـتەوخۆوە جێبەجێبکات. ئەم ڕێگا ناڕاسـتەوخۆیەش ئەوەیە هەسـتیاری شـانۆگەری دەتوانێ بە هۆی

قارەمان و ڕووداوەکانی شانۆگەرییەکەوە ئامۆژگاری و ڕابەری و خوو و ڕەوشتی چاک و هاندان دژی خراپە بڵاوبکاتەوە و پەردە لە سەر نەریت و خووە خراپەکانی کۆمەڵ لاببات بەبێ ئەوەی تەماشاکەر و خوێنەری شانۆگەرییەکە هەست بەم ئامانجە کۆمەڵایەتییەی هەستیار بکات.

ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان لە چەسپاندنی ئەم بنەڕەتە کۆمەڵایەتییە بەرەنگاری چەند کێشە و بابەتێکی هونەری دەبنەوە. لەم کێشە و بابەتە هونەریانە مەسەلەی هەڵوێستیانە دەربارەی پەیوەندی شانۆگەری بە واقیع و ڕووداوەکانی ژیانەوە.

ئایا شانۆگەری دەبێت ناوەڕۆکەکەی ڕووداوی بێت و لە واقیعی ژیانەوە وەرگیرابێت یاخود دەبێت ماقووڵ و هۆشمەندی بێت؟ هەروەها مەسەلەی داڕشتن و شێوازی هۆنینەوەی شانۆگەری پێویستە لە ڕووی ڕازاندنەوە و وێنەی هونەرییەوە چلۆن بێت؟ ئایا ئەم داڕشتن و شێوازە دەبێت ڕەوان و سووک و بێ گرێ و دوور لە هونەرە ڕەوانبێژییەکانەوە بێت یان بە هۆی ئەندێشەیێکی قووڵەوە بە سازکردنی دەربڕینی جوان و ڕستەی خوازەیی ئەنجامبدرێ؟ ئەم دوو مەسەلەیە هەڵبەت پەیوەندیان بە بنواشە و بنەڕەتی ڕەخنەسازییەوە هەیە و ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان لە ئاستیاندا تێڕوانینی تایبەتی خۆیان هەیە.

## • بنەڕەتیماینیزم لە ڕێبازی کلاسیزمیدا

بابەتی ناوەڕۆکی شانۆگەری خاوەن ئامانجێکی کۆمەڵایەتی لە ڕێبازی کلاسیزمی لە سەر بناغە و بنەڕەتی (ماینیزم)، واتە مەعقولی و هۆشمەندی دامەزراوە. ئەم بنەڕەتەش لە سەرچاوەوە دەگەڕێتەوە سەر بەشێك بە باسی نۆیەمی کتێبە بەناوبانگەکەی (بیوتیکا)ی ئەرستۆ، کە دەڵێ: ئاشکرایە ئەرکی هەستیار ئەوە نییە ڕووداو تۆماربکات و ئەوەی بەڕاستی بەرپابووە بنوێنێ، بەڵکوو ئەرکی ڕاستەقینەی هۆنینەوەی ئەو ڕووداوانەیە، کە دەشێن ڕووبدەن و بەرپابن یاخود با بڵێین هۆنینەوەی ئەو کاروبارانە، کە بە گوێرەی پێویست و بە پێوانەی مەعقول هەستیار دەرکیانپێدەکات. بە ڕاستی هیچ جیاوازییەك لە نێوان هەستیار و مێژوونووس بەدیناکرێت، ئەوە نەبێت کە هەستیار بە هەڵبەست دەدوێت و مێژوونووس بە پەخشان ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، بەڵام جیاوازی سەرەکی دووبارە لە نێوانیاندا ئەوەیە مێژوونووس ئەوەی ڕوویداوە تۆماریدەکات و هەستیار ئەوەی دەشێ ڕووبدا دەیهۆنێتەوە. هەروەها هۆنراوە کاروباری گشتی دەردەبڕێت، کەچی مێژوو کاروباری تایبەت بە سەردەمێك و شوێنێك تۆماردەکات. مەسەلەی

گشـتیش لە هۆنراوەدا بەوە ڕووندەکرێتەوە، کە وتە و کردەوەی مرۆڤێکە بە گوێرەی ڕەوشـتی خۆی و مەنتیقی پێویست و مەعقول. ئەمەش بناغەی هۆنراوەیە لە دانانی ناوی تایبەتی بۆ ئەو مرۆڤە.[١]

ئەرسـتۆ لە شـوێنێکی دیکەی کتێبی (بیوتیکا)دا دووبارە باسـی بنەڕەتی ماینیزمی مەعقولْ دەکات و بە چەشنێکی ڕوون و ئاشکرا دەریدەخات، کە ماینیزم واقیعی و ریالیزمی نییە و هەروەها پەیوەندی بەوەوە نییە، کە بابەتەکەی ڕەنگە ڕوویدات، بەڵکوو پەیوەندی تەنیا بە بڕوای هەستیارەوە هەیە، کە هەستدەکات ئەو ڕووداوە دەشێت ڕوویدات. هەروەها پەیوەندی بە بیروڕای جەماوەرەوە بەندە، کە لەسەر یەك بار لەنگەرناگرێ، بەڵکوو دەگۆڕدرێ و بە گوێرەی دەرفەت لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی ڕەنگ و بۆنوبەرامەی تایبەتی خۆی دەبێت.

هەرچەندە ڕەخنەسازە کلاسیزمییە ئیتاڵییەکان لە فێرگە و کۆڕە وێژەییەکاندا بە دوورودرێژی بنەڕەتی ماینیزمیان خستۆتەبەر لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە، بەڵام ڕەخنەسازی کلاسیزمی فەرەنسی بەناوبانگ (شابلان) وێنەی کۆتایی داوە بەم بنەڕەتە و دووپاتیکردۆتەوە، کە بابەتی ماینیزم و مەعقول هەر دەبێت پەیوەندی بە ڕووداوی ڕۆژانەوە هەبێت و خۆی لە ڕووداوی تایبەتی سەرسوڕهێن بپچڕێنێ. بۆیە بە توندی ڕەخنە لە (کۆرنیل)دەگرێت، چونکە بابەتی مێژووی وای هەڵبژاردووە، کە هەرچەندە دەشێت ڕوویدەن، بەڵام لە هەمان کاتدا مەعقولْ و هۆشمەند نین.

ئەم بنەڕەتە ڕەخنەسازییەی ڕێبازی کلاسیزم هەڵبەت گەلێ جیاوازی لە نێوانی ئەم ڕێبازە و ڕێبازی ڕۆمانسی و ڕیالیزمیدا لە ڕووی پەیوەندیی هۆنراوەوە بە مێژوو و ژیان و هەستیارەوە دەچەسپێنێ. هەروەها بە چەشنێکی ئاشکرا چەمکەکانی ئەم ڕێبازە لە مەسەلەی زەمانی هۆنراوەدا دەخاتەڕوو.

ئەم ڕێبازە لە ڕووی پەیوەندی ناوەڕۆکی هۆنراوەوە بە مێژوو و ژیانی گشتی و ژیانی هەستیارەوە تاقە پێوانەیێکی سازکردووە، کە دەڵێ: ناوەڕۆکی هۆنراوە هەر دەبێت لە تەك عەقڵ و مەنتیق بگونجێ، ئەوجا ئەگەر هاتوو ئەو ناوەڕۆکە ڕووداوێکی مێژوویی ڕاست بوو یاخود ئاکامی واقیعی ژیان بوو، بەڵام عەقڵی ئادەمیزاد پێی قایل نەبوو، مەنتیقی جەماوەرانیش وەرینەگرت. ئەم ئاکام و ڕووداوە لە بەر تیشکی ئەو پێوانەیەی ڕێبازی کلاسیزمیدا بە پڕوپوچ لەقەڵەمدەدرێت و بە بەرهەمێکی ئەندێشەیی دادەنرێ.

---

١ مراجعة: المذاهب الادبية الكبرى في فرنسا، ص٥٣ ـ ٥٤

## • ڕێبازی کلاسیزم و وێنەی هونەری لە زمانی هۆنراوەدا

زاراوەی (وێنەی هونەری) لە چەمکی ڕەخنەسازیی هاوچەرخ لە بری شێوازە ڕوونبیرییەکان لە ڕەوانبێژیدا بەکاردێت، کە لە لێکچواندن و خوازە و خواستە و درکە پێکهاتوون. ئەم زاراوەیە مەبەستەکەی لەوەوە سازدەکرێ، کە دەوترێ: ئەگەر هاتوو تەماشای گوڵێکت کرد و هەستت بە ڕەنگ و پەڕەکانی و گەڵاکانی کرد و بە وردی تێتڕوانی، ئەوا بەرەنگاری شتێك دەبیت، کە قەوارەییێکی تایبەتی خۆی هەیە و بوونی لە کەسایەتیت سەربەست و جیاوازە و خۆیت بە سەردا دەسەپێنێ و بە هیچ ڕەنگێ ناتوانێ دەستکاری بوونی بکەیت. هەرچەندە لە هەمان کاتدا ئەو گوڵە بەشێکە لە هەستت، چونکە بە هۆی تەماشاکردنییەوە عەقڵت بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و هۆشمەندیت داگیردەکات، بەڵام ئەگەرهاتوو ڕووت لەو گوڵە وەرگێڕا و خەریکی تەماشاکردنی شتێکی دیکە بوویت، درەختێك یان ڕووبارێك هەڵبەت ئەو گوڵە خۆی لە خۆیدا هەر ماوە و بوونی نەفەوتاوە و ئەوەی دەربارەی بوونی ڕوویداوە تەنیا دەرچوونییەتی لە جوغزی

هۆشمەندیت.

ئەوجا ئەگەر هاتوو لە بەر هەر هۆیەك بێت، ئەگەر ئەو گوڵەت یادکردەوە دیسانەوە تایبەتییەکانی دێتەوە یادت، بە جۆرێکی وەها کە بوونی گوڵەکە لە بەرچاوت بێت. ئەم هێنانەوە یادە هەڵبەت وێنەی گوڵەکەیە، نەك بوون و قەوارەکەی. بەم جۆرە ئەم گوڵە سەبارەت بە تۆ دوو بوونی هەیە:

**یەکەمیان:** بوونێکی کەرستەیی و ماددییە، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە بەرچاوتدا بووە و هەستت بە قەوارەکەی کردووە.

**دووەمیان:** بوونێکی وێنەییە، کە بە زەین و هۆشمەندیت بیری لێ دەکەیتەوە و دەیهێنیتەوە یادت.

جیاوازی ئەم دوو بوونە لەوەدایە، کە بوونی کەرستەیی و ماددی گوڵەکە سەربەخۆیە و تایبەتییەکانی سەرئەنجامی قەوارەکەیەتی، بەڵام بوونە وێنەییەکەی شوێنەوارێکە لە هۆشمەندیت و دەتوانیت دەستکاریبکەیت و بە گوێرەی مەبەستت بەکاریبهێنیت.

جگە لەوە بوونی کەرستەیی و مادیی گوڵەکە بەشێکە لە جیهانی هەستپێکراو، کەچی بوونی وێنەی گوڵەکە بەشێکە لە جیهانی بیر، کە مەیدانی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازی و فەلسەفەیە. ڕێبازە ڕەخنەسازییەکان دەربارەی ئەم بوونە وێنەییە هەڵوێستی جیاوازیان هەیە.

ڕێبازی کلاسیزم لە نێوان ئەو ڕێبازانە دەرحەق بە وێنە بیروڕای وایە، کە نابێت هەستیار وێنەی هونەری لە زمانی هۆنراوەدا بە چەشنێکی فراوان سازبکات و مەبەستی تێگەیاندن و ڕابەری عەقڵ و ئامۆژگاری خەڵکی لە خۆی تێکبدات، چونکە وێنەی هونەری، کە بە ئەندێشە سازدەکرێ لە جیهانی ناهەستپێکراوەوە وەردەگیرێ، تەمومژێك بەرپادەکات و ئاوێنەی عەقڵ و تێگەیشتن لێڵدەکات.

ئەم هەڵوێستەی ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان دەرحەق بە وێنەی هونەری نابێت بەوە ڕاڤەبکرێت، کە ئەم دەستەیە بە هیچ ڕەنگێ ڕێگایان نەداوە، کە لە زمانی هۆنراوەدا وێنەی هونەری بەکاربهێنن، بەڵکوو سنوورێکی هۆشمەندییان بۆ ئەو بەکارهێنانە ڕاکێشاوە و دووپاتیانکردۆتەوە، کە وێنەی هونەری شوێنەواری بوونی شتێکی هەستپێکراوە. هەستیاریش پێویستە پەیڕەوی پەیوەندی نێوان وێنەی شتەکە و بوون و قەوارەی ئەو شتە بکات و نابێت بە هەوەسی خۆی دەستکاری وێنەکە بکات، بەڵکوو دەبێت بە هەمان واتا و چەمك بەکاریبهێنێ. ئەم سنوورەش هەڵبەت ئەوە دەگەیەنێ، کە ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان هەروەکوو لەمەودوا دەبینین لە چاو ڕەخنەسازە ڕۆمانسیزمییەکاندا تابڵێیت ڕێگایان بە گۆڕینی زمانی هۆنراوە نەداوە.

## • سەرچاوە و زاراوەی ڕۆمانیزم

زاراوەی ڕۆمانیزمی لە بناغەدا لە وشەی (ڕۆمانیوس- romanius)داڕێژراوە. وشەی (ڕۆمانیۆس)یش لە فەرهەنگدا ناوێکە بۆ ئەو زمانە ئەورووپیانە، کە لە سەرەتاوە لە زمانی لاتینی جیابوونەتەوە و پەرەیانسەندووە و بوون بە زمانی نەتەوایەتی چەند میللەتێك لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. کۆمەڵێك لە هەستیارانی ئەم میللەتانە کردیان بە هۆی دەربڕین لە سازکردنی وێژەی نەتەوایەتیان، کە لە چاو وێژەی دێرین و وێژەی لاساییکەرەوەی بەرهەمی ئەغریقی و ڕۆمانیدا بە پلەیێکی نزم تەماشادەکرا.

هەرچۆنێك بێت ئەو زمانە نەتەوایەتییانە بە کارتێکردنی جەماوەرە بەکارهێنەرەکانیان هەنگاو بە هەنگاو لەو بارە ڕزگاریان بوو، هەتاوەکوو سەدەی ڕاپەڕین، کە توانیان جێگا بە زمانی لاتینی لەقبکەن و لە کۆڕی وێژە و زانستی ناوچەکانیان دەرببپەڕێنن و جێگای بگرنەوە و ببن بە زمانی هونەر و زانیاری و وێژەر و هونەرمەند و زاناکان، وەکوو دەربڕینێکی ڕەسمن لە

ڕۆشنبیریی نەتەوایەتی و شارستانێتیی نیشتمانی شانازی پێوەبکەن.

لەم ڕۆژانەدا بە زمانی فەرەنسی و ئیتاڵی و ئیسپانی و پرتوگالی و ڕۆمانی و بروفانسیالی و ڕۆمانسی، کە یەکێکە لە زارە سویسرییە ناسراوەکان ئەمە لە ڕووی بناغەی ڕۆمانیزمییەوە، بەڵام لە ڕووی وێژە و ڕەخنەسازییەوە هەمان زاراوە بوو بە نازناو (لقب) بۆ چەشنێك لە وێژە، کە لە ڕووی فۆرم و ناوەڕۆکەوە چەند تایبەتییەکی هەیە و ئەم تایبەتییانەش بە کورتی دژواری تایبەتییەکانی وێژەی کلاسیزمن، چونکە لە مێژووی وێژەی نەتەوە ئەورووپییەکاندا ساغبۆتەوە، کە وێژەرە ڕۆمانیزمەکان لە داهێنانی بەرهەمەکانیاندا شۆڕشێکی هونەرییان دژ بە دەستوور و بناغەکانی وێژەی کلاسیزمی بەرپاکرد و بە هەموو توانایەکیانەوە لە بنەڕەتەکانی ڕێبازی کلاسیزم لە ڕەخنەسازیدا لایانداوە.

ئەگەر بە گشتی ئاوڕێ لە بەرهەمەکانی وێژەرە ئەورووپییە ڕۆمانیزمییەکان بدەینەوە و تێبکۆشین نەخشەیەك بۆ نیشتمانەکانیان بکێشین، بە نیازی ئەوەی شوێنی لەدایکبوونی وێژەی ڕۆمانیزمی دەستنیشانبکەین، بەرەنگاری بیردۆزێکی مێژوویی دەبینەوە، کە دەڵێ: وێژەی ڕۆمانیزمی لەگەڵ تایبەتی دەروونی و باری کۆمەڵایەتی چەند نەتەوەیێکی ئەورووپی وەکوو ئینگلیزی و ئەڵمانی دەگونجێ و قەوارەکەی لە نێوان ئەم دوو نەتەوەیەدا خولقاوە. بۆیە ئەو مێژوونووسانە سوورن لە سەر ئەوەی وێژەی ڕۆمانیزمی لە فەرەنسادا، هەرچەندە فراوان و بە پیتە، وێژەرە ڕۆمانیزمە فەرەنسییەکان بەرهەمیان زۆرە، بەڵام ئەمە هەمووی بە هۆی لاساییکردنەوەی وێژەی ڕۆمانیزمی ئینگلیزی و ئەڵمانی بەرپابوو، بەڵگەشیان بۆ سەلماندنی ئەم بیرورایە لە سەر ئەو تێبینییە دامەزراوە، کە یەکەم وێژەری ڕۆمانیزمی فەرەنسی (شاتۆبریان) کە کۆچیکردبوو بۆ ئینگلیستان و لەوێ لاسایی وێژەرە ڕۆمانیزمە ئینگلیزەکانی کردۆتەوە و شوێنپێیانی هەڵگرتووە، بەهەشتە ونبووەکەی هەستیاری بەناوبانگی ئینگلیزی (ملتۆن)ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی و لەبەر تیشکیدا وێژەی (ڕۆمانیزمی) نووسیوەتەوە. هەروەها (مەدام دی ستال)یش، کە لە پاریسدا سەرکردەی وێژەرە ڕۆمانیزمییەکان بوو، ماوەیێکی زۆر لە ئەڵمانیادا تەمەنی بردۆتەسەر و مێشك و هەست و نەستی بە وێژەی ڕۆمانیزمی ئەڵمانی زاخاوداوە و کتێبێکی فراوانی بە زمانی فەرەنسی دەربارەی وێژەی ئەڵمانی داناوە.

پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە، تا چ ڕاددەیەك ئەم بیرورایە ڕاستە و دەشێت ببێت بە تاقە هۆی لەدایکبوونی وێژەی ڕۆمانیزمی لە فەرەنسادا، کە بەڕاستی بزووتنەوەیێکی ڕەسەن و بەپیتە؟

ئەوەی بە وردی شاکارە بە نرخ و بەرزەکانی وێژەرە فەرەنسییە ڕۆمانیزمییەکانی وەکوو: (ئەلفرێد دیمۆسین و ڕۆسۆ و فیکتۆر هۆگۆ) بخوێنێتەوە، بە هیچ ڕەنگێ بەو بیرورایە

قایلنابێت و سەرئەنجام بڕوا بەوە دەهێنێت، کە وێژەی ڕۆمانیزمی لە فەڕەنسادا لاساییکەرەوەی وێژەی ڕۆمانیزمی ئینگلیزی و ئەڵمانی نییە و لە سەر ئەوە سووردەبێت، کە ئەم وێژەیە وەکوو وێژەکانی دی هاوتایبەتی و ئاکامی چەند هۆیێکی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتییە، بەم جۆرە بیروڕا لە سەر ئەوە بەنددەبێت، کە وێژەی ڕۆمانیزمی لە فەڕەنسادا بەرهەمێکی ڕەسەنە و ئەم وێژەیە، کە لە سەدەی نۆزدەیەمی زایینییەوە لە ئەورووپادا وەکوو ڕێبازێکی کامڵ و پێگەیشتوو بەرامبەر بە وێژە و ڕەخنەسازیی کلاسیزمی خۆی ڕاگرت، ئاکامی بارێکی کۆمەڵایەتی و دەرفەتێکی ئابووری و حاڵەتێکی دەروونی بووە، کە دوابەدوای ڕووخاندنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و بەرپابوونی شۆڕشی پیشەسازی و نەمانی دەسەڵاتی خێڵایەتی و بەهێزبوونی هەستی کەسی باڵی بە سەر ئەورووپادا کێشا.

(شاتۆبریان و مەدام دی ستال)، کە بە خوڵقێنەری وێژەی ڕۆمانیزمی لە فەڕەنسادا دەژمێردرێن، بە هیچ ڕەنگێ خۆیان لە داهێنانی بەرهەمی وێژەییدا مەبەستیان بەرپاکردنی ڕێبازێکی تازە نەبووە، بەڵکوو هەموو مەبەستیان دەوڵەمەندکردن و پتەوکردنی وێژەی کلاسیزمی بوو، بەڵگەش بۆ چەسپاندنی ئەم ڕاستییە ئەوەیە، ئەم دوو وێژەرە بلیمەتە خاوەن ڕێبازێکی ڕەخنەسازی بوون و لە بەر تیشکی بناغەی هونەری و ستاتیکی و کۆمەڵایەتیدا وێژەی بێگانەیان لێکدایەوە یاخود بە دەربڕینێکی دی بابڵێین: کە (شاتۆبریان) و (مەدام دی ستال) لە نووسینەوەی وێژە تازەکەیاندا هێشتا هەر لە چوارچێوەی دەستوور و بنواشەی بیردۆزمی وێژەدا بەرهەمی نوێیان ئەنجامدەدا.

هەرچۆنێك بێت مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی لە ساڵی ١٨١٦ ی زایینییەوە دەرکیان بەوە کرد، کە وێژەیێکی تازە وا لەدایکدەبێت و جێ بە وێژەی کلاسیزمی لەقدەکات و شوێنپێیدە گرێت و دەبێت بە تەرزی چەشەی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی.

کەوابوو: وێژەی ڕۆمانیزم بە چەشنێکی سروشتی و دوور لە سەنعەتکاری و پلانی دروستکردن بە قەستی لە سەر دەستی کۆمەڵێك لە هەستیارانی سەرفراز و عاشقانی ئازادی و گوێڕایەڵی چەژەی کەسیدا، وەکوو تیشکی خۆری زەرد لە جیهانی ئەندێشەی بەرز و هەڵچوونەوە بە گوڕ سەریدەرهێنا و بەرهەمێکی نوێی بەرامبەر بە وێژەی کلاسیزمیدا بەدەستەوە.

جا بۆ ئەوەی لە سروشتی وێژەی ڕۆمانیزمی بگەین و هێڵە گشتییەکانی لە وێژە دژوارەکەی جیابکەینەوە، واتە: وێژەی کلاسیزمی بنوێنین دەبێت بزانین، کە وێژەی ڕۆمانیزمی بەرهەمێکی کەسییە و بە چێژ و چەشەی تایبەتی خاوەنەکەی خوڵقاوە، بەڵام وێژەی کلاسیزمی

کارێکی مەوزوعییە و لە قاڵبی دەستوور و بنواشەی گشتیدا سازکراوە.

هەروەها ڕێژەی ڕۆمانیزمی لە بەر تیشکی مەیل و ئارەزووی تەنی هەستیاراندا هاتۆتەبەرهەم، ئەم مەیل و ئارەزووە تەنیا تاقە بیردۆزی ئەو هەستیارانە بووە، بۆیە شاکارەکانیان بە نامەنتیقی و بێ ڕێوشوێن لەقەڵەمدەدرێن، کەچی ڕێژەی کلاسیزم ئاکامی بیردۆزمێکی ئایدۆلۆجی و هونەری پتەوە و هێڵە وردەکانی ئەم بیردۆزمیە لەسەر چەند بنەڕەتێکی سنوورداری ئاشکرا دامەزراوە.

جگە لەمە ڕێژەی ڕۆمانیزم دەنگی خاوەنەکەیەتی و ئاوێنەی باری دەروون و هەستی ئەنجامدەرەکەیەتی، لە کاتێکدا کە ڕێژەی کلاسیزمی ڕەنگدانەوەی باری کۆمەڵێکە و دەرفەتێکی گشتی دەردەبڕێ. ئەم بەراوردکارییە لە نێوانی ڕێژەی ڕۆمانیزمی و کلاسیزمیدا، ئەوە دەردەخات کە ڕێژەی ڕۆمانیزمی سەرئەنجامی کۆمەڵێکی تازەیە، کە بە کارتێکردنی چەند هۆیەکی کاریگەر و بنیاتنراو زاڵبوو بەسەر کۆمەڵی سەدەکانی ناوەڕاست، بۆیە ئەم ڕێژەیە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هەرچی بابەتی دژ بە یەکتر لە ژیاندا هەیە دەگرێتەخۆی و دەیانکات بە سەرچاوەی خورپە و ئیلهامی و لە ڕووی فۆرمیشەوە خۆی بە توندی لە هەموو تەکنیك و دەربڕین وشەسازییەکی دێرینەوە پچڕاندووە.

ڤیکتۆر هۆگۆ، کە شاسواری هەستیارە ڕۆمانیزمییەکانە لەم ڕووەوە دەڵێ: بۆ ئەوەی شتێکی ڕاستینە سازبکەین پێویستە وەسفی باری دەروونی ڕاستینە بکەین.

هەروەها نابێت ئەو بارە بە وشە و دەربڕینی سەردەمێکی کۆتایی پێهێنراو دەربڕێت و لاسایی شێوازی دێرینی لە سەردەم پچڕاومان بکەینەوە. سەرئەنجام هەموو بیرۆکەیەك کە لە سەر بنواشەی لاساییکردنەوە دامەزرابێت، بێگومان لەگەڵ وستەنی خولقاندنی ڕێژەی تازە ناگونجێت.

## • ویژەی ڕۆمانیزمیی و ڕێبازی ڕەخنەسازی

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی پاش ئەوەی ویژەی کلاسیزمیان لەگەڵ ویژەی ڕۆمانیزمی بەراوردکرد. هەمان ڕەفتاریان بەرامبەر ئەم دوو ویژەیە کردووە و سەرنجیان بۆ ئەوە ڕاکێشاوە، کە ڕەخنەسازیی کلاسیزمی ڕێبازێکی جیاوازە لە ویژەی کلاسیزمی و ڕەخنەسازە پەیڕەویکەرەکانی ئەم ڕێبازە بە سەرفرازی ڕابەری ویژەرە کلاسیزمییەکانیان کردووە و ئەم ویژەرانە خۆیان لە کۆڕی ڕەخنەسازی هەڵنەقورتاندووە.

ئەگەر هاتوو هەستیارێکی کلاسیزمی وەکوو (شاپلان)، کە پلەیێکی ئەوتۆی لە هونەری هۆنراوەدا نییە دەمی لە ڕەخنەسازی ژەنیبێت، زۆربەی هەستیارە کلاسیزمییە پایەبەرزەکان هەر خەریکی بەرهەمهێنانی هۆنراوە بوون و بە دڵسۆزی لەم کارەیاندا پەیڕەوی دەستوور و بنواشەی ڕێبازە ڕەخنەسازییەکەیان کردووە، کەچی باری ڕەخنەسازیی ڕۆمانیزمی وانەبوو، بگرە بە پێچەوانەوە ئەنجامدەدرا، چونکە ویژەرە ڕۆمانیزمییەکان خۆیان بە ڕەخنەساز دادەنا و هەوڵی

چەسپاندنی ڕێبازێکی ڕەخنەسازیی تایبەتیان بە بزووتنەوە وێژەییەکەیان دەدا.

سەرئەنجام بەرهەمی ئەم هەوڵدانە، تا ماوەیێکی زۆر کاڵوکرچ بوو، مێژووناسەکانی ڕەخنەسازیی ئەوروپیش وەکوو ڕێبازێکی ڕەخنەسازیی سەربەخۆ دانیان پێدانەنا. بۆیە لەم ڕووەوە تێبینی دەکرێ، کە هیچ ڕەخنەسازێکی ڕۆمانیزمی هەتاکو کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و نیوەی سەدەی نۆزدەیەم بۆی نەکرا باری دەروونی هەستیاری ڕۆمانیزمی شیبکاتەوە و مەسەلەی نەخۆشی سەردەم یەکالابکاتەوە و زۆرانبازی مەیل و ئارەزووی دژوار لەم بزووتنەوە تازەیەدا بخاتەڕوو. کەسێك ناتوانێ بڵێ: بە درێژایی ئەو سەدە و نیوەی تەمەنی وێژەی ڕۆمانیزمی ڕێبازێکی ڕەخنەسازیی ڕۆمانیزمی لە سەر بناغەی دەستوور و بنواشەی پتەو دامەزرا و بەرپابوو. بۆ نموونە نووسەری ڕۆمانیزمی بەناوبانگ (سینانکۆر) لەو کتێبەیدا، کە بە ناونیشانی (ئۆبرمان)داینا، کۆششیکرد سنووری وێژەی ڕۆمانیزمی دەستنیشانبکات و تایبەتییەکانی بە چەند سنوورێك بخاتەڕوو. سەرئەنجامی کۆششەکەی جگە لە نواندنی چەند تێبینییەکی کەسی و بریاری سۆزی هیچی دیکە نەبوو.

هەروەها (ستاندال) تەنیا لە ڕوانگەیێکی وێژەییەوە بیروڕای خۆی چەسپاندووە، کە وتوویەتی: ڕۆمانیزمی ئەو هونەرەیە، کە بە هۆیەوە دەتوانین تەوژمێکی قووڵ و بەهێز لە لەزەت و خۆشی پێشکەش بە میللەتان بکەین.

ئەم پێناسەیەی وێژەی ڕۆمانیزم، هەڵبەت شتێکی تازە نییە و بە هیچ ڕەنگێ تایبەت بەم وێژەیە دانانرێ، بەڵکوو بۆ هەموو وێژەیەك دەستدەدات و ڕەنگە لەگەڵ چێژ و چەشەی دێرینترین سەردەمدا بگونجێت.

بەم پێیە مێژوونووسی ڕەخنەسازی دەتوانێ ڕەخنەسازییە ڕۆمانیزمییەکان هەڵبسەنگێنێ و هەمان سەرئەنجام سەبارەتیان دووپاربکاتەوە. نموونەیێکی دی لەم بارەیەوە ئەم پێناسەیەیە، کە دەڵێ: وێژەی ڕۆمانیزمی پێویستە دەربڕینێك بێت دەربارەی کۆمەڵگای نوێ، بەڵام ئەم کۆمەڵگا نوێیە چییە و تایبەتییەکانی لە ڕووی شارستانێتی و ڕۆشنبیرییەوە چین؟

ڕەخنەسازی بەناوبانگ (دوبریە) وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ: ئەم کۆمەڵگا نوێیە لەسەر نەریتێکی مەسیحیدا دامەزراوە، کە نەریتێکی گیانی و لە ماددەپەرستییەوە دوورە. کەچی ڕەخنەسازێکی دی بە ناوی (فیتە)وە، بیروڕای وایە کە ئەو کۆمەڵگا نوێیە بناغەکەی ئازادیی کەسایەتییە، کە تەرز و بۆن و بەرامەی سەردەمی تازەیە.

مێژوونووسی وێژەی فەرەنسی (گیرۆ GUINAUD)تایبەتییەکانی ئەو سەردەمە تازەیە شیدەکاتەوە و پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێت، کە سەردەمی لاوییەتی و سەربەستی شۆڕش شەیدای

نوێخوازییە. بەم جۆرە بۆمان ساغدەبێتەوە، کە هەرچەندە وێژەی ڕۆمانیزمی بە چەشنێکی فراوان لە سەدەی هەژدەهەم و نیوەی سەدەی نۆزدەیەمدا بڵاوبووەوە، بەڵام ڕەخنەسازیی ڕۆمانیزمی بە درێژایی ئەم ماوەیە هەر بەکاڵوکرچی مایەوە و هەڵگرانی دروشمەکانی نەیانتوانی بناغەی ئەو ڕەخنەسازییە بە پتەوی دابمەزرێنن و دەستوورەکانی بچەسپێنن و بیکەن بە ڕێبازێکی سەربەخۆ.

پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە ئایا لەم بارەدا هەروا مایەوە یاخود تا ماوەیەک دوابەدوای ئەو ماوەیە گۆڕدرا؟

هەروەکوو لەمەوبەر بینیمان شانبەشانی وێژەی ڕەخنەسازیی ڕۆمانیزمی هیچ ڕێبازێکی ڕەخنەسازیی ڕۆمانیزمی ڕاستینە لەدایکنەبوو، هەرچی لەم ڕووەوە بە دەستمان گەیشتووە، تێبینی کەسییە و لە بەر تیشکی ڕێبازێکی زانستی پێگەیشتوودا ئەنجامنەدراوە.

ئەم ڕاستییە هەڵبەت نابێت ئەوە بگەیەنێت، کە وێژەی ڕۆمانیزمی بە بێ لێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازی ماوەتەوە و هیچ ڕەخنەسازێکی ڕاستینە باسی ئەم وێژە تازەیەی نەکردووە، چونکە لە مێژووی وێژە و ڕەخنەسازیی میللەتە ئەورووپییەکاندا ساغبۆتەوە، کە چەند توێژەر و مێژوونووس و ڕەخنەسازی هەڵکەوتووی خاوەن ڕێباز بە وردی باسیان لە بەرهەمەکانی هەستیار و نووسەرە ڕۆمانیزمییەکان کردووە، بەڵام ئەم توێژەر و مێژوونووس و ڕەخنەسازانە لە ڕێبازدا ڕۆمانیزمی نەبوون.

هەرچۆنێک بێت بەناوبانگترینی ئەم زانایانە (لاهارب)ە، کە بە وردی لە هۆنراوەی خودی (زاتی) ڕێبازی ڕۆمانیزمی کۆڵیوەتەوە و دووپاتیکردۆتەوە، کە ئاکامی بلیمەتی لە هونەری هۆنراوەدا ئەگەر لە بۆتەی زانستی تەکنیکی هەڵبەستدا ئەنجامنەدرێ، بەرهەمێکی کاڵوکرچە، هەروەها سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە، کە شوێنەواری بەرهەمی سۆزی و هەڵچوونی چەند گەرموگوڕ بێت و دەنگدانەوەی ویستەنی نوێخوازی بێت، تەنیا سەرئەنجامێکی کاتییە و ناتوانێ جڵەوی نەمریی وەدەستبهێنێ، ئەگەر هاتوو خاوەنەکەی بڕوای بە دەستوور و بنواشەی پیشەسازیی وێژە نەبوو.

ئەم تێبینییە ڕەخنەسازییەی (لاهارب) هەڵبەت توانجن و ئاراستەی وێژەی ڕۆمانیزمی کراون بەڵام لە هەمان کاتدا بە هۆیانەوە ئەم وێژەیە خرایەبەر توێژینەوە و یەکاڵاکردنەوە. ئەوجا تایبەتییەکانی لە تۆمارگای مێژووی ڕەخنەسازیی جیهانیدا خرانەڕوو. بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە مێژوونووسی ئیتاڵی (جنفینە)یە، لە دووتوێی کتێبە بەناوبانگەکەیدا دەربارەی مێژووی وێژەی ئیتاڵی، دەروازەی ئەم زانستەی لە ڕووی وێژەی ڕۆمانیزمی کردەوە و بە

چەشنێکی زانستیانە لە هەستیار و نووسەرە ڕۆمانیزمە هاوچەرخەکانی کۆڵییەوە، لە کاتێکدا کە ئەم دەروازەیە تەنیا بۆ ڕێژەی کلاسیزمی کرابووەوە.

. سەرئەنجام ئێمە ڕامان وایە، کە ڕۆمانیزم وەکوو ڕێبازێکی ڕێژەیی بوون و قەوارەی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام وەکوو ڕێبازێکی ڕەخنەسازی نەیتوانی زانستیانە شوێنەوارێك بۆ خۆی پەیدابکات.




# • زاراوەی ریالیزم و مەبەست لەبەکارهێنانی

ریالیـزم لـە فەرهەنگـی زمانە ئەورووپییەکاندا، لە وشـەی (ریەل)ەوە داتاشـراوە. وشـەی (ریەل)یش لە بناغەدا بە واتای ڕاست و ڕاستینە هاتووە. لە پاشان بووە بە زاراوەیێکی وێژەیی و ڕەخنەسازی بۆ جیاکردنەوەی بزووتنەوەیێکی ئایدۆلۆجی و هونەری، کە چەند تایبەتییەکی ناوەڕۆکی و فۆڕمی هەیە، کە لە بزووتنەوەکانی کلاسیزم و ڕۆمانیزم جیایدەکەنەوە.

مەبەستی سەرەکی هەڵبژاردنـی ئـەم زاراوەیە بۆ ئـەو بزووتنەوە ئایدۆلۆجـی و هونەرییە لـە ڕووی مێژوویـیـەوە بەرپەرچدانەوەی بیروڕا بەناوبانگەکەی ئەفلاتوونە دەرحەق بە هونەر بە گشتی و هونەری هۆنراوە بە تایبەتی، چونکە لەمەوبەر بۆمان دەرکەوت بیروڕای ئەفلاتوون لەم کۆڕەدا دووپاتیدەکاتەوە، کە هونەر کارێکی ڕاست و ڕاستینە نییە، بەڵکوو ئاکامێکی درۆیە لە لاساییکردنەوەی سروشت و سێ هەنگاو لە ڕاستییەوە دوورە.

ڕەخنەسازە پەسەندکەرەکانی ئەم ڕێبازە زاراوەی ڕیالیزمیان هەڵبژارد وەکوو کاردانەوە دژ بە بیروڕاکانی ئەفلاتوون و وتیان: وێژە کارێکی ڕاست و ڕاستینە و ڕەسەنە، چونکە ئاکامی ژیانی

کۆمەڵە و ئاوێنەیێکی ڕوون و بێگەردە بۆ نواندنی هەموو بیرۆکە و ڕووداوێکی ڕاست، کە بە هۆی بزووتنەوەی مێژووی بوونەوە بەرپا دەبێت.

ڕەخنەسازە دامەزرێنەرەکانی ڕێبازی ڕیالیزم لە ڕووی جۆری وێژەی ڕێبازەکەیانەوە ڕایان وایە هۆنراوە بەزۆری ناشێت ببێ بە بڕبڕەی پشتی بزووتنەوەی وێژەی ڕیالیزم، چونکە بەهۆی بنواشـە و دەسـتووورە هونەرییەکانییـەوە لـە کێش و قافیە و ئەندێشـە و وێنـەی هونەری، کەس بڕواناکات کە زمانی دەربڕینی چینە زەحمەتکێشـەکانە و نەخوێندەوار و پیرەمێرد و منداڵ بۆ دەربڕینی هەڵسوکەوت و هەست و نەستیان لە شانۆگەریدا بە ڕاستی بەکاری بهێنن.

سـەرئەنجام ئەم ڕەخنەسـازانە بڕوایان وایە، کە جۆرەکانی پەخشان بە گشتی و ڕۆمان بە تایبەتی بواری سـەرەکی ڕیالیزمن و نووسـەرە ڕیالیزمییەکان دەتوانن بە هۆی ڕۆمانەوە واقیع بنوێنن و ژیانی چینەکانی کۆمەڵ تۆماربکەن و بیروڕای شۆڕشـگێڕی و کۆمەڵایەتییەکان بڵاوبکەنەوە.

لەبەر تیشـکی ئەم ڕاسـتییەدا ڕێبازی ڕیالیزمی لە چەشـنەکانی پەخشاندا سێ ڕووگە (اتجاه) یە:

## • یەکەم: ریالیزمی فۆتۆگرافی:

ئەم ڕووگەیە لە ڕیالیزمدا مەبەستی ڕەنگدانەوەی واقیع و بوونە بەبێ دەستکاری و گۆڕین، بۆیە پەیڕەویکەرەکانی ئەم ڕووگەیە بەوپەڕی دەستپاکییەوە ژیان و ڕەوشت و کارساتی چینەکانی میللەت بە خۆیان تۆماردەکەن و هەڵسوکەوتیان دەخەنەڕوو و بە شێوازێکی تەقریری، هەرچی دەبینن یاخود هەستیپێدەکەن لە دووتوێی ڕۆمانەکانیاندا ڕەنووسیدەکەن.

## • دووەم: ڕیالیزمی ڕەخنەگری:

نووسـەر لـەم ڕووگەیـەدا لایەنێکی هەڵبژاردە لـە ژیانی واقیعی هەڵدەبژێرێ و دەیکات بە مایە و ماکی ڕەخنەگرتن لە ڕەوشتی ناپەسند و خووی خراپ، بەتایبەتی بە نیازی ڕابەری و سەرزەنشتکردن بە قووڵی و بە وێنەیێکی (کاریکاتێر)ی لایەنە هەڵبژاردەکەی شیدەکاتەوە و دەیچەسپێنێ.

### • سێیەم: ڕیالیزمی سۆشیالیزمی:

لە بەر تیشکی بیردۆزێکی ئابووری ڕامیاریدا، ڕووداوی ژیان و باری کۆمەڵایەتی بە شێوازێکی ئامانجدار و ڕابەریکەر شیدەکاتەوە و بەرەو مەبەستێکی تایبەتی بەڕێوەیدەبا و ژیانی داهاتووی بەختیار لە چوارچێوەی کوێرەوەری و ئێش و ئازاری چینە زەحمەتکێشەکان و زولم و زۆری چینە دەستەڵاتدارەکاندا، وەکوو هیوایێکی ڕووداوی نەخشەدەکێشێت.

ئەم سێ ڕووگەیە لە ڕیالیزمدا، لە ڕووی لەدایکبوونیانەوە ڕەگوڕیشەیان لە بیروڕاکانی ئەرستۆدا بە دیەکرێ، چونکە هەروەکوو لەمەوبەر بینیمان، ئەم ڕەخنەسازە فەیلەسووفە لە دێرینترین سەردەمی ڕەخنەسازیی ئەغریقییەوە سووربوو لە سەر ئەوەی هەستیار دەبێت پەیامێکی کۆمەڵایەتی هەبێت.

هەروەها ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا دروشمی پەیامداری هەستیاری شانۆگەرییان هەڵگرتبوو، دووپاتیاندەکردەوە، کە ناوەڕۆکی شانۆگەری تراژیدی و کۆمیدی دەبێت خووڕەوشتی و کۆمەڵایەتی بێت.

ئەمە لە ڕووی مێژووی ڕەخنەسازیی ئەورووپییەوە، بەڵام لە ڕوانگەی تایبەتی خۆمانەوە ئێمە ڕامان وایە، کە پەیامداری لە هۆنراوەدا بە چەشنێکی زانستی و هونەری لە ڕەخنەسازیی عەرەبی سەردەمی قورئانەوە دەستپێدەکات و وەکوو سەرچاوەیێکی مێژوویی لەو سەردەمەوە بووە بە کەرەسەی هەموو ڕووگەیێکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری لەبەر دەستی هەستیارە نەتەوە موسڵمانەکاندا.

هەرچۆنێك بێت ئەمە تێبینییەکە هەڵبەت پێویستی بە گفتوگۆ هەیە، ئێمەش کە لێرەدا دەیخەینەڕوو و دەمانەوێ سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشین، کە هیچ نەبێت دوو سەرچاوەی مێژوویی بۆ پەیامداری (التزام) لە مێژوودا هەیە:

**یەکەمیان:** سەرچاوەیێکی ئەغریقی و ڕۆمانی و ئەورووپییە، کە بە ئاکامەکەی دەوترێ (ڕیالیزم) و بوارەکەی یاخود چەشنە وێژەییەکەی یا هۆنراوەی شانۆگەرییە یان چیرۆك و ڕۆمانە.

**دووەمیان:** سەرچاوەیێکی عەرەبی و ئیسلامییە، کە ئێمە ئاکامەکەی بە هۆنراوەی شۆڕشگێڕ و پەیامدار ناودەبەین. تایبەتییەکانمان لەمەوبەر لەبەر تیشکی پێوەرەکانی قورئانی پیرۆزدا شیکردەوە و سەرنجمان بۆ ئەوە ڕاکێشا، کە ئەم پێوەرانە لەم سەردەمانەدا فەرامۆشکراون و ڕەخنەسازە هاوچەرخەکانمان لە عەرەب و لە کورد پەنا دەبەنە بەر سەرچاوەی ئەغریقی و ڕۆمانی

و ئەورووپی و بە چەشنێکی لاساییکەرەوە زاراوە و پێوانەی ڕەخنەسازی ئاکامی ئەم سەرچاوەیە، کە ڕێبازی ڕیالیزمە بە سەر هۆنراوەی خودی (زاتی) نەتەوەکەماندا دەیسەپێنین.

لە نێوانی ئەم دوو ڕێبازەدا، جیاوازییەکی فرە بە دیدەکرێ، بۆ نموونە: ڕێبازی ڕۆمانیزم لە وێژەدا، ڕێبازێکی کەسی و زاتییە، بەڵام ڕێبازی ڕیالیزم ڕووگەیێکی بابەتی و مەوزووعییە و کەسایەتییە. هەرچۆنێك بێت سەرەتای لەدایکبوونی ڕێبازی ڕیالیزم کە بەو جۆرە بووە، هەر لە یەکەم هەنگاوییەوە هەڵوێستی دژ بە وێژەی ڕۆمانیزمی هەبوو. ئەم هەڵوێستەش لە نووسەری بەناوبانگ (بلزاك)خۆی دەنوێنێ.

ڕاستە بلزاك لە دەستوورسازی ڕەخنەسازیی ڕێبازی ڕیالیزم نەبوو، چونکە بەر لەوەی ڕەخنەسازێت ڕۆماننووس بوو، بەڵام تێبینییەکانی لە کۆڕی نووسینەوەی ڕۆمان و چیرۆکدا کەرەستەیێکی زانستین لە بنیاتنانی بناغەکانی ڕێبازی ڕەخنەسازیی ڕیالیزمی.

بلزاك لەساڵی ١٨٣٠ی زایینیدا تێبینیکردووە، کە هەموو ئەو ڕووداوە گونجاوانە، کە دەشێن ڕووبدەن ئەوەندە باسکراون و سواون و تامیان نەماوە، هەروەها هەموو بارە کەسی و کۆمەڵایەتییەکان لە چەشنی وێژەی ئەندێشەییدا بە ساردوسڕی بەرچاوەدەکەون. بۆیە دەپرسێ: کەوابوو ئێمە چۆن دەتوانین وێژە تازەبکەینەوە؟ بلزاك وەڵامی خۆی دەداتەوە و دەڵێ: ئێمە دەتوانین وێژە بە شێوازی درێژەپێدان و نواندنی گشت لایەنەکانی، بابەتەکەی تازەبکەینەوە. نووسەر لەمەودوا بڕوادەکات، کە نووسینەوەی گشت لایەنەکانی بابەتەکەی چەشنێکی تازە لە وێژە دەخوڵقێنێ، کە بە ڕۆمان ناودەبرێ. گشت لایەنەکانی بابەتیش لە ڕاستی و حەقیقەتی هاوچەرخەوە وەردەگیرێ، نەك لە ڕووداوی مێژوویی و ئەندێشەی کەسی، کە چوارچێوەی کاری وێژەییە. لایەنەکانی گشت بابەت لە ژیاندا بە پەرشوبڵاوی بەرچاوەدەکەون. کاری نووسەریش هەڵبژاردنی ئەو لایەنانە و ئینجا ڕێکخستنیان لە تەکنیکی درامی سەبارەت بە ڕووداوێکی دەستنیشانکراو یاخود قارەمانێکی تایبەتی و ئەنجامدانی ئەم تەکنیکە بە چەشنێکی بابەتی و مەوزووعی.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە گشت لایەنەکانی بابەت، کە هەڵبژاردن و ڕێکخستنیان بڕبڕەی پشتی (ڕۆمان)ی سەرکەوتوون، لە کوێوە نووسەر وەدەستیاندەهێنێ؟!

بلزاك وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەداتەوە، کە گشت لایەنەکانی بابەت لە ژیانی چینی دەوڵەمەند و پایەبەرزەوە وەرناگیرێ، چونکە ژیانی ئەم چینە ڕازاوە و دەستکردە و لە هێڵە وردەکانیدا ڕاستی ونبوون. سەرئەنجام دەبێت گشت لایەنەکانی بابەت لە خەستەخانە و بەندیخانە و شەقام و تۆمارگاکانی دادگاوە وەربگیرێ، چونکە لەم سەرچاوانەدا ژیانی ڕاستینەی ڕووداوی ڕاستی بەبێ فڕوفێڵ و بە چەشنێکی ڕاستەوخۆ خۆی دەنوێنێ.

رۆماننووسی سەرکەوتوو لە ڕوانگەی ڕێبازی ڕەخنەسازیی ڕیالیزمەوە، هەرچەندە پێویستە لە بناغەدا وێنەگرێکی ژیانی کۆمەڵ بێت، بەڵام ئەم وێنەگرە ناشێت کارەکەی تەنیا بە چاو وەکوو ئامێرێکی وێنەگرتن ئەنجامبدات، بەڵکوو دەبێت لەگەڵ توانای وێنەکێشانیشدا زانا و فەیلەسووفێك بێت و لە سەرچاوەیەکی ئایدۆلۆجی فەلسەفیانەوە ئەرکی سەرشانی بەجێبهێنێ.

ئەم سەرچاوە ئایدۆلۆجییە فەلسەفیانە بە بیروباوەڕی (بلزاك)دەبێت بیرۆکەیەك بێت، کە دەڵێ: گیانلەبەر تاقە نموونەیێکی هەیە ئەم نموونەیەش بە گوێرەی جیاوازی ئەم ژینگانە، کە شوێنی خۆشگوزەرانییەتی ڕەوشت و خووی جیاواز وەدەستئەهێنێ، واتە ئادەمیزاد لە هەموو جیهاندا لە بناغەدا یەك ڕەگەزی هەیە، گۆڕینی شێوە و زمان و هەڵسوکەوتی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی سەرئەنجامی تایبەتییەکانی ئەم وڵاتانەیە. ئەم بیرۆکەیەی بلزاك بیرۆکەی

(جوفر واسان - هیلیر)ە[1]، کە بلزاك خۆی بە قوتابی ئەو دادەنێ.

هەرچۆنێك بێت ئادەمیزاد لە بەرتیشکی ئەم بیرۆکەیەدا بەرهەمـی کۆمەڵەکەیەتی و بەگوێرەی بـاری ئابـووری و ڕامیاری ئەم کۆمەڵە لـە ژینگەیەکەیەوە بۆ ژینگەیەکی دی دەگۆڕێ، هەروەکوو ئاژەڵ چلۆن بەگوێرەی ئاووهەوا لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی دی، ئەم سـەرزەمینە ڕەنـگ و ڕواڵەتـی ئاڵوگـۆڕ دەبێت. جگـە لەم هۆیە سروشـتییە، کە گۆڕینی ئادەمیزاد بەرپادەکات، هۆیەکی زگماکیش هەیە کە پێیدەوترێ زیرەکی.

زیرەکی بە ڕای بلزاك هۆیەکی کاریگەرە لە گۆڕینی ژیانی ئادەمیزادێکی دەستنیشانکراو لە بارێکی چینایەتییەوە بۆ بارێکی تازە، ئەم بارە تازەیەش هەروەکوو تێبینیدەکرێ لە بەرگ و پۆشاك و خانوو و شێوازی ئاخاوتندا خۆی دەنوێنێ.

ئەم بارە تازەیەش هەڵبەت هەرچەندە ڕواڵەتی و ڕووکەشە، بەڵام ڕەنگدانەوەی گۆڕینی دەروون و سروشـتی ئـەو ئادەمیزادەیـە، چونکـە هەمـوو گۆڕینێکـی چەنـدی دەبێت بەهۆی گۆڕینێکی چۆنێتی.

ڕۆماننووسـی ڕاسـتینە دەبێت بڕوا بەم بیرۆکەیە بهێنێ و لەبەر تیشکی دەستوورەکانیدا وێنەی ژیان بکێشێ. بەمانای ئەوەی لە تۆمارگە و قەواڵە و موستەنەداتی ژیانی قارەمانەکانی ئـەو ڕووداوانـە، کـە دەیەوێ تۆماریانبکات، وەربگرێت و بیانکات بە ئامێر بۆ پەردەهەڵماڵین لەسەر دەروون و هەست و سروشتی ئەو ئادەمیزادە، یان ئەو کۆمەڵە ئادەمیزادانە، کە دەیەوێ لە دووتوێی ڕۆمانەکانیدا وێنەی ژیان و هەڵسوکەوتیان پێشکەشبکات.

ئەم ئامانجەی ڕۆماننووس هەروەکوو بلزاك دەستنیشانیدەکات زۆر لە ئامانجی مێژووەوە بەگوێرەی بیروڕای ( ڤۆڵتیر ) نزیکە، بەڵام بلزاك هەروەکوو مامۆسـتاکەی (والتر سـکوت) دەیەوێ مێژووی نەریت و ڕەوشت و خوو لە سەردەمەکەیدا دروستبکات.

کەوابوو مەرجی سـەرەکی ڕۆماننووسـی سـەرکەوتوو جگە لە وێنەکێشـان بە وشـە و بە ڕستە، شیکردنەوەی دەروون و خووڕەوشتی ئادەمیزادە لەگەڵ نووسینەوەی بزووتنەوەی مێژووی چینەکانی کۆمەڵ لەسەردەمەکەیدا.

ڕێبازی ڕیالیزم لە ڕەخنەسازیدا بناغەکانی بە چەشنێکی زانستی نەچەسپاون و زاراوەی ڕیالیزم نەبوو بە چەمکێکی هونەری و وێژەیی هەتاکوو سەردەمی پەیدابوونی (شان فلوری) ی ڕەخنەسازی فەرەنسیی بەناوبانگ، کە وتار و نووسراوە ڕەخنەسازییەکانی دەگەڕێتەوە سەر

---

[1] المذاهب الأدبية الكبرى في فرنسا، ص٢٢٨

ساڵی ١٨٤٣ ی زایینی.[1] شان فلوری بۆ ئەوەی چالاکانە ڕێبازە ڕەخنەسازییەکەی شیبکاتەوە و بیخاتەڕوو دەستیکرد بە هەڵسەنگاندنی ڕێباز و ڕووگە وڕێژمییەکانی سەردەمەکەی، بۆیە لەم ڕووەوە بەتوندی توانجی ئاراستەی قوتابی و شوێنپێهەڵگرەکانی (فوریە) کرد و ئەندێشەی وڕێنەی منداڵانیان پووچەڵکردەوە و سەرنجی بۆ چێژ و چەشنەکانیان ڕاکێشا، کە مەیل و ئارەزوویانە لە نووسینی ڕۆمان و چیرۆکی درێژدا.

هەروەها هەوڵدانە وێژە میللییەکانی خستەبەر نەشتەری پووچکردنەوە و دانپێدانەنان و لەوە واقی وڕدەما، کە مرۆڤی میللی بە نووسەر و دانەر، لە هەمان ڕوانگەوە ڕەخنەی لە ڕۆمانەکانی (ئوجین سو)و (ئەلکسندر دیماس) گرت، کە سەرکەوتنە ئاسانەکەیان بەرهەمی ئەندێشەیەکی بێ سنوور و لامەعقوڵ و ئاکامی گوێنەدانە بە کارەسات و ڕووداوی ڕاستینە. هەروەها بەهیچ جۆرێك قایلنەبوو بە ڕۆمانە هۆنراوەییەکان کە لەبەر تیشکی ڕێۆشوێنی (جورج ساند) هۆنراونەتەوە، چونکە ئەم ڕۆمانانە بەشێوازێکی گۆرانی و ویژدانی نووسراونەتەوە و بە وشە و ڕستەی ڕازاوە ئەنجامدراون. سەرەڕای ئەمەش بە ڕەفتارێکی باشتر مامەڵەی لەگەڵ قوتابی و شوێنپێهەڵگرەکانی ڕێبازی هەستی ساغ ( الاحساس الصحی ) نەکرد، کە سەرکردەکەی (بونسار) بوو. هەروەها دوژمنایەتییەکی زۆری لەگەڵ ڕۆمانیزمەکان کرد، کە بەلایەوە دەستەیەکی ئەندێشە نەخۆش و شێواز دەستکرد و کەمتەرخەم بوون.

هەروەکوو دیارە (شان فلوری )ی ڕەخنەسازی فەرەنسی بەناوبانگ هەموو چەشنەکانی ڕۆمانی ئەندێشەی بە پڕوپووچ لەقەڵەمدەدان و ئەوەی لەم چەشنە وێژەیەی بە دڵ بوو، هەر ڕۆمان و چیرۆکی (بلزاك)بوو.

ئەم ڕەخنەسازە لە ساڵی ١٨٥٢ ی زایینییەوە بەجۆرێکی ڕێکوپێك و ئیجابی بنەڕەتە ڕەخنەسازییەکانی چەسپاندن و گەیشتە سەر ئەنجامی بنیاتنانی (ڕیالیزم) لە ڕەخنەسازیدا، کە لەبەر تیشکەکەیدا بڕیاریداوە و وتوویەتی:

ڕۆماننووس پێویستە بەر لە هەموو شتێك لە ڕواڵەتی کەسایەتیی ڕۆمانەکانی بکۆڵێتەوە و لەگەڵیاندا گفتوگۆبکات و پرسیاریان ئاراستەبکات و سەر لە خانووەکانیان بدات و ئەحواڵیان لە دراوسێیەکانیان بپرسێ. ئەوجا بیانوو و بیروڕا و سەرنج و مەیل و ئارەزووە تایبەتییەکانیان تۆماربکات.

مەبەستی (شان فلوری) لەم هەنگاوە بنەڕەتییەی ڕۆماننووس ئەوەیە ڕێگا لە خودی کەسایەتیی دانەر بگرێت و بەهیچ ڕەنگێ دەرفەتی دەستکاریکردنی ژیانی قارەمانەکانی

---
[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٠

ڕۆمان و چیرۆکەکەی نەداتێ و هەموو توانای تەرخانبکات بۆ ئەنجامدانی بەرهەمەکەی بە شێوازێکی بابەتی و مەوزووعی.

نووسەری ڕۆمان هەڵبەت لە ئەنجامدانی کارەکەیدا هەر دەبێت پەخشان بەکاربهێنێ و خۆی لە هەموو جەشنەکانی هۆنراوە وەکوو فۆرمێکی ونژمی دووربخاتەوە، چونکە هەر پەخشان دەتوانێ چینەکانی کۆمەڵ بنوێنێ و بەهۆی ڕزگاربوونییەوە لە کۆت و زنجیرەکانی هەڵبەست ببێ بە زمانی زانا و نەخوێندەوار و دەوڵەمەند و هەژار و پیاو و ژن و پیر و لاو و منداڵ.

تاقە کەرەسەی ڕۆمان و چیرۆکیش بەلای (شان فلوری)یەوە، هەر دەبێت ئادەمیزادی ئەمڕۆ بێت، کە گیرۆدەی داوی شارستانێتیی هاوچەرخە.

ئەرکی سەرشانی ڕۆماننووس لەم کۆڕەدا ڕەنگە بە ڕواڵەت ئاسان بێت، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە، چونکە پەخشان کە زمانی ڕۆمان و چیرۆکە با کێش و قافیەشی نەبێت و پێویستی بە شیرینکاری و ڕەوانبێژی نەبێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نووسینەوەی لە هۆنینەوەی هەڵبەست سووکترە، چونکە پەخشان لە نووسینەوەی ڕۆمان و چیرۆکدا دەبێت هونەری بێت و لە شێوازی ئاخاوتن گەلێك بەرزتربێت.

هەروەها کەسایەتیی ڕۆمان و چیرۆك، کە ئادەمیزادی هاوژیان و هاوسەردەمی نووسەرە، بابەتێکی ساکار و سەرپێیی نییە، بەڵکوو جیهانێکی قووڵ و بەرفراوانە. نووسەر پێویستە ئاگای لە نهێنی و گشت کون و قوژبنەکانی بێت، دەبێت کەسایەتیی خۆی بەجێبهێڵێ و شارەزای دەروونی قارەمانەکانی بێت و بتوانێ بە زمان و شێوازی ئەو قارەمانانە بدوێت و بە ڕاددەی هۆشمەندییان بیریکاتەوە و بە گوێرەی هەڵسوکەوتیان ڕەفتاربکات.

ئەم بناغانەی ڕێبازی ڕەخنەسازیی ریالیزم بێگومان بیروڕای گشتی ڕێبازەکەن و وێنەی پۆلایینی کۆتایی نین، چونکە هەروەکوو لەمەوبەر وتمان ڕیالیزم یەك جۆر نییە و دروشمهەڵگرانی لەیەك ڕوانگەوە بیرناکەنەوە، بەڵام ئەوەی بە لای ئێمەوە گرنگە دەبێت بزانین، کە وێژەی ڕیالیزم کارێکی ڕاستەوخۆ و دوانەری و تەقریری و ناهونەری نییە و دروشمە سەرەکییەکەی ئەوەیە: نووسین نابێت نووسەر لە تەکنیکی هونەری و وێنەسازکردن دووربخاتەوە، بەڵکوو بەپێچەوانەوە نووسەر دەبێت بە ئەوپەڕی چالاکییەوە ڕاددەی چەژەی هونەری خوێنەرەکانی بەرزبکاتەوە و وێژە وەکوو قوتابخانەیێکی بیری و هونەری تەماشابکات.

هەندێك لە مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی بیروڕایان وایە، کە (سروشتی ) لە وێژە و ڕەخنەسازیدا، ڕێبازێکی سەربەخۆ نییە و بە چەشنێکی هەستپێکراو بە خاوەن تایبەتییەکی جیاکەرەوە لەقەڵەمنادرێ، بەڵکو سەرئەنجامی هەوڵدانێکە بۆ تەواوکردنی ڕێبازی ڕیالیزم و درێژەپێدانی لە کۆڕی جیهانیدا. بۆیە ئەم مێژوونووسانە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشن، کە چلۆن ڕێبازی ڕۆمانیزم لە (ڕۆسۆ) وە سەریهەڵداوە و لە سەر دەستی (شاتۆبریان و لامارتین و هۆگۆ و جۆرج سان)دا پەرەیسەندووە، هەروەها سروشتییش لە (دیدرۆ) وە دەستیپێکردووە و لەگەڵ بەرهەمەکانی (ستاندال و بلزاك و فلوبێر و ئەلغونفور) دا گەشەیکردووە و پەلی هاویشتووە.

سەرئەنجام (سروشتی) بە لای ئەم مێژوونووسانەوە وێنەیەکی ڕەنووسکراوە لە ڕێبازی ڕیالیزم. بەڵام تا چ ڕاددەیەك ئەم بۆچوونە ڕاست و ڕەوایە ؟! ئایا (سروشتی) هیچ بوون و ڕەنگێکی نییە و بە هیچ هێڵێ- شێوازی و ئامانجی- لە ڕیالیزم جیا ناکرێتەوە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە دەبێت بەر لە هەموو شتێك بزانین، کە تایبەتی هاوبەش لە

نێوانی ڕیالیزم و سروشتیدا بە ئاشکرایی خۆی دەنوێنێ بە چەشنێکی دەستنیشانکراو لە ڕووی تێڕوانین بۆ سەرچاوەی وێژە، چونکە ڕیالیزم و سروشتی هەردووکیان جیهانی هەستپێکراو بە تاقە سەرچاوە و بواری وێژەیی ڕاستینە تەماشادەکەن بەڵام ئەم تایبەتییە هاوبەشە سنووری جیاکەرەوەی ئەم دوو ڕێبازەیە، چونکە بەڵگەنەویستە کە ڕێبازی ڕۆمانیزمیش لە هەمان تایبەتدا لە تەك ڕیالیزم یەکدەگرێتەوە، کەچی کەسێك بۆی نییە بڵێ ڕۆمانیزم و ڕیالیزم هەردووکیان یەك ڕێبازن.

هەرچۆنێك بێت (سروشتی ) لە وێژەدا، دیاردەیەکی بابەتی و هونەری و ئایدولۆجییە. ئەم دیاردەیە لە ڕووی تایبەتییەکانی لەم خاڵانەی خوارەوە دەخرێتەڕوو:

١- وێژە دەبێت ئاوێنەی شارستانێتی بێت. شارستانێتیش هەڵبەت لایەنەکانی پێشکەوتنی ژیانی ماددی و سەرئەنجامی زاڵبوونی تەکنەلۆجی و ئامێرە داهێنراوەکانە بەسەر باری کۆمەڵگای لادێیی و نیوچەشاریدا.

٢- وێژەر دەبێت زانا بێت و لە کۆڕی زانستی پراکتیکی خاوەن ئەزموون و زانیاری بێت.

٣- مەیدانی داهێنانی وێژە، ڕۆشنبیری و ئەندێشە و مێژوو نییە، بەڵکو ئەم مەیدانە هەر تاقیگە و موختەبەر و کۆڕی لێکۆڵینەوەی پراکتیکییە.

٤- ئامانجی وێژە پێشخستنی ژیانی ماددییە لەگەڵ هەوڵدانێکی بێوچان لەپێناو داهێنانی شەکی تازە و پەردە داماڵینە لەسەر نهێنییەکانی سروشت بۆ دەستنیشانکردنی یاساکانی ماددە و بوونی هەستپێکراو.

## • ڕێبازی سروشتی و ئەمیل زۆلا

ئەمیل زۆلای وێژەر و زانای بەناوبانگ، کە دەستیکرد بە بنیاتنانی ڕێبازی سروشتی لە ڕەخنەسازیدا بە توندوتیژی بەرهەنگاری ڕۆمانیزمەکان بوو و دووپاتیکردەوە، کە وێژەی ڕۆمانیزم هەرچەندە هەندێ مێژوونووس وەکوو وێژەیەکی تازە و سەرکەوتوو لە قەڵەمیدەدەن بەڵام لە ڕاستیدا لاساییکردنەوەی دیوی دەرەوەی وێژەی کلاسیزمە و ئەنجامدەرەکانی جگە لە جووینەوەی نموونەکانی ئەم وێژەیە هیچی تریان ئەنجامنەداوە و بەرهەمەکانیان کارێکی لێڵ و گرێدراو و ناڕوونە. هەروەها ئەم ئەنجامدراوانە جگە لە شێوازی ڕازاوە شتێکی دی نازانن و بەیاریکردن بە ئەندێشە و ملکەچکردن بۆ سۆز و هەڵچوون لە کۆمەڵەکەیان پچڕاون و سەردەمە زانستییەکەیان پشتگوێخستووە.

ئەمیل زۆلا پاش ئەوەی زەمینەی ئایدۆلوجی و هونەری ڕێبازەکەی ئامادەکرد دەستیکرد بە بنیاتنانی بناغەکانی و وتی: پەرەسەندنی وێژە پێشکەوتنی کۆمەڵ لە کۆڕی زانستیدا ئەنجامیدەدات و وێژەر چەند بلیمەت بێت وەکوو کرێکارێك وایە، کە بە تیشکی زانست و هێزی تەکنەلۆجی بەردێك لە سەر بناغەی بنیاتنراوەکانی پێشوو دادەنێت.

هەڵبەت ئەم کارەش بەبێ نەخشەکێشانی زانست و ئەندازیاری بەرپاناکرێ.

سروشتیش جیهانێکی سەرپێچیکەر و گێرەشێوێن نییە، بەڵکوو کۆڕێکی ڕێکوپێك و یاسادارە و لە کۆنترین سەردەمەوە ڕەگوڕیشەی خۆی داکوتاوە، تەنانەت (مونتانی) هەمان زاراوەی بەکارهێناوە و سروشتی بۆ هەمان مەبەست سازکردووە.

کەوابوو، ئەگەر ئێمە لەم ڕۆژانەدا هەمان کار ئەنجامبدەین هەر لەبەر ئەوەیە، کە لە سەدەی نۆزدەیەمی زایینیدا، کە سەدەی زانست و زانیارییە و سروشتیش بۆچوونی کۆمەڵگای دیموکراتی تازەیە.[1]

## • ڕێبازی سروشتی لە ڕەخنەسازیدا

ڕێبازە ڕەخنەسازییە تەوروییەکان تەنانەت ڕیالیزمیش کەم بێت یان زۆر سەرچاوەکانیان کتێبی ڕەخنەسازیی و کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆجی و ئابووری و مێژوویی بوون، کەچی ڕێبازی ڕەخنەسازیی سروشتی بەر لە هەموو شتێك خۆی بە زانستە ڕووتەکانەوە دەبەستەوە و سەرچاوە سەرەکییەکانی کتێبە زانیارییە پراکتیکییەکان بوون، بۆیە کە لێکۆڵینەوەیەکی ئەم ڕێبازە دەخوێنیتەوە بۆمان ساغدەبێتەوە، کە نووسەرەکەی لە چەسپاندنی تێبینییە ڕەخنەسازییەکانی

---

1 المذاهب الأدبية الكبرى في فرنسا، ص ٢٥٠

سەرنج هەر بۆ کتێبی زانستی دەدات، وەکوو کتێبی: ( توێژینەوەیەك لە بۆماوەیی سروشتی )، که له دانانی (لۆکاس)ە و کتێبی (بنەڕەتی ڕەگەزەکان)، که له نووسینی (داروین)ە هەروەها کتێبی (سەرەتایەك لە پزیشکی پراکتیکی ) لێکدانەوەی (کلود برناد).

جگه لەمه له ڕێبازی ڕەخنەسازیی سروشتیدا تێبینیدەکرێ، که (کلود برناد ) وتوویەتی: پێویسته ئەو ڕێبازە زانستییە، که لەبەر تیشکێکدا ماددەی سروشتی باسدەکرێ گیانلەبەریش بە هۆیەوە دەبێت بخرێتەبەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە.

ئەمیل زۆلا لە هەمان ڕێچکەوە بڕیاریداوە، که ئەم ڕێبازە زانستییە بەکاربهێنرێت لە باسکردنی بەرهەمی بیری و ڕووگەی وێژەیی. بەمانای ئەوە ڕێبازی سروشتی هیچ جیاوازییەکی دەستنیشانەکردووە لە نێوانی ماددە و مرۆڤ و بەرهەمی بیری وێژەییدا، بەڵکو بڕیارێکی سەپاندووە، که دەبێت ڕەخنەساز و پزیشك و زانای کشتوکاڵ و بایەلۆجی، ڕێبازێکی یەکلیگیر له لێکۆڵینەوەکانیاندا بگرنەبەر.

بیانووی هەڵگرانی ڕێبازی ڕەخنەسازیی سروشتیش لەم ڕوانگەیەوە ئەوەیە: که هەموو شتێك لەم زەوییەدا له بناغەوە ماددیه هەروەها هەموو ڕووداوێك کۆمەڵایەتی بێت یان ڕۆشنبیری ئاکامی ئەو ماددیەیە. سەرئەنجام پێویسته ماددە و ئاکامەکەی بەهەمان ڕێباز شیبکرێنەوە و تایبەتییەکانیان بخرێتەڕوو. ئەم ڕێبازەی ڕەخنەسازیی سروشتی، هەڵبەت ڕێبازێکی زانستی پراکتیکییە، نووسەرە پەیڕەویکەرەکانی وەکوو: (زۆلا و ستاندال و فلوبێر) بەر لەمانیش (بلزاك) هەر تێبینی و سەرنجلێدانیان بەکاردەهێنا له تۆمارکردنی دیاردە وێژەییەکان و بەهیچ جۆرێك خۆیان له جیهانی هەستپێکراو، که شیاوی بەڵگەی ماددییە دوورنەخستەوە.

سەرئەنجام ڕۆمان و چیرۆکەکانیان هەر شانۆی ژیانی واقیعی بوو، خوێنەرەکانیان هەستیان بە هیچ شوێنەوارێکی ناهەستپێکراو نەدەکرد و ڕاستەوخۆ لە بابەتەکان تێدەگەیشتن، چونکه نووسەرەکانیان بەبێ ئەندێشە و بەبێ سۆز و هەڵچوونی کەسیی دەیاننووسییەوە.

بەم جۆرە تێبینیدەکرێ، که ڕێبازی سروشتی لە ڕەخنەسازیدا بوو بە هۆی دامرکاندنی وێنەی هونەری و ئاواز و ترپەی وشەیی و ڕستەیی له وێژەدا.

## ● سەرئەنجامی ڕێبازی سروشتی

ڕێبازی سروشتی هەروەکوو لە مەوبەر بۆمان ساغبووەوە، ڕێبازێکی ئالی و ئامێرییە، دامەزرێنەرەکانی لە ڕێبازی ڕیالیزمەوە دەستیانپێکرد و لەگەڵ زانستە داهێنراوەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا هەنگاویان هەڵگرت، هەتاکو خۆیان لە هەموو سەرچاوەیەکی ناماددی پچڕاند و بەتوندی دروشمی لێکدانەوە و باسکردنی دیاردە کۆمەڵایەتی و خووڕەوشتی و ڕۆشنبیرییەکانیان لەبەر تیشکی لێکۆڵینەوەی کەرەستەی ماددیدا هەڵگرت.

سەرئەنجامی ئەم هەڵوێستە کاردانەوەیەکی قووڵ بوو لە لایەن زۆربەی وێژەر و هونەرمەندەکانی نیوەی سەدەی نۆزدەیەمی زایینییەوە، کە بەهەمان توندوتیژی دروشمی (وێژە بۆ وێژە)یان بەرزکردەوە و دووپاتیانکردەوە، کە ئادەمیزاد با (لەش)ی ماددە بێت، بەڵام بەر لەوە گیانلەبەرێکی بیرکەرەوەیە و بە تیشکی هۆشمەندی و تەوژمی سۆز و هەڵچوون لە ماددە و جیهانی ماددی خۆی جیادەکاتەوە. هەروەها وێژەر کە بەرهەمی بلیمەتی ئادەمیزادە جیهانێکی جوانە، توێژەر و ڕەخنەساز بۆ ئەوەی لەم جیهانە تێبگەن، تاقە ڕێباز بۆ ئەو تێگەیشتنە هەر هەست و سۆز و ئەندێشەیە، نەك زانستی پراکتیکی و تاقیگەی کارگەی تاقیکردنەوە.

ئەم هەڵوێستە دژوارە هەڵوێستی سروشتی، زۆرانبازییەکی قووڵ و فراوانی لە ڕەخنەسازیی ئەورووپیدا بەرپاکرد، سەرئەنجامەکەی پەیدابوونی چەند ڕێبازێکی تازە بوو، وەکوو ڕێبازی پەرناسی و ڕێبازی ڕەمزی و ڕێبازی نامەعقول.

## • رێبازی پەرناسی

وشەی (پەرناس) لە بناغەدا ناوی چیاییێکە لە وڵاتی یۆنان. داستانەکانی ئەم وڵاتە دەگێڕنەوە، کە ئەو چیایە مەڵبەندی خواکانی هۆنراوە بووە و هەستیارانیش لەوێوە بەهۆی خوڕپە و ئیلهامەوە هەڵبەستەکانیان وەدەستهێناوە.

لە گرێی سێیەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە ئەم وشەیە بوو بە زاراوەیەکی ڕەخنەسازی و نازناوی هۆنراوەیی، کە لە ژێر ئاڵاکەیدا کۆمەڵە ڕووگەیەکی هۆنراوەیی خڕبوونەوە و هەوڵی جێبەجێکردنی ئامانجێکی هونەرییان دا.

لە ڕووی مێژووەوە ئەو ڕووگە هۆنراوەییانە لە ساڵی ١٨٣٠ی زایینیدا سەریانەڕهێنا، لەبەر چەند هۆیەکی هونەری و ئابووری و کۆمەڵایەتی پەرەیانسەند.

دوا کتێبی ڕەخنەسازیش، کە باسی ئەم ڕووگانەی کردووە، لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی هۆنراوەی فەڕەنسی، نووسینەوەی (بانفیل) لە ساڵی ١٨٧٢ ی زایینیدا و ڕەنگە دەنگدانەوەی

کۆتایی ئەم بزووتنەوە ڕەخنەسازییە ئەو لێکۆڵینەوە نرخپێدانەی (ڤیکتۆر هۆگۆ) بێت، کە (لیکونت دی لیل) لە ئەکادیمییەی فەرەنسیدا لە ساڵی ١٨٧٧ی زایینیدا پێشکەشیکردووە، بەڵام ناوی (پەرناس) لە ساڵی ١٨٦٦ی زایینیدا چەسپا، پاش ئەوەی کۆمەڵە بەرهەمی چل هەستیار بەناوی ( پەرناسی هاوچەرخ)ەوە بڵاوکرایەوە.

ڕێبازی پەرناسی هەروەکوو هێمامان بۆ کرد، ڕێبازێکی یەکدیگیر نییە، بەڵکو لە کۆڕە فراوانەکەیدا چەند ڕووگەیێکی هونەری جیاوازی گرتەخۆی و دروشمی کۆکەرەوەی ئەم ڕووگانەی دەربڕی: (هونەر بۆ هونەرە).

جا بۆ ئەوەی ئەم دەربڕینە ڕوونبکەینەوە و لە سروشتی دروشمەکەی بگەین، پێویستە بزانین کە لە ساڵی ١٨٣٠ی زایینییەوە کۆمەڵێك لە فەیلەسووفە شوێنپێهەڵگرەکانی (سان سیمون و فوری)یە، ئامۆژگاری نووسەر و هەستیارەکانیان بەوە دەکرد، کە وشە بۆ خزمەتی میللەت بەکاربهێنن و ناوەڕۆکی بەرهەمەکانیان بۆ بەرگریکردن لە جەماوەر و وەدەستهێنانی مافەکانیان تەرخانبکەن.

ڤیکتۆر هۆگۆ یەکەم نووسەر بوو، کە وەڵامی ئەم دەستەیەی دایەوە و دووپاتیکردەوە، کە هەستیار و نووسەر مافی ئەوەیان هەیە، کە بەرهەمێکی بێ ئامانجی کۆمەڵایەتی بڵاوبکەنەوە، بەڵام بەمەرجێك ئەم بەرهەمە هونەرییە بێگەرد بێت و بۆ خەمڕەوێنی جەماوەران بنووسرێتەوە.

دوابەدوای ڤیکتۆ هۆگۆ، تیوفیل غوتیە لە ساڵی ١٨٤٠ی زایینیدا، زانستیانە تایبەتییەکانی هۆنراوەی بێ ئامانجی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری خستەڕوو.

هەروەها لە پاش بیست ساڵ سەرنووسەرانی گۆڤاری (هونەرمەند) سەربەخۆیی هونەریان دووپاتکردەوە و لە ساڵی ١٨٥٧ی زایینیدا لە هەمان گۆڤار هەڵبەستێکیان بەناونیشانی (هونەر) بڵاوکردەوە، کە لە دووتوێیدا زۆربەی تایبەتییەکانی بیردۆزی ( هونەر بۆ هونەر) یان چەسپاند. ئەمانەن سەرچاوەکانی ڕێبازی پەرناسی، کە دەتوانین بەهۆیەوە هێڵە گشتییەکانی ئەم ڕێبازە دەستنیشانبکەین و یەکالاّیانبکەینەوە.

## • سروشتی ڕێبازی پەرناسی

ئەگەر بمانەوێ لە سروشت و گەوهەری پەرناسی بگەین، پێویستە دیسانەوە دووپاتیبکەینەوە، کە ئەم ڕێبازە هەمە چەشنەیە و ڕووگە و مەیل و ئارەزووی جیاواز لەژێر دروشمەکانیدا کۆدەبنەوە. بۆ یەکەم جار دامەزرێنەری هەنگاوی یەکەمی لەدایکبوونی ئەم ڕێبازە ڤیکتۆر

هۆگۆ لە ساڵی ۱۸۲۹ی زایینیدا لە کاتی مشتومڕی لەتەك ڤۆڵتێردا دەربڕینی (هونەر بۆ هونەر)ی بەکارهێنا و کەسایەتیی ئایدولۆجییەکانی ئەم وێژەرە لە نووسینەوەی تراژیدیا خستەبەر نەشتەری پووچکردنەوە و سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشا، کە ئەو کەسایەتیانە بەیەك قاچ بەڕێوەدەچن، چونکە ئاسۆی ژیانیان تەنگەبەرە و دەمار بۆ لایەنێکی بیری دەیانگرێ، سنووری بوون و سروشت لەبەر دەستی هونەردا ئەوەندە فراوانە، نابێت هونەرمەند خۆی بە تاقە چەمکێکیداهەڵبواسێ.

دوابەدوای ڤیکتۆر هۆگۆ ڕەخنەسازی بەناوبانگ (غوتیە) هەمان ڕێچکەی شکاندووە و لە پێشەکی بڵاوکراوەکانی نووسەرە ئایدۆلۆجییەکاندا دووپاتیکردۆتەوە، کە گرنگیدان بە ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی لە هونەردا کارێکی بێ ئەنجامە و بەشێوازێکی گاڵتەپێکردن وتوویەتی: ڕۆمانی ئامانجدار هەرگیز نابێت بە شۆربا، سکبرسییەکان تێربکات و هەڵبەستی خووڕەوشتی بۆ کرێکارە ماندووەکان نابێت بە ڕێچکەکێش (شەمەندەفەر).

لە هەمان ڕوانگەوە ( لیکونت دی لیل) وەکوو هەستیارێك بەتوندی ڕەخنەی لەو هەستیارانە گرت، کە خۆیان بە ڕووداوی ڕۆژانە دەبەستنەوە و ئێش و ئازاری چینێکی تایبەتی ڕەنووسدەکەن، یان هەڵبەستەکانیان دەکەن بە دەنگدانەوەی خەم و خەفەتی کەسایەتییەکانیان.

سەرئەنجام لە هەڵبەستە بەناوبانگەکەیدا (سونی)، کە لە ساڵی ۱۸٦۲ی زایینیدا هۆنیویەتییەوە، بە هەموو توانایەکییەوە بانگەوازی هەستیارانی کرد بۆ ڕۆشنبیرییەکی زانست و فەلسەفی و مێژوویی و دەستهەڵگرتن لە کاروباری ڕۆژانە و خەریکبوون لەگەڵ لێکۆڵینەوەی قووڵ و ڕێبازیی، چونکە لەم ڕێگایانەوە دەتوانن چینێکی خوێندەوار و تێگەیشتوو بۆ لای هونەرەکەیان ڕابکێشن، ئیتر بە تەمای کارتێکردن لە جەماوەران نەبن.

پەرناسەکان لە لوتکەی پەرەسەندنی ڕێبازەکەیاندا دوژمنایەتییەکی بێوچانیان لەتەك ( لامارتین و مۆسێ )دا کرد، نەك لەبەرئەوەی ئەم دوو هەستیارە ئێش و ئازار و خەفەتی کەسایەتیان هۆنیوەتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی شێوازی هونەرییان فەرامۆشکردووە و لە پێناوی تێگەیاندنی جەماوەراندا قوربانییان بە زمانی هونەری و وێنەی ئەندێشەیی و وشەی ئاوازدار دا.

سەرئەنجام ئەم بیروڕایانە دەیسەلمێنن، کە ڕێبازی (پەرناسی ) بڕیاری ئەوەی داوە، هونەری هۆنراو هیچ ئامانجێکی نییە و هەستیاری هونەرمەند بۆ جێبەجێکردنی مەبەستێکی تایبەتی، هۆنراوەناهۆنێتەوە.

جا ئەگەر لێرەدا لە پەرناسییەکان بپرسین: کەوابوو هەستیاری هونەرمەند بۆچی هەڵبەست

دەهۆنێتەوە و نووسەر بۆ کێ ڕۆمان و چیرۆك دەنووسێتەوە؟!

ئەو ڕەخنەسازانە لە وەڵامدا دەڵێن: هەستیاری هونەرمەند و نووسەری بەهرەدار ( وێژە بۆ وێژە) ئەنجامدەدات. هەروەکوو چلۆن بولبول ئاوازی خۆش دەخوێنێ و گوڵی جوانیش چۆن بۆن و عەتر بڵاودەکاتەوە و جۆگەلە و ڕووبار و دەریا ئاوازی خۆش پەخشدەکەن و هیچ مەبەستێکیان لەوەدا نییە و چاوەڕێی پاداشت ناکەن، هەروەها هەستیاری هونەرمەند و نووسەری بەهرەدار، بیانەوێ یان نەیانەوێ هەر دەبێت سروشتیانە ئەرکی هونەری سەرشانی خۆیان بهێننەدی و لە بەجێهێنانی ئەم ئەرکەدا چاوەڕێی هیچ شتێ ناکەن، ئەوە نەبێت کە بوونی ڕاستینەی خۆیان دەربڕیوە و بەس، ئەو دەربڕینەش ئاوێنەی جوانی خواییە و کەمالی هۆشمەندی و بیری و خۆشگوزەرانی و عەقڵ دەنوێنێ.

خۆ لەم کەماڵ و جوانییەیان نەکۆڵیوەتەوە و تایبەتییەکانیان نەخستۆتەڕوو، بەڵام سەرکردەکەیان غوتیە لەم ڕووەوە وتوویەتی: جوانی هەموو شتێکە، کە سوودی نەبێت و ئەو شتەی سوودی هەیە بێگومان جوان نییە، چونکە هۆیەکە بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکی کاتی و بەدیهێنانی مەبەستێکی سەرپێیی ئادەمیزادانە.[1]

ئەم ڕووگەیە هەڵبەت ئەوپەڕی کاردانەوەیە دژ بە ڕێبازی ڕیالیزم و ڕۆمانیزم و هەتا کلاسیزمیش، چونکە ئەم ڕێبازانە هەموویان تەماشای وێژەیان وەکوو هۆیەك کردبوو، بەڵام ڕێبازی پەرناسی وێژەی وەکوو ئامانجێك لە قەڵەمداوە و دووپاتیکردۆتەوە، کە وێژە خۆی لە خۆیدا ئامانجێکی بەرزە.

بەم جۆرە ڕێبازی پەرناسی جوانی بە تاقە ئامانجی وێژە دادەنێت و ئەم جوانییە بە قیبلە و پەرستگەی وێژەر لە قەڵەمدەدات و دووپاتیدەکاتەوە، کە وێژەی ڕاستینە جوانی پەرستییە.

پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە: ئایا جوانی پەرستی لە وێژەدا هیچ مەبەستێکی خووڕەوشتی و کردەوەیی نییە؟

پەرناسیزمەکان وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەدەنەوە: نەخێر پەرستنی جوانیی بێگەرد لەبەرئەوەی جوانیی بێگەردە، ئامانجی وێژەرە و بەس، ئەمە دەڵێن و دووبارە دوپاتیدەکەنەوە، کە جوانیپەرستی هەڵبەت گیانی ئادەمیزاد بەرزدەکاتەوە لە پێویستییە نزمە ماددییەکان دووریدەخاتەوە. بەڵام دیسانەوە ئەم کارە ئەگەر بە ڕواڵەت مەسەلەیەکی خووڕەوشتی بێت، لە ڕاستیدا ئەمە مەبەستێکی ڕاستەوخۆی وێژەری جوانپەرست نییە، چونکە ئەم مەسەلەیە خۆی لە خۆیدا هۆیەکە بۆ گەیشتن بەجوانیی بێگەرد، کە مەڵبەندی خواپەرستن و هۆشمەندی

---

[1] المذاهب الأدبية الكبرى في فرنسا، ص ٣٦٥

و هەمـوو تایبەتییـە بەرزەکانی مرۆڤی هەڵکەوتـووە. کەوابوو، وێژەر چلۆن دەتوانێ ئامانجی جوانیی بێگەرد لە بەرهەمەکانیدا جێبەجێبکات؟

پەیڕەوکەرەکانی ڕێبازی پەرناسی وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەدەنەوە، کە وێژەر لە ڕێگای ڕوخسار و شێوەی وێژەوە دەتوانێت ئەو ئامانجە پیرۆزە جێبەجێ بکات.

شێوە و ڕوخساری وێژەش لە لای پەرناسیزمەکان سەرئەنجامێکی لێکدراوە لە ڕەنگ و هێڵ و ئاواز و ترپە، کە بەکەرەسەی وشەی ڕەوان و دەربڕینی سفت و پتەو و ڕستەی واتا قووڵ و شەوقلەرەوە بە مەبەستی هێما و خورپە و ئیلهام بەخشنەدە، سازدەکرێ.

سەرئەنجام وێژەر لە سازکردنی ئەو چەشنە شێوە و ڕوخسارە پێویستە بە ئەوپەڕی وردییەوە کەڵك لە سەرچاوەکانی مەیل و ئارەزوو، زانست و ئەندێشە و مێژوو وەربگرێت و نابێت ساکارانە لاپەڕە ڕەشبکاتەوە، ئەگەر هاتوو بە چەشنێکی سەرپێیی وێژەی نووسییەوە بۆ مەبەستێکی کاتی، هەڵبەت گوناهبارە و دەرهەق بە بنەڕەتەکانی خود و ڕەوشت و ئایین گوناحێکی گەورەی کردووە.

کەوابوو خووڕەوشت و کردەوە لە هونەردا دڵسۆزییەکە بەرامبەر بە کاری هونەری، کاری هونەریش بەدیهێنانی جوانیی بێگەردە لە ڕێگای شێوە و ڕوخساری هونەرییەوە.

## • ڕوخسار و ناوەڕۆک لە ڕێبازی پەرناسیدا

دووپاتکردنەوەی ئەرکی ڕوخسار لە بەدیهێنانی جوانیی بێگەرد، ڕەنگە ئەوە بگەیەنێ، کە پەرناسییەکان بایەخ بە ناوەڕۆکی دەقی وێژەیی نادەن، بۆیە سەرکردەکانی ئەم ڕێبازە غوتیە و لیکونت دی لیل ڕێگا لەو بیرۆکەیە دەگرن و دەیسەلمێنن، کە لە وێژەی ڕاستینەدا ناوەڕۆك لە ڕوخسار جوداناکرێتەوە و هەست بە بوونی ناکرێت، چونکە ڕوخساری جوان و سەرکەوتوو خۆی لەخۆیدا ناوەڕۆکێکی جوان و سەرکەوتووە. بەمانای ئەوە ئەگەر هاتوو هەڵبەستێکمان لە ڕەخنەسازیدا بەوە هەڵسەنگاند، کە وشەکانی ڕەوان و بەهێزن و ڕستەکانی تێکسمراو و سفتن و وێنە هونەرییەکانی خورپەدار و تازەن و کێشـەکەی ترپەدار و دەربڕینی سـۆز هەڵچوونە و سەرواکانی ئاوازبەخشن، هەڵبەت بڕیاری ئەوەمان داوە، کە ناوەڕۆکەکەی پایەبەرز و بەنرخە، چونکە ئەم ناوەڕۆکە هەر لە ڕوخسـاری جوان دایە، بە پێچەوانەش ئەگەر هاتوو ڕوخسـاری دەقێکی وێژەییمان بەوە مەحکومکرد، کە ڕەگەزەکانی لاواز و ناشیرین و لە جوانی بێبەرین، بێگومان بڕیاری بێکەڵکی ناوەڕۆکەکەیشمان سەپاندووە.

سەرئەنجام لە ڕێبازی پەرناسیدا ڕوخسار لە ناوەڕۆك جوداناکرێتەوە و ڕوخساریش کە پێوانەیە و هەڵسەنگێنرابێت هەر دەبێت کارێکی گران بێت، چونکە لە ڕوانگەی پەرناسییەکانەوە سووکی و ئاسانی دوژمنی ڕاستینەی هونەری و هونەر قورسترین کاری مێشکی و عەقڵی و سۆزی و ئەندێشەی ئادەمیزادە. ئادەمیزادی هونەرمەندیش لە کاری هونەردا لە ڕێگای فێربوونی بەردەوام و وەدەستهێنانی ڕۆشنبیریی قووڵ و چێشتنی موعاناتی هەمیشەییەوە دەتوانێ بگاتە پلەی نەمری لە جیهانی هونەردا.

## • بنواشەکانی ڕازانەوەی شێواز و ڕوخساری ڕەسەن

پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی پەرناسی کە بەو چەشنە گرنگیان بە ڕوخسار (فۆڕم) داوە، بێگومان مەبەستیان لەوە پەیڕەویکردنی بنواشە و دەستوورەکانی ڕازانەوەی شێوازی وێژەیی نەبووە، کە لە ڕێگای زانست و ڕەوانبێژییەوە وەدەستدەهێنرێ، چونکە ڕازاندنەوەی شێواز خۆی لە خۆیدا کارێکی دەستکردە بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا یەکنەگیر نەبێ. کەوابوو ئەم پەیڕەویکەرانەی ڕێبازی پەرناسی دروشمی ڕوخساری ڕەسەنیان هەڵگرتبوو، نەك شێوازی ڕازاوە بە وێنەی هونەری لە لێکچواندن و خوازە و خواستە و درکە.

ئەم دروشمەش هەڵبەت هەر لەوەدا بەدیدێت، کە ئامرازی ناوەڕۆکی ڕەسەن بێت و دەربڕینێکی ڕاستەوخۆبێت لە تاقیکردنەوە و موعانات و سۆز و هەڵچوون و ئەندێشەدا.

مێژوونووسی ڕەخنەسازیی ئەورووپی چەند لەسەر ئەو ڕاستییە سووربێت، کە دەڵێ: ڕێبازی پەرناسی قەوارە و بوونێکی یەکگرتووی نییە، بەڵام بێگومان ناتوانێ ئینکاری ئەوە بکات، کە ئەم ڕێبازە چەند هێڵێکی گشتی هەیە، کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا وەکوو سنوورێکی جیاکەرەوەدەستنیشانکراون:

**یەکەم:** ڕێبازی پەرناسی بە هیچ جۆرێك بڕوای بە سوودی هۆنراوە نییە و هەرگیزا و هەرگیز ئامانجێکی کۆمەڵایەتی یان خوورەوشت بۆ هەستیاران دەستنیشان ناکات.

**دووەم:** پەرستنی جوانیی بێگەرد و هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی نموونەی بەرزی هۆنراوەی پایەبەرز لە هەموو ڕوویێکی هونەرییەوە.

**سێیەم:** پشتگوێخستنی هۆنراوەی سووك و ئاسان و نرخپێنەدانی بەرهەمی ڕووکەش و چەسپاندنی تەکنیکی لێکدراو و شێوازی گران لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا.

**چوارەم:** کردنەوەی دەرگای مێژوو و فەلسەفە و تیڕوانینی بیری لێکدانەوەی میتافیزیقی

لەبەر دەستی هەستیاراندا بۆ ڕەنگدانەوەی هەموو بیرۆکەیەکی قووڵ و هەستێکی بێسنوور لە هەڵبەستەکانیاندا.

پەرناسی بەم هێڵانە بێگومان سەرچاوەی میسۆلۆجی دێرین و لێکۆڵینەوەی ئایینی و هاوچەرخ و زانستی زمان و چەندین سەرچاوەی تری لەم بابەتە کرد بە کەرەسەی هۆنینەوەی هەڵبەستی تازە پاش ئەوەی پەیڕەویکەرەکانی بڕوایان وابوو، کە ئیتر سەرچاوەی هەڵچوونی کەسی و تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی و باری ڕامیاری وشکبوون و توانای قوڵپدانی بابەتی هۆنراویان نەماوە. بۆیە لیکونت دی لیل هەستیارانی بانگەکرد بۆ بووژانەوەی داستانە ئەغریقییەکان و لێکۆڵینەوەی نەریت و ڕەوشتی میللەتە سەرەتاییەکان و گەڕان بە دوای ڕووداوە هەرە دێرینەکان، بۆ ئەوەی بتوانن ناوەڕۆکێکی تازە وەدەستبهێنن و خوێنێکی نوێ بکەنە ناو جەستەی هۆنراوەی هاوچەرخەوە، کە بە هۆی تێڕوانینی کەسی و ئایدولۆجی کۆمەڵایەتییەوە ساردوسڕ بووە.

ئەم هێڵە گشتییانەی ڕێبازی پەرناسی بێگومان وێستگەی جیابوونەوەی چەمکی هۆنراوەن چ لە ڕووی ڕوخسارەوە چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە چاو تێڕوانینی ڕێبازەکانی تری ڕەخنەسازیی ئەورووپییەوە، جا ئەم چەمکە، کە لە ڕێبازی پەرناسییەوە دەستپێکرد بەرەو کوێ هەنگاوی ناو گەیشتە چ بارەگایەك؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی لە باسکردنی (بۆدلێر)ەوە دەستپێدەکەن و دووپاتیدەکەنەوە، کە ئەم هەستیار و ڕەخنەسازە بلیمەتە توانیویەتی یەکگرتنەوەیەك لە نێوانی ڕێبازی ڕۆمانیزم و ڕێبازی پەرناسیدا پێکبهێنێت و زەمینە بۆ لەدایکبوونی ڕێبازی ڕەمزی خۆشبکات.

ڕاستە کە بۆدلێر سوودی لە ڕێبازی ڕۆمانیزم و ڕێبازی پەرناسی وەرگرتووە، بەڵام خۆی نەبەستووە بە کۆت و زنجیرەکانیانەوە و نەبووە بە موریدی پەیڕەویکەرەکانیان، بەڵکو سوودوەرگرتنەکەی وەکوو بناغەیەك دامەزراندووە و کەسایەتییەکی بۆ خۆ لەسەر بنیاتناوە.

ئەم کەسایەتییەش بە کورتی لە شیکردنەوەی دەروونی هەستیاری سەدەی نۆزدەیەمدا خۆی دەنوێنێ.

دەروونی هەستیاری سەدەی نۆزدەیەمیش لە تێڕوانینی بۆدلێرەوە میراتی سامانی هۆنراوەی مرۆڤایەتییە و دەریایەکی بێبنە لە هەست و سۆز و هەڵچوونی ئادەمیزاد.

ئەوجا بۆ ئەوەی لە کەسایەتیی بۆدلێر بگەین، دەبێت بزانین، کە ئەم مرۆڤە بەرهەمی ئێجگار زۆرە. هۆنراوەگەلێکی هۆنیوەتەوە و لە هەموو چەشنەکانی هونەری کۆڵیوەتەوە وەك

مۆسیقا و داتاشین و نیگارکێشان و ڕازاندنەوەی کۆشك و تەلاریش. سەرەڕای هونەری هۆنراوە ئەم بەرهەمە زۆرانەی بەلای مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپییەوە نەیانتوانیوە ڕێبازێکی سەربەخۆ بۆ نووسەرەکەیان سازبکەن، چونکە ئەم نووسەرە خۆی مەبەستی ئەوە نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بیروڕای وا بووە، کە هونەری جوان لەوە فراوانترە، کە نووسەر بەهۆی ڕێبازێکەوە دەوری بدات و بیگرێتە چنگی خۆی، بۆیە لەم ڕووەوە وتوویەتی:

زۆر هەوڵمداوە پێوانەی لێکۆڵینەوە و ڕەخنەسازیی فراوانبکەم، بەڵام هەمیشە ئەم پێوانەیە لە چاوی ئادەمیزادی هونەرمەنددا بەتەنگەبەری و دواکەوتوویی ماوەتەوە.

بەڵێ ئەم پێوانەیە هەنگاوی فراوانی هەڵگرتووە و غاریداوە، بەڵام لە ئەنجامدا هەناسەبڕکێی پێکەوتووە، چونکە جوانیی و ڕەنگ و بۆن و بەرامەی لە ژمارە بەدەرە و هەمیشە قوڵپدەدات، هەمیشە دەگۆڕێ، هەمیشە بەرگی تازە بەبەردا دەکات و لەگەڵ خولەکانی ژیانی نەمریی بێ کۆتایی دەوردەگێڕێ.

ئا لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا بۆدلێر بڕیاری ئەوە دەدات، کە ناتوانێ باوەش بە ڕاستیی جوانیدا بکات و بە پێوانەیەکی یەکلیگیر لێیتێبگات، بۆیە تەنیا لە جوانی و ناشیرینی کەسی و هەڵچوونی بە چەشنێکی زاتی و خودی دەکۆڵێتەوە و لایەنی سادەی بابەتەکەی شیدەکاتەوە و بە هیچ جۆرێ هەوڵی توێژینەوەیەکی گشتی و کامڵ نادات.

کەوابوو: هەموو شتێك لە هونەردا دەبێت پارچەیی و کەرتۆلکەیی (جزئی) بێت، بۆ ئەوەی ڕەخنەساز بتوانێ وەریبگرێت و لێیبکۆڵێتەوە و تێڕوانینی کەسی و سۆزی تایبەتی خۆی لە ئاستیدا بخاتەڕوو. ئەم کارەش هەڵبەت کارێکی ڕێبازی نییە و ئاکامەکانیشی بە ڕەخنەسازییەکی زانستیانە لە قەڵەمنادرێ، بەڵکو هەر بە بەرهەمێکی هونەری دادەنرێ، چونکە سەرئەنجامی هەڵوێستێکی کەسییە و لەسەر بناغەی سۆز و هەڵچوونێکی کاتی ئەنجامدراوە.

## • هونەر و دەستووری ڕەخنەسازی

بۆدلێر بۆ ئەوەی زەمینەیەکی بەپیت بۆ تێڕوانینە ڕەخنەسازییەکانی خۆشبکات، دووپاتیکردۆتەوە، کە جوانی لە هونەردا کارێکی سەرسوڕهێنەرە، کاری سەرسوڕهێنەریش بۆ ئەوەی ئاکامە کاریگەریی و جادووگەرییەکەی ئەنجامبدات، دەبێت هەمیشە لە گۆڕاندابێت و لەسەر یەك بار لەنگەرنەخات و مەنگ نەبێت.

ئەوجا کە جوانی هونەر ئەمە دۆخی بێت، ڕەنگە بەدوای هۆیەکی هۆشمەندی و عەقڵیدا بگەڕێ بۆ ئەوەی قایلمان بکات. ئەم هۆیەش هەڵبەت ئەوەیە کە هونەر بەرهەمی ژینگەیە، ژینگەش لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی دەگۆڕدرێ و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە چەشنە بۆن و بەرامەیەکی هەیە.

سەرئەنجام جوانیی هونەری هەمیشە گۆڕدراو و سەرچاوە هەرگیزا و هەرگیز پەنگ نەخواردووەکەی چلۆن بە دەستوور و بنواشەی دەستنیشانکراو باسدەکرێ؟!

ئەمە پرسیارێکە وەڵامەکەی بە لای بۆدلێرەوە، هەڵبەت دیار و ئاشکرایە و دووپاتیدەکاتەوە، کە هونەری زیندوو بە دەستووری مردوو بەندناکرێ و دامەزرێنەر و یاسادانەری ڕەخنەسازی چەند بلیمەت بێت بەیەك چاو جوانیی هونەر دەبینێ و بە مێشکێکی سنووردار تێیدەنواڕێ. بۆیە هەرچی دەستوور و یاسا لەو بارەیە سازبکات، ناتوانێ لە سروشتی باسکراوەکەی بکۆڵێتەوە.

سەرئەنجام بیروڕای بۆدلێر لەڕەخنەسازیدا لەسەر بناغەی نادەستوور و نابنواشە دامەزراوە. ئەم سەرئەنجامە ڕەخنەسازییە نابێت ئەوە بگەیەنێ، کە بۆدلێر بڕوای بە هیچ چەشنە ڕەخنەسازییەك نەبووە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کە ڕەخنەسازیی کارێکی نیسبی و لایەنییە، چونکە جوانی موتڵەق و بێسنوور لە هۆنراوەدا، هەروەکوو پەرناسییەکان دەڵێن ڕۆژێ لە ڕۆژان نەبووە و ئێستاش نییە و هەرگیزاو هەرگیز لەدایکنابێت.

جوانی سەرچاوەی جۆربەجۆری هەیە و کاتی دەستنیشانکراو و ژینگەی تایبەتی ڕەگەزیی میللەتانی جیاواز و مەیل و ئارەزووی کەسی و دەیان سەرچاوەی هەمیشە گۆڕدراو دەبن بەهۆی پەیدابوونی سەدان جوانی لە هونەردا.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە یەك چەشنە جوانی لەبەر دەستی ڕەخنەسازدا نییە، بگرە بەرەنگاری چەندین جوانی دەبێتەوە.

جا کەوابوو چلۆن ئەم ڕەخنەسازە بە دەستووری ڕەخنەسازیی یەکگیر و بنواشەی یەك پێوانە، دەتوانێ ئەو هەموو جوانییە شیبکاتەوە و نرخیان دەستنیشانبکات و هەڵیانبسەنگێنێ؟

ئەمە پرسیارێکە و مەبەستی بۆدلێریش لەبەرپاکردنی ئەو پرسیارە ئەوەیە، کە بڵێ: ڕەخنەساز ناتوانێ بە شتێکی یەکگیر و یەك پێوانە، سەدان شتی یەکنەگرتوو و جۆربەجۆر باسبکات و لێبکۆڵێتەوە. هەروەها مەبەستی ئەوەیە، کە بڵێ ڕەخنەسازیی جیهانی کە بۆ هەموو میللەتێك و هەموو سەردەمێك گونجاو بێت نییە و نابێت ببێ، بەڵکو دەبێت بۆ هەر سەردەمێك و بۆ هەر میللەتێك بۆ هەر ژینگەیەك، ڕەخنەسازییەکی تایبەتی هەبێت.

## • بۆدلێر و زمانی هۆنراوە

هەروەکوو تێبینیدەکەین بۆدلێر بە هەمووتوانایەکییەوە دروشمی بەدیهێنانی دیاردەی تایبەتی لە هۆنراوەدا هەڵگرتووە و دژ بە هەموو شتێکی گشتی و فراوان ڕاوەستا، دیاردەی تایبەتیش لە هۆنراوەدا بە لای ئەم ڕەخنەسازە هەستیارەوە یان ئاکامی سەردەم و میللەت و ژینگەیەکی دەستنیشانکراوە یان بەرهەمی دەروون و مەیل و ئارەزووی هەستیارێکی تایبەتییە. جا دیاردەی تایبەتی لەهەر سەرچاوەیەکەوە بەرپابوویێت، پێویستی بە زمانێکی تایبەتی هەیە، چونکە زمانی هۆنراوە سامانێکە بۆ دەربڕینی بابەتی هۆشمەندی هاوبەش و نەریتی گشتی و ڕەنگی سەردەمی. وشەو وێنە هونەرییەکانی فەرهەنگێکی چەسپێنراوە، بۆ هەر هەستیارێك کە بیەوێ هەڵبەست بهۆنێتەوە، بەڵام هەستیاری ڕاستینە کە دەیەوێ شتێکی تازە لە دەروونی تایبەتی خۆیەوە دەربڕێ یان کاروبارێکی تایبەت بە سەردەمەکەی بخاتەڕوو، دەمێت پشتبکاتە زمانی هۆنراوەی سامانی و کلێشەکانی. ئەوجا زمانێکی هونەریی نوێی تایبەت بە باری دەروونی و تایبەت بە هەست و تایبەت بە سەردەمەکەی سازبکات. جا با ئەو زمانە لە فەرهەنگی چەسپێنراوەوە وەرنەگیرابێت. هەروەها با وێنە هونەرییەکانی بەرگوێی کەس نەکەوتبن. ئەمانە گرنگ نین، گرنگ ئەوەیە کە ئەم زمانە هۆیەکی ڕاستگۆبێت لە نواندنی هەست و سۆزێکی ڕەسەن.

کارگەی ئەم زمانەش ئەندێشەی تایبەتی هەستیارەو بەهۆی بۆچوونی خۆیەوە سازیدەکات.

هەروەکوو دیارە ئەم تێڕوانینانەی بۆدلێر دەرحەق بە زمانی هۆنراوە و ئەنجامدانی لە هەڵبەستە بەناوبانگەکانیدا، کە بە ناونیشانی: (گوڵەکانی شەڕ)بڵاویکردوونەتەوە هەنگاوێکی سەرەکین بۆ لەدایکبوونی ڕێبازی ڕەمزی لە وێژەدا.

## • بنەڕەتەکانی ڕێبازی هێمایی "ڕەمزی"

وشەی "هێما" لە فەرهەنگی کوردیدا هەندێ جار بەرامبەر بە وشەی (الرمزیە)ی عەرەبی بەکاردەهێنرێت، ئەم بەکارهێنانەش ڕەنگە لە ڕووی زانست و وشەسازییەوە کارێکی زانستی نەبێت، بەڵام لە سووچی واتاوە تاڕاددەیەکی زۆر مەبەستی ئەو وشە عەرەبییە دەهێنێتەدی و لە سروشتی ڕێبازی ڕەمزیی ئەورووپی نزیکدەبێتەوە.

هەرچۆنێک بێت "ڕێبازی هێمایی: المدرسە الرمزیە" لە هۆنراوە و ڕەخنەسازیدا بەچەشنێکی کامڵ و پێگەییشتوو لەدایکنەبووە، بەڵکوو وردەوردە بەدرێژایی نیوەی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی تایبەتییەکانی کەوتنەڕوو و پەرەیانسەند و چەند هێڵێکی جیاکەرەویان لەچاو ڕێبازی پەرناسی و تیۆرواتینە ڕەخنەسازییەکانی بۆدلێر چەسپاند.

مێژوونووسی ڕەخنەسازیی ئەورووپی، کە دەیەوێ ئەو تایبەتییانە شیبکاتەوە، پێویستە پەنجە بۆ هەستیار و ڕەخنەسازی فەڕەنسی بەناوبانگ (فرلین) درێژبکات و ئەوە بهێنێتەوە

یاد، کە ئەو هونەرمەندە لە ژێر سێبەری دروشمەکانی ڕێبازی پەرناسیدا دەستی بە ژیانی وێژەیی خۆی کرد و وتارە ڕەخنەسازییەکانی پاش شوێنپێهەڵگرتنی "ڕامبۆ"ی هەستیاری هێمایی شۆڕشگێڕ نووسییەوە و بەرهەمە هونەرییەکانی لە ساڵانی: ١٨٧١ — ١٨٧٣ ی زایینی هۆنییەوە. جا کە فرلین بە دامەزرێنەری بەردی بناغەی بیردۆزەی هێماییەکان دابنرێت، پێویستە ئەوە لەیادنەکەین، کە لەسەردەستی ئەم هەستیار و ڕەخنەسازەدا، تەنیا بنەڕەتی گشتی ئەم ڕێبازە بەرچاودەکەون.

بنەڕەتی گشتیی سەرەکی ڕێبازی هێمایی لەڕەخنەسازیدا کاردانەوەیەکە دژی بنەڕەتی پەرناسی، کە بڕوای بە نموونە و میسالیی بەرز لە هونەردا هەیە و پێویستە هەستیار و هونەرمەندان لاسایی ئەو نموونە بەرزە بکەنەوە و پەیڕەوی دەستووری وەدەستهێنانی بکەن. بۆیە دەستووری هێمایی بیروباوەڕی وایە، کە نموونەی بەرزی ڕەخنەسازی لە هونەردا گۆڕستانێکە بۆ هونەرمەند، چونکە ئەگەر هاتوو هونەرمەند خۆی بە شتێکی دەستنیشانکراوەوە بەستەوە ئیتر توانای خوڵقاندن و داهێنانی دەمرێت و دەبێت بە نۆکەری ڕابردوو و چاوی لە ئاسۆی فراوانی دواڕۆژ نابێت. هۆنراوەکەیش، کە نموونەی بەرزیی نەبێت بۆ لاساییکردنەوە دەبێت خۆی لە هونەری مۆسیقا و کۆڕی ئاواز نزیکبخاتەوە تا دەتوانێ وەکوو: وێنەکێشان و داتاشین بەهێڵ و ڕەنگ و قەوارە بابەتەکانی ڕاستەوخۆ نەدرکێنێ.

سەرئەنجام نابێت ئەرکی وشە و ڕستە و داڕشتن لە هونەری هۆنراوەدا تێگەیاندن و ڕوونکردنەوە و چەسپاندنی واتا و بیرۆکە و باوەڕ بێت، بەڵکو دەبێت وەکوو دەنگی پەنهانی تریە و ئاواز و خورپە ببەخشێ و هێما بکات و خوێنەر بەرەو جیهانی پەنهانی هونەر بۆ تێڕوانین و وردبوونەوە و هەستکردن ڕابکێشێ.

کەوابوو: هەستیار نابێت کەرەسەی زمان وەکوو نووسەرێکی پەخشانی هونەری بەکاربهێنێت و لە ترسی ئەوەی هەڵەی ڕێزمانی بکات بە وشکی شوێنپێی زمانەوان و ڕێزماننووس بکەوێت.

وشە لە زمانی هۆنراوەدا بە دەنگە نەبزوێن و بزوێنەکانی ئاوازێکە لە سەمفۆنیای هەڵبەستدا. دێڕە هۆنراوەیش بەرگەکانی کە ترپەی چەشنێك لە چەشنەکانی کێش ئەنجامدەدا، کۆمەڵە ئاوازێکی یەکگرتوو سازدەکات، کەچی قافیە کە کۆتایی دێڕە هۆنراوەکەیە، ڕاوەستاندن و ئاواز لە هەڵبەستی سەمفونیدا دەبەخشێ.

بەم جۆرە هۆیەکانی هەڵبەست لە کەرەسەی زمان و کێشی دێڕ و قافیەدا وەکوو ئاهەنگێکی مۆسیقین و مەبەستیان بەرپاکردنی ناڕوونی و ڕاڕایی و هاندانی خوێنەرە، نەك تێگەیاندن و نواندنی بیرۆکەیەکی مەنتیقی و سۆزێکی وردە.

## • ڕامبۆی هەستیاری بەناوبانگ و ڕێبازە نوێیەکەی لە هۆنراوەدا

ئەو بنەڕەتە گشتییانەی ڕێبازی هێمایی، کە بە زۆری بە پێنووسی فرلین نووسراونەتەوە بیردۆزەیین و بە ئاسانی خوێنەر لێیان تێناگات، بۆیە هەر لەم سووچەوە ڕێگای پراکتیکیان نەگرتەبەر.

لە ساڵی ١٨٧٣ی زاینیدا، هەستیاری شۆڕشگێڕ دەستی بە بڵاوکردنەوەی تێبینییە ڕەخنەسازییەکانی کرد، کە مەبەستی چەسپاندنی ڕێبازێکی نوێ بوو لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا.

ڕامبۆ بیروڕای وا بوو، کە هێما نەك وشە توانای بەدیهێنانی ئەرکی هۆنراوەی هەیە. ئەرکی هۆنراوەش هەڵبەت گەیاندنی بیروباوەڕ و ڕوونکردنەوەی بیرۆکە و چەسپاندنی واتا نییە، بەڵکو ئەو ئەرکە خوڵقاندنی جیهانێکی تایبەتییە لە هەست و شمەکی سەیری نەبینراو و نەبیستراو.

هێما، واتە "ڕەمز" لە گێڕانی هێزی ئەو کارە نیشانەیەکی داستانی و مێژووییە، کە لە ناخی مێشکی ئادەمیزاددا ڕەگوڕیشەی داکوتاوە و بەبێ ئەوەی پێیبزانێ بەو چەشنە شوێنی خۆی کردۆتەوە.

جا کە هەستیار ئەو هێما و نیشانەیە لە جیاتی وشەی فەرهەنگی بەکاردەهێنێ، سەرچاوەی یادگاری دێرین و هەستی سەرەتایی لە دڵ و دەروونی خوێنەرەکانیدا هاندەدات و بەرەو ئەو جیهانەڕایاندەکێشێ.

هەستیار لە هەڵبژاردنی هێما و نیشانەکانی پێویستە وەکوو لاساییکەرەوەی خورپە پێبەخشراوێك بە بێ سنوور و بە بێ هۆشمەندی لە هەموو واتاکانی هەستی تازە بنوێنێ لە واقیع و بووندا. سەرچاوەی ئەم هەستە تازەیە بتەقێنێ و بە بێ ئەوەی کارگە بە پەرستگە لە قەڵەمبدات، دەستکاری سروشتی شمەکەکانی ژیان بشێوێنێ، پێویستە کاروباری وا پێشکەشبکات کە بەڕاستی خوڵقێنراو و تازەبن و هیچ هەستیارێکی دی بەر لەو بەلایاندا نەچووبێت.

ڕامبۆ بە شیکردنەوەی ڕێبازە هۆنراوەییەکەی سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە لە منداڵییەوە حەزی لەو شتانە کردووە، کە لە کۆڕی ڕێژمی ڕاستینەدا فەرامۆشکراون، وەکوو ترپە و مۆسیقای ساکار و حیکایەتی دێوودرنج و داستانی میللی.

ئەم حەزکردنەش بە لای مێژوونووسانی ڕەخنەسازیی ئەورووپییەوە ڕووناکییەکە بۆ تێگەیشتن لە تێبینییە ڕەخنەسازییەکانی ئەم هەستیارە، بۆیە لەبەر تیشکەکەیدا سەرنج بۆ ئەوە

ڕادەکێشن، کە ڕێبازەکەی ڕامبۆ لە هۆنراوەدا دژواری هەموو ڕێبازە وێژەییە ئەورووپییەکانە.
هەرچۆنێك بێت ئەم ڕێبازەی ڕامبۆ لەسەر سێ بناغەی سەرەکی جیاکەرەوە دامەزراوە:
**یەکەم:** هێما و نیشانە نەك وشەی فەرهەنگی، کە ئەرکی گەیاندنی واتایەکی دستنیشانکراوە و دەربڕینی هەستی هەستیارە. هێما و نیشانەش هەڵبەت بێژەیەکن، بەڵام مەبەست لەم بێژەیە واتای فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکەی نییە، بەڵکو مەبەست لەم بێژەیە ئاوازی دەنگە پێکهێنەرەکانێتی، کە بە هۆیانەوە هەستی خوێنەر دەجوڵێت و یادگارە دێرینەکانی لەتەك ئەو هێما و نیشانە بێژەییەیدا دێنەوە یادی.
**دووەم:** جیهانی هۆنراوە، کە جیهانێکی تازەیە و هیچ پەیوەندییەکی بە جیهانی ڕۆژانەی بیستراو و نەبینراوەوە نییە.
**سێیەم:** بوون و واقیع، هەرچەندە سەرچاوەی هەستیارە، بەڵام هەستیار دەبێت شتێك لەم سەرچاوەیە هەڵبژێرێ، کە هەتا ئێستا هیچ هەستیارێك هەڵینەبژاردبێت. بە واتایەکی دی دەبێت بابەتی هەر هەستیارێك جیاواز بێت لە بابەتی هۆنراوەی هەستیارێکی دی.
**کەوابوو:** لەم ڕێبازەی ڕامبۆ لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا بیردۆزێکی دی لە بیردۆزەکانی هێما و ڕەمز لەدایکدەبێت، ئەم بیردۆزەش لە چاوی (فرلین) دا هەنگاوێکی تازە بەرەو دوورکەوتنەوەی هۆنراوەی ئەورووپی لە پەیامی کۆمەڵایەتی گەیاندنی بیرۆکە و درکاندنی واتاوە.
ئەوجا دوابەدوای ئەم هەنگاوە هۆنراوەی ئەورووپی بەرەو کوێ ڕۆیشت و گەیشتە چ قۆناغێك؟

## • ئەرکی وشە لە هۆنراوەدا

لە مێژووی هەموو چالاکییەکانی ئادەمیزاددا، ڕاستییەك ڕەچاوکراوە کە دەڵێ: هەموو بیرۆکەیەکی تازە کە بەرپادەبێت، ناتوانێت بە ئاسانی و بە بێ گیروگرفت ڕێگای زاڵبوون و سەرکەوتنی ببڕێت، بەڵکو هەر دەبێت بەشداری زۆرانبازییەکی توندوتیژی بکات و دەستەویەخە بەرامبەر بە بیرۆکە دێرینە دژوارەکانی ڕابوەستێ.
ڕەخنەسازیی ئەورووپیش وەکوو چالاکییەکی ئادەمیزادانە ئەم ڕاستییە دووپاتدەکاتەوە، چونکە دەگێڕدرێتەوە بەرامبەر بە بانگەوازەکەی ڕامبۆ بۆ بەکارهێنانی هێما و نیشانە لەجیاتی وشە بانگەوازێکی بەتین لە لایەن ڕەخنەسازی فەرەنسی بەناوبانگ (مالارمیە)وە بەرزبووەوە و

سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشا، کە ئەرکی وشە لە هۆنراوەدا کارێکی نەمرە، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو لەو ئەرکە گەیشتین و زانیمان کە وشە تاقە بێژەیەکی پچڕاونییە، بەڵکو نیشانەیەکی زیندووە لە بنیاتنانی دێڕە هۆنراوەدا شانبەشانی وشەکانی دی یەکدەگرێتەوە و ئاوێتەیەکی مۆسیقی دروستدەکات و لەم ڕێگایەوە سنووری ناوچەیی و واتایی فەرهەنگی دەشکێنێ و بەرەو ئاسۆی سۆز و ئەندێشە لە شەقەی باڵدەدا.

هەروەها وشە بەهۆی ئاوازی کێش و قافیەی هۆنراوەوە دەتوانێ زیاتر ئەرکی کارتێکردن و شوێنەوار و بەجێهێشتن بگێڕێ.

سەرئەنجام نابێت ئێمە خۆمان بخەینە تەلیسمی نیشانە و هێما و ڕەمز بگرینەبەر و هەموو بیانوومان لەم کارەدا ئەوە بێت، کە ئەم ئامێرە ئاوازبەخش و ترپە بەخشندەن، چونکە ئاواز و ترپە لە وشەشدا بەرگوێدەکەون.

ئەگەر هاتوو چەمکی وشە تاقە بێژەیەك نەبوو، بەڵکو ئەم چەمکە لە دێڕی هۆنراوەدا، وەکوو یەکێتییەکی تێکسمڕاو لە وشەگەلێك وەدەستهێنرابێت.

ئەم بیروڕایانەی مالارمیە دەربارەی ئەرکی وشە لە هۆنراوەدا بەرگرییەکی ئایدۆلۆجییە لە دارشتنی هەڵبەستی دێرین، چونکە دەیەوێ ئەم دارشتنە هەر وەکوو خۆی لە ڕەگەزی وشە و ڕەگەزی کێش و قافیە بهێنێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ بەرامبەر بە لێشاوی هۆنراوەی نوێخوازی دژ بە هەموو کۆت و زنجیرە دێرینەکانی هەڵبەستی میراتی خۆی ڕابگرێ.

پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە ئایا هەڵبەستی میراتی توانی لەم زۆرانبازییەدا سەربکەوێ، یاخود دوابەدوای مالارمیە بە دەیان ڕەخنەسازی لاوی نوێخواز پشتیانکردە ئەو هەڵبەستە و پاوەشیان بۆ هۆنراوەی نوێخواز کردەوە؟

## ● هۆنراوەی سەربەست

لە مێژووی هۆنراوەی فەرەنسیدا ساغبۆتەوە، کە نووسەر و هەستیاری بەناوبانگ ڤیکتۆر هۆگۆ دوا هونەرمەند بوو لە کۆڕی پەیڕەوکردنی یاسا لاساییکراوەکانی کێش و قافیە میراتی، دوابەدوای ئەم هەستیارە بە چەشنێکی هەستپێکراو بزووتنەوەی هۆنراوەی سەربەست و نوێخواز کەوتە گەڕ.

ئەم بزووتنەوەیە لە سەرەتاوە تا ڕادەیەکی زۆر زۆربەی هەڵبەست و سازکردنی دێڕە هۆنراوە و ئەنجامدانی قافیەی دەستکارینەکرد، بەڵام وردەوردە تا دەهات ئەم دەستکاریکردنە پەرەیسەند

هەتاوەکوو کۆمەڵێك لە هەستیارە لاوەکان وەکوو: (ە. دی رینیە و لافورغ) پەیدابوون و توانیان کارزانانە لە کۆت و زنجیری هۆنراوەی دێرینی میراتی سەربەست بین.

ئەوەی لەم سەربەستییە پەیوەندی بە ڕێبازی هێماییەوە هەیە، هۆنینەوەی هەڵبەستی تاکە برگەیی و لێکدراو لە یانزە برگە و سیانزە برگەییە.

هەروەها بەکارهێنانی ئەو وشانەی، کە دوو دەنگی بزوێنی یەك لە دوای یەکیان تێدا بەرگوێدەکەوێ.

مەبەستی ئەو هەستیارە لاوانە لەم چەشنەی هۆنینەوەیە هەڵبەت بەرپاکردنی ئاواز و مۆسیقای چڕە لە هەڵبەستەکانیاندا، بۆ ئەوەی گوێگر و خوێنەر ڕابکێشن بەرەو جیهانی ماددی و هێمایی. ئەم هەستیارە لاوانە، کە لە ساڵی ١٨٨٠ی زایینییەوە بەنازناوی بێفەرەکان (المنحطین) ناوبانگیاندەرکرد. بە بێسنوور مافی داتاشینی وشەی نوێباویان بە خۆیان دا و دەستیانکرد بە دروستکردنی وشەی ئاوازدار بەبێ ئەوەی لەم کارەیاندا سەرنج لە فەرهەنگ بدەن و پەیڕەوی دەستوورەکانی سازکردنی وشە بکەن.

سەرئەنجام ئەم بزووتنەوەیە بێگومان سەرکەتوو نەبوو، چونکە وشەی داتاشراو چەند لە واتاوە دووربێت ناگاتە ڕاددەی ئاوازی مۆسیقا لە خولقاندنی جیهانی گیانی و هەستی، چونکە هەر دەبێت ئەو وشانە پەیوەندییان بە کۆمەڵێکی تایبەتی و ناوچەیەکی دەستنیشانکراوەوە هەبێت، بە پێچەوانەی ئاوازی مۆسیقا کە خۆی لە خۆیدا جیهانییە و لە هەموو شتێکی ماددی و گشت دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەتی و ناوچەیی سەربەستە و وزەی داهێنانی سۆز و ئەندێشەی ئادەمیزادانەی هەیە.

## • ڕووگەی مالارمیە و ڕێبازی هێمایی

لەم کۆڕە فراوانەی بزووتنەوەی هۆنراوەی سەربەستدا، کە هێڵە گشتییەکەی مەسەلەی ئاواز و مۆسیقایە، "مالارمیە"ی ڕەخنەسازی فەرەنسی بەناوبانگ چالاکانە هەوڵیدا، ڕووگەیەك بۆ خۆی لە ڕەخنەسازیدا بچەسپێنێ، ڕەگەزەکانی ئەم ڕووگەیە، سێ سەرنجی جیاواز و دژ بەیەکترین:

ڕەگەزی یەکەم: وشەو دێرە هۆنراوە، خۆی لە خۆیدا پێویستە ئاکامێکی ئاوازی و مۆسیقی ببەخشێ.

ڕەگەزی دووەم: هەڵبەست هەرچەندە دەبێت پارچەیەکی مۆسیقی بێت، بەڵام لە هەمان

کاتدا پێویستە مەبەستێکی واتایی هەبێت.

ڕەگەزی سێیەم: ناوەڕۆکی هۆنراوە دەبێت بیرۆکەیەکی پەتی بێت.

ئەم سێ ڕەگەزە هەر وەکوو وتمان پێکەوە ناگونجێن، چونکە ئەگەر هەستیار هەموو کۆششی سازکردنی ئاواز و مۆسیقا بێت و لە سەرچاوەی بیری پەتییەوە هۆنراوە بهۆنێتەوە، چلۆن دەتوانێ بە هەڵبەستەکانی مەبەستێك بهێنێتەدی؟

ئەمە پرسیارێکی سەرسوڕهێنەرە، وەڵامەکەشی دیار و ئاشکرایە، بەڵام بۆ ئەوەی لە هۆی نەگونجانی ئەو سێ ڕەگەزە ڕەخنەسازییە بگەین، دەبێت بزانین کە مالارمیە ڕەخنەسازێکی پێشەوایە لە نێو ساڵانی ١٨٧٠- ١٨٨٥ دەستی بە بڵاوکردنەوەی بیروڕا ڕەخنەسازییەکانی کرد، بەڵام نەیتوانی ڕێبازێکی هۆنراوەی ئاشکرا و چەسپاو پێکبهێنێ.

ئەم ڕێبازە بە چەشنێکی زانستی دوابەدوای ساڵی ١٨٨٠ی زایینی بناغەکانی خۆی چەسپاندن و کەوتەگەڕ و لە ساڵی ١٨٩٠ی زایینییەوە بەرهەمەکانی بەرچاوکەوتن.

## • لەدایکبوونی ڕێبازی هێمایی لە ڕەخنەسازیدا

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی لە سەر ڕاستییەك یەکدەگیرن، کە دەڵێ: ڕێبازی هێمایی (ڕەمزی) ئەو کاتە لەدایکبوو، کە(موریاس )ی ڕەخنەسازی فەرەنسی بەناوبانگ لە ڕۆژی ١٨ی ئەیلوولی ساڵی ١٨٨٦ی زایینیدا نامەیەکی لە پاشکۆی وێژەی ڕۆژنامەی (لۆ فیگارۆ ) دەربارەی دەوری وشە لە هۆنراوەدا بڵاوکردەوە.

ئەم ڕەخنەسازە لەم وتارەیدا بە هەموو توانایەکییەوە چەمکێکی تازەی سەبارەت بە هۆنراوە چەسپاند و هەوڵیدا ئەم چەمکە شوێنپێی چەمکی ڕێبازی پەرناسی بگرێتەوە و لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا دەریبپەڕێنێ. هەروەکوو چلۆن ڕێبازی پەرناسی خۆی هەمان ڕەفتاری لەگەڵ ڕێبازی ڕۆمانیزمدا کرد.

موریاس بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم چەمکە تازەیە لە هۆنراوەدا (بۆدلێر و مالارمیە و فرلین) ی بە سەرکردەی ڕێبازی نوێ لە هەڵبەست هۆنینەوەدا دەستنیشانکردن و هۆیەکانی ئەم دەستنیشانکردنەشی شیکردنەوە و وتی: بۆدلێر سەرکردەی ڕاستینەی هۆنراوەی نوێخوازی و ئاوازدارە، مالارمیەش ئەو هەستیارەیە کە نهێنی بە هۆنراوە بەخشی و شێوازی هەڵبەستەکانی لە سەرووی پیاهەڵدان و وەسفەوە دێن، بەڵام فرلین کە سەرکردەی سێیەمە لەبەرئەوە بەم چەشنە لەقەڵەمدەدرێ، چونکە هەموو کۆت و زنجیرەکانی هۆنراوەی دێرینی میراتی شکاندن و بە

چەشنێکی ڕێکوپێك هەڵبەستی نوێخوازی هۆنییەوە.

موریاس جگە لە پێشکەشکردنی ئەو سێ هەستیارە و خستنەڕووی تایبەتییەکانیان، دەستیکرد بە شیکردنەوەی هۆنراوەی ڕاستینە چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە و چ لە ڕووی ڕوخسارەوە و دووپاتیکردەوە، کە هۆنراوە نابێت هۆی دەربڕینی بیر و هۆشمەندی بێت، بەڵکو ئاوێنەی بیرۆکەیەکی ئایدیایی و میسالی بێت و لە ڕێگای سازکردنی لێکچواندن و بەراوردکارییەوە، جیهانی هەستپێکراو لەتەك جیهانی پەنهانیدا تێکەڵبکات و سنووری دەستکردی نێوانیان بشکێنێ.

لە ڕووی زمانی هۆنراوەوە ئەم ڕەخنەسازە بە توندی بەرپەرچی هەستیارە لاوەکانی دایەوە، کە بە بێفەڕەکان (المنحطون) ناودەبران و بیروڕایان ئەوە بوو کە هەستیار دەبێت لە سازکردنی وشە و ڕستە پەیڕەوی ڕێزمان نەکات و بە هەڵە زمانی هەڵبەستەکان ئەنجامبدات، بۆیە دووپاتیکردەوە، کە پێویستە هەستیار بە ئەوپەڕی وردییەوە پەیڕەوی ڕێزمان بکات و زمانی هەڵبەستەکانی لە سەرچاوەی هۆنراوەی دێرینی فەڕەنسییەوە بەر لە ( فوجیل و بوالۆ و دیبریۆ ) و هەستیارە میراتییەکانی دی وەربگرێت، چونکە تەنیا لەم سەرچاوە زمانییە دێرینانەدا وشەی ڕەسەن و ڕستەی پتەو و داڕشتنی ئاوازدار بەرگوێدەکەون.

هەستیار بە لای ئەم ڕەخنەسازەوە، دەبێت زمانی ڕەسەن وەکوو کەرەسەیەك وەربگرێت و بە مەبەستی تازەکردنەوە تایبەتییەکانی ئەم کەرەسەیە دەگەڵ تایبەتی هاوچەرخ لە ئاسانی و ئاڵۆزی و ناڕوونیدا تێکەڵبکات و زمانێکی هۆنراوەی لێکدراو لە تایبەتی دێرین و سیفاتی تازە ئەنجامبدات.

لە ڕووی کێشەوە پێویستە ئاوازە میراتییەکان فەرامۆشنەکرێن، بەڵکو ئەو ئاوازانە بە چەشنێکی ڕەنگاوڕەنگ لە هەڵبەستدا بەکاربهێنرێن. هەروەها قافیە پێویستە بە جۆرێکی گۆڕاو لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە سازبکرێ.

باشترین بناغەی لایەنی ئاواز لە هەڵبەستدا، بەکارهێنانی ژمارەی تاکە لە (حەوت و نۆ و یانزە و سیانزە) بۆ ئەوەی بە تەواوی هەڵبەستەکە ئەرکی ئەنجامدانی ئامانجی ناوەڕۆکی و ڕوخساری خۆی ڕاپەڕێنێ.

## • بیردۆزەکەی ڕنیە غیل لە مۆسیقای وشەدا

هەروەکوو لەمەوبەر تێبینیمانکرد، نرخی وشە لە لای پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی هێماییدا لە واتای وشەکەوە دابیننا‌کرێ، بەڵکوو ئەو نرخە لە مۆسیقای دەنگەکانی وشەکەدا هەڵدەقوڵێ، چونکە بەهۆی مۆسیقای وشەوە هەستیار دەتوانێ کاربکاتە سۆز و هەستی خوێنەر و جڵەوی هۆشمەندی بەرەو جیهانە تایبەتییەکەی ڕابکێشێ.

ئەم بیروڕایەی ڕێبازی هێمایی سەبارەت بە وشە لە هۆنراوەدا بە چەشنێکی پەرشوبڵاو بەبێ لێکدانەوەی قووڵ مایەوە، هەتاوەکوو (ڕنیە غیل)ی فەیلەسووف و ڕەخنەسازی فەڕەنسی لە ساڵی ١٨٩١ زایینیدا لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی لەم ڕووەوە بڵاوکردەوە و لەبەر تیشکی ڕێبازێکی زانستی بەراوردکاریدا بیردۆزەیەکی پێگەیشتووی دەربارەی مۆسیقای وشە داهێنا.

بناغەی سەرەکی بیردۆزەکەی غیل لەسەر بیرۆکەیەك دامەزراوە، کە دەڵێ: ئەرکی کاری هۆنراوە تەنیا لە بووژاندنەوەی یاسا گشتییەکانی بووندا بەرچاودەکەوێ. ئەم ئەرکەش لە دوو دیاردەدا خۆی دەنوێنێ:

دیاردەی یەکەم: ئەوەیە کە هەڵبەست بەرهەمی یاسا گشتییەکانی بوونە، کە بە گوێرەی یاسای پەرەسەندن لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی گۆڕاوە.

دیاردەی دووەم: ئەو یاسا گشتییانەی بوون، تەنیا ترپە و ئیقاع بوون، نەك کەرەسەی هەستپێکراو.

وشەش کە بەردی بناغەی هەڵبەستە دەبێت وەکوو ئاوازێك لە ترپەی ئەمری یاسا گشتییەکانی جیهان تەماشابکرێت و هەستیار لە بەکارهێنانیدا دەبێت شارەزایانە ئاگای لە سروشتی وشەکانی بێت و بزانێت هەر شتێك لە وشە چ کارێك دەگێڕێت و چلۆن کاردەکاتە سەر خوێنەری هەڵبەستەکانی.

غیل لە شیکردنەوەی دەنگەکانی وشە ئەم دەنگانە بەسەر دوو کۆمەڵدا دابەشدەکات:

١- کۆمەڵەی دەنگە بزوێنەکان وەکوو: (ا، ە، ی، ێ، و، ۆ )، کە بەرامبەر بە پلەکانی ڕەنگی سوور دێن و لە کارکردنیاندا ئەو هەڵچوون و سۆزانە بەرپادەکەن کە بەبینینیی ڕەنگی ئەرخەوانی و قورمزی و بنەوشەیی و جۆرەکانی دی ئەم ڕەنگە لە ویژدان و هەستی بینەرەوە هەڵدەقوڵێن.

٢- کۆمەڵەی دەنگە نەبزوێنەکان وەکوو: (چ، ڕ، س، ف، ...تاد) کە لە یاسای ئامێرە مۆسیقییەکاندا بەرامبەر بە کۆمەڵە (ساکس)ی بەرزی مۆسیقا دەنگدەدەنەوە و هەموو

ڕووداوێکی هەراوهۆریا و قیژە و دەنگەدەنگ و هاوار و غەڵبەغەڵب دەنوێنن.

وشە کە دەبێت هەر لە دوو دەنگ یا پتر لەم کۆمەڵە دەنگانە پێکهاتبێ، بە هۆی ئاواز و نرخە هێمایی و ڕەمزییەکەیەوە زمانی تایبەتی هۆنراوە سازدەکات، ئەم زمانەش هەڵبەت فەرهەنگی و چینایەتی کۆمەڵی نییە، بەڵکو زمانی سۆز و هەڵچوونی کۆنترین سەردەمی پەیدابوونی ئادەمیزادە لەسەر ئەم زەوییە.

ئەم زمانە سۆزی و هەڵچوونییە، هەڵبەت گۆڕدراوە دەگۆڕدرێ، گرنگ ئەوەیە هەستیار جڵەوی زمانەکەی بگرێتەدەست و ناهۆشمەندانە ملکەچی سۆز و هەڵچوونی تایبەتی خۆی بێت و بەبێ گوێدان بە فەرهەنگ و ڕێزمان هەڵوێستی خۆی لە هەڵبەستێکدا بچەسپێنێ.

ئەم بیردۆزەی غیل هەروەکوو دیارە ڕێبازێکە بەرەو سریالیزم و ناهۆشمەندی لە هۆنراوەدا تەکاندەدا وەك لەمەولا دەیبینین.

**ئەم ڕێبازە کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە باڵی بەسەر زۆربەی کۆڕە هونەری و وێژەییە ئەورووپییەکاندا کێشا و بوو بە ڕەنگی جیاکەرەوەی سەدەی بیستەم لە سەدەکانی دیکە.**

## • زەمینەی بەرپابوونی ڕێبازی سریالیزم

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی لە دابینکردنی زەمینەی بەرپابوونی ڕێبازی سریالیزم سەرنج بۆ دوو هۆی سەرەکی ڕادەکێشن:

هۆی یەکەم: بڵاوبوونەوەی بیردۆزە دەروونی و فەلسەفییەکەی (فرۆید)ە، سەبارەت بە مەسەلەی هێزی ناهۆشمەندی ئادەمیزاد و چەسپاندنی بیرۆکەی زاڵبوونی ئارەزووی جنسی بەسەر هەموو هەڵسوکەوتی ئارەزووەکانی مرۆڤ و نواندنی ئادەمیزاد وەکوو گیانلەبەرێکی بێتوانا و بێدەستەڵات بەرامبەر بەم ئارەزووە و دووپاتکردنەوەی بێهێزی هۆشمەندی لە ئاستی ناهۆشمەندیدا.

هۆی دووەم: کارتێکردنی کوێرەوەری و میحنەتی شەڕی جیهانییە لە هەموو بیروباوەڕ و بنەڕەتەکانی ئادەمیزادی خێرومەندو حەقپەرست. ئەوجا جێڵەقکردن بەم بنەڕەتی و بیروباوەڕانە و چاندنی نائومێدی و دوودڵی و گومانکردن لە هەموو یاسا و نەریت و ئامۆژگارییەکی کۆمەڵایەتی و ئایینی و مرۆڤایەتی.

ئەم دوو هۆیە هەروەکوو زاناکانی کۆمەڵ دووپاتیدەکەنەوە زەمینەی بەرپابوونی ڕێبازی سریالیزمیان خۆشکرد، کە هێڵە گشتییەکانی لە بەرهەڵایی ئارەزووە زگماکییەکانی ئادەمیزاد و پچڕاندنی جڵەوی عەقڵ و هۆشمەندی و بێشەرمی لە هەموو شتێکی دەستەڵاتداردا خۆیان دەنوێنن.

ئەم بارە ژیانییە بە توندوتیژی لە وێژە و هونەر هەمیشە ئاوێنەی ژیانن و هەموو کاتێك لەگەڵ گۆڕانی ژیاندا دەگۆڕێن.

## • واتا و سروشتی ڕێبازی سریالیزم

زاراوەی سریالیزم لە کۆڕی ڕەخنەسازی و وێژە و هونەریدا بە واتای سەرووی واقیع و بوونەوە، واتە (مافوق الواقعیە) هاتووە.

پەیڕەویکەرەکانی ئەم ڕێبازە بڕوایان وایە، کە واقیع و بوونی هەستپێکراو و مەنتیقی و بە یاسا و دەستوور و نەریت و خووڕەوشتی کۆمەڵایەتی سنووری کێشراوە و بنیاتنراوە، بە هیچ جۆرێ واقیع و بوونی ڕاستینە نین، بەڵکوو لە دەورووبەر و سەرووی ئەم واقیع و بوونەوە، واقیع و بوونێکی ڕەسەن و ڕاستینە بە چەشنێکی زیندوو هەیە و هەمیشە دەمارەکانی بە خوێنی ژیانی حەقیقی قوڵپەدەدات. ئەم واقیع و بوونەش هەڵبەت لە عەقڵ و هۆشمەندییەوە قەوارەی خۆی نانوێنێ، بەڵکو لە ناهۆشمەندی و لاوەکی ئادەمیزادەوە لێشاودەهێنێ.

ئەم واقیع و بوونە بەلای سریالیزمەکانەوە هێزێکی دامرکاو و خنکێنراوە، کۆمەڵ بە هەموو دەسەڵاتەکانییەوە هەوڵی مردن و فەوتاندنی ئەم واقیع و بوونەی داوە، بەڵام لە هەوڵدانەکەیدا سەرنەکەوتووە، چونکە ویستوویەتی هێزێکی نەمر و ڕاستینە بە خووێکی دەستکرد، کە دەسەڵاتە یاسایی و نەریتییەکانیەتی بکوژێ.

هێزی نەمریش هەرگیزاوهەرگیز بە توانایەکی بێتوانا و دەستکرد نامرێت، بۆیە مرۆڤی ڕاستینە بە گشتی و وێژەر و هونەرمەندی ڕەسەن بەتایبەتی، پێویستە ناهۆشمەندی (لاوعی) خۆی بلەرکێنێ و بە بێترس و بە بێ چاوەڕێی پاداشت دەریببڕێ و ڕێگای هاتن بە دەنگییەوە

خۆشبکات، ئەم ئەرکانەش وێژەر و هونەرمەند هەڵبەت پێویستییەکی ژیانییە، چونکە ئەرکی دەربڕینی واقیع و بوونێکی ڕاستینەیە.

## • ئامانج و تایبەتییەکانی ڕێبازی سریالیزم

فەیلەسووفی فەرەنسی بەناوبانگ (ا. بریتۆن) پێناسەی سریالیزم بەوە دەکات، کە بزووتنەوەیەکی زاتی و خودی و دەروونییە، بەنووسینەوە یان دەماودەم یان بە هەر هۆیەکی دییەوە لە بابەتێکی سروشتی، کە لە بیر و ناهۆشمەندی ئادەمیزادەوە هەڵدەقوڵێ دوور لە دەسەڵاتدارێتی عەقڵ و یاسای کۆمەڵ.

ئەم پێناسەیە بێگومان بەوردی ئامانجی سریالیزم دەستنیشاندەکات و سروشتە بێهاوتاکەی دەخاتەڕوو. هونەرمەندی سریالیزم کە بابەتەکەی لە ناهۆشمەندییەوە وەردەگرێ، وێنەیەکی یەکگرتوو لە نێوانی ڕابردوو و ئێستا و ڕۆژگاری داهاتوودا پێشکەشدەکات. هەروەها سنووری جیاکەرەوەی عەقڵ و شێتی دەشکێنێ، چونکە ئادەمیزاد و ناهۆشمەندی تۆمارگەیەکی بە خوڕ و بەتینە، سەرچاوەکانی کارویاری زنجیرەی گۆڕان و خەملاندنی ژیانی مرۆڤایەتییە لەسەر ئەم زەوییەدا، کە دەستی ڕێکەوت و ڕووداو و گەردوون و ئاوات و ئێش و ئازار سازیکردووە.

هەروەها هونەری سریالیزم، کە خۆی بە هیچ کۆت و زنجیرێك نابەستێتەوە، هەڵبەت هەڵسوکەوتی وەها دەنوێنێ، کە بە هیچ جۆرێك لە هەڵسوکەوتی ئادەمیزادی ملکەچی یاسا و نەریتی کۆمەڵایەتی ناچێ، جگە لەمە هۆی دەربڕینیش، کە شوێنپێی چەشنە هونەرییەکان هەڵناگرێ بە خۆخنکاندن لە چوارچێوەی تەرزێکی دەربڕیندا. هەڵبەت ئاوازێکی تازە و نموونەیەکی نوێ پێشکەشدەکات، کە ئاکامی وشە و تریە و هێڵ و ڕەنگ و قەوارە و جۆرە دەربڕینەکانی تری هونەرن. سریالیزم لە ڕوانگەی هەموو لایەنەکانییەوە و لە چوارچێوەی ئەم سروشتەیدا سێ ئامانجی سەرەکی بەدیدەهێنێ:

١- ڕاکێشانی بوون و گیانی تەماشاکەر و گوێگر و خوێنەر بە هۆی تەلیسمی جادووگەرییەوە، کە بناغەکانی خوڵقاندنی پەنهانی و داهێنانی شتی سەیر و لادان لە هەموو کارێکی ناسراون.

٢- بەرپاکردنی خەونێکی هەمیشەیی بۆ چەشەوەرگرەکانی هونەر، کە لە ژێر خێوەتەکەیدا هەست بە بەختیارییەکی بێهاوتا دەکرێت و هەموو چەشنە ئێش و ئازارێك لە بیردەچێتەوە.

٣- پێکهێنانی جیهانێکی تازە و سەرسوڕهێن، کە لە چوارچێوەکەیدا، ئادەمیزاد ڕاستیی

خۆی دەدۆزێتەوە و بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕەگەزی مرڤایەتیدا دەزانێ چییە و بۆچی دەژی؟

ئەم ئامانجانەی سریالیزم بەلای سریالیزمەکانەوە دەربڕین لە ڕاستی هونەر و هۆن بۆ بەدیهێنانی ئامانجی ڕێبازەکانی وێژە و هونەر، کە تا ئێستا نەیانتوانیوە هیچ شتێك بۆ ئادەمیزادی عاشقی هونەر جێبەجێبکەن.

## ● هەڵسەنگاندنی ڕێبازی سریالیزم

لەدایکبوونی ڕێبازی سریالیزم لە هونەر و وێژەی ئەورووپیدا، هەرچەندە سەرئەنجامی چەند هۆیەکی ڕەسەنە و ناتوانرێ لە چوارچێوەی باری میللەتە ئەورووپییەکاندا بە ئاکامێکی دەستکرد و نامەشروع و ناسروشتی لەقەڵەمبدرێ، بەڵام لە هەمان کاتدا، مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی جیهانی بەیەك چاو تەماشایناکەن و لەبەر پێوانەیەکی یەکگرتوودا هەڵیناسەنگێنن. بۆیە ئەم مێژوونووسانە دوو دەستەی جیاوازن و دەستەویەخە ڕاوەستاون. دەستەیەکیان تا دەتوانن ستایشی ئەم ڕێبازە دەکەن و بڕیاری ئەوە دەدەن، کە سریالیزم هونەری ژیانە. دەستەکەی تریان بە پێچەوانەوە بڕوایان وایە، کە سریالیزم گۆڕستانی هونەرە و سریالیزمەکان جگە لە پێشێلکردنی پەیامی هونەر و تێکدانی چێژ و چەشەی بەرز و لادان لە یاسای ژیان هیچ شتێکی دیان نەکردووە. بەتایبەتی کە بە ئاشکرا لە دەستووری زمان و یاسای دەربڕین لادەدەن و هەڵچوونی شێتانە دەنوێنن و ورێنە دەنووسنەوە و وێنەی ئاڵۆزاو و شێواو تۆماردەکەن.

ئێمە ئەگەر بمانەوێ لەم کۆڕەدا بیروڕای خۆمان بچەسپێنین ڕەنگە هەر ئەوەمان پێ ڕەوابێت، کە بڵێین: ڕێبازی سریالیزم سروشتی بێت یان دەستکرد، ئاکامی کۆمەڵگایەکی ئەورووپییە، کە لە بارێکی ڕۆشنبیری و ڕامیاری و ئابووری و دەروونی تایبەت بە خۆی ژیاوە.

میللەتی ئێمە هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان بەو باردا تێنەپەڕیوە و بە چەشنێکی کوتومتیش پێیدا تێناپەڕێ، سەرئەنجام پێویستە ڕەخنەسازانمان لاساییکردنەوەی ئەم ڕێبازە مەحکوم بکەن، ئەگەر هاتوو لە وێژەر و هونەرمەندێکمانەوە وەشایەوە و ڕۆشنبیریمان باوەشی بۆ کردەوە.

هەروەکوو لەمەوبەر دیتمان شوێنەوارەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیی لە ئێش و ئازاری مرۆڤ و بڵاوبوونەوەی هەژاری و ستەمکاری زەمینەی لەدایکبوونی ڕێبازی سریالیزم بوو. هەروەها شوێنەوارەکانی شەڕی دووەمی جیهانیی، دەرفەتی بیری و ئابووری و ڕامیاری بووە هۆی پەیدابوونی ڕێبازی وجوودی و لەدایکبوونی.

ئەم شوێنەوارانە هەروەکوو زانراوە لەبەر توندوتیژی فراوانی شەڕی دووەمی جیهانیی لە شوێنەوارەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیی سامناکتر و زیانبەخشتر بوو، مرۆڤی ئەورووپی بەدەم لافاوی ئێش و ئازارەکانییەوە تا بڵێیت لە هەموو پەیوەندییەکی ئایینی و کۆمەڵایەتی پچڕا و خۆی لە ناو شەپۆلی بێبنی خودێتی و دوودڵی و بێبەزەیی و نائومێدیدا نقومکرد.

ئەم بارەی ژیانی مرۆڤی ئەورووپی، سەرئەنجامەکەی بوو بە هۆی پەیدابوونی ڕووگە و ئیتیجاهاتی کەسیی جۆربەجۆر، هەموویان لە ژێر ناوی وجوودییەت کۆدەبوونەوە.

ڕێبازی وجوودیەت لە ڕێبازە بیری و هونەرییەکانی دیکەی ئەورووپییە، بەوە تایبەتییەکانی

چەسپاندووە، کە لە ساڵی چلەکانەوە بوو بە تەرز و ڕەنگی هەموو چینە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆڕی فەیلەسووف و ڕووناکبیرەکاندا پەنگی نەخواردەوە.

سەرئەنجامی ئەم بڵاوبوونەوە بەرینەی ڕێبازی وجوودییەت ئەوەیە، ڕێبازەکەی بە چەشنێکی جۆربەجۆر لێکدراوەتەوە و هەر دەستەیەك لە تێڕوانینی خۆیەوە ڕاڤە و تەفسیریکردووە و بە هەوەسی خۆی ئامانجەکانی دەستنیشانکردووە.

مێژوونووسەکانی فەلسەفەی ئەورووپی تێبینیدەکەن کە وجوودییەت با فەلسەفەش بێت، بەڵام ئەم فەلسەفەیە یەکگرتوو نییە و لە دەستەیەکەوە بۆ دەستەیەکی دی، لە چینێکەوە بۆ چینێکی دی، ناوەڕۆك و ڕوخسارەکەی دەگۆڕێ.

## • چەمک و واتای وجوودی

کورد زاراوەی وجوودی بە زاراوەی بوونیەتی لە عەرەبییەوە وشە بە وشە وەرگێڕاوەتە سەر زمانەکەی. هەروەها عەرەبیش، زاراوەی ئیگزستینس existence ی ئەورووپی کردووە بە (الوجودی).

ئەم زاراوەیە لە فەلسەفەدا ڕووگەیەکی (ئیتیجاهێکی) ئایدۆلۆجی دژواری (الماهیە) ی عەرەبییە. دووبارە وەرگێڕانی زاراوەی (ئیسینس essence)ی ئەورووپی، وشەی چۆنێتی واتاکەی دەگەیەنێ.

لە فەلسەفەی کلاسیزمدا، بە تایبەتی لە سەردەمی ئەفلاتوونەوە بیروڕا وایە، کە وجوودییەت ڕەنگدانەوەی ماهیەتە و چۆنێتی و هەموو شتێکی هەستپێکراوی ماددی و مەعنەوی لە بوون و وجووددا دوابەدوای چۆنیەتی و (ماهیە) هاتۆتەکایەوە یاخود وەکوو فەیلەسووفە کلاسیزم و میتافیزیکییەکان دەڵێن: ماهیەت و چۆنێتی پێش (الوجود) و(بوون) دێت.

بۆ نموونە هەموو ئەندامەکانی ڕەگەزی مرۆڤ لە کورد و عەرەب و ئەورووپی، لە سپی و ڕەش و زەردپێست لە جیهاندا بەرلەوەی بخوڵقێن ماهیەت و چۆنییەتییەکەیان خوڵقێنراوە، کە لە گەوهەر و تایبەتییە بەرزەکانی ئەم ڕەگەزە گیاندارە پێکهاتووە.

جیاوازیی ئەندامانی ڕەگەزی مرۆڤ، کە بە ڕواڵەت هەستپێدەکرێ، لە ڕێنەی ماهیەت و چۆنێتی ڕەگەزی مرۆڤەوە نییە، بەڵکوو سەرئەنجامی چەند هۆیەکی کاتی و ژینگەییە.

بەرامبەر ئەم بیروڕایەی فەلسەفەی کلاسیزم و میتافیزیکی، بیروباوەڕی فەلسەفەی وجوودییەت و بوونیەتی دەستەویەخە ڕادەوەستێ، چونکە ئەم فەلسەفەیە کە هەروەها بە

فەلسەفەی فیزیکی ناودەبرێ بڕیاردەدات، کە بوون و وجوود بەر لە ماهیەت و چۆنێتی دێت، بوونیەت شتێکی ڕەسەن و سەرچاوەییە و ماهییەت و چۆنێتی ڕەنگدانەوەی بوونیەتی و وجوودییەتە، بەڵکوو ماهییەت و چۆنێتی بەلای هەندێ لە فەیلەسووفە مادی فیزیکییەکانەوە قەوارە و کیانێکی تایبەتی نییە، بگرە ڕەنگێکە لە ڕەنگەکانی بوون و وجوود و بەهۆی گۆڕانی چەندێتی بوونەوە دێتەکایەوە.

## • بناغە و سەرئەنجامەکانی فەلسەفەی بوونیەتی

فەلسەفەی بوونیەتی (الوجودیە) کە ئینکاری بنەڕەتی و لە پێشەوەهاتنی چۆنیەتی و (ماهییەت) دەکات، هەڵبەت پشت بە بناغەی ماددە و قەوارەی جیهانی هەستپێکراو دەبەستێ. بۆیە فەیلەسووفە پەیڕەویکەرەکانی لە کەسایەتی خۆیانەوە بیر لە هەموو شتێك دەکەنەوە و بیرکردنەوەکەشیان دەکەن بە بەڵگەی بوون و وجوودیان و تاقە حەقیقەت و ڕاستینە بەلایانەوە بوون و وجوود و بیرکردنەوەی خودی و زاتیانە.

سەرئەنجام لەم ڕوانگەیەوە دروشمی ئەم فەیلەسووفانە دەربڕینی (کۆجیتۆ)ی دیکارتییە. (کۆجیتۆ)کەی دیکارتیش زاراوەیەکی لاتینییە، واتاکەی ئەو ڕستەیەیە، کە دەڵێ: من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم.

سەرئەنجامەکانی ئەم فەلسەفەیە سەبارەت بە هەموو شتێکی مەعنەوی و واتایی ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** لە دەرەوەی سنووری بوون و پێش هاتنەکایەوەی ئەم بوونە هیچ شتێکی دی نییە و نەبووە و نابێت.

**دووەم:** خوو و ڕەوشت و نەریت و هەموو شتێکی دی، ڕەوشتی سامانی بوون و قەوارەیەکی ڕاستینەی نییە، بەڵکو ئەمانە هەموویان نرخێکی کاتییان هەبووە و ئاکامی ترس و دەسەڵاتداریتی و زەلیلی ئادەمیزادن، کە لە دێرینترین سەردەمەوە هەتا ئەمڕۆ بارێکی قورسن بەسەر شانییەوە.

**سێیەم:** هەموو شتێکی واتایی و مەعنەوی لە کۆمەڵدا ڕاددەمی و نسبییە. پێوانەش بۆ هەڵسەنگاندنی نرخیان قازانجی تایبەتی ئادەمیزادە، نەك وەکوو ڕەگەزێك یان ئەندامێك لە کۆمەڵێکدا، بەڵکوو وەك کەسێکی سەربەخۆ، کە ئارەزووی زگماکی و بەرژەوەندی خۆی هەیە.

**چوارەم:** تاقە ئەرکی سەرشانی ئادەمیزاد، هەر تەحقیقی بوونی خۆیەتی و پێویستە هەر بۆ هاتن بە دەنگی بەرژەوەندی خۆیەوە بۆ کاتێکی دەستنیشانکراو تێبکۆشێ.

ئەم سەرئەنجامانە، بێگومان بەرادەی یەکەم ناکامی نەخۆشییەکانی کۆمەڵگای ئەوروپییە، کە هەروەکوو لەمەوبەر وتمان دوابەدوای شەڕی دووەمی جیهانی کەوتە ژێر باری گرانی شوێنەوارەکانی ئەم جەنگە دڕندەیە و هەموو شتێکی مەعنەوی و بنەڕەتی خود و ڕەوشتی لە کیس خۆی دا و شیرازەکانی خۆی پچڕاند، ئەوجا ملکەچی فەلسەفەی جۆربەجۆر بوو، کە هەرە سامناکترینیان فەلسەفەی بوونیەتی. جگە لە سەرچاوەی شەڕی دووەمی جیهانیی بۆ فەلسەفەی بوونیەتی سروشت و چۆنیەتی ڕۆشنبیریی ئەوروپییە کە لە بناغەدا لەسەر فەلسەفەی دێرینی ئەغریقی و ڕۆمانی و داستانی و بتپەرستیدا بنیاتنراوە.

ئەم فەلسەفە دێرینەی ئەغریقی و ڕۆمانییە لە سەرەتاوە بوونی لە جیهانی ئایدیالزم و میسالییەت جیاکردۆتەوە و لە نێوانیاندا زۆرانبازییەکی بەرپاکردووە و پلەی یەکەمی بە جیهانی هەستپێنەکراو بەخشیوە و جیهانی هەستپێکراوی بە پلەی دووەم داناوە و بڕیاریداوە، کە ئەم جیهانە هەستپێکراوە و لە سەرووی هەموو دیاردەکانییەوە ئادەمیزاد خۆی شتێکی دەستکرد و گومانلێکراوە. هەروەها بڕیاریداوە، کە هەموو چەشنەکانی هونەر سێبەر و درۆن.

سەرئەنجام بەلای ئێمەوە فەلسەفەی بوونیەت و وجودییەت، وەکوو هەڵوێستێکی کاردانەوە کەوتە شەڕی وەڵامدانەوەی فەلسەفەی میتافیزیکی و ئایدیالیزمی، بەشدارییەکی بێوچانی ڕووخاندنی بیروباوەڕ و بنەڕەتییەکانی مرۆڤایەتی کرد.

## • خود و ڕەوشت و ژیان

پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی بوونیەتی (وجودی)، کە پشتیانکردۆتە خود و ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵایەتی، بێگومان شوێنپێی فەیلەسووفە فیزیکییەکانی سەدەی هەژدەم و بیستەمی زایینییان هەڵگرتووە.

مێژووی فەلسەفەی ئەوروپی لەم ڕووەوە دەیگێڕێتەوە، کە فەلسەفەی ماددی ئەو دوو سەدەیە بیروباوەڕی وا بووە، کە خود و ڕەوشت، داستان و پڕوپووچە و هیچ بناغەیەکی زانستی نییە و بێتوانا و بێدەسەڵاتەکان دایانهێناوە بۆ ئەوەی خۆیان لە بەهێز و دەسەڵاتدارەکان بپارێزن.

شۆپنهاوەر، کە یەکێکە لەو فەیلەسووفانە بە جۆرێکی بنەڕەتی بەشداری ڕووخاندنی خود و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی کرد و وەڵامی ئەو پرسیارە نەمرەی سەبارەت بە ئامانج لە ژیاندا بەوە دایەوە، کە ئامانجی ژیان ویستەمەنی ژیانە، بە مانای ئەوەی ئادەمیزاد هەر بۆ ژیان دەژی.

نیچە، کە دوابەدوای شوپنهاوەر هات لە سەر هەمان ڕێچکە خێراتر هەنگاوینا و بڕیاریدا،

کە ئامانجی ژیان ویستەنی هێز و توانایە و ژیان هەر دەبێت دەستکەوتی ئادەمیزادی بەتوانا و بەهێز بێت و مرۆڤی بێهێز و لاواز نابێت بژی و نابێت خوو و ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵایەتی بکات بە قەڵغانی پاراستنی.

بەم جۆرە ویستەنی هێز لە لای فەیلەسووفە هاوچەرخەکان بوو بە دەستوری ژیان تەنانەت (ئۆنانمیر)ی فەیلەسووفی ئیسپانی بەناوبانگ لای وایە دەستووری ویستەنی هێز تاقە دەستووری پیرۆز و موقەدەسە.

## • ڕێبازی وجوودی و ئازادیی کەسیی

فەیلەسووفە وجوودییەکان لەم کۆڕە سامناکەی هەستپەرستن، ئامانجی ژیانیان بەوە دابینکرد، کە هێنانەدی و جێبەجێکردنی بوونی ئادەمیزادە. بە مانای ئەوەی ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەوییە دەژی بۆ ئەوەی بێت بەدەنگی وجوود و بوونی تایبەتی خۆی و هەرچییەکی دەیەوێ لە سەربەستی و سەرفرازی و ئازادی وەدەستبهێنێ. ئازادیی کەسیی بەلای فەیلەسووفە وجوودییەکانەوە مانای ژیانە و تاقە هۆی قایلبوونە بە بەردەوامبوونی ژیانی مرۆڤ.

ئەم ئامانجەی وجوودییەکان لە ژیاندا هەڵبەت مەبەستێکی بیردۆزەیی و ئایدیالیزمی نییە، بەڵکوو خۆی لە خۆیدا هۆیەکە بۆ تەحقیقی ئارەزووی زگماکی و ژیانی ئادەمیزاد، چونکە فەلسەفەی بوونیەتی هەروەکوو وتمان یەك لایەن لە ژیان بە شتێکی ڕاستینە دادەنێ، ئەم لایەنەش هەڵبەت ژیانێکی کاتییە.

ڕاستە، کە فەلسەفەی وجوودی بیروباوەڕی بەوە هەیە، کە ئادەمیزادی ئەندام لە کۆمەڵێکدا دەژی و ئامانجی بەندە بە ئامانجی گشت ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵە و پێویستە لەبەر تیشکی ئەم پەیوەندییەدا چەشنە هاوکارییەك لە نێوانی ئەو ئەندامانەدا هەبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێت بزانین، کە ئامانجی ئادەمیزادی یەك تەن هێزێکی بنەڕەتییە و خاوەنەکەی بۆ جێبەجێکردنیان دەژی. کەوابوو لە چوارچێوەی کۆمەڵدا دەنگی بەرز کەسایەتی ئادەمیزادە و ڕەنگی جیاکەرەوەی هەر ڕەنگی ئەم ئادەمیزادەیە.

## • پەیامداری لە وێژە و ڕەخنەسازیی وجوودیدا

کە هەموو شتێك لە ڕوانگەی فەلسەفەی وجوودییەوە ئامانج و هۆ بێت، هەڵبەت وێژەش لە هەمان ڕوانگەوە تەماشادەکرێت و هەڵدەسەنگێنرێت. بۆیە وێژە لە ڕەخنەسازیی وجوودیدا بۆ

وێژە نییە، بەڵکوو هۆیەکە بە دەستی وێژەرەوە بۆ ڕواندنی کەسایەتی و بوونی و جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی.

ئەم ڕاستییە، بێگومان ئەوە دەگەیەنێ، کە ڕەخنەسازە وجوودییەکان وەکوو ڕەخنەسازە ڕیالیزمییەکان دروشمی پەیامداری و ئیلتیزامیان لە وێژەدا هەڵگرتووە.

هەرچەندە دەبێت بزانین، کە لە نێوانی پەیامداری ڕیالیزمی و پەیامداری وجوودییەت جیاوازی سەرەکی هەیە، ئەم جیاوازییەش ئەوەیە پەیامداری وێژەری ڕیالیزمی بۆ میللەت و بۆ کۆمەڵە نەك بۆ کەسایەتیی وێژەر، بەڵام پەیامداری وێژەری وجوودی بۆ کەسایەتیی وێژەر و بۆ نواندنی ئامانجەکانی خۆیەتی.

هەرچۆنێك بێت ڕەخنەسازیی وجوودی، کە ئەو چەشنە دروشمەی هەڵگرتووە، لە کۆڕی پەیامداریدا دووپاتیکردۆتەوە، کە نابێت وێژەر لەبەر ناوەڕۆکی وێژەکەی لایەنی هونەری فەرامۆشبکات، سەرئەنجام ئەم ڕەخنەسازە چەند تایبەتییەکی بۆ وێژەی پەیامداری تازە دەستنیشانکردووە، کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** وێژە دەبێت لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بە ئەوپەڕی سەربەستی و ئازادییەوە ئاوێنەی هەست و بیروباوەڕی وێژەر بێت، وێژەریش بەبێ ملکەچکردن بۆ هیچ نەریت و یاسایەك ڕاستەوخۆ بڕوای بە هەرچی هەیە دەرببڕێت.

**دووەم:** ڕاستگۆیی و ئازایەتی دەبێت تاقە ڕێگای وێژەر بێت. بەمانای ئەوەی وێژەر پێویستە لەبەر هیچ هۆیەك لە نووسینەوەدا درۆنەکات و بە بێ پێچوپەنا هەرچی هەیە دەرببڕێ.

**سێیەم:** نیشانە و ڕەمز، داستان باشترین شێوازە بۆ ڕازاندنەوەی شێوازی وێژە، بە مەرجێك ئەم هۆیانەی دەربڕین نەبێت بە ئامانجی وێژەر، بەڵکو دەبێت وەکوو هۆ تەماشابکرێت.

## • بەراوردکارییەك لەنێوانی پەیامداریی وجوودییەت و پەیامداری لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا

هەروەکوو لەمەوبەر وتمان ڕۆشنبیریی ئەورووپی و هەموو ئاکامەکانی سەرئەنجامی دەرفەتێکی مێژوویی و ماددی تایبەتییە، بۆیە توێژەری ڕاستینە ناتوانێت هیچ پەیوەندییەکی ڕەسەن لە نێوانی عەرەبی و ئیسلامی بەدیبکات، بەڵام لە هەمان کاتدا پێوستە سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشین، کە ئەم پەیامدارییەی ڕێبازی وجوودی لە وێژەدا بیرۆکەیەکی جیاوازە

لە بانگەوازی پەیامداریی ڕەخنەسازیی عەرەبی، چونکە پەیامداریی ڕەخنەسازیی عەرەبی بەرپرسیارێتی و پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە و بناغەکانی عەقیدە و بڕوا و چاکەکردن، خەبات و تێکۆشان و ڕاپەڕین دژ بە هەموو ستەمکارییەك و دروشمەکەی بۆ بنیاتنانی کۆمەڵێکی نوێ بەرزکرابووەوە، کەچی پەیامداری لە تێڕوانینی ڕێبازی وجوودییەوە داواکارییەکی کەسییە بۆ هێنانەدی ئامانجێکی کەسی، کە یاخیبوونە لە هەموو نەریت و بنەڕەتێکی گشتی و پێشێلکردنی ڕابردوو و گوێنەدان بە داهاتوو.

بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین، کە مێژوونووسەکان ئەم تایبەتییانەی وێژەی وجوودی و ڕێبازە ڕەخنەسازییەکەی بە پەیامداری و ئیلتیزام لەقەڵەمدەدەن، بە هیچ ڕەنگێ لەم کارەدا ورد و زانستی نین، بگرە بە ئاشکرا لە مانا و چەمکی زاراوەی پەیامداری لایانداوە.

هەرچۆنێك بێت، ڕەنگە پاش ئەم گەشتە لەگەڵ ڕێبازە ڕەخنەسازییە ئەوروپییەکاندا، وەکوو ئێمە بڕوا بەوە بهێنین، کە ئەم ڕێبازانە سەربە وێژەی ئەورووپیین و ڕەگوڕیشەیان لە بارەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونی و ڕامیاریی میللەتە ئەورووپییەکاندا داکوتاوە و خواردەمەنی و ئاوهەوایان لە ژینگەی شارستانێتیی ئەغریقی و ڕۆمانییەوە وەرگرتووە، کە لە ژێر سێبەری بتپەرستی و داستاندا گەشەیکردووە. هەروەها هەر زاراوەیەك لە زاراوە ڕەخنەسازییەکانی ئەو ڕێبازانە وەکوو کلاسیزم و ڕیالیزم و ڕۆمانیزم و پەرناسی و سریالیزم و .. تاد، مانا و چەمکێکی دەستنیشانکراو و سنووردارییان هەیە و زۆر بە هەڵەدادەچین ئەگەر هاتوو ئەم زاراوانە دوور لە مەبەست و چەمکەکانیانەوە لە ڕەخنەسازیماندا بەکارهێنران.

ڕاستە، کە میللەتان لە زۆر ڕووەوە لەیەکدەچن، بەڵام ئەم لەیەکچوونە ڕەنگ و شەقڵێکی گشتییە و ناتوانێت تایبەتی گیانی و ویژدانی و سۆزی و ئەندێشەی ئەو میللەتانە بسڕێتەوە و لە بۆتەیەکدا بیانتوێنێتەوە، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو ئەو میللەتانە لە ڕووی ئایین و نەریت و باری ئابووری و ڕامیارییەوە یەکنەبوون.

لەمەوبەر بە وردی لە ڕێبازە ڕەخنەسازییە ئەورووپییەکانمان کۆڵییەوە و تایبەتییەکانی هەر ڕێبازێکمان خستەبەرچاو و بە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن گەیشتینە بیروڕایەکی دەستنیشانکراو دەربارەی هەریەکەیان. ئەم ڕێبازانە ئاکامی دەرفەتێکی ئابووری و ڕوحی و ڕامیاری تایبەت بە میللەتە ئەورووپییەکانن، بۆیە نابێت ڕەخنەسازە ڕۆژهەڵاتی و نائەورووپییەکان بە گشتی و ڕەخنەسازە کوردەکان بەتایبەتی لاسایی ئەو ڕێبازانە بکەنەوە و بە زۆرەملێ بیانسەپێنن بەسەر وێژەوە نەتەوایەتییەکانیاندا، چونکە ئەم وێژەرانە لە دەرفەتێکی جیاوازدا دەژین و ڕابردووی ڕۆشنبیری و ڕوحییان جیاوازە. هەروەها بۆ ئامانجێکی تایبەتی جیاواز دەنووسنەوە.

ئێمە لە ڕوانگەیەکی ئایدۆلۆژییەوە بڕوامان بەم بیروڕایە هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا بڕوامان وایە، کە نابێت دەرگا لەسەر خۆمان داخەین و چاومان لە ئاستی هەموو شتێکی بێگانە بنوقێنین، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێویستە بە هوشیاریی خۆمان لە تاقیکردنەوەی میللەتان بێبەش نەکەین.

سەرئەنجام بۆ ئەم مەبەست و نیازە لە سەر ناسینی ڕەخنەسازیی ئەورووپی بەردەوام دەبین و لەگەڵ بەرهەمی ڕەخنەسازە شاسوارە ئەورووپییەکاندا دەڕۆین و لە هەندێکیان دەدوێین.

## • یەکەم: ڕەخنەسازی ئینگلیزی ولیەم وردس ورث

ولیەم وردس ورث هەروەکوو زانراوە بەر لەوەی زانا و ڕەخنەساز بێت، هەستیاربووە، بەڵام ئەم هەستیارە لە جیهانی هۆنراوەی ئینگلیزیدا لە ڕووی بابەت و دەربڕین و بنیاتنانی هەڵبەستەوە شۆڕشێکی هونەری بەرپاکردووە و بەرهەمی تازەی داهێناوە.

ئەم کارە نایابەی وردسورث لە دیوانێکدا لە ساڵی ١٨٠٠ی زایینی کە بە ناوی هۆرەکانی ستران (الترانیم الغنائیه) وە چاپکەیاندووە.

ولیەم وردسورث بەر لەوەی ئەم دیوانە لە چاپبدات هەستیدەکرد، کە هەڵبەستەکانی تازەن و خوێنەواران چەشە و چێژی لێوەرنا گرن. نەك ئەمە و بەس، بەڵکوو زیاتر هەستیدەکرد، کە تەنانەت پسپۆڕەکان و شارەزاکانی مێژووی هۆنراوەی ئینگلیزیش بە ئاسانی لە کارەکەی ناگەن و پێی قایلنابن، چونکە دەیزانی ڕێگایەکی هونەری وای هەڵبژاردووە بە هیچ ڕەنگێ لە تەك ڕێگای هەستیارە بەناوبانگەکان یەکنا گرنەوە، وەکوو: کاتلس و تیرنیس و لوکریتیاس هەروەها ستاتیوس و کلودیان و شکسپیر و بومنت و درایدن و بوب، کە لە دێرینترین سەردەمەوە هەستی خوێنەرانیان داگیرکردووە و بە چەشنێکی هونەریی جیاواز ڕایانهێناون و بەئاسانی تاقیکردنەوەی تازە وەرنا گرن.

ئەوجا لەبەر ئەم هۆیە سەرەکییە ڕەخنەسازەکەمان لەسەرەتای چاپی یەکەمی دیوانەکەیدا تێبینییەڕەخنەسازییەکانی نووسییەوە.

هەروەها لە ساڵی ١٨٠٢ی زایینی، کە دیسانەوە دیوانەکەی لە چاپدایەوە دەستکاری ئەو تێبینییانەی کردن و بە چەشنی پاشکۆیەك لە چاپیدان. ئەم پاشکۆیە بەڕاستی لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەسازی ورد و زانستییە. هەرچەند لە بناغەدا وەکوو بەرگرییەك لە ڕێبازە هونەرییەکەی نووسیویەتییەوە، چونکە ئەم بەرگرییە چەند بابەتێکی ڕەخنەسازیی گرنگ شیدەکاتەوە، وەکوو مەسەلەی هەستیار و بابەتەکانی و تەنگوچەڵەمەی زمان و دەربڕین و بابەتی کێش و قافیە و ئامانجی نووسینەوەی هۆنراوە و مەسەلەی پەیوەندی هۆشمەندی بە سۆز و هەڵچوون و جیاوازی لە نێوان پەخشان و هۆنراوەدا و ئەرکی ڕەخنەساز لە تازەکردنەوەی وێژە و دەیان بابەتی دیکەی گرنگ.

## • چەمک و واتای هۆنراوە

مێژووی هۆنراوەی ئینگلیزی هەرچەندە لە ڕووی دەستپێکردنەوە لە سەدەی چواردەهەمی زایینیدا کۆنتر نییە، بەڵام پاش هەستیاری دامەزرێنەری ئەم هۆنراوەیە (چۆسەر) ڕێگای بابەتی کلاسیزمی گرتەبەر و هەستیارەکان خۆیان لەگەڵ بیرۆکەی فەلسەفی و هۆشمەندی ئایدیالیزمیدا خەریککرد.

سەرئەنجام ناوەڕۆکی هۆنراوەی نموونەیی بە لای زۆربەی هەستیارە ئینگلیزییەکانەوە دەبوو ئاوێنەی بابەتی بەرزی دوور لە ژیانی ڕۆژانە بێت.

وردسورث لە تێبینییە ڕەخنەسازییەکانیدا بە توندی بەرەنگاری ئەم دۆخەی هۆنراوەی نەتەوەکەی بووە و چالاکانە بەریەرچیدایەوە و چەمك و واتایەکی تازەی بۆ هۆنراوە چەسپاند و وتی: هۆنراوەی ڕاستینە پێویستە ناوەڕۆکەکەی لە سەر بناغەی هەڵبژاردنی بار و ڕووداوی ئاسایی لە ژیانی جەماوەردا دامەزرابێت.

ئەوجا پیاهەڵدان و گێڕانەوەی ئەم ڕووداو و بارە بە زمانی ئادەمیزادی ساکار لەگەڵ چەشنێك لە ئەندێشەدا، بۆ ئەوەی بۆ عەقڵ و هۆشمەندی شتی ئاسایی لە وێنەی نائاساییدا بنوێنین.

سەرەڕای ئەمە و لەمە گرنگتر ئەو ڕووداو و بارە ئاساییانەیە بە جۆرێك پێشکەشبکرێن، کە سەرنجڕابکێشن و هەستی خوێنەرەکانیان داگیربکەن. ئەمەش هەڵبەت بە پەیڕەویکردنی یاسای ژیانی بێگەرد و ساکارمان دەبێت، کە لە هەموو کردەوە و ڕەفتارێکی دەستکرد و دروستکراوەوە دوورە.

ولیەم وردسورث بەم جۆرە ناوەڕۆك و بابەتی هۆنراوە دەستنیشاندەکات، بێگومان نایەوێ بڕیاری ئەوە بدات، کە دەبێت کەرەسەی بیرۆکە و واتاکانی بەر لە هەموو شتێ ئامادەبکات، چونکە لەسەر هەمان باس بەردەوامدەبێت و دەڵێ:

هەستیار لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا، نابێت ئامانجێکی دەستنیشانکراو بۆ خۆی بچەسپێنێ، بەڵکو دەبێت بە بێپلان و ڕێباز تێبفکرێت و لە ناخی دەروونی وردبێتەوە، ئەوجا ملکەچی لێشاوی هەست و شعوری خۆی ببێت و هەرچی بە دڵ و ویژدانیدا هات، بە بێدەستکاری ڕوونووسیبکات.

وردسورث لەم بیروڕایەدا هەڵبەت نایەوێ بڵێت ئاکامی ئەم هەڵوێستەی هەستیار، کارێکی نارێك و ئاڵۆزی دەبێت، چونکە کارەکە بە بێپلان و ڕێباز ئەنجامدراوە.

بەڵکوو بەپێچەوانە بڕیاری ئەوە دەدات، کە بەرهەمی ئەو چەشنە نووسینەوەی هۆنراوە تا بڵێیت ڕێکوپێك و هەڵبەستراو دەبێت. جا ئەگەر لێی بێینە پێشەوە و بپرسین: چۆن کاری بێنەخشە (پلان) و ڕێباز ڕێکوپێك و هەڵبەستراو دەبێت؟ لە وەڵامدا دەڵێت: چونکە سەرچاوەی هۆنراوە، ئەگەر هاتوو تێفکرین و وردبوونەوە و تەئەمول بوو، هەڵبەت بەرهەمەکەی وەکوو سەرچاوەکەی ڕێکخراو و باش دەبێت، یاخود بەمانایەکی تر هەستیار لە تێڕوانینی ناوبراوەوە وەکوو پیشەساز و ئەندازیار پێویستی بە نەخشە و ئامانجی دەستنیشانکراو نییە، بۆ ئەوەی بەگوێرەی داواکاری شمەك دروستبکا، بەڵکوو پێویستی بە پیاچوونەوە و تاقیکردنەوە و خودی ژیانی لە ڕۆژانە هەیە، کە بەرهەمەکەی وەکوو یاسای ئەم ژیانە مەنتیقی و ساکار و ڕێکوپێکە.

ڕەخنەسازەکەمان لە لایەنێکی دی ئەم چەمکەی هۆنراوە، بیروڕاکەی ڕووندەکاتەوە و دەڵێ: بیرۆکەکانمان سەرچاوەی سۆز و هەستی بوێژەکانمانن، یاخود با بڵێین بیرۆکە و عەقڵ و سۆز و هەست، وەکوو هەر دوو ڕووەکەی سکەی پارەن لە یەکتر جودانابنەوە، ئەگەر هاتوو هەستیار خۆی لەسەر بیرکردنەوە و تێفکرین و وردبوونەوەی ڕێکوپێك ڕاهێنا و مەشقیکرد، سروشتیانە هۆی ئەنجامدانی سۆز و هەستی ئاڵۆز و بێگەرد وەدەستدەهێنێ.

سەرئەنجام چەمکی هۆنراوە بە لای ئەم ڕەخنەسازەوە عەقڵ و هۆشمەندییەکی پەتی نییە، هەروەها سۆز و هەستێکی بەتەنیا نییە، بەڵکوو کارێکی دوو لایەنییە لە یەکێتییەکی سروشتی و بەیەکداچوونێکی بێگەرد لەنێوانی بیرکردنەوە و سۆزدا ئەنجامدەدرێ.

## • هۆشمەندی و هەڵچوون لە کۆڕی هۆنراوەدا

وردس ورث کە بەم چەشنە پەیوەندیی ئەندامی لە نێوان بیرکردنەوە و سۆزدا بنیاتدەنێ، بەرەنگاری مەسەلەیەکی فەلسەفی و دەروونی و نۆشداری، سەبارەت بە بابەتی هۆشمەندی و سۆز دەبێتەوە: ئایا کۆڕی هۆشمەندی و عەقڵ هیچ بەیەکداچوونێکی لەتەك هەڵچوون - انفعال - دا هەیە؟ یاخود لەنێوانیاندا شوورەیەکی پۆڵایین بنیاتنراوە؟

ئەم ڕەخنەسازە هەستیارە لە ئاستی ئەم پرسیارەدا دووپاتیدەکاتەوە، کە هۆشمەندیی و عەقڵی مرۆڤ دوورگەیەکی بەردین نییە، بەڵکوو ئەگەر هاتوو خاوەنەکەی هەستیار بوو کێوێکی ئاگرین لە هەڵچوون و سۆزی بەتین ئەو شوورە پۆڵایینە وەك پووش دەسووتێنێ، کە هەندێ توێژەر و پسپۆڕ لەم کۆڕەدا بنیاتیدەنێن.

ئەم بیروڕایەی وردسورث هەڵبەت سەرئەنجامێکی تازە لە مەسەلەی دابەشکردنی وزە

بەسەر هۆنراوە و پەخشاندا بەدەستەوە دەدا و بیردۆزێکی بێهاوتا لە بابەتی سروشتی زمانی هونەری دەخاتەڕوو.

## ● جیاوازی لەنێوانی هۆنراوە و پەخشاندا

لە مێژووی وێژە جیهانییەکاندا، پرسیارێکی گرنگ بەرپادەکرێ و دەپرسرێ: کە وێژە دوو چەشنی سەرەکی هەبێت، هۆنراوە و پەخشان، کام چەشنیان لەوی تریان کۆنترە؟ ئایا هۆنراوە بەر لە پەخشان لەدایکبووە یان پەخشان لە پێش هۆنراوەدا، مرۆڤ دایهێناوە؟

پسپۆڕ و توێژەرەوەکان لەبەرامبەر ئەم پرسیارە، بیرورایان یەك نییە، بەڵام ئەوەی لەم دواییەدا بە بەڵگە و سۆراخی مێژوویی و دەق و لێکۆڵینەوەی زانستی بۆیان ساغبۆتەوە و چەسپاوە، ئەوەیە کە هۆنراوە بەر لە پەخشان لە لای هەموو نەتەوەکانی ئەم سەر زەوییە لەدایکبووە، چونکە هۆنراوە زمانی هەڵچوون و سۆزە و لەسەردەمی هەنگاوهەڵگرتنی میللەتان لە باری کۆچەری و نائاسایی و دوور لە شارستانێتی و بەرەو شارستانێتی پەرەیسەندووە و کەوتۆتە گەڕ، کەچی پەخشان بەپێچەوانەوە زمانی عەقڵ و هۆشمەندییە و هۆی دەربڕینی میللەتانە لە قۆناغی شارستانیی زانستیدا.

ئەم بیرورایە سەبارەت بە کات و سروشتی سەردەمی لەدایکبوونی هۆنراوە و پەخشان، چەند جیاوازییەکی گرنگ لە نێوانی ئەم دوو چەشنەی وێژەدا دەچەسپێنێ، کە گرنگەکانیان ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم:** هۆنراوە لەبەرئەوەی زمانی سۆز و هەڵچوونە، بە کێش و قافیە و ترپەی دەربڕینەکانی و ئاوازی وشەکانی قەوارەی تایبەتی خۆی پێکدەهێنێ، پەخشانیش چونکە ئاوێنەی عەقڵ و هۆشمەندییە و ئامرازی دەربڕینی بیرکردنەوەی هێمنی و لەسەرخۆییە، پێویستی بە غەڵبەغەڵب و دەنگەدەنگی شوێنەوارە سۆزی و هەڵچوونەکان نییە.

**دووەم:** زمانی هۆنراوە لەبەر سروشتی بابەت و سەردەمەکەی، خۆی بە وێنەی هونەری لێکچوواندن و خوازە و خواستە و درکە و جۆرەکانی دی ڕەوانبێژی دەڕازێنێتەوە، چونکە ئەم وێنانە بۆ هەستیار لە خۆیاندا ئامانج و مەبەستن، بەڵام زمانی پەخشان لەبەرئەوەی ئامانج و مەبەستی گەیاندنی بیرۆکە و چەسپاندنی بیرورایە بەهیچ جۆرێك پێویستی بە ڕازاندنەوەی وشە نییە، چونکە ڕەنگە ئەم ڕازاندنەوەیە ببێت بەهۆی جێبەجێنەکردنی ئامانج و مەبەستی نووسەری خاوەن پەیام و بیروباوەڕ.

## • وردسورث و یەکێتیی هۆنراوە و پەخشان

وردسورث کە دووپاتیکردۆتەوە، عەقڵی نووسەر و هەڵچوونی لەیەکجوداناکرێنەوە، دەڵێت: زمانی هۆنراوە و زمانی پەخشان نابێ بە هیچ تایبەتییەکی ڕەوانبێژی و هونەری لەیەکتر دووربخرێنەوە، جگە لە کێش کە بە جۆرێکی ڕێکوپێك لە هۆنراوەدا پەیڕەویدەکرێت و بە ڕوونی بەرگوێدەکەوێ، بەڵام وێنەی هونەری نابێت بە هیچ جۆرێك بە تایبەتییەکی جیاکەرەوەی دارشتنی هەڵبەست لە شێوازی پارچە پەخشان دابنرێ.

بەڵگەکانی ئەم ڕەخنەسازە هەستیارە ڕەنگاوڕەنگ و جۆربەجۆرن، تەنانەت دەقی هۆنراوەی باش، بگرە نموونەی بەرز لە هەموو سەردەمە وێژەییەکان دەهێنێتەوە و سەرنج بۆ هەستیاری پایەبەرزی ئینگلیز (ملتۆن) ڕادەکێشێ و دەڵێ: بەرهەمی بێوێنەی ئەم هەستیارە لە ڕووی زمانەوە لە پەخشان دەچێت، دێڕە هونەرییەکانی خۆیان لە ڕێگای ڕەوانبێژییەکانەوە نەگەیاندۆتە پلەی هونەری، بەڵکوو تاقە ڕێگایان تاقیکردنەوەی قووڵ و تێفکرین و وردبوونەوەیە.

وردسورث لەسەر ئەم بیروڕایە سووردەبێت و دەڵێ: با بچین بۆ هەڵبەستەکانی هەستیاری بەناوبانگ (gray)، کە چالاکانە هەوڵی چەسپاندنی تایبەتییە جیاکەرەوەکانی هۆنراوەی لە پەخشان داوە و دەستکردانە زمانی هۆنراوەکانی ڕازاندۆتەوە، کەچی سەرەڕای ئەمە بە ئاشکرا تێبینی ئەوە دەکەین، کە زمانی دێڕە هۆنراوە بەنرخەکانی لە زمانی پەخشانی هونەری دەچێت.

بۆ نموونە: ڕەخنەسازەکەمان ئەم هەڵبەستەی (gray) دەهێنێتەوە، کە تێیدا وتوویەتی:

به بێسوود بەیانی دەم بە پێکەنین بۆم هەڵدێت
خوای هەتاویش
"ڤیس" ئاگرە زێڕینییەکەی هەڵدەکات
بە بێسوود کۆترەکان
کۆرانییە پڕ خۆشەویستییەکانیان دەڵێنەوە
کێڵگەکانیش بەرگە سەوزەکانیان وەردەگرنەوە
بەداخەوە ئەم گوێچکانە بۆ ئاوازێکی دی هەناسە هەڵدەکێشن
ئەم چاوانەش بەرەو شتێکی تر دەڕوانن
خەفەتەکانم هیچ دڵێک جگە لە دڵی خۆم ئێش و ئازارەکانیان، ناتوێنێتەوە
لە سنگمدا خۆشی نەپشکوتووە، دەکوژێتەوە
بەڵام بەیانی هەر زەردەخەنە دەڕوێنێ بۆ ئەوەی خۆشی بخاتە دڵی کارکەرانەوە

* * * *

هەروەها بۆ بەختیارەکان خۆشییەکی نوێ پێشکەشدەکات
کێڵگەکانیش بۆ هەمووان دیارییە بەلەزەتەکانیان دەهێنن
کۆترەکانیش دەناڵێنن بۆئەوەی
هێلانەی بێچووە نازدارەکانیان گەرمبکەنەوە
بەڵام من بە نائومێدی هاواری ئەو کەسە دەکەم، کە ناتوانێ دەنگم ببیستێ
دەگریم و لە گریانیش هەر بەردەوام دەبم، چونکە بە بێسوود دەگریم

## • وێنەی هونەری و زمانی هۆنراوە

وردسورث پاش ئەوەی ئەو هەڵبەستە دەهێنێتەوە دووپاتیدەکاتەوە، کە بەرزترین دێڕەکانی، ئەو دێڕە نارازاوانەن وەکوو:

ئەم چاوانەش بەرەو شتێکی تر دەڕوانن
خەفەتەکانم هیچ دڵێک جگە لە دڵی خۆم ئێش و ئازارەکانیان، ناتوێنێتەوە
لە سنگمدا خۆشی نەپشکوتووە، دەکوژێتەوە
بەڵام بەیانی هەر زەردەخەنە دەڕوێنێ،
بۆ ئەوەی خۆشی بخاتە دڵی کارکەرانەوە

مەبەستی ڕەخنەسازەکەمان هەڵبەت ئەوەیە کە بڵێ: هۆنراوە بە وێنەی هونەری پلەی بەرز وەدەستناهێنێ، ئەگەر هاتوو ئەو وێنە هونەرییانە دەستکردبوون و وەکوو کەڵێشە و پینەدۆز، زمانی هۆنراوەیان ڕازاندبووەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو زمانی هۆنراوە بەچەشنێکی ئاساییانە لێکچوواندن و خواستن و درکەی کرد بەهۆی گەیاندنی سۆزی ڕاستینە، ئەو وێنە هونەرییانە، بێگومان ئاکامێکی سروشتی دەبن. پەخشانیش هەڵبەت لەم تایبەتییە بێبەری نییە، بەڵکوو وەکوو هۆنراوە بەگوێرەی پێویست ڕێگای ڕەوانبێژی ساکار، دوور لە ڕازاندنەوەی دەستکرد دەگرێتەبەر بەمەبەستی کارکردن لە هەست و عەقڵی خوێنەر.

## • ڕێبازی هۆنراوە بەرەو کۆڕی جیهانی

وردسورث لە چەند لایەنێکی تایبەتییەکاندا، دان بەوەدا دەنێ کە ئاووهەوا و دیاردە سروشتییەکانی تر لە نیشتمانێکەوە بۆ نیشتمانێکی دی ڕەنگە جیاوازبن، بەڵکوو زۆر جاریش جیاوازن، بەڵام ئایا ئەو جیاوازییە و هەرچی جیاوازییەکی تریش دەستنیشانبکرێ، دەستێک سازدەکەن بۆ بنیاتنانی سنووری داخراو لە ڕووی هۆنراوە و هەستیاردا، بۆ ئەوەی لە سووچی

ناوچەکەیدا گۆشەگیربێت، یاخود ئەم دەستە ئەگەر سازیشبکرێت ناتوانێ سنوورێکی وەها لە ڕووی هۆنراوە و هەستیاردا بنیاتبنێ، چونکە هەستیار لەڕێگای هۆنراوەوە، کە زمانی ئاواتی یەکگرتووی ئادەمیزادە دەتوانێ هەموو سنوورێك بشکێنێت و خۆی بگەیەنێتە کۆڕی جیهانی، کە لەژێر خێوەتەکەیدا ڕەگەزی مرۆڤایەتی بە بێجیاوازی بۆ یەك ئاوات دەژین، کە ئەویش بەختیاری و ئاشتییە.

وردسورث بەم بیروڕایە دووبارە دیەوێ بەڵگەکانی خۆی دووپاتبکاتەوە، کە دەڵێن: هۆنراوە بەرهەمی ژیانی ساکار و ناڕازاوەیە و زمانی هونەریش بە کڵێشەی دەستکرد سازناکرێت و وێژە بە سنووری پەخشان و هۆنراوە لەتلەتناکرێ.

## ● دووەم: ڕەخنەسازی بەناوبانگ هنری جیمس

هنـری جیمـس هەرچەنـدە لـە بناغـەدا بـە چیرۆکنـووس ناوبانگیدەرکـردووە و وەکـوو ڕۆماننووسێکی بلیمەت ناودەبرێ، بەڵام لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا شوێنێکی بەنرخ و بەهاداری داگیرکردووە.

دیارە ئەم ناوداریـیەشی بەهۆی نووسینەوە و دانانی دەیان کتێب و نامیلکە و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازییەوە بووە، کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- لە ساڵی ١٨٧٨ی زایینیدا، کتێبێکی مێژوویی و ڕەخنەسازی بە چاپگەیاند، کە لەو کتێبەدا لە چەند هەستیار و چیرۆکنووسی بەناوبانگی فەڕەنسی دەدوێ.

٢- بیـروڕاو پیاچوونـەوە، لـە سـاڵی ١٩٠٨ی زایینـی، کـە وتارێکـی ڕەخنەسـازییە لە هەڵسەنگاندن و نرخپێدانی کۆمەڵێك بەرهەمی وێژەیی هەمەچەشنە.

٣- تێبینـی سـەبارەت بـە چیرۆکنووسەکان لە سـاڵی ١٩١٤ی زایینیدا لـە چاپیداوە، لێکۆڵینەوەیەکی وردە دەربارەی هونەری کورتەچیرۆك و ڕابەریکردنی چیرۆکنووسەکان.

ئەمبەرهەمە ڕەخنەسازییانەی هنری جیمس لەتەك بەرهەمەکانی دی چەشنە پسپۆڕییەکی ئەم ڕەخنەسـازە دەردەخەن، کە بە زۆری چەسـپاندنی پەیوەندیی ئەم ڕەخنەسـازییە بە هونەری دانانی ڕۆمان و نووسینەوەی کورتەچیرۆك.

بۆیە ئێمەش لە باسکردنی ئەم ڕەخنەسازە گرنگی بە شیکردنەوەی بەرهەمێکی دەدەین، کە بەناونیشانی هونەری ڕۆمان، واتە (فن الرواية) نووسیویەتی.

## • هنری جیمس و هونەری ڕۆمان

هنری جیمس بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٨٨٤زایینی لێکۆڵینەوەیەکی هونەری (ڕۆمان) ی لە گۆڤاری (لونجمان)دا بڵاوکردەوە و لە ساڵی ١٨٨٨ی زایینیدا بە چەشنێکی فراوانتر لە چاپدرایەوە.

**سەرباسە گرنگەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەم بابەتانەی خوارەوە دەدوێن:**

پێوانەی تاقیکردنەوە و ئەزموونی نووسەر نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی بەهرەی ڕۆماننووس، سەرچاوەکانی بەهرە و توانای ڕۆماننووس، ڕەگەزەکانی ڕۆمان، چەشنەکانی ڕۆمان، بەراوردکارییەك لە نێوان هونەرمەندی ڕۆماننووس و مێژوونووسدا، ڕوخساری چیرۆك و ئامانجی ناوەڕۆك، ڕێبازەکانی دەربڕینی هونەری لە هونەری ڕۆماندا، تایبەتییەکانی ڕۆمانی ئینگلیزی، پێویستی لە چەشنەکانی دیکەی پەخشان و هونەر.. هەروەها گرنگیی و سوودمەندیی لە کۆڕی شیکردنەوەی سروشتی ئەم هونەرە و دەستنیشانکردنی توانا و بەهرە و تایبەتییەکانی نووسەرەکەی، چونکە لە مێژووی وێژەی زۆر نەتەوەدا بەتایبەتی نەتەوەکەمان تائێستا بەچەشنێکی ورد (ڕۆمان) لە کورتەچیرۆك و حیکایەت و تۆمارکردنی ڕووداو جیانەکراوەتەوە.

جگە لەمە بەزۆری ئەوەی قەڵەمێك بگرێ بە دەستەوە و بە تۆمارکردنی کارەساتێك لاپەڕە ڕەشبکاتەوە، ڕەنگە بە ڕۆماننووس لە قەڵەمبدرێ. بۆیە ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین لەو سەرباسانە چەند بابەتێك هەڵبژێرین و یەکالایانبکەینەوە.

## • ڕەگەزەکانی ڕۆمان

هنری جیمس لە پێناسەی ڕۆمان و دەستنیشانکردنی ڕەگەزەکانی بەهیچ جۆرێك پەنا ناباتەبەر ڕێبازی پێناسەی مەنتیقی و ژماردنی تایبەتی و سنووردانانی ڕەگەزەکان، بەڵکوو بە چەشنێکی گشتی هونەری ڕۆمان دەخاتە بەر باسکردن و شیکردنەوە.

سەرئەنجام ئەم ڕەخنەسازە هەڵکەوتووە لە سەرەتای باسەکەیدا بڕیاری ئەوە دەدات، کە هیچ کەسێك ناتوانێ بەوە لە ڕۆمان بگات، کە تۆپەڵێکی پچڕپچڕە لە پەخشان، بەڵکوو پێویستە بزانین، ئەم هونەرە لەوەدا قەوارەی خۆی دەچەسپێنێ، کە بەرهەمێکی یەکگرتووە. پیاهەڵدان و وەسف لەگەڵ گفتوگۆ (حوار)دا شانبەشانی تۆمارکردنی ڕووداو و نواندنی ڕاست هەموویان پێکەوە بۆ وەدەستهێنانی نووسینەوەی ڕۆمانێکی سەرکەوتوو تێدەکۆشن.

سەرکەوتنی ڕۆمانیش هەڵبەت هەر ڕوونکردنەوەیەکی وێنەکێشانییە. کەوابوو هنری جیمس لێرەدا لە پێناسەی ڕۆمان و تەعریفیدا تەنیا ئەرکی ڕۆمان دەستنیشاندەکات. ئەم ئەرکەش هەروەکوو دووپاتیدەکەینەوە ڕوونکردنەوەی ڕووداوێکە لە ڕووداوەکانی ژیان بەهۆی وێنەکێشانەوە.

ئەم ڕەخنەسازە پەنجە بۆ ڕەگەزەکانی ڕۆمان درێژدەکات، کە گرنگترینیان پیاهەڵدان و وەسفی ڕووداو و دەمەتەقێ و خزمەتکردنی ڕاستییە، بەڵام بە هیچ ڕەنگێ لەیەکترپچڕاو نین، هەر یەکێکیان ئەرکێکی تایبەتی نییە، بەڵکوو هەموویان پێکەوە بەیەکادەچن و کارلێکدەکەن و داڕشتەیەکی یەکگرتوو پێکدەهێنن. بۆیە ئەم ڕەخنەسازە هەمیشە دووپاتیدەکاتەوە، کە ڕۆمان وەکوو گیاندارێك شتێکی زیندووی هەمیشە بەردەوامە.

بەردەوامبوونی ژیانی ئەم شتە بەندە بە بوونی هەر پارچەیەك لە پارچەکانی دیکەوە. بەمانای ئەوەی ئادەمیزاد چلۆن بوون و قەوارە تایبەتییەکەی لە چەند ئەندامێك پێکهاتووە و بەردەوامبوونی ژیانی لە ئیشکردنی ئەم ئەندامانەوە، وەکوو یەکێتییەك هەڵدەقوڵێ.

هەروەها ڕۆمانیش بۆ ئەوەی بەرهەمێکی ساردوسڕ نەبێت و قەوارەکەی بە ژیان قوڵپبدات، پێویستە ڕەگەزەکانی پێکەوە خۆیان شەتەکبدەن و لە هەموو لایەنێکیدا پێکەوە بەرچاوبکەون.

## • چەشنەکانی ڕۆمان

هنری جیمس، کە ڕەخنەسازێکی زانستی و خاوەن ڕێبازە بە هەموو توانایێکییەوە نەریت و یاسا ڕەخنەسازییە نازانستییەکان دەخاتەبەر لێکۆڵینەوە و یەکالاکردنەوە، بەنیازی ئەوەی هەرچی ڕەسەنە بیچەسپێنێ و ئەوەی دەستکرد و ڕووکەشە پووچەڵیبکاتەوە. بۆیە لەم ڕوانگەیەوە پەنجە بۆ دابەشکردنی ڕۆمان بەسەر چەشنێکی لەیەکتر پچڕاودا درێژدەکات و دەڵێ:

هەندێ مێژوونووس و ڕەخنەساز، هەندێ جاریش خوێنەرەکان دووپاتیدەکەنەوە، کە ڕۆمان سێ چەشنی سەرەکییە:

**یەکەم:** ڕۆمانی ئەندێشەیی، کە بەرهەمی ئەندێشەی نووسەرەکەیێتی و لە سەرچاوەی (تێفکرین)ی خولقێنەرییەوە هەڵقوڵاوە.

**دووەم:** ڕۆمانی لاسایی، کە بابەتی ژیانی کەسێکە و ئامانجی سەرەکی تۆمارکردنی هەموو لایەنەکانی هەڵسوکەوتی ئەو کەسەیە، کە بەناوی قارەمانەکەوە ناودەبرێت.

**سێیەم:** ڕۆمانی مێژوویی، کە شانۆیەکە بۆ کارەسات و ڕووداوی گشتی و نووسەرەکەی وەکوو مێژوونووسێك هەرچی لە قۆناغێکی تایبەتیدا بەرپابووە، دەنووسێتەوە.

هنری جیمسی ڕەخنەساز پاش دەستنیشانکردنی ڕۆمان، کە بە چەند تایبەتییەکی تەکنیکی و ناوەڕۆکی و ڕوخساری ڕووکەش لەیەکترجیادەکرێنەوە و شوورەی جیاکەرەوەش لە نێوانیاندا بنیاتدەنرێ. بە توندی ئەم دابەشکردنە فەرامۆشدەکات و دەیسەلمێنێ، کە ڕۆمان یەک تاقە چەشنە، ئەم تاقە چەشنەش هەر ڕۆمانە و ڕۆمان و بەس.

لە پاشا بە سەرسوڕمانێکەوە دەپرسێ: ئایا هیچ چەشنە ڕۆمانێك هەیە پێویستی بە ئەندێشەی نووسەرەکە نەبێت بۆئەوەی پارچەکانی یەکگرتووبن ؟! ئایا ڕۆمانێك هەیە باسی کەسایەتییەکی نەکردبێت؟ یاخود هیچ ڕۆمانێك لە مێژووی وێژەی هەر نەتەوەیەکدا بەرچاودەکەوێ، کە بە ڕووداوی مێژوویی شیرازەکەی نەپچرابێت؟!

هنری جیمس، هەڵبەت ئەم سێ پرسیارە بە وشەی (نەخێر) وڵامدەداتەوە و دەڵێ: هەموو ڕۆمانێکی هونەری بە ئەندێشە و خەیاڵ ئاودراوە و بڕبڕەی پشتی ڕەنگوبۆی کەسایەتییە و زەمینەکەشی ڕووداوێکی مێژوویی تەنی یان کۆمەڵییە.

هنری جیمس کە بەم جۆرە دان بە چەشنەکانی ڕۆماندا نانێت، نابێ وا بزانین کە ئەم ڕەخنەسازە، ڕۆمان لەگەڵ کورتەچیرۆك و حیکایەت و شانۆگەری تێکەڵدەکات. نەخێر ئەم ڕەخنەسازە زانایە بە هیچ جۆرێك ڕەفتاری وای نەنواندووە، چونکە بە وردی هەموو چەشنێکی تر جیادەکاتەوە و سنووری دەکێشێ. جا لەبەرئەوەی حیکایەت و کورتەچیرۆك و شانۆگەری هەر یەکێکیان لە باخچەی وێژەدا، چەشنێکی سەربەخۆن، بلیمەتانە جیاوازی نێوانیان دەخاتەڕوو و تایبەتییەکانیان دەچەسپێنێ.

## ● ڕۆمان و کورتەچیرۆك

لە ڕەخنەسازیی هاوچەرخی زۆربەی نەتەوەکاندا، سەبارەت بە کورتەچیرۆك و ڕۆمان زۆر بیروڕای ڕەخنەسازیی هەڵە هەیە، کە باوەڕ و ڕەخنەسازەکان ئەو بیروڕا هەڵانە وەکوو دەستوور پەیڕەویدەکەن.

لەم بیروڕایانە، بنواشەیەکی بەربڵاو هەیە، کە دەڵێ: کورتەچیرۆك ڕۆمانێکی کورتکراوەیە و ڕۆمانیش کورتەچیرۆکێکی درێژە پێدراوە.

بە مانای ئەوەی نووسەر دەتوانێ کورتەچیرۆکێك وەربگرێت و بەزیادکردنی وشەکانی و درێژەپێدانی وەسف و پیاهەڵدانی ژینگە و دیمەنەکان و قسەخستنەسەر دەمەتەقێ و گفتوگۆکانی، ڕۆمانێکی ڕەسەن سازبکات.

هەروەها بەپێچەوانەوە، دەتوانرێ ڕۆمانێك بڕوتێنرێتەوە و ڕستەکانی کورتبکرێنەوە و وەسف و پیاهەڵدانەکانی فڕێبدرێن، دەمەتەقێ و کەسایەتییەکانی بهێنرێنەوەیەك، بەم کارە کورتە چیرۆکێك ئەنجامدەدرێ.

سەرئەنجام ئەم بنواشە هەڵەیە هیچ جیاوازییەکی هونەری لەنێوانی کورتەچیرۆك و ڕۆمان دەستنیشاننەکات، جگە لە زۆری وشە و ئاوساوی قەوارە و دوور و درێژی و پانتایی.

هنری جیمس، بێگومان بڕوای بەم بنواشەیە نییە و بە هیچ ڕەنگێ پەیڕەوینەکات، چونکە لە تێڕوانینییەوە کورتەچیرۆك و ڕۆمان، هەر یەکێکیان جیهانێکی سەربەخۆنە و بیروڕای وایە، ئەگەر هاتوو ڕۆمانمان بە ئادەمیزادێکی زیندوو چوواند، کورتەچیرۆك ئەندامێکی زیندووی سەربەخۆیە لە لەشی ئەو ئادەمیزادەدا.

جا کە ڕۆمان ئادەمیزادێکی زیندووی تەواو بێت، چلۆن کورتدەکرێتەوە و قەوارەکە دەئاخنرێ، ئایا دەشێت سەری فڕێبدەین و دەست و قاچی ببڕین، بەنیازی کەمکردنەوەی قەوارەکەی، ئەوجا ئیدیعای ئەوە بکەین، کە ئەو ئادەمیزادە هێشتا هەر زیندووە و چەشنە بوونێکی هەیە؟!

هەڵبەت ئەمە کارێکە هیچ عەقڵێك دانیپێدانانێت و لە هیچ شارەزایەك ناوەشێتەوە.

هەروەها ئەگەر هاتوو ئەندامێکی ئەو ئادەمیزادەمان وەرگرت، بۆ نموونە: با دڵی بێت بە فووپیاکردن و ڕاکێشانی ئەملاو ئەولاپێکردن وبستمان زلیبکەین و قەوارەکەی گەورە و گەپ بکەین، ئایا جگە لە پچڕاندنی ئەو دڵە و تێکدانی و لەکارخستنی، هیچ سەرئەنجامێکی تر بەدەستدەهێنین، بێگومان نەخێر.

هنری جیمس لەبەر تیشکی ئەم نموونەیەدا بڕیاری ئەوە دەدات، کە کورتکردنەوەی ڕۆمان بەنیازی سازکردنی کورتەچیرۆك و درێژەپێدانی کورتەچیرۆك بە هیوای ئەنجامدانی ڕۆمان، نەك کارێکی بێسوودە و بەس بەڵکوو زیانبەخشیشە، چونکە ئاکامەکەی تێکدانی گیانلەبەرێکی زیندووە و پێشێلکردنی دەستووری ژیانە.

## • ڕەنگاوڕەنگیی کۆڕی ڕۆماننووس

هنری جیمس لە تەك کۆمەڵێك لە ڕەخنەساز و ڕووناکبیردا بەشداری لێکدانەوەی کۆڕی ڕۆماننووس دەکات، بەتایبەتی لەگەڵ (بیزانت)دا، بەربەرەکانێیەك بەرپادەکات سەبارەت بە ئەرکی سەرشانی وێژەر چیرۆك و ڕۆماننووسەکان.

بۆیە لەم ڕووەوە چەند پرسیارێك ئاراستەدەکات و دەپرسێت: چیرۆکنووس و ڕۆماننووس تا

چ ڕاددەیەك لە ڕیزی مێژوونووس و فەیلەسووف و هونەرمەندان دادەنرێ؟ ئایا ڕۆماننووس چ پەیوەندییەکی هەیە بە مێژوو و فەلسەفە و هونەر؟

ئەم دوو پرسیارە هەروەکوو دیارە لە سروشتی کۆڕی ڕۆماننووس دەکۆڵنەوە، ڕەخنەسازەکەشمان بە وردی و ڕوونی وەڵامیاندەداتەوە و دەڵێ: کۆڕ و دەرفەتی ڕۆماننووس یەك ڕەنگی نییە، بەڵکوو ڕەنگاوڕەنگە، چونکە لە هەموو لایەنەکانی چالاکی ئادەمیزاد ڕەنگێك وەردەگرێت. چەپکەگوڵێکی کەسی و بابەتی و مێژوویی و بیری و فەلسەفی و هونەری سازدەکات.

ڕۆماننووس لە تێڕوانینی هنری جیمسەوە مێژوونووسێکە، چونکە لە ڕووداوی ژیانی کەسایەتییەکانی دەکۆڵێتەوە. هەروەها فەیلەسووفێکە چونکە لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆجییەکەوە دەڕوانێتە ژیان و ڕووداوەکانی هەڵدەسەنگێنێ. جگە لەمە ڕۆماننووس هونەرمەندێکە، چونکە بە دەربڕینی وشەی جوان ئەرکی وێنەکێشانی دیمەنەکانی ژیان جێبەجێدەکات.

سەرئەنجام لە کۆڕی ڕۆماننووسەوە تابلۆیەکی ژیان سەردەردەهێنێ، کە لە ڕووی ڕابەری و سەرکردایەتییەوە بۆ ئامانجێکی بیری و ئایدۆلۆژی تێدەکۆشێ.

هەروەها لە ڕووی ئامراز و دەنگ و ڕەنگ و هێڵ و قەوارە لە دووتوێی ئاخاوتندا بەکاردەهێنێ.

## • ئەرکی ڕەخنەسازی لە پێناوی نرخپێدانی ڕۆماندا

لە دێرینترین زەمانەوە هەتا ئەمڕۆ لە لای زۆربەی نەتەوەکانی سەر ئەم زەمینەدا بیرۆکەیەکی گشتی چەسپاوە، سەبارەت بە گرنگی چەشنەکانی هونەر لەچاو پێویستییەکانی ژیاندا.

ئەم بیرۆکەیە بە چەند دەربڕینێك خۆی نواندووە، بۆ نموونە: لە هۆنراوەی دێرینی عەرەبیدا چەند دێڕێك بەرچاودەکەون، کە خاوەنەکەیان دەڵێ: نانەوا بەهیچ زانستێك لە زانستەکانی زمان و بە هیچ ئاوازێك لە ئاوازە هونەرییەکان و بەهیچ هەڵبەستێك قایل نەبوو، کە نانم بداتێ، بەڵام کە پەنجا فلسەکەم بۆ درێژکرد یەکسەر هات بە دەنگمەوە.

ئەم بیرۆکەیە هەروەکوو ئاشکرایە بڕیارێك سەبارەت بە گرنگی چەشنەکانی هونەر دەدات و دەیەوێ بڵێ هونەر کارێکی فەنتازییە و بە کەمالیات و زیادەشت دەژمێردرێ.

هنری جیمس، بەتوندی بەربەرەکانێی ئەم بیرۆکەیەی کرد و بەرگری لە هونەر بە گشتی و ڕۆمان بەتایبەتی کرد و دروشمی بوونی بیردۆزەیەکی ڕەخنەسازیی هەڵگرت و دووپاتیکردەوە،

کـە جەمـاوەر بـۆ ئەوەی بڕوایان بە دەور و ئەرکی ڕۆمان ببێ پێویسـتە ڕەخنەسـازەکان لەبەر تیشکی بیردۆزمیەکی ڕەخنەسازیدا ڕابەری ڕۆماننووسەکان بکەن و هانیانبدەن بۆ نووسینەوەی ڕۆمانی پەیامدار و ناوەڕۆك بەسوود و دوور لە گاڵتەوگەپ و وەخت بردنەسەر.

ئەم دووپاتکردنەوەیەی ڕەخنەسازەکەمان هەڵبەت دەیەوێ چەمکی ڕۆمان لە چەمکی حکایەتی بەرثاگردان و داستانەکان دووربخاتەوە و بیچەسپێنێ، کە ڕۆمان لای لایەی منداڵان نییە و خەونی ورێنەی کارساتی نامەعقول ناگرێتەوە، بەڵکوو ڕۆمان بیروباوەڕ و ئامۆژگاری هونەرە و ڕۆماننووسەکانیش ئەندازیارانی ژیانن. بە مانای ئەوە، ڕۆمان بۆ میللەت دەبێت وەکوو ئاووهەوا و نان و بەرگ بێت و چلۆن هەرکەسێك لە ئەندامانی میللەت بەبێ پێداویستییەکانی ڕۆژانەی ناتوانێت ژیانی بەرێتە سەر، هەروەها دەبێت لەگەڵ هونەری ڕۆماندا هۆگر بێت و خوێنەرەوەی بەرهەمی نووسەرەکان بکا بە خووێکی کەسی.

ئەم پێداویستییانەی سەرشانی خوێنەری ڕۆمان هەڵبەت نابن بە ڕاستی و حەقیقەت، ئەگەر ڕۆمان ڕێزی خۆی فەرزنەکات و بەرزنەبێتەوە بۆ ڕادەی هێنانەدی داواکاری بیردۆزمیەکی ڕەخنەسازی.

کەوابوو ڕۆماننووس دەبێت بە ئەوپەڕی بایەخەوە ئەرکی سەرشانی خۆی بزانێ و بتوانێ چۆن ئەم ئەرکە بەدیبهێنێ، ئەمەش بێگومان ڕێگایەکی فراوانە بۆ پەیوەندی بنیاتنان لەگەڵ ڕەخنەسازیدا.

## • سێیەم: ڕەخنەساز و فەیلەسووفی بەناوبانگ هیگڵ

هەروەکوو زانراوە ئەم فەیلەسووفە لە مەسـەلەی مێژوو و زانسـتی جوانی و سـتاتیکادا هەڵوێستێکی تایبەتی هەیە و لە لێکدانەوەی وێژە بەگشتی و هونەری تراژیدیا بەتایبەتی، بیردۆزێکی ئایدۆلۆژی و ڕەخنەسازی بەرپاکردووە.

(ئەندرسیسل براودلی)ی ڕەخنەساز و مێژوونووسی بەناوبانگ لە وتارێکدا ئەو بیردۆزەی (هیگڵ)ی شیکردۆتەوە و چەند تێبینییەکی بیری دەربارەی خستوونەتەڕوو. ئێمەش لەبەر گرنگی ئەم بابەتە هەوڵدەدین، چەند لایەنێکی بیردۆزەکەی هیگڵ و تێبینییەکانی براودلی بخەینەڕوو و شیبکەینەوە.

## ● چەمکی تراژیدیا

لە مێژووی وێژە و ڕەخنەسازیی ئەغریقیدا چەسپاوە، کە زاراوەی تراژیدیا لە لایەن فەیلەسووفی یۆنانی بەناوبانگ ئەرستۆوە سازکراوە و بۆ چەشنێك لە چەشنەکانی هۆنراوەی شانۆ گەری وەکوو ناوێك دانراوە.

ئەرستۆ هەروەکوو زانراوە دەروونی هەستیار بەسەرچاوەی هۆنراوە لەقەڵەمدەدات و چەشنەکانی ئەم هونەرە بەجیاوازی هەستیاران ڕاڤەدەکات.

سەرئەنجام، بەگشتی ئەم فەیلەسووفە بیروڕای وایە، کە دەروونی هەستیار یان چاك و خێرخوازە یان خراپ و شەڕخوازە.

هەستیاری چاك و خێرخواز لە بەرەبەیانی لەدایکبوونی هۆنراوە هەڵبەستی ستایش و مەدحی خوایەکان و شانازیکردن بە قارەمان و فەرمانبەرانی داناوە، بەڵام هەستیاری دەروون خراپ و شەڕخواز، لەهەمان کاتەوە هەڵبەستی جوێندان و هەجووی هۆنیوەتەوە.

بەم جۆرە لە دێرینترین سەردەمی تەمەنی هۆنراوەدا، بەگوێرەی دەروونی هەستیار دوو چەشنی جیاواز هەبووە، کە هەڵبەستی ستایش و مەدح و هەڵبەستی جوێندان و هەجوون.

ئەرستۆ لەبەر تیشکی یاسای گۆڕان و پەرەسەندندا، شوێنپێی ئەو دوو چەشنە هەڵدەگرێت و بڕیاری ئەوە دەدات، کە چەشنی هەڵبەستی ستایش و مەدح وردەوردە خەملا و گۆڕا لەسەر بناغەکەی تراژیدیا لەدایکبوو.

چەشنی هەڵبەستی جوێن و هەجوویش هەر لە پەرەسەندندا بوو، هەتاکو بەهۆیەوە کۆمیدیا بەرپابوو.

ئەرستۆ لە شیکردنەوەی چەمکی هۆنراوەی تراژیدیادا سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێت، کە هۆنراوەی کۆمیدیا لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی بابەتی بە هەڵبەستی جوێندان و هەجووەوە هەیە، تایبەتییە ناوەڕۆکییەکانی بەوە دەچەسپێندرێن، کە هۆنراوەی گاڵتەوگەپ و پێکەنین و توانجگرتنە، بەڵام هۆنراوەی تراژیدیا بەپێچەوانەوە ڕەنگی هۆشمەندی و ڕابەریکردنی لە هەڵبەستی ستایش وەرگرتووە و بووە بە هونەری نواندنی هەڵوێستی ژیانی ڕاستینە.

سەرئەنجام ئەرستۆ چەمکی تراژیدیا لەسەر سێ بناغە دادەمەزرێنێ:

یەکەم: ناوەڕۆکی تراژیدیا، بابەتێکی بەپەرۆش و دوور لە گاڵتەوگەپە و لە مەسەلەیەکی خەفەتباری و ئێش و ئازاربەخش دەدوێ.

دووەم: هێڵی درامایی تراژیدی لە زۆرانبازییەکی نایەکسانی لە نێوان گەردوون و

ئادەمیزادەوە سەر دەردەهێنێ و پەرەدەسێنێ.

سێیەم: کۆتایی تراژیدیا هەر دەبێت کارساتێکی دڵتەزێن بێت، وەکوو مردن وماڵوێرانی و سەرلێشێواوی و کوێرەوەری.

## • هیگل و زۆرانبازی تراژیدیا

تراژیدیا، سەرەڕای ئەو بناغانە، هۆنراوەیەکی شانۆگەرییە و لەگەڵ گۆڕانی ژیاندا تەکنیکی ڕۆمانی وەرگرت و بە پەخشان نووسرایەوە و وەکوو چیرۆکێك تەماشادەکرا.

ئەم چیرۆکە لەبەرئەوەی ناوەڕۆکەکەی هەر لەسەرچاوەی ئێش و ئازار و ئەشکەنجەوە هەڵدەقوڵێ، بەناوی چیرۆکی کوێرەوەری لە ڕەخنەسازیدا ناودەبرێ.

کۆمەڵگا ئەورووپییەکان لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازییەوە جگە لە زۆری هۆیەکانی هەژاری و ستەمکاری و لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا زیاتر چینە دەستکورتەکانی تووشی کوێرەوەری بوون.

هەندێ لە نووسەرە ناهونەرمەندەکان ئەم بارمیان بە هەل زانی و دەستیانکرد بە ڕەشکردنەوەی لاپەڕە بە حیکایەتی دڵتەزێن و خەفەتباری و ناویان نا: ناتراژیدی کوێرەوەری، کە بەڕاستی بەهۆی ئەو بارەوە بازاڕی گەرم بوو.

هیگل وەکوو فەیلەسووفێکی ڕەخنەساز دژی ئەو چەشنە نووسەرانە ڕاوەستا و دەستی بە یەکالاکردنەوەی تراژیدیا کرد و چەمکە دێرینەکەی خستەبەر لێکۆڵینەوەی زانستی، بەنیازی ئەوەی ڕێگا بە نووسەرە هەلپەرستەکان بگرێت و جیاوازی نێوان تراژیدی ڕاستینە و چیرۆکی کوێرەوەری دەستکرد بچەسپێنێ.

هیگل لەم ئەرکە ئایدۆلۆژی و هونەرییەوە پشتی بە بیردۆزە گشتییەکەی سەبارەت بە زۆرانبازی لە هەموو دیاردەیەکی سروشت و کۆمەڵایەتیدا بەست و وتی: گرنگ لە تراژیدیا ئێش و ئازار و کوێرەوەری نییە، بەڵام گرنگ ئەو هۆیەیە، کە ئێش و ئازار و کوێرەوەری بەرپادەکات.

جا ئەگەر لێرەدا لەم فەیلەسووفە بچینە پێشەوە و بپرسین: بۆچی گرنگ لە تراژیدیدا هۆی بەرپابوونی ئێش و ئازار و کوێرەوەرییە، نەك ئێش و ئازار و کوێرەوەری خۆی؟

هیگل وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ: ئێش و ئازار و کوێرەوەری دەشێت کارساتێکی دەستکرد و ڕووکەش بێت. جا کە وابوو بەهیچ جۆرێك هەستی بەزەیی و ترس لە دەروونی

خوێنەر و تەماشاکەری تراژیدیدا ناجولێنێت و هیچ شوێنەوارێکی ئایدۆلۆژی هۆشمەندی لە مێشکیاندا بەجێناهێڵێ.

ئەم چەشنە لە ئێش و ئازار و کوێرەوەری لەوەوە هاتووە، کە هۆی بەرپاکردنی زۆرانبازییەکی ڕەسەن نییە. کەوابوو: بە لای هیگڵەوە دەبێت ئێش و ئازار و کوێرەوەری تراژیدیا، کارەساتێکی ڕەسەن بێت. کارەساتی ڕەسەنیش بەلای ئەوەوە لە تراژیدیادا، دوو سەرچاوەی یەکلیگیری هەیە:

سەرچاوەی یەکەم: ئەوەیە کارەساتەکە دەبێت پەیوەندی بە گیانی مرۆڤەوە هەبێت. هیگڵ لە شیکردنەوەی ئەم سەرچاوەیەدا، زاراوەی (گێست = geist)ی بەکارهێناوە، کە ئێمە بە وشەی (گیان - الروح) وەریدەگێڕین. مەبەستی ئەم فەیلەسووفە لە بەکارهێنانی وشەی (گێست) واتە گیان، ئەوەیە کە بڵێ کارەساتی تراژیدیا بۆ ئەوەی کاریگەر و شوێنەواردار بێت، دەبێت هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە شمەکی ڕۆژانە و هەڵوێستی کاتییەوە نەبێت، بەڵکوو دەبێت لەگەڵ ئێش و ئازاری گیانی و دەروونیدا پەیوەستبێت و لە بابەتێك ڕووداوەکانی بنیاتبنێت، کە خۆراکی ئێش و ئازاری مەعنەوی و ڕۆحی بێت.

ئەم مەبەستەی هیگڵ دیارە زیاتر ڕووندەبێتەوە، ئەگەر هاتوو زانیمان بۆچی زاراوەی ژیری و عەقڵی لە شیکردنەوەی ئەو سەرچاوەیەدا بەکارنەهێناوە؟ چونکە ژیری و عەقڵی ئادەمیزاد دەتوانێ خاوەنەکەی لە ئێش و ئازاری هەمیشەیی دووربخاتەوە یاخود لە شوێنەوار و تەئسیری ئەو ئێش و ئازارە کەمبکاتەوە. جا ئەگەر دووبارە لە هیگڵ بپرسین: چلۆن ژیری و عەقڵی ئادەمیزاد، ئەو توانایەی هەیە؟ کەچی گیان و دەروونی ناتوانێت ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنێت؟

لە وەڵامدا ئەم فەیلەسووفە دەڵێ: ژیری و عەقڵی ئادەمیزاد دەتوانێ بە پێوانەی بەرژەوەندی کەسی یان بە هیوا و ڕێگاکانی دیکەی لێکدانەوەی هەستپێکراو بیانوو بۆ ڕاڤەکردن و هۆدەرخستنی کارەسات بدۆزێتەوە، بەڵام گیان و دەروونی ئادەمیزاد، کە هێزێکی گشتییە ئەو توانایەی پێنەبەخشراوە، بۆیە وەکوو شووشە چۆن ئەگەر هاتوو شکا، دووبارە وەکوو خۆی ناگرێتەوە، ئەمیش هەمیشە بە دەم ئازارەوە دەتلێتەوە و بە خەفەتباری دەمێنێتەوە.

سەرچاوەی دووەم: کارەساتی ڕەسەن لە تراژیدیادا زۆرانبازییە (الصراع). هیگڵ لە باسکردنی ئەم سەرچاوەیەدا دووپاتیدەکاتەوە، کە زۆرانبازی نیشانەی نەمریی ژیانە و هێزی هەمیشەیی بەرپابوونی ڕووداو گۆڕانە. بۆیە نووسەری ڕاستینەی تراژیدی دەبێت ئاگای لەم ڕاستییە بێت و لە شانۆگەرییەکانیدا زۆرانبازی نێوانی خێر و شەڕ و خێر خۆی و لایەنەکانی شەڕ تۆماربکات و بە هیچ جۆرێ نابێت وێنەکانی ئەم زۆرانبازییە لە ژیانی کەسی و گشتیدا فەرامۆشبکات.

هیگل کە فەیلەسووفێکی ئایدیالیزمە و بڕوای بەکارتێکردنی سەرووی بوون و سروشت هەیە لە دەستنیشانکردنی سەرچاوەی زۆرانبازیدا، وەکوو کەرەستەیەکی نەمر بۆ هەستیاری ئەم جۆرە هونەرە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێت، کە قەوارە و گیانی ئادەمیزاد لەژێر دەسەڵاتی چەند هێزێکی خوو و ڕەوشتی خۆشەویستیدایە.

ئەم هێزانە لە پەیوەندی نەمریی مرۆڤەوە بە ئەندامانی خێزانەکەی و میللەتەکەیەوە شەپۆڵدەدەن. هەروەها لە خۆشەویستی ئەم مرۆڤەوە بەرامبەر بە نیشتمانەکەی و دەرحەق بە فەرمانڕەواکانی، کە ئەرکی بەرگریکردن لە نیشتمانەکەی بە ئەستۆیانەوە هەڵدەقوڵێ.

سەرەڕای پەیوەندیی هاونیشتمانی و بەرژەوەندی گشتی و بڕواهێنان بە بنەڕەتی نەتەوایەتی و مرۆڤایەتی و تێکۆشان لەپێناوی بەرزکردنەوەی ڕاددەی زانست و فیداکاری بۆ وەدەستهێنانی پلەیەکی کۆمەڵایەتی و بیری و دەیان مەسەلەی هۆشمەندی و میسالی، کە بەڕاستی نرخی ڕاستینەی ئادەمیزاد دەستنیشاندەکەن و لە ژیاندا پایەی بەرزدەکەنەوە.

ئەم هێزانە وەکوو هیگل دەیڕوێ هێڵێکی نموونەیی لە بوونی ئادەمیزاددا دەکێشن، کە لە دژواریدا هێڵێکی دڕندەیی لە ئارەزووی نزم وەکوو خۆپەرستی و ستەمکاری و شەڕخوازی شۆڕدەبێتەوە لەگەڵ ئەو هێڵەدا دەستەویەخە ڕادەوەستێ و زۆرانبازییەکی خوێناوی لە تەکدا بەرپادەکات.

خاڵە سەرەکییەکانی بەیەکاچوون و زۆرنبازی ئەم دوو هێڵە لە دەروونی ئادەمیزادێکدا، یاخود لە مەیدانی ڕووداوێکی گشتیدا، سەرچاوەی وەدەستهێنانی تراژیدیای بەرز و هونەرین، هەستیاری سەرکەوتووش ئەو هونەرمەندیە، کە بە ڕووناکیی دەروون، تیشکی مێشك و توانای هونەری ئەو خاڵانە دەدۆزێتەوە و ڕێگای سوودلێوەرگرتنیان خۆشدەکات و دەتوانێ تراژیدیای وا بهۆنێتەوە، کە بەڕاستی ئاکامەکەی پاککردنەوەی دەروونی خوێنەر و تەماشاکەرانە لە هەموو خراپە و ناهەمووارییەك.

## • تراژیدیای نموونەیی لە ڕوانگەی هیگلەوە

هیگل لە ڕەخنەسازیدا گرنگییەکی زۆری بە ناوەڕۆکی تراژیدیا داوە و پێوانەیەکی فەلسەفی و میسالی بۆ هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆك چەسپاندووە. ئەم پێوانەیەش مافی گشتی و فەرامۆشکردنی حەقی کەسی و شەخسییە. جا بۆئەوەی سنووری فراوانی ئەم پێوانەیەمان بۆ دەرکەوێ، با نموونەیەك لە هەڵسەنگاندنی ئەم فەیلەسووفە سەبارەت بە تراژیدیایەك بهێنینەوە.

ئەم نموونەیەش تراژیدیای ئەغریقی بەناوبانگ (ئەنتیگونا)یە.

کورتەی ناوەڕۆکی تراژیدیای (ئەنتیگۆنا) ئەوەیە: برایەکەی ئەنتیگۆنا ڕقی لە فەرمانڕەوای وڵاتەکەی، کە (کریۆن)ە هەڵدەستێ، لەگەڵ دوژمناندا هاوکاریدەکات و لەشکرێك لە بێگانە و خۆفرۆشەکان پێکدەهێنێ و پەلاماری پایتەختی نیشتمانەکەی دەدات، کە شاری لەدایکبوونی خۆی و باب و باپیرێتی.

سەرئەنجام لەو شەڕ و هەرایەدا برایەکەی ئەنتیگۆنا کە بەپێی یاسا و نەریت خیانەتکارە دەکوژرێ. کریۆنی فەرمانڕەواش بڕیاری ئەوە دەدات، کە نابێت لاشەی کوژراوەکە بنێژرێ. ئەنتیگۆنای خوشکی کە دەستگیرانی کوڕی کریۆنە، ملکەچی ئەو بڕیارە نابێت و دوای خۆشەویستی برایەکەی دەکەوێت و یاسای فەرمانڕەواییەکەی پێشێلدەکات لە مافی گشتی دەربازدەبێت. کریۆنی فەرمانڕەوا ئەنتیگۆنا بە بێ نان و ئاو لە زینداندا دەهێڵێتەوە. خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی شارەکە و گەورەپیاوانی ئایینی، وەك (تیریسیاس) دڵیان بە ئەنتیگۆنا دەسووتێ و لە کریۆن دەپاڕێنەوە، کە خوشکی دڵسووتاو ئازادبکا.

کریۆنی فەرمانڕەوا پاش ماوەیەك بەدەنگ خەڵکەکەوە دەچێت و بڕیاری ئازادکردنی ئەنتیگۆنا دەدات. ئەم بڕیارە هیچ سوودێکی نابێت، چونکە ئەنتیگۆنا لە زیندانەکەدا بە مردوویی دەبینرێت.

دەستگیرانەکەی کە کوڕی کریۆنە، لە خەفەتی خۆشەویستەکەی ئەویش دەمرێ. دایکیشی سەری خۆی هەڵدەگرێت و نایەوێت چاوی بە ناوچاوانی مێردەکەی بکەوێ.

لەم تراژیدیایەدا ئاشکرایە، کە هەستیارەکەی لەبەر مافی کەسی، کە بناغەی هەڵسوکەوتی قارەمانەکانێتی، مافی گشتی فەرامۆشدەکات، چونکە وا باسی ئەنتیگۆنای کردووە، کە لەبەر برایەکەی نیشتمانپەروەری دەخاتە پشتگوێ.

هەروەها وێنەی کریۆنی فەرمانڕەوا بە جۆرێك پێشکەشدەکا، کە تەماشاکەر تێدەگات، کە ئەم فەرمانڕەوایە ڕێز لە یاسا و بڕیارە میرییەکانی خۆی ناگرێ.

سەرئەنجام هیگلی فەیلەسووف بە پشتبەستن بە پێوانە ڕەخنەسازییەکەی بڕیاری ئەوە دەدا، کە تراژیدیای ئەنتیگۆنا کارێکی ناهونەری و بێسوودە.

هۆی بڕیارەکەش هەروەکوو دیارە لەوەوە هاتووە، کە ئارەزووی کەسی و عەقڵی شەخسی لەسەر بنەڕەتی خوو و ڕەوشت و مافی گشتیدا زاڵبووە.

## • هەڵسەنگاندی بیروڕاکانی هیگل

برادلی کە هەروەکوو لەمەوبەر گوتمان بیروڕاکانی هیگلی سەبارەت بە تراژیدیا خستۆتەبەر تیشکی هەڵسەنگاندن و نرخپێدان، سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشاوین، کە هیگل لە بیروڕاکانیدا بەرلەوەی ڕەخنەساز و هونەرمەند بێت فەیلەسووفێکی ئایدیالیزمە، چونکە لە ڕوانگەیەکی بیری و بنەڕەتییەکی گشتییەوە بڕیارەکانی سازدەکات و پشت بە بیروباوەڕی ڕووتی لە ژیانپچڕاو دەبەستێ و هەوڵی ڕابەری هەستیاران دەدات.

برادلی لەم هەڵسەنگاندنەدا دەیەوێ بڵێ هیگل هەرچەندە نووسەرێکی هاوچەرخە، بەڵام هێشتا وەکوو ئەرستۆ باوەڕی بە قەزا و قەدەر هەیە و بەخت و چارەنووس بەهێزێکی بێهاوتا دادەنێت و ئادەمیزاد لەبەردەستی ئەم هێزەدا وەکوو پووش بەدەم باوە ڕێنەدەکێشێ.

خوێنەر و تەماشاکەری هاوچەرخی تراژیدیا، کە مێشکیان بە زانست ئاودراوە چاویان بە ڕۆشنبیریی ڕیالیزمی کراوەتەوە بە ئاسانی بڕواناکەن ئادەمیزاد ئەوەندە بێدەستەڵات بێت، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو زانیمان بیرۆکەیەکی ڕەخنەسازی لەسەردەمی شکسپیرەوە خۆی چەسپاندووەو دووپاتیکردۆتەوە، کە کەسایەتیی ئادەمیزاد خۆی لە خۆیدا گەردوونە. بە مانای ئەوەی خوای مەزن، کە ئادەمیزادی خوڵقاند و توانای بزووتنەوە و بیرکردنەوە و تێکۆشانی پێبەخشیوە و وای لێکردووە، کە کەشتی ژیانی بە ویستەنی خۆی تا ڕاددەیەکی زۆر بەڕێوەببات.

هەرچۆنێك بێت ئەم هەڵسەنگاندنانەی بیروڕایەکانی هیگل دیسانەوە هەر لە ڕوانگەیەکی فەلسەفی و ناوەڕۆکییەوەیە. بۆیە ئێمە لەو باوەڕە داین، کە خاڵی سەرەکی سەرکەوتنی هیگل لە بیروڕاکانیدا مەسەلەی دووپاتکردنەوەی زۆرانبازییە لە هونەری تراژیدیادا، چونکە ئەم مەسەلەیە پەیوەندی هەیە بە دراما و بزووتنەوە و تەکنیکی پێشکەشکردنی ڕووداو و کەسایەتیی ئەم چەشنە لە هۆنراوەی شانۆگەریدا.

## • چوارەم: ڕەخنەساز و هونەرمەندی ئینگلیزی هربرت رید

لێرەدا لە ڕەخنەساز و هونەرمەندێکی دی ئینگلیزی هربرت رید دەدوێین، ئەم هونەرمەندە ڕەخنەسازێکی بە توانا بووە و بە ڕێبازێکی زانستیانە وتاری ڕەخنەسازی نووسیوە و بڵاوکردۆتەوە. بە تایبەتی ئەو وتارە زانستییەی کە سەبارەت بە پەیوەندی لە نێوانی ڕێبازی سریالیزم و ڕێبازی ڕۆمانیزمدا نووسیویەتی.

## ● بەرپابوونی سریالیزم لە ژینگەی ئینگلیزیدا

ئەوەی وتارەکەی رید بخوێنێتەوە، کە دەربارەی سریالیزم و ڕێبازی ڕۆمانیزم نووسیوێتی، تێدەگات، تا چ ڕاددەیەك ئەم ڕەخنەسازە پشتگیری لە پەرناسییەکان دەکات و دەماردەیگرێ بۆ ئەم ڕێبازە نوێیە.

هەروەها ئەگەر خوێنەری ئەم وتارە زانی ژینگەی ئینگلیزی چلۆن بە سروشت و مەیل و ئارەزوو و نەریت و خوو و ڕەوشتی دێرێنە و تا ڕاددەیەکی زۆر حەز لە نوێخوازی و تازەکردنەوە ناکات، گرنگیی ئەم وتارە بە شتێکی زیادەڕۆ لەقەڵەمنادات و هەڵوێستی نووسەرەکەی وەکوو شۆڕشێك تەماشادەکات.

بەڵێ. ڕاستە، کە وێژەی ئینگیزی لە سەرەتای پەیدابوونی ڕێبازی ڕۆمانیزمەوە بە فراوانی سنگی بۆ بەرهەمهێنەرەکانی ئەم ڕێبازە کردۆتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا هیچ کەسێك ئینکاری ئەوە ناکات، کە لوتکەی بەرز لەم وێژەیەدا هەمیشە شانۆگەرییەکانی شکسپیرن، کە دوابەدوای (چۆسەر و میلتۆن) دەمڕاستی کلاسیزمییەکانە.

هەرچۆنێك بێت رید خۆی وێنەی ئەم بارە بە شێوازێکی درامی لە سەرەتای وتارەکەیدا پێشکەشدەکات و دەڵێ: پاش زستانی ساڵی ١٩٣٦ زایینی، کە سەرما و سۆڵەکەی لە ڕاددەبەدەربوو، هەموو گیانلەبەرێك وەکوو مێشکی کۆنەپەرستان لە بزووتنەوە کەوتبوو، لەپڕ مانگی حوزەیران بە گەرموگوڕییەکی بەهاری پەیدابوو. سەرەنجام لە سەرەتای هاوینی ئەو ساڵەدا خونچەی خنکاو پشکوت و داری سەروو سەوز بوو، هونەری ڕاستینە لەو مانگە زیندووەدا بەشداری بەختیاری سروشتی بە کردنەوەی پیشانگەی سریالیزمی جیهانی کرد، بەڵام بەداخەوە ئەو کەسانەی مێشك و دەروون و گیانیان هەمیشە ساردوسڕە، گەرمی ئەم پیشانگایە نەیتوانی تۆزقاڵێك ڕایانبچڵەکێنێ.

هەروەها ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، کە هەمیشە کلێشە و دەربڕینی مردوویان بە سەر قەڵەمەوەیە، بوختان و درۆودەلەسەیەکی زۆریان ئاراستەی هونەرمەندە سریالیزمە بەشداریکەرەکانی ئەو پیشانگایە کرد.

سەرەڕای ئەوانەی لە دەمیاندا دوو سێ زمان هەیە کەوتنە گەڕ بۆ پەلاماردانی ئەم بزووتنەوە هونەرییە خوڵقێنراوە. لەم وێنەیەدا ئاشکرایە، کە زۆربەی کۆمەڵگای ئینگلیزی دەستەویەخە لەگەڵ هونەری سریالیزمدا کەوتنەشەڕ و دووپاتیاندەکردەوە، کە هەموو شتێك دەزانن و لەژێر تیشکی خۆردا هیچ شتێکی تازە نایەتەکایەوە.

ئەم ڕاستییە هەڵبەت لە قسەکانی هربرت ریددا ئاشکرایە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم ڕەخنەسازە وێنەکەی تەواودەکات و دەڵێت: بوختان و درۆودەلەسەی ئەو دەستانە نەیتوانی ڕێگا بەرەو ئەو پیشانگایە بە زیرەکان و خاوەن چێژە بەرزەکان بگرێ، کە زۆربەیان لاو و گەنج بوون، بگرە دەستەدەستە بۆ فێربوون و زاخاودانی مێشك و چەشەوەرگرتن، تەماشای بەرهەمە سریالیزمەکانیان دەکرد و خۆشی و سەرسوڕمانی خۆیان لە بەرزی ئەو هونەرە تۆماردەکرد.

ئەم ڕەخنەسازە زیاتر لە سەر پیاهەڵدانی نرخپێدەرەکانی ئەو پیشانگا سریالیزمە دەڕوات و دەڵێ: کۆتاییهاتنی شەڕی دووەمی جیهانیی، سەرەڕای هەموو ئێش و ئەشکەنجە و ماڵوێرانییەکانی ئەو جەماوەرە، پیشانگای هونەری سریالیزم هەروەکوو خۆی مایەوە، بەڵکوو لە ڕووی ژمارەوە پەرەیسەند و لە ڕووی دڵگەرمییەوە بڕوای بە داوڕۆژی ئەم هونەرە تازە بەهێزتر بوو.

## • هربرت رید و زاراوەی سریالیزم

رید هەروەکوو دیارە تا بڵێیت دەمارگرتووێتی بۆ ڕێبازی سریالیزم، لەبەرئەوەی بە هیچ جۆرێ پشتگیری لە ڕێبازێکی دی ناکات. بۆیە بە هەموو توانایەوە بەرگری لەم ڕێبازە، واتە سریالیزم دەکات و لە لێکۆڵینەوەکەیدا بە بەڵگەیەکی فرە ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێ و لە جیاتی زاراوەی سریالیزم، کە وشەیەکی فەرەنسییە بێژەی (سوپرلزم) بەکاردەهێنێ، بە بیانووی ئەوەوە وشەی (سوپرلزم) جەماوەر لە چەمك و واتاکەی تێدەگەن، کە سەرووی واقیع و بوون دەگەیەنێ و لەگەڵ زاراوەی سریالیزمدا هاوواتایە.

هەروەها بە توندی هێرشدەباتەسەر ڕێبازی کلاسیزم، کە دوژمنی خوێنمژی سریالیزمە. هێرشبردنەکەشی لە ڕوانگەی سیاسەت و ڕامیارییەوەیە و دووپاتیدەکاتەوە، کە کلاسیزم هەمیشە نیشانەی کاری فەرمانبەرانە و هەرگیزاوهەرگیز لە ژێر سێبەری سەرمایەداری و ڕژێمی کۆنەپەرستی و دەمارگرتندا دەخەملێ. جگە لە ئەمە رید بڵاوبوونەوەی ڕێبازی ڕۆمانیزم لەناو گشت چینەکانی میللەتی ئینگلیزدا دەکات بە داردەستی خۆی، بۆیە دووپاتیدەکاتەوە، کە سریالیزم و ڕۆمانیزم هەردووکیان یەك ڕێبازن هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە، ئەوە نەبێت، کە ڕێبازی ڕۆمانیزم لەبەرئەوەی دەنگی کەسایەتییە لە قۆناغی بەربەرەکانی دژ بە زەبر و زەنگی ڕێبازی کلاسیزم، وەکوو سەرەتایەك لە واقعی ژیانی هەستیارەوە هەڵدەقوڵا.

ئەوجا وردەوردە پەرەیسەند و گۆڕا و لە ڕاددەی واقیعی هەستپێکراوەوە بەرەو سەرووی واقیع

بەرزبووەوە و بوو بە ڕێبازێکی نوێ، کە جیهانێکی تازە و واقیعێکی تازە دەخوڵقێنێ.

## • سەرچاوەی هۆنراوەی سریالیزمی لە نێوانی ئەفلاتون و ریددا

هربرت رید دیسانەوە بۆ چەسپاندنی ڕێبازی سریالیزم لە دڵ و دەروونی جەماوەراندا، پەنادەباتە بەر مێژووی ڕەخنەسازیی فەلسەفە. سەرەنجام لە ناوجەرگەی ئەو مێژووەدا پەنجە بۆ بیروڕاکانی ئەفلاتون سەبارەت بە سەرچاوەی هۆنراوە ڕادەکێشێ و دەڵێ: ئێمە کە دووپاتیدەکەینەوە سریالیزم واتای سەرووی واقیع و بوون دەگەیەنێ. بەر لەم دووپاتکردنەوەیە، فەیلەسووفی فەیلەسووفەکان ئەفلاتون وتوویەتی: سەرچاوەی هۆنراوە، خوای هۆنراوەیە.

ئەم وتنە، هەڵبەت مەبەستی واتا وشەییەکەی نییە، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە کە هۆنراوە لە جیهانێکی نادیار و پەنهانییەوە هەڵدەقوڵێ. ئەم جیهانەش بەلای پەیڕەویکەرەکانی ڕێبازی سریالیزمەوە هەست و ناعەقڵی و ناژیری هەستپێنەکراوی هەستیار و هونەرمەندە. کەوابوو ئەم جیهانە بەشێکە لە هونەرمەند، هونەرمەندیش بەشێکە لەو جیهانە، هەموو ڕێبازەکانی هونەر جگە لە ڕێبازی سریالیزم نەیانتوانیوە نهێنی ئەو جیهانە بدرکێنن.

ئەوەی توانی بەم ئەرکە هونەرییە فەلسەفییە هەستێ، هونەرمەندی سریالیزمە. جا کە لێیدەپرسرێ بۆچی تەنیا هونەرمەندی سریالیزم دەتوانێ ئەو ئەرکە ئەنجامبدات؟ وەڵامدەداتەوە و دەڵێ: هۆی ئەو توانایەی هونەرمەندی سریالیزم لەم خاڵانەی خوارەوە سەردەردەهێنێ:

**یەکەم:** هونەری سریالیزم، لاسایی هیچ شتێکی لە ویژە و هونەری باسکراو ناکاتەوە.

**دووەم:** دەربڕینەکانی چ بە وشە بێت چ بە هێڵ و ڕەنگ، هەمیشە داهێنراو و خوڵقێنراون.

**سێیەم:** هونەرمەندی سریالیزم کە بەرهەم دادەهێنێ لە هیچ هێزێك ناترسێ، بەڵکوو بە ئەوپەڕی ئازادی و سەربەستییەوە جڵەوی لێکدانەوە و بیرکردنەوە و هەستکردن بەڕەڵادەکات.

## • پێنجەم: ڕەخنەساز و دەروونناس س. ج. یونج

ئەم ڕەخنەسازە لە لێکۆڵینەوەکانیدا بە وردی باسی زانستی دەروون و ویژەی کردووە و ئەرکی ڕەخنەسازی لەم کۆڕەدا خستۆتەڕوو.

خاڵە سەرەکییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە چوار بابەتی سەرەکی بەدەرنین:

**یەکەم:** جیاوازی لە نێوان تێڕوانینی دەروونشووناس و ڕەخنەسازدا سەبارەت بە دەقی ویژەیی.

**دووەم:** ڕێگای وێژەر لە خولقاندنی بەرهەمی وێژەییدا.

**سێیەم:** هەڵسەنگاندنی بیروڕاکانی فرۆید لە پەیوەندی نێوانی دەروونی وێژەیی و بەرهەمەکانیدا.

**چوارەم:** مەسەلەی کەسایەتی و ڕەنگی گشتی لە داهێنانی وێژەدا.

ئێمەش لە باسی ئەم ڕەخنەسازەدا هەوڵدەدەین، هەرچی بیروڕای گرنگ کە لەو خاڵانەدا هاتوون بە وردی شیانبکەینەوە و سوود و کەڵکیان لێوەربگرین.

## ● وێژە و زانستی دەروون

بەڵگەنەویستە کە بوترێ: وێژەی ڕاستینە ئاوێنەی دەروونی وێژەرە بە دەنگدانەوەی هەستی نەتەوە و مرۆڤایەتی لەقەڵەمدەدرێ.

ئەمە ڕاستییەکە، بەڵام زانستی دەروون و ڕەخنەسازی لە چ ڕوانگەیێکەوە ئەم وێژەیە هەڵدەسەنگێنێ؟ ئایا دەروونشووناس و ڕەخنەساز بە یەک پێوانە نرخی بەرهەمی وێژەیی دەستنیشاندەکەن یاخود هەر یەکەیان پێوانەی تایبەتی خۆی هەیە و لە ڕوانگەیەکی دەستنیشانکراو بە ئامانج و مەبەستی کارەکەی دەڕوانێتە وێژەر؟

ڕەخنەساز و دەروونشووناسی بە ناوبانگ (یونج) وەڵامی ئەم پرسیارانە بەوە دەداتەوە، کە زانستی دەروون و ڕەخنەسازی لە هەڵسەنگاندنی دەقی وێژەییدا ئاسمان و ڕێسمانن:

دەروونشووناس ڕەنگە دەقێکی وێژەیی بە ئەوپەڕی گرنگییەوە وەربگرێت و بۆ سەلماندنی بیردۆزەکانی بە گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی لەقەڵەمبدات، کەچی ڕەخنەساز ڕەنگە دەقی وێژەیی بە کارێکی بێنرخ تەماشابکات و بڕیاربدات، کە هیچ نرخێکی هونەری نییە.

یونج هۆی ئەم جیاوازییەی دەروونشووناس و ڕەخنەساز بەوە دابینەکات، کە دەروونناس بەرهەمی وێژەیی وەکوو دانپیانانێك لە لایەن وێژەرەوە دەخاتە بەرچاو، بەو جۆرەی دەیەوێ.

بە واتای ئەوەی وێژەر ئەگەر هاتوو بەبێ ئاگاداری و پەیڕەوکردنی دەستووری هونەرسازکردن بەرهەمی نووسییەوە هەستی قووڵی دەروونی خۆی دەردەکێنێ، بەڵام ئەگەر هاتوو لە بەرهەمسازکردندا بە چرای ئاگاداری و هۆشمەندی پەیڕەوی دەستوور و یاسای ئەنجامدانی هونەری کرد، ئارەزوو و هێزەکانی دەروونی بە وێنەی هونەریی دروستکراو دەشارێتەوە.

ئەم هەڵوێستەی دەروونشووناسی بێگومان دژی هەڵوێستی ڕەخنەسازە، کە دەیەوێ دەقی

وێژەیی لە ڕووی بنواشە و دەستووری سەنعاتکاری بەرهەمی هونەرییەوە پێگەیشتوو بێت.

ئەم جیاوازییەی نێوانی دەروونشووناسی و ڕەخنەساز هەڵبەت دیاردەیەکی گشتییە. ڕێبازی فرۆید لە شیکردنەوەی دەروونیدا، بە تایبەتی دانیپێدادەنێت بەڵام یونج کە خۆی پێشکەشیدەکات دەیەوێ بەرپەرچیبداتەوە و بیروڕای تایبەتی خۆی سەبارەتی بنوێنێ.

## ● فرۆید و داهێنانی دەقی وێژەیی

ڕێبازە بەناوبانگەکەی فرۆید لە شیکردنەوەی دەروونی ئادەمیزاددا، بە گشتی دەقی وێژەیی لە ڕوانگەی دامرکاندنی هەست و ئارەزووی قەدەغەکراوەوە یەکالادەکاتەوە.

پەیڕەوکەرانی ئەم ڕێبازە بە گشتی و (رانك و ستیکل) بەتایبەتی بیروڕایان وایە، کە وێژەری ڕاستینە مەتەڵێکە، بەرهەمەکانی کە ئاکامی بیرکردنەوە و ملکەچکردنە بۆ یاسای کۆمەڵایەتی بە هیچ جۆرێك نابن بە کلیلی کردنەوەی تەلیسمی ئەو مەتەڵە.

جا ئەگەر لەم ڕێبازە بچینە پێشەوە و بپرسین هۆی ئەم بڕیارە بە چ بیانوویێك ڕاڤەدەکرێت؟ پەیڕەویکەرەکانی لە وەڵامدانەوەدا دەڵێن: هەموو بەرهەمێکی وێژەیی ڕەسەن لە بناغەدا، ئاکامی تاقیکردنەوەیەکی ڕاستینەیە.

لە کۆڕی دڵداریدا بۆ نموونە ئەم تاقیکردنەوەیە دەنگدانەوەی ئارەزوویێکی ناپەسەندە.

وێژەری خاوەن ئەم تاقیکردنەوەیە لەبەر چەند هۆیەکی کۆمەڵایەتی هەوڵدەدات، ئەم تاقیکردنەوەیە داپۆشێ و ئارەزووە ناپەسەندەکەی دابمرکێنێ.

بەم جۆرە ئەم وێژەرە تووشی زۆرانبازییەکی کوشندە دەبێت لە نێوانی ئارەزووەکەی و هەڵوێستی کۆمەڵەکەیدا. سەرەنجام تووشی گرێی دەروونی دەبێت و ئارەزووەکەی لە هەستیدا پەنگدەخواتەوە.

جالەبەر ئەوەی خاوەنی ئەم گرێ دەروونییە هونەرمەندە، هەر دەبێت چەمکێك لەم حاڵەتە دەربخات. هۆی ئەم دەرخستنەش پەردەیەکی لێڵە لە کەڵێشەی زمانی ئەندێشەیی و پێچوپەنا و سۆزی دەستکرد. بە واتای ئەوەی بەرهەمەکەی ئەم هۆیانە، کە پێیدەوترێ: دەقی وێژەیی. ئەم دەقە وێنەیەکی دروستکراوە بۆ تاقیکردنەوەیەکی قەدەغەکراو و ئارەزوویێکی دامرکێنراو، بۆیە ئەم بەرهەمە ڕەنگە هێمایەك بێت بۆ باری ئەنجامدەرەکەی، بەڵام هێمایەکی ناڕاستەوخۆیە.

## • یونج و داهێنانی وێژە لە کەسایەتییەوە بۆ سەرچاوەی مرۆڤایەتی

س.ج. یونج بە چەشنێکی زانستی ورد بیروڕاکانی فرۆید لە داهێنانی دەقی وێژەییدا یەکالادەکاتەوە و بەرپەرچی کەسایەتییەکانیان دەداتەوە و دەڵێ: گومان لەوەدا نییە، کە دەروونی وێژەر، چ ناهۆشمەندی بێت و چ هەستپێکراو پەیوەندی هەیە بە داهێنانی دەقی وێژەییەوە، گرنگی ئەم پەیوەندییە بەوە ڕووندەبێتەوە، کە بیشوبهێنین بە پەیوەندی نێوانی ڕەگوڕیشەی درەختێك و بەرهەمەکانی. بەو واتایە بەرهەمی وێژەر بە هۆی دەروونییەوە کەرەسەی گەوهەری خۆی وەدەستدەهێنێ، بەڵام ئەم دەروونە بە هەموو هێزەکانییەوە چلۆن پێکهاتووە؟ ئایا تەنیا ئاوازێکی کەسییە و لە کۆمەڵی خاوەنەکەی دابڕاوە، یاخود وەکوو سەرچاوەی ئاوی زوڵاڵ لە سەدان ڕێگا و ڕووگەوە ئاوەکەی خۆی وەدەستدەهێنێ و قوڵپ دەدات؟

یونج بە ڕوونی وەڵامی ئەمانە دەداتەوە و دووپاتیدەکاتەوە، کە دەروونی وێژەر ئاوێنەیەکە بۆ دەروونی گشتی نەتەوەکەی و بەرهەمە وێژەییەکانی دەنگدانەوەی ئەم دەروونە گشتییەن.

بۆ نموونە: گۆتێ کە شانۆگەریی (فاوست)ی داهێنا و کتێبی (بەم جۆرە زەردەشت دووا)ی خوڵقاند، زیاتر لە تۆمارکردنی خەون و هەڵچوون و نەریتی نەتەوەی جەرمان بەولاوە هیچ شتێکی دی نەکردووە.

بەم جۆرە ئەوەی گۆتێی کرد بە وێژەر، گۆتێ خۆی نەبوو، بەڵکوو بەرهەمی فاوست و بەم جۆرە زەردەشت دوا بوو، کە گۆتێیان خوڵقاندووە.

بەم جۆرە کلیلی تێگەیشتن لە داهێنانی دەقی وێژەیی تەنیا دەروونی وێژەر نییە، بەڵکوو ئەم کلیلە لە ڕوانگەی نەتەوەی وێژەرەوە وەدەستدەهێنرێت.

هەروەها نەتەوەش چەند خاوەنی تایبەتی خۆماڵی بێت، دوورگەیەکی پچڕاو نییە لە دەریایەکی بێسنوور، بەڵکوو کێڵگەیەکی سەوزە لە زەمینەی جیهان، کە لە ئاسمانی مرۆڤایەتییەوە بە بێسنوور ئاووهەوا وەردەگرێ هەروەکوو لەم تێبینییانەی (یونج)ەوە ساغدەبێتەوە، داهێنانی دەقی وێژەیی تاقە ڕێگایەکی نییە، بەڵکوو ڕێگاکانی جۆربەجۆر و هەمەڕەنگن، لە دەروونی وێژەرەوە دەستپێدەکات و بە دەروونی نەتەوەدا تێدەپەڕێت و لە گەڵ دەروونی مرۆڤایەتیدا یەکدەگرێتەوە.

بەم جۆرە ئەم کارە هونەرییە چەند (کەسی)بێت لە هەمان کاتدا گشتی و مەوزووعییە و گرنگ ئەوەیە ڕەسەن بێت و کار لە سۆز و بیری کۆمەڵ بکات و لەتەك هەستی مرۆڤایەتیدا دەنگبداتەوە.

نموونەکانی یونج بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەی، دیارە کە بەڵگەنەویستن و جێگای مشتومڕنین، بەڵام ئەوەی لەم بۆچوونە بە لامانەوە گرنگە دوورخستنەوەی دەقی وێژەییە لە نەخۆشی دەروونی و بیردۆزەی دامرکاندنی ئارەزووەکانی وێژەر، چونکە بەمە وێژە بە کارێکی سوودبەخش و بەکەڵك لەقەڵەمدەدرێ و وێژەریش وەکوو پێشەوایەکی ڕابەر تەماشادەکرێ.

## • حەوتەم: ڕەخنەساز و هەستیار و فەیلەسووفی ئینگلیزی ستیفن سبندر

ستیفن سبندر کە ڕەخنەساز و هەستیار و فەیلەسووفێکی ئینگلیزییە. لە کۆڕی ڕەخنەسازیی پراکتیکیدا بیروڕای تایبەتی خۆی هەیە.

ئەوەی لەم بیروڕایانە دەمانەوێ لێیبدوێین و شیبکەینەوە و هەڵیبسەنگێنین، وتارێکە بە ناوی (چۆن هەڵبەستێك دەهۆنینەوە). سەردێڕەکانی ئەم وتارە لەم بابەتانەی خوارەوە پێکهاتوون:

**بابەتی یەکەم: مەرجەکانی هەستیار**

**بابەتی دووەم: هۆنراوەی لادەر لە یاسا و دەستوور**

**بابەتی سێیەم: یادکردنەوە**

**بابەتی چوارەم: خورپە و بەهرە"الهام"**

**بابەتی پێنجەم: بڕوا بە هونەر**

**بابەتی شەشەم: ئاهەنگی هۆنراوە**

## • مەرجەکانی هەستیار و هۆنراوەی لە یاسا و دەستوورلاداو

لە کۆنترین قۆناغەکانی ڕەخنەسازیی جیهاندا، مەسەلەی سەرچاوەی هەستیار لە هۆنینەوەی هەڵبەست، جێگای مشتومڕی مێژوونووسەکان بووە:

هەندێك لەم مێژوونووسانە بیروڕایان وایە، کە ئەم سەرچاوەیە هێزێکی پەنهانییە لە خورپە و بەهرە و هەندێکی دیکە بە پێچەوانەوە، بڕوایان وایە، کە ئەم سەرچاوەیە زانست و زانیاری و فێربوونە.

ستیفن سبندر هەروەکوو لەمەوبەر گوتمان لە کۆڕی پراکتیکدا بۆچوونە ڕەخنەسازییەکانی دەچەسپێنێ و بە هیچ جۆرێك لە ڕوانگەی فەلسەفە و بیردۆزییەوە تەماشای ئەو مەسەلەیە ناکات، بەڵکوو بە چاوێکی ورد دەڕوانێتە باری هەستیار و وەکوو ئادەمیزادێك لێیدەکۆڵێتەوە و

مەرجە تایبەتییەکانی کارەکەی دەخاتەڕوو و دەڵێ: ئادەمیزاد بۆ ئەوەی ببێ بە هەستیارێك پێویستە چەند مەرجێکی تێدا بەدیبکرێن.

ئەم مەرجانە بەگشتی پەیوەندییان بە سروشتی گوێچکە و چۆنێتی بیرکردنەوە و ئەندێشە بەکارهێنان و بڕوا بە ئیشەکەی و زاڵبوون بەسەر زماندا، هەیە. جەمسەری ئەم مەرجانە ئەوەیە خاوەنەکەیان دەبێت بە وێنە بیربکاتەوە و کەرەسەی زمان بکات بەهۆی ڕوونووسکردنی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە. بەو واتایە هەستیار پێویستە بە هەستپێکەری گوێگرتن و تەماشاکردنێکی ورد و هەستکردنێکی قووڵ، گەنجینەی یادکردنەوە و ئەندێشەی سازکردنی دەوڵەمەندبکات. ئەوجا لە بۆتەی ئاواز و ئاهەنگدا بە سۆز و هەڵچوون، زمانی دەربڕین سازبکات.

ئەم کارە لێکدراوە بێگومان یاسا و دەستووری خۆی هەیە، کە کۆمەڵەکەی هەستیار لەگەڵیدا ڕاهاتووە و چەژو چێژی لێوەردەگرێت. ئەگەر هاتوو هەڵبەستێك لەم یاسا و دەستوورە لابدات بێگومان ئەم هەڵبەستە ئاکامێکی هونەری ڕاستینەی نییە، بەڵکوو وڕێنەیەکی نامەعقولی شێتێکە.

سبندر کە بەم جۆرە لە سروشتی کاری هەستیار دەکۆڵێتەوە، مەبەستی بەرپەرچدانەوەی ئەو ڕێبازانەیە، کە بڕوایان بە دەستوور و یاسای هونەری نییە، وەکوو ڕێبازی پەرناسیزم و سریالیزم و ڕێبازی نامەعقول و ڕێبازی کەسی و ڕێبازی ئینتیباعی، بۆیە بە ناو پەنجە بۆ هەندێك لەم ڕێبازانە درێژدەکات و دووپاتیدەکاتەوە، کە پەیڕەویکەرەکانی ئەم ڕێبازانە تێگەیشتنێکی گشتی و فراوانیان سەبارەت بە هونەری هونراوە نییە و وادەزانن کە هۆنراوە یەك چەمکی هەیە، ئەم چەمکەش لادانە لە یاسا و دەستوور.

لەبەر تیشکی ئەم تێبینییەدا ڕەخنەسازەکەمان نموونەیەك لە بەرهەمەکانی هەستیارێکی نامەعقول دەهێنێتەوە، کە تێیدا وتوویەتی: (شەو - تاریکی - ئەستێرە - ئاسۆیەکی بێسنوور - شین - ئارەزوومەند - ئەستوون - هەور - مانگ - داس - دروێنە - ئاگر - سەربازگەیەکی فراوان - دۆزەخ ...)

ئەوجا بەتوندی دەیخاتەبەر نەشتەری پووچکردنەوە و دەڵێ: ڕیزکردنی ئەم وشانە هیچ پەیوەندییەکی بیری ناگەیەنێت و هیچ ئاوازێك بەرپاناکات و لە دەمەتەقێی وڕێنەکەر و شێت دەچێت، چونکە لە مەرجەکانی هەستیار و کاری هونەری لایداوە.

## • خورپە و کاری هونەری

ستیفن سبندر کە هونەری هۆنراو بە کارێك لەقەڵەمدەدات و بڕیاری بیرکردنەوە و موعاناتی ژیری وەکوو هۆیێکی سەرەکی لە خوڵقاندنیدا دەدات، بەرەنگاری پرسیارێك سەبارەت بە خورپە و بەهرە لەم کارەدا دەبێتەوە:

ئایا هەستیار لە ئەنجامدانی کاری هونەریدا لە سەرچاوەی خورپە و ئیلهامەوە هیچ یارمەتییەك وەردەگرێت؟ یاخود هەر بە زانست و بنواشەی زانیاری بەرهەمەکەی دەهێنێتەدی؟ ڕەخنەسازەکەمان لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا دەڵێ: خورپە و ئیلهام لە سەرەتای پێکهێنانی هەڵبەستێکەوە دەوری هەیە. هەروەها لە کۆتایی ئەنجامدانیشدا ڕەنگدەداتەوە، بەڵام لە نێوانی ئەم کۆتایی و ئەو سەرەتایەدا، مێشك و هۆشمەندی و دەستی زانستکاری خۆیان ئەنجامدەدەن.

سبندەر بۆ چەسپاندن و ڕوونکردنەوەی ئەم بیروڕایە وتەیەکی (پۆل ڤالێری) دەهێنێتەوە، کە دەڵێ: خۆی هونەر یان سروشت تاقە شادێڕێك لە هەڵبەستێکدا بە ڕێگای خورپە و ئیلهامەوە دەبەخشێ بە هەستیارێك، ئەو هەستیارە دەبێت بە توانا و ژیریی خۆی دێڕەکانی دی هەڵبەستەکە بدۆزێتەوە و تەواوی قەوارەکەی بنیاتبنێ.

سبندەر لەبەرئەوەی لە کۆڕی پراکتیکدا دەیەوێ، بیروڕا ڕەخنەسازییەکانی بهێنێتەوە. نموونەیەك لە چۆنێتی هۆنینەوەی یەکێك لە هەڵبەستەکانی دەهێنێتەوە و ڕووداوەکانی لەدایکبوونی دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

ڕۆژێك لە ڕۆژان بە شەمەندەفەر بە ناو ڕێگایێکی کشتوکاڵی (کشتەمەنی)دا سەفەرمدەکرد، لە پەنجەرەی فارگۆنەوە تەماشای کێڵگەیێکی فراوانم دەکرد، کە جووتیارەکان لە لایەکەوە تۆیان دەوەشاند و تراکتۆرەکانیش لە لایەکی دیکەوە سنگی پارچە زەوییەکیان هەڵدەدڕی.

بە باڵی ئەندێشە لەم دیمەنەوە بەرەو جیهانێکی ڕۆژانە هەنگاوم هەڵگرت و بەهێزی زەین زۆرانبازی نێوان چینی دەوڵەمەند و چینی هەژارم وەکوو شریتێك هێنایەبەرچاو، وێنە بە وێنە لەگەڵ ئەم شریتەدا بیرمکردەوە، جووتیاری هەژار زەوی دەکێڵێ و تۆو دەوەشێنێ و بە درێژایی ڕۆژانی وەرزێك ئاوی مەرەزە دەدات و بژاریدەکات، هەتاکو دەبێت بە بەرهەم و بەرهەمیش دەبێت بە خواردنی چینێك، کە خۆی ماندوونەکردبێت و کیسەیان بە بەری ڕەنج و داماوی پڕدەکەن.

لە باوەشی ئەم وێنانەدا ڕەخنەسازی هەستیار دەڵێ: لە پڕ ڕستەی زمانی گوڵ و کاکڵەی بەرهەم بە خەڵاتی خورپە و بەهرە، وەکوو بروسکەیەك بەدڵمدا هات.

ئەوجا ئەم ڕستە خوریەیەم کرد بە هەوێنی بنیاتنانی هەڵبەستێك، کە تیایدا لە ڕێگای دەربڕینی (زمانی گوڵەوە) باسی خۆشەویستی و دادپەروەری و یەکسانی میللەتم کردووە، لە ڕێگای ( کاکڵەی بەرهەمەوە ) لە دووبەرەکی و خۆپەرستی و زوڵم و زۆرداری دوام.

سبندار بە گێڕانەوەی چۆنێتی لەدایکبوونی ئەم هەڵبەستەی دەیەوێ بیسەلمێنێ، کە هەستیار ئەگەر پێویستی بە خوریە و بەهرە هەبێ، ئەم پێویستییەی تاقە هەنگاوێکە بۆ بڕینی ڕێگایەکی دووروودرێژ، بەرەو ئەنجامدانی کارێکی ئامانجدار.

ئەم ڕێگایەش هەڵبەت ڕێوشوێنی خۆی هەیە و لەسەر چەند بناغەیەکی زانستی دامەزراوە، بۆیە بەڕوونی پەنجە بۆ ئەم بناغانە درێژدەکات و دەپرسێ:

**ئایا هەڵبەست هەیە تریە و ئاهەنگ و ئاوازی ڕێکوپێکی نەبێت؟**

ئەم تریە و ئاواز و ئاهەنگە ڕێکوپێکە لە ژمارەیەکی دستنیشانکراوی بڕگە و کۆتایی پێکهێنانی وشەکان بە دەنگێکی تایبەتی پێکنەهاتووە؟

لە وەڵامدا ڕەخنەسازەکەمان وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بە (ئەرێ) دەداتەوە. ئەوجا بڕیارێك سازدەکات و دەڵێ: کەوابوو دەبێت بزانین، کە هەستیار بەهۆی زانستی کێش و قافیەوە فێری ئەم لایەنە گرنگەی هەڵبەست دەبێت.

هەروەها زمانی هەڵبەست، کە لە وشە و ڕستە و داڕشتن وشێواز پێکهاتووە، ئایا هەستیار بەهۆی زانینی بەکارهێنانی فەرهەنگ و زانستی ڕێزمان و زانستی ڕەوانبێژییەوە وەدەستیناهێنێ؟ لە وەڵامدا دووبارە ڕەخنەسازەکەمان بە (ئەرێ) بیروڕای خۆی دەچەسپێنێ.

سەرئەنجام بڕیارێك سازدەکات و دەڵێ: ئەم زانستانە، هەموویان، کە هەستیار پێویستی پێیان هەیە وا لە هونەرەکەی دەکەن، کە ببێت بە کارێك لە کارەکانی ئادەمیزاد.

## • بیری هەستیار

سبندر لە شیکردنەوی سەرچاوەکانی توانای هەستیار لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا، بە ڕادەی یەکەم پەنجە بۆ بیر و توانای یادکردنەوە درێژدەکات و دەڵێ: ئەوەی هەستیار لە ئادەمیزادی ئاسایی جوادەکاتەوە بیری تیژ و بەهرەی سروشتی بێهاوتایە. بەم پێیە باشترین پێناسەی هەستیار ئەوەیە، کە مرۆڤێکی بیرکەرەوەیە و دەتوانێ یادگاری دێرین لە ناخی دەروون و بیریدا تۆماربکات و پاش ماوەیەکی فرە ئەو یادگارییە هەروەکوو خۆی و بە چەشنێکی تەواو بهێنێتەوە یاد.

باشترین نموونە بۆ ئەم پێناسەیە باری هەستیاری بەناوبانگ "دانتی" یە، کە بەیەکگەیشتنەکەی لەگەڵ "بیاتریس"دا لە تەمەنی نۆساڵیدا، هەوێنی هۆنراوەی کومیدیای خواییە.

هەروەها هەڵکەوتوویی (وردسورث) لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا سەبارەت بە جوانیی سروشت لە تاقیکردنەوەکانی سەردەمی منداڵییەوە هەڵقوڵاوە.

ڕەخنەسازەکەمان بۆ چەسپاندنی ئەم بیروڕایە ڕوونکردنەوەی بەڵگە لە ژیانی هونەری خۆی دەهۆنێتەوە و دەڵێ: مەبەستم لە یادکردنەوە هێنانەوەیادی تاقیکردنەوەی هەستی و سۆزییە، نەك یادکردنەوەی شمەکی ڕۆژانە بۆ نموونە بە هیچ جۆرێك ڕەنووسی بیستەکی (ڕەقەمی تەلەفۆنی) هاوڕێکانم یادناکەمەوە، بگرە زۆر جاریش لە بیرمدەچێ، کە پۆستەی ڕۆژانەکەم لە کوێ هەڵگرتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕووداوە هەستییە هەرە دێرینەکان وەکوو شریتی زیندوو یاددەکەمەوە. ئەگەر هاتوو شوێنەوارێکم بەرچاوکەوت، کە پەیوەندی بە ڕوودانەوە هەبێت، تەنانەت لەم حاڵەتەدا شوێنی سەردەمی ئامادەبوو لە یاددەکەم و بە خێرایی بەرەو ڕابردوو خێوەتی دڵ و هەستم ڕاپێچدەکەم و سەرلەنوێ ژیانی لە دەست ڕۆیشتوم وەردەگرمەوە و پێیدەژیم. باشترین نموونەی پراکتیکی ڕەخنەسازەکەمان هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی دەفتەری تێبینی هۆنراوەکانێتی، کە پانزە ساڵ لەمەوبەر نووسیویەتییەوە.

لە یادگاری ئەم دەفتەرەدا دەگێڕدرێتەوە، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم بیرۆکەیەی نووسیوەتەوە و وتوویەتی: هەتاو لەسەر ڕووی هەردەکانەوە و لەناو دارەکاندا هەڵدێت و پێکەنین بەسەر کێڵگە سەوزەکاندا دابەشدەکات..

سبندر ئەم بیرۆکەیە بەوە پێناسەدەکات، کە بابەتی هەڵبەستێکی ناتەواوە، پانزە ساڵ لەمەوبەر وەکوو یادگارێك تۆماریکرد بۆ دەربڕین لە بارێکی کەسی، کە لەسەر گوێسەبانەی خانووەکەیدا ڕاوەستابوو، تەماشای ڕێگای گوندەکەی دەکرد، کە ئەمبەر و ئەوبەری بە درەختی سنەوبەر و چنار و سەروو ڕازابووەوە و لە پشت درەختەکانیشەوە، دەریا شەپۆلی دەدا و هەتاو وردەوردە لە ئاسۆی کەناری دەریاکەوە بەرزدەبووەوە و تیشکە زێڕینەکەی بەرەو لقوپۆپی درەختەکان دەکشا و باوەشی بە گوێسەبانەی خانووەکەدا دەکرد.

ئەم یادگارە دێرینە بەقووڵی لە بیری هەستیارەکەماندا، نەخشەی خۆی کێشاوە، بۆیە کە نزیکەی چارەکسەدەیەك بەسەریدا تێپەڕی و هەمیشە قوڵپیدەدات، تەنانەت کە ئەو گوندەی بەجێهێشت، لە شاری لەندەن ئارامیگرت، بەیانیان کە چاوی بە تیشکی هەتاو لە وەرزی بەهار و هاویندا هەڵدەهێنا، سەرلەنوێ ئەو دیمەنە دەهێنێتەوە بەرچاوی و دەیکات بە سەرچاوەی

هەڵبەستێکی نوێ.

سبندر لەبەر تیشکی ئەم بیروڕایەیدا، سەبارەت بە بیر و یادگاری هەستیار چەند بنواشەیەکی ڕەخنەسازی سازدەکات:

**یەکەم:** توانای یادکردنەوەی لە لای هەستیاری هونەرمەند، تەنیا یادکردنەوەیەکی ڕووکەش ناسەلمێنێ، بەڵکوو ئەوە دەسەلمێنێ هەستیار بۆ دووجار و زیاتر تاقیکردنەوەیەك ببووژێنێتەوە سەرلەنوێ لە ژێر خێوەتە خوڕبە بەخشندەکەیدا بژی.

**دووەم:** یادکردنەوەی سەرچاوەی هەمیشە زیندووی هونەرە، هەستیار دەتوانێ بە هۆیەوە خۆی لە تاقیکردنەوەی تازە بپچڕێنێ و لەهەمان کاتدا بە تیشکە جادووگەرەکەی، هەڵبەست بهۆنێتەوە.

**سێیەم:** ئەندێشە، کە ئامرازی تابلۆکێشانە جگە لە ڕاهێنان و مەشقی یادکردنەوە هیچ شتێکی دی نییە بەهرەی هەستیار لە ئەندێشەسازکردن بخوڵقێنێ، تەنیا هێزی یادکردنەوەی توندوتیژ نەبێت.

**چوارەم:** کەموکوڕی یادکردنەوە و بیری هەستیار لەوەدا دابینەکرێت، کە هەندێ جار سنوورێکی کەسی و نێرگزی و خۆپەرستی هەیە، ناتوانێت ببێت بە شوێنەوارێکی بابەتی و گشتی.

ڕەخنەسازەکەمان لەبەر تیشکی ئەم بنواشانەدا دووپاتیدەکاتەوە، کە هەستیار و یادکردنەوە دوو وشەن بۆ یەك واتا. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ مرۆڤ ئەگەر توانای یادکردنەوەی نەبوو، بە هیچ جۆرێك بە هەستیار ناژمێردرێ.

## • بڕوای هەستیار

ستیفن سبندر پاش ئەوەی لە هێزی بیر و توانای یادکردنەوەی هەستیاربووەوە، لە مەسەلەی بڕوای هونەرمەندی کۆڵییەوە و وتی: هونەرمەند ئەگەر هاتوو توانای هۆنینەوەی هەڵبەستی هەبوو، بە هەستیارێکی سەرکەتوو ناژمێردرێ، ئەگەر هاتوو بڕوای بە خۆی و هونەرەکەی نەبوو، بڕواش بێگومان نابێت بەوە ڕاڤەبکرێت، کە لوتبەرزی و خۆبەزلزانینە، بەڵکوو پێویستە بەوە دابینبکرێت کە خۆپاراستنە لە ڕاڕایی و دوودڵی و ناڕوونی ئامانج و خۆنەناسین.

هەستیار ئەگەر هاتوو بڕوای بە هونەرەکەی هەبوو، دەتوانێ بە بێگرێ و بە بێ کۆسپ دڵی خوێنەرانی ڕابگرێت و جڵەوی ڕابەریکردنیان بگرێ بەدەستەوە.

ڕەخنەسازەکەمان بەڵگەگەلێک لە ژیانی هەستیارە بەناوبانگەکانی بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەی (بڕوا) دەهێنێتەوە، بەتایبەتی شاهەستیارە ئینگلیزەکان.

شکسپیر کە لە شانۆگەری و لە هەڵبەستە گۆرانییەکانیدا زۆرجار بڕوای بە هونەرەکەی چەسپاندووە. سەرەڕای ئەم بەڵگەگەلانە ڕەخنەسازەکەمان لە ژیانی خۆیەوە نیشانەی (بڕوا) دەهێنێتەوە و دەڵێ: کە لە تەمەنی نۆساڵیدا بووم لە ناوچەی دەریاچەکاندا، باوکم هەڵبەستەکانی (وردسورث)ی بۆ دەخوێندمەوە و لەو کاتەوە تێگەیشتم بڕوا بەکارتێکردنی هونەر چەند گرنگە، چونکە بە هۆیەوە هەستیار دەتوانێت لە کارە تاقانەکەیدا سەربکەوێ.

کاری هەستیار وەکوو کاری فەرمانبەر و کاربەدەست و کاسبکار نییە، کە بە هۆی زەبروزەنگی پارە و دەستڕۆیشتن و چالاکی لەشییەوە ئامانجی خۆیان دەهێننەدی، کەچی کاری هەستیار تەنیا لە ڕێگای داگیرکردنی پەرمودەی خوێندەوارانەوە دەتوانێ سەربکەوێت و پلەی نەمریی وەدەستبهێنێ.

ڕەخنەساز و هەستیارەکەمان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی و ڕوونکردنەوەی سروشت و مەبەستی ئەم هەڵبەستەی دەهێنێتەوە، تێیدا وتوویەتی:

ئاشتی و دڵنیاییم پێببەخشە. پەرموودە و هیوام پێببەخشە. ڕێگام بدەرێ بگەمە لوتکەی نەمری و ڕۆژی هەمیشە شەوقدەرەوە،

کە لەوێدا بەسەر مەملەکەتی وشە زاڵدەبم و ڕاڕایی و دوودڵی لە ژیانمدا ئاوادەبێت.

ئەگەر ئەم ئاواتەم بۆ نەیەتەدی،

وەکوو بەرخۆڵەیەک بەژێردەستی لەژێر چەنگی گورگان دەبم.

هەروەها وەکوو ئاژەڵێکی بەسەزمان، بەبێ دڵنیایی لەملا بۆ ئەولا سەرگەردان دەبم..

## هەشتەم: ڕەخنەسازی چەشە. داڤید هیوم

ئەم ڕەخنەسازە لێکۆڵینەوەیەکی وردی دەربارەی (چەشە) نووسیوەتەوە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا زانستیانە لەم خاڵە سەرەکیانە دەدوێ:

**یەکەم:** بوونی چەشەیەکی گشتی و تایبەتییەکانی ئەم چەشەیە.

**دووەم:** جیاوازی خەڵکی لە چەشە و هۆیەکانی ئەم جیاوازییە.

**سێیەم:** زاراوە دەربڕەکانی چەشەی گشتی.

**چوارەم:** دەستووورە گشتییەکانی نووسینەوە و ئەرکی چەشە لە هەڵسەنگاندنیاندا.

**پێنجەم:** ڕەخنەسازیی چەشە.
**شەشەم:** ڕێگا بۆ خولقاندنی چەشەی هونەری.
ئەم خاڵە سەرەکیانەی لێکۆڵینەوەکەی داڤید هیوم، هەروەکوو دیارە بابەتێکی گرنگ لە ئاسانکردنی ئەرکی ڕەخنەساز بەرپادەکەن. ئێمەش لەم باسەدا تێدەکۆشین ڕوونیانبکەینەوە.

## • جیاوازی چەشەی خەڵکی

داڤید هیوم، لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەیدا سەرەنج بۆ جیاوازی چەشەی خەڵکی ڕادەکێشێ و دەبێژێ: لەوە ڕوونترنییە، کە خەڵکی لەم چەشەیەدا جیاوازن و بەدەگمەن یەکدەگرنەوە، تەنانەت ئەگەر هاتوو لە ژێر دەستەڵاتداری حکومەتی خاوەن ئایدۆلۆژییەتێکی یەکگرتوودا ژیابوون بە بیروباوەڕ و پەیامدارییەکی دەستنیشانکراو لە زانست و هونەر مێشکیان زاخاودرابوو، بگرە ئەگەر هاتوو چاومان بەسەردەمە جیاوازەکانی مێژوودا خشاند و لە باری نەتەوە لەیەکتربچڕاوەکانمان کۆڵییەوە، هەمان جیاوازی دەستنیشاندەکەین.

سەرەنجام ڕەنگە لەبەر تیشکی ئەم جیاوازییەدا بتوانین، بڵێین هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەکانی ئەم سەرزەمینە، جیاوازی گەلێك لە چەشە و چێژ دەیخەنە بارێکی سۆزی و دەروونی تایبەتییەوە و هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئەم نەتەوەیە بە ڕەنگێکی چەشەی تایبەتی بە خۆی هەڵوێستێك سەبارەت بە دیاردەکانی ژیان بنیاتدەنێ و هەروەکوو چلۆن وێنەی سەر پەنجەرەکانی تایبەتن بە خۆی هەروەها چەشە و چێژی کەسی هەیە.

ئەمە ڕاستییەکە بە ئاسانی بەرپەرچنادرێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا، بەرامبەر بەم ڕاستییە بەڵگەنەویستێك هاتۆتەکایەوە و دووپاتیکردۆتەوە، کە ئادەمیزاد چەند دەمار بۆ چەشە و چێژی تایبەتی بیگرێ، ناتوانێ ملکەچی چەشە و چێژی گشتی نەبێت.

ڕەخنەسازەکەمان سەبارەت بەم بەڵگەنەویستە پەنادەباتە بەر زاراوەکانی زمان بۆ تەسککردنەوەی جوغزی چەشە و چێژی تایبەتی و دەڵێ: جوانی و ناشیرینی لای هەموو نەتەوەیەك یەکالاکراوەتەوە و هیچ کەسێك لە ئەندامانی نەتەوەیەك ناوێرێ بڵێ حەز لە جوانی ناکەم و ناشیرینم خۆشدەوێ. ئەمە بە جۆرێکی گشتی و لە ڕوانگەیێکی دەستنیشانکراویشەوە دەتوانین دووپاتیبکەینەوە، کە هەموومان شادیی خۆمان سەبارەت بە نووسینەوەیێکی بەهێز و ڕوون و بەکەڵك دەردەبڕین و لە ئاستی کاری دەستکرد و لاواز و زیادڕۆ نارەزایی خۆمان دەخەینەبەرچاو.

## • زمان و یەکێتیی چەشە

داڤید هیوم لە چەسپاندنی چەشەی گشتیدا، پەنجە بۆ زمان درێژدەکات وەکوو هۆیێکی سەرەکی لە هۆیەکانی ئەو چەسپاندنە. ئەوجا دووپاتیدەکاتەوە، کە هیچ کەسێك ناتوانێ بە چاکە قایل نەبێت و دڵخۆشی خۆی لە خوێندنەوەی وێنەکانی لە وێژە و بینینی شوێنەوارەکانی دەرنەبڕێ.

سەرئەنجام دادپەروەری و ئازایەتی و جوامێری و زیرەکی و تایبەتییە بەرزەکانی دیکەی ئادەمیزاد و کۆمەڵ هەمیشە بە هەموو زمانێك جێگای ڕەزامەندی و قایلبوونی چەشە و چێژە، بەڵام لە کاتی پێشکەشکردنی وێنەی جۆربەجۆر و تێفکرینی ورد لەم وێنانە چەشە و چێژ سەردەردەهێنێ. بۆ نموونە کە خوێنەر وێنەکانی (هۆمیرۆس)ی هەستیاری ئەغریقی بەناوبانگ دەربارەی ئازایەتی و قارەمانی ئەسینا ( ئەخیل)دەخوێنێتەوە تێبینیدەکات، کە ئەو وێنانە زەبروزەنگ و خوێنڕشتن و دڕندەیی دەنوێنن، هەروەها کە لە ژیریی (یولیس) بە هۆی ڕستە و دارشتنی وێژەیی ئەو هەستیارە دەکۆڵێتەوە و تێیدەفکرێ بۆی ساغدەبێتەوە، کە ئەو ژیرییە هەندێك جار ڕێگای فڕوفێڵ و دەستبڕین دەگرێتەبەر.

پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە ئایا هەموو خوێنەرێك ئازایەتیی ئەخیلی بەدڵ دەبێت ؟ کە دەبینێ خوێنی دوژمنەکانی بە دڕندەیی دەرژێنێ بە بێ جیاوازی ماڵ و شاری (تەڕوادییەکان) تێکدەدات؟ ایاخود گشت خوێنەرێك کارەکانی (یولیس) بە ژیریی و هەڵکەوتوویی لەقەڵەمدەدات، کە بۆی دەردەکەوێ ئەم فەرمانڕەوایە ژیریی و عەقڵی خۆی بۆ نانەوەی داو و تەڵە لە ڕێگای نەیارەکانیدا تەرخاندەکات؟

هەڵبەت چەشە و چێژی خەڵکی لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە یەك نییە. هۆی ئەم یەکنەبوونەش لەوەوە هاتووە، کە سۆز و هەڵچوونیان جیاوازە و هەریەکەیان بە گوێرەی بۆچوونی خۆی لە ئازایەتی و دادپەروەری دەگات، یاخود بابڵێین ئازایەتی و دادپەروەری هەر یەکێکیان خۆی لەخۆیدا جێگای ستایش و ڕەزامەندییە، بەڵام هۆی بەرپاکردنی ئەم ڕەزامەندی و پەسندکردنە بە گوێرەی چێژ و چەشەی ئادەمیزاد دەگۆڕدێ.

## • ڕێگا بۆ سازکردنی پێوانەی چەشە

چەشەی ڕەخنەساز گرنگترین تیشکە بۆ پەردەهەڵدانەوە لە سەر کاری وێژەیی و باشترین کلیلە لە پێناوی کردنەوەی تەلیسم و نهێنی هونەر. ئەوجا کە چەشە بەو جۆرە بێ لەنگەرێت و هەمیشە لە گۆڕاندا بێت، ئایا دەتوانین پێوانەی زانستی و یەکگرتووی بۆ سازبکەین؟ ڕەخنەسازەکەمان داڤید هیوم لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سەرنج بۆ فەلسەفەیێکی بیردۆزەیی ڕادەکێشێت، کە دەڵێت: بە هیچ ڕەنگێ ناتوانرێ پێوانەیێکی زانستی و یەکگرتوو بۆ چەشە لە هەڵسەنگاندنی دەقی وێژەییدا سازبکرێ، چونکە هەڵسەنگاندنی دەقی وێژەیی پەیوەندی بە ژیریی و عەقڵ و مەنتیقەوە هەیە. ئەم چالاکیانەی ئادەمیزادیش بە هیچ جۆرێك ناگەنە بڕیارێکی ڕاستینە، بە پێچەوانەی سۆز و هەڵچوونی ئادەمیزادەوە، کە هەمیشە خۆی لە خۆیدا ڕاست و ڕەوایە.

ئەگەر لە ئالاهەڵگرانی دروشمی ئەم فەلسەفە بیردۆزەییە بپرسین: هۆی ئەم بارە چییە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: ژیریی و عەقڵ و مەنتیق لە ڕاستی و حەقیقەتی کارە هونەرییەکان دەکۆڵنەوە. ڕاستی و حەقیقەتیش هەمیشە ئاکامێکی نسبین و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی جیاوازە، بۆیە لەم ڕووەوە دەیان بڕیار سازدەکرێت، کە تەنها یەکێکیان ڕاست و ڕەوایە. بە پێچەوانەی سۆز و هەڵچوونەوە، کە خۆی لە خۆیدا لە ڕوانگەی خاوەنەکەیەوە شایەنی بڕوایە. بۆیە ئەگەر هاتوو خەڵکی بە ژیریی و عەقڵ و مەنتیق ویستیان جوانی شتێك بسەلمێنن لە کارەکەیاندا بەڵگەکانیان یەك نابێت، بەڵام سۆز و هەڵچوون بە بێ مشتومڕ بەو جوانییە قایلدەبێت، چونکە بڕیارێکی خودی و کەسی سازدەکات.

ڕەخنەسازەکەمان پاش ئەوەی لە پێشکەشکردنی ئەم فەلسەفە بیردۆزەییە دەبێتەوە، بەرپەرچیدەداتەوە و دەڵێ: سۆز و هەڵچوون ڕەنگە ساغ و سەلیم بێت، هەروەکوو چۆن ئەگەر هەستپێکەری تامکەری مرۆڤێك ناساغ بوو، ناتوانێ شیرینی لە تاڵی جیابکاتەوە، وەهاش هیچ کەسێ بە بڕیارەکانی ئەم هەستپێکەرە قایل نابێت بە هەمان پێوانە لە وێژە و هونەریشدا نابێت دەستەوئەژنۆ بەبێ پێوانەیێکی زانستی و یەکگرتوو دابنیشین، بەڵکوو هەر دەبێت ئەم پێوانەیە سازبکرێت.

## • بناغەکانی چەشەی ڕاستینە

بەڵگەنەویستە کە تێگەیشتنی هەڵە، هۆیێکی کاریگەرە لە تێکدانی چەشەی ڕاستینە و ساغ. هەروەها هۆییێکی زیانبەخشە بۆ لێککردنی بەهای جوان و ڕێگا گرتن لە لەززەتبینین. بۆیە ڕەخنەسازەکەمان داڤید هیوم، هەوڵیداوە تایبەتییەکانی چەشەی ڕاستینە یەکالآبکاتەوە و بناغەکانی بە نیازی چەسپاندنی سازبکات.

ئەم نووسەرە بلیمەتە لەم ڕووەوە سێ ڕاستی یەکدیگیر و بە یەکاچووی دەستنیشانکردووە:

**ڕاستی یەکەم:** ئەوەیە هەموو کارێکی وێژەیی هەرچەندە لە چەند پارچەیەك بنیاتنراوە و بوون و قەوارەیێکی یەکگرتووی هەیە، تیشکی ژیریی و یاسای مەنتیق لەم قەوارە و بوونە دەسەلمێنن. سەرئەنجام ئەگەر بمانەوێ لە جوانی کارێکی وێژەیی بگەین، پێویستە بە گشتی هەڵیبسەنگێنین و لە ڕوانگەییێکی فراوانترەوە نهێنی بەرزێتی و پایەبڵندی بدرکێنین.

ئەم ڕاستییە هەڵبەت بناغەییێکی سەرەکی بۆ چەشە سازدەکات و دووپاتیدەکاتەوە، کە چەشەی ڕاستینە دەبێت بۆچوونێکی گشتی هەبێت و بە هیچ جۆری ناشێت (چەشەوەرگر) خۆی ببەستێت بە بەشێك لە بەشەکانی کاری وێژەیی هەڵسەنگێنراو لەبەر تیشکێکدا، بڕیاری جوانی یاخود ناشیرینی بدات. بناغەی گشتی چەشە هەروەکوو دیارە دەبێت لە ڕوانگەییێکی فراوانەوە بڕوانێتە کاری هونەری و پلەی بەرزێتی و نزمی دەستنیشانبکات.

ڕەخنەسازەکەمان بە پشتبەستن بەم ڕاستییە بنەڕەتێکی ڕەخنەسازیی دێرین دەڕوخێنێ، کە لە ڕەخنەسازیی ئەورووپیدا لە سەردەمی هۆراسەوە بنیاتنراوە و دووپاتیکردۆتەوە، کە لە کاری هونەریدا پارچەی ئەرخەوانی بەدیدەکرێت، کە لە بەرزیی جوانی، چاو لە کەموکوڕی پارچەکانی دیکەی کارە وێژەییەکە دەپۆشرێ. هەروەها ئەم بنەڕەتە لە ڕەخنەسازیی عەرەبیشدا بە (بیت القصید) شادێڕی هەڵبەست ناودەبرێ، کە ڕەخنەسازەکان لە بەر تیشکیدا بەرگری لە تەواوی هەڵبەستێك دەکەن، گەرچی تەنیا دێڕێکی سەرکەوتووشی تێدا بەدیبکرێت.

**ڕاستی دووەم:** ئەوەیە کە هەموو کارێکی وێژەیی و هونەری و زانستی ئامانجێکی دەستنیشانکراوی هەیە. بۆ نموونە ڕوونبێژی بۆ قەناعەتکردن بە خەڵکی تێدەکۆشێ. مێژوو مەبەستی ڕابەریکردنی جەماوەر و هۆنراوە ئامانجە سەرەکییەکەی لەززەت و خۆشی بەخشینە. لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا داڤید هیوم بڕیارێکی چەشەیی سازدەکات و دەڵێ: چەشەوەرگر لە کاری وێژەیی دەبێت چەشنە گونجاندنێك لە نێوان ئامانجی ئەو کارە وێژەییە و هۆیەکانی جێبەجێکردنیاندا بەرپابکات و بزانێت ئایا خاوەنی ئەم کارە وێژەییە توانیویەتی ئامانجی

ئەنجامدانی کارەکەی بهێنێتەدی؟ یاخود لەم کۆڕەدا سەرنەکەوتووە.

چەشەی ڕاستەقینە لەسەر ئەم بناغەیە دەبێت بزانێ، کە هەموو بەرهەمێکی هونەری لە چەند خاڵێکی ژیری و چەند ڕاستییێکی عەقڵی پێکهاتووە. ئەم بەرهەمە هونەرییە با هەڵبەستێکی خودی و زاتیش بێت. ئەندێشە و خەیاڵ لەم حاڵەتەدا ناتوانێ خاڵە بابەتییەکانی داپۆشێ. هەرروەها کەسایەتییەکان لە داستان و تراژیدییەکاندا چەند داهێنراو و خوڵقێنراو بن، نابێت لە ڕەفتاری پێ قایلبوون لابدەن، بەڵکوو دەبێت هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مەنتیقی ژیاندا بگونجێتە

**ڕاستی سێیەم:** ئەوەیە هەموو کارێك پێویستی بە توانای ڕازیکردن و هێزی پێ قایلکردن هەیە. ئەم ڕاستییە بناغەیێکی دیکە بۆ چەشەی ڕاستینە بە دەستەوەدەدات و دووپاتیدەکاتەوە، کە چەشە نابێت بەبێ لێکدانەوە و هۆخستنەڕوو بەشداری سازکردنی بڕیار بکات، بەڵکوو دەبێت لە ڕێگای تەعلیل و پەردە هەڵماڵین لەسەر هۆکانی ڕێگای ڕازیکردن و قایلبوون بگرێتەبەر.

داڤید هیوم تایبەتییەکانی چەشە لەم کۆڕەدا بەوە دەستنیشاندەکات، کە دەبێت ڕوون و بێگەرێ بن و بەشێکی فراوانی لە زەین و تێگەیشتن هەبێت و خۆی لە بڕیاری بێ هۆ دووربخاتەوە.

## • ڕەخنەساز و چەشەی ڕاستینە

ئەو سێ بناغەیەی چەشەی ڕاستینە هەروەکوو دیارە قەناعەتمان پێدەکەن کە چەشە یاسا و دەستووری هەیە، بەڵام سەرەڕای ئەم قەناعەتپێکردنە پرسیارێکی سەرەکی هێشتا بە بێ وەڵام ماوەتەوە و دەپرسێ: چەشەی ڕاستینە وەکوو بیرکاری و ئەندازیاری یاسا و دەستووری هەبێت هەموو کەسێك دەتوانێ وەدەستیبهێنێ؟ یاخود لە هەموو حاڵەتێکدا تایبەتە بە چەند کەسێك لە کۆمەڵدا؟

داڤید هیوم سەرنجمان بۆ ڕاستییێکی ژیان ڕادەکێشێ، کە دەڵێ: لە هەموو کۆڕێکی ژیاندا تەنانەت شمەکدا چەند کەسێك توانای هەڵبژاردنی پێداویستی باشیان هەیە. بۆ نموونە، هەموو کرێکارێك پێیناکرێ زێڕی خەوشدار لە زێڕی بێخەوش جودابکاتەوە، بەڵکوو زێڕناس و زێڕنگری لێهاتوو دەتوانێ ئەو کارە بەجێبهێنێ.

ڕەخنەسازەکەمان لە بەرتیشکی ئەم ڕاستییەدا وەڵامی ئەم ڕاستییە دەداتەوە و دووپاتیدەکاتەوە، کە لە هەموو کۆمەڵێکدا، چەند کەسێك دەتوانێ چەشەی ڕاستەقینە بەدەستبهێنن و ڕابەری

خەڵكی بەرەو لەززەت بێنن و لە كاری هونەری بگەن.

ئەم چەند كەسە لە كۆڕی وێژە و هونەردا بە (ڕەخنەساز) ناودەبرێن. جا ئەگەر لێرەدا لە ڕەخنەسازەكەمان بپرسین بە چی ئادەمیزاد بە یەكێك لەو كەسانە و نازناوی (ڕەخنەساز) دەبێت؟ لە وەڵامدا ڕەخنەسازەكەمان چوار تایبەتی بۆ ڕەخنەساز دەستنیشاندەكات:

**یەكەم:** ڕەخنەساز پێویستە هەستپێكەر و لە تواناكانیدا هیچ كۆسپ و گرێیەك نەبێت، واتە: دەبێت لە هەموو ڕوویێكەوە تواناكانی تەواو و پێگەیشتووبن، بۆ ئەوەی بتوانێ بگاتە ناخی دەروونی و كاری هونەری و لەگەڵیدا بەیەكابچێت و لە هەموو لایەنەكانی چێژ وەربگرێت.

**دووەم:** دەبێت خاوەن هەستێكی تیژ و زەینێكی فراوان بێت، بۆ ئەوەی لە هیچ شتێ غافڵنەبێت، هەموو نهێنییەكانی كارە هونەرییەكە بخاتەژێر كەمەری تێگەیشتنییەوە.

**سێیەم:** دەبێت لە كۆڕی هەڵسەنگاندنی هونەردا، پراكتیكێكی زۆری كردبێت و تاقیكراوەگەلێك و مومارەسەیێكی بێژماری هەبێت، چونكە چەشە لە ڕێگای خوێندنەوەی بیردۆزمییەوە بە تەنیا وەدەستناهێنرێ، هەرچەندە خوێندنەوەی بیردۆزمییش چرایەكە بۆ ڕووناككردنەوەی مەیدانی پراكتیك.

**چوارەم:** دەبێت خۆی لە هەموو چەشنە دەمارگیرییەك دووربخاتەوە و بەبێ بڕیارێكی بەهێز و لە پێشەوەدراو، بە پیر كارە هەڵسەنگێنراوەكەوە بچێت و بەبێ مەبەست چەشەی زانستی بەكاربهێنێ.

داڤید هیوم بیروڕای وایە، كە ئەم چوار تایبەتییە بە دەگمەن لە كەسێكدا كۆدەبنەوە. سەرئەنجام لە هەر سەردەمێكدا، ڕەنگە بە زەحمەت ڕەخنەسازێكی بەریڤان و حەكەم هەڵكەوێت.

## • نۆیەم: ڕەخنەسازی بە ناوبانگ ماتیو ئارنۆلد

ئەم ڕەخنەسازە بە ناوبانگە، لێكۆڵینەوەیێكی زانستی سەبارەت بەو بابەتە نووسیوەتەوە و لە لێكۆڵینەوەكەیدا، لەم خاڵە سەرەكییانە دەدوێ:

١- نەمریی هۆنراوە.

٢- ئەركی هۆنراوە لە ژیان و كۆڕی زانستدا.

٣- چلۆن لە هۆنراوە تێدەگەین.

٤- كۆسپەكانی خۆشیبینین لە هۆنراو.

٥- هەڵە میژووییەكانی لێكۆڵینەوەی هۆنراوە.

٦- ڕێبازی زانستی و هونەری بۆ لێکۆڵینەوەی ڕاستینە سەبارەت بە هۆنراو.
لەم باسەدا هەوڵدەدەین ئەم خاڵانە ڕوونبکەینەوە و بۆچوونی ڕەخنەسازەکەمان لە ئاستیاندا بخەینەڕوو.

## • نەمریی هۆنراوە

لە کۆڕی ژیانی ماددیدا، بەرامبەر بە لێشاوی پەرەسەندنی شارستانێتی هاوچەرخمان و زاڵبوونی بەرژەوەندی ڕۆژانە بیرۆکەیێکی بەهێز، هەمیشە بەرزبۆتەوە و بەرزدەبێتەوە و دووپاتیدەکاتەوە، کە هۆنراوە خێراخێرا بەرەو نەمان و فەوتان هەنگاوهەڵدەگرێ، چونکە زادەی هەڵچوون و سۆزە و دەنگی خەیاڵ و ئەندێشەیە. جا لەبەر ئەوەی هەڵچوون و سۆز بۆ بەرژەوەندیی ڕۆژانە هیچ کەڵکێکی نییە و ئەندێشە و خەیاڵیش لە کۆڕی شارستانێتی و ژیانی ماددیدا، ئاوازێکی زیانبەخش و پڕوپووچە. هۆنراوە بەبێ ئەندێشە و خەیاڵ و سۆز و هەڵچوون ناتوانێ بژی و لە ڕۆژێکی نزیکدا زیندەبەچاڵدەکرێ و بە تەواوی شوێنی خۆی بۆ زانست و زانیاری چۆڵدەکات.

ڕەخنەسازەکەمان ئارنۆلد بەتوندی بەرەنگاری ئەم بیرۆکەیە دەبێت و دەیخاتە بەر نەشتەری پووچکردنەوە و بەرتەکدانەوە، دووپاتیدەکاتەوە، کە هۆنراوە دوارۆژێکی مەزنی هەیە و لەگەڵ هەنگاوی یەکەمی پەیدابوونی ئادەمیزاددا لەدایکبووە و هەوێنی نەمریی هەبووە و توانای بڕینی ڕێگای پەرەسەندن و خەملاندنی پێبەخشراوە و بووە بە تاقە بەرهەمی نەمریی درەختی ژیان. هەموو شتێك لەم جیهانەدا چەند مەزن و دەستەڵاتدار بێت، ڕۆژێك لە ڕۆژان مەزنییەکەی بەرەو نزمی و گلۆربوونەوە دەڕوات و دەسەڵاتدارییەکەی کزدەبێت و دەفەوتێ.

ئارنۆلد لەبەر تیشکی ئەم بیروڕایانەدا بڕوا و سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە بڕوا و باوەڕێ نییە تووشی شکست نەبووبێت و مەزهەب و ڕێباز لەدایکنەبووە گومان و دوودڵی نەبووبێت. نەریت و خوو و ڕەوشت نەچەسپاوە، چارەنووسی گۆڕان و نەمان نەبێت، بەڵام هۆنراو لەم دەستوورە بەدەرە، چونکە هەمیشە ماوە و دەمێنێ و لە لوتکەی نەمریدا، هەمیشە دەگەشێتەوە.

ڕەخنەسازەکەمان کە بەم چەشنە هۆنراوە لەقەڵەمدەدات، هەڵبەت بەرەنگاری پرسیارێك دەبێتەوە، کە لێیدێتە پێشەوە و داوای خستنەڕووی هۆیەکانی ئەم بارەی هۆنراوەی لێدەکات. ئەمیش بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەستبەجێ دەڵێ: هۆی سەرەکی نەمریی هۆنراو لەوەدا دابیندەکرێ، کە دەنگی ڕاستییە بە زمانی سۆز و هەڵچوون داڕێژراوە. ڕاستیش مانای ژیانی

ڕاستەقینەیە، سۆز و هەڵچوونیش مانای بوونی مرۆڤایەتییە. جا لەبەرئەوەی ڕاستی و ژیان و بوونی مرۆڤایەتی دوو سەرچاوەی نەمرن، هۆنراویش لەم دوو سەرچاوەیەوە هەڵدەقوڵێ، هەمیشە نەمرە و هەرگیزاوهەرگیز نەمان و فەوتان بە خۆیەوە نابینێ.

## • گرنگیی هۆنراوە

ئارنۆلد لە ڕێبازەکەیدا، بۆ لێکۆڵینەوەی هۆنراوە دووپاتیدەکاتەوە، کە هۆنراوی مرۆڤایەتی ڕووبارێکە و جۆگەکانی ئەم ڕووبارە هۆنراوە نەتەوەییەکانە. مەبەست لەو دووپاتکردنەوەیە بە شێوازە لێکچوواندنەکەی، ئەوەیە، کە هۆنراوە بەرهەمێکی جیهانییە و توێژەر لە دابینکردنی تایبەتییەکاندا، دەتوانێت بڕیاری گشتی سازبکات. بە مانای ئەوەی تایبەتی بەرزی هۆنراو بەندنییە بە ناوچەیەکەوە و نەتەوە نییە لە بەرزیی هۆنراو بێبەش بێت، چونکە هەموو نەتەوەیەك لە ئادەمیزاد پێکهاتووە و لە ناوچەیەکدا دەژی.

ڕەخنەسازەکەمان گرنگیی هۆنراوە بە گشتی لە سێ خاڵی سەرەکیدا دەستنیشاندەکات:

١- هۆنراوە ڕاڤەکەری ژیانی ڕاستەقینەیە.

٢- هۆنراوە خەمڕەوێنی ئادەمیزادە.

٣- هۆنراوە تەواوکەری زانستە.

بەم سێ خاڵانە ڕەخنەسازەکەمان گرنگیی هۆنراوە بە بەڵگەیێکی مێژوویی فرەوە لە ڕوانگەی زانا و فەیلەسووفە جیهانییەکانەوە دەسەلمێنێ. بۆ نموونە: وشەیێکی (وردسورث) دەهێنێتەوە، کە تێیدا وتوویەتی: هۆنراوە دەربڕینی ڕووی زانستە، ئەوجا ئەم وتەیە ڕوونەکاتەوە و دووپاتیدەکاتەوە، کە (ڕوو) ئەگەر خاوەن دەربڕینێکی زیندوو نەبێت دەلالەت لە سەر کەڵکی بوونی هەڵگرەکەی ناکات، یاخود بابڵێین: کە هۆنراوە بۆ زانست ئاوا بێت هەڵبەت ڕاستی زانست دەردەخات و تەواویدەکات، چونکە زانست لە لایەنی ماددی و ڕووکەشی ژیان دەکۆڵێتەوە، بەڵام هۆنراوە نهێنی ژیان دەدرکێنێ. سەرئەنجام ئادەمیزاد بە هۆیەوە لە ژیانی تێدەگات و بە هۆیەوە خەفەتەکانی دەڕەوێنێتەوە و لە ژێر بارياندا دەردەچێت و هەرچی کەموکوڕی هەیە تەواویدەکات.

## • پێوانەی بەرزیی هۆنراوە

هۆنراوە کە سروشتی بەو جۆرە بێت و گرنگی لەو بەرزییە دابێت، دەبێت چلۆن لە تەکیا بجووڵێینەوە و بە چ پێوانەیەك هەڵبسەنگێنری؟

ئارنۆلد لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا دووپاتیدەکاتەوە و دەبێژێ: دەشێت بە جۆرێکی ورد و دوور لە ڕاڕایی و چاوپۆشی، هۆنراوەی ڕاستەقینە لە قسەی هەڵبەستراو جودابکەینەوە و بە پێوانەیێکی زانستی ڕوون هەڵیبسەنگێنین.

جا چلۆن ئەم ڕەفتارە لە تەك هۆنراوەدا دەکرێت و لە چ ڕوانگەیەکەوە ئەنجامدەدرێ؟ ڕەخنەسازەکەمان لە زمانی ڕەخنەسازی فەرەنسی بەناوبانگ (سانت بیڤ)ەوە دەگێڕێتەوە و دەبێژێ: ڕۆژێك لە ڕۆژان کابرایەك لە لای ناپلیۆن زەمی کابرایێکی دی کردووە، بە درۆودەلەسە هەڵسوکەوتی مەحکومکرد. ناپلیۆن لە وەڵامدا وتی: با ئەو کابرایە درۆباز بێت، بەڵام کوانێ ئەو شوێنەی لەو جیهانەدا لە درۆودەلەسە بەدەرە و کوانێ ئەو مرۆڤەی لەسەر ئەم زەوییەدا بەبێ درۆ دەژی؟!

سانت بیڤ لە سەر ئەم ڕووداوە تێبینی خۆی دەچەسپێنێ و دەڵێ: ئەم بیروڕایەی ناپلیۆن ڕەنگە لە مەیدانی ڕامیاریدا ڕاست و ڕەوا بێت، بەڵام لە کۆڕی هونەر و هۆنراوەدا هیچ بناغەیێکی نییە، چونکە ئەم کۆڕە پیرۆزە، بە هیچ جۆرێ درۆودەلەسە ناگرێتەخۆی.

ئارنۆلد لەبەر تیشکی ئەم بڕیارەی سانت بیڤ پێوانەی بەرزیی هۆنراو دادەڕێژێ، دووپاتیدەکاتەوە، کە تاقە پێوانەی هەڵسەنگاندنی هۆنراوە، ڕاستی و بێبەرییە لە درۆودەلەسە. ڕاستی و بێبەری لە درۆودەلەسەش پلەیێکی هەیە نە لە خوارەوەی نە لە سەرەوەی پلەیێکی دیکە نایەت، بە مانای ئەوەی هۆنراوە یەك چەشنە لە بەرزیی و هونەری هۆنراوی نابەرز و ناهونەری نییە، هەروەها لە کۆڕە پیرۆزەکەیدا هۆنراوی مامناوەندی لە ڕووی بەرزیی و هونەرییەوە شوێنی نییە.

ئەم پێوانەیە هەروەکوو دیارە ڕێگە لە هەستیاری لاواز و خاوەن نیوچە توانا دەگرێ، کە بەرزیی هۆنراوە بە هەڵبەستی تێکەڵوپێکەڵ، بە هەڵبەستی مامناوەندی بشکێنێ، ئەو ڕێگایە تەنیا بۆ هەستیاری بلیمەت و هەڵکەوتوو بەرەڵلادەکات.

## • هەڵە سەرەکییەکان لە هەڵسەنگاندنی هۆنراوەدا

ئارنۆلد لە نرخپێدانی هۆنراوە دووپاتیدەکاتەوە، کە خوێنەری ئەم هونەرە دەبێت هەمیشە هەست بەوە بکات، کە لە خوێندنەوەکەیدا لەززەت وەردەگرێت و خۆشیدەبینێت و کەسایەتیی خۆی تەواودەکات و سوودێکی گەورە وەدەستدەهێنێ. ئەم هەستکردنەی خوێنەری هۆنراو، بێگومان هەرگیزاوهەرگیز بەردەوامنابێت، ئەگەر بێت و ڕێگای بەرپابوونی لە دوو هەڵەی سەرەکی ڕانەماڵێ:

**یەکەم:** هەڵەی مێژوویی: ڕەخنەسازەکەمان ئەم چەشنە هەڵەیە بەوە دەستنیشاندەکات، کە ئاکامی نرخپێدانی هۆنراوە لەبەرئەوەی ئاوێنەی قۆناغێکی مێژوویی دێرینە و هەستیارە خاوەنەکەی لەو قۆناغە مێژووییەدا لە بنیاتنانی سامانی نەتەوەکەی دەورێکی گێڕاوە. ئارنۆلد لە بەربەرچدانەوەی هۆیەکانی ڕەواکردنی ئەم هەڵەیە دەڵێ: هۆنراوەی مێژوویی ڕەنگە لە مێژووی وێژەدا نرخێکی هەبێت و لە لێکۆڵینەوەی زمانیدا، سوودێکی هەبێت، چونکە بەهۆیەوە زۆر بابەتی سەردەمی ڕابردوو و ڕووندەبێتەوە و بۆ چەسپاندنی فەرهەنگی زمان و ڕێزمان دەبێت بە نموونە و شاهید، بەڵام تا چ ڕاددەیەك هۆنراوەی مێژوویی لە کۆڕی هونەردا پلەیێکی بەرزی دەبێت؟

ڕەخنەسازەکەمان وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەداتەوە، کە هونەری سەردەم و شوێنێکی تایبەتی نییە، بەڵکوو هونەر سەرچاوەی جوانی و لەززەتوەرگرتن و خۆشیبەخشینە، لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا.

سەرئەنجام ئێمە نابێت لەبەر دێرینیی و کۆنیی دەقێکی وێژەیی پێوانەی هونەری ڕاستەقینە پێشێلبکەین و پلەی بەرز بە هۆنراوەی سەردەمە ڕابردووەکان ببەخشین و بە بیانووی ئەوەی هەستیارەکەی لە کاروانی باب و باپیرانماندا ژیاوە و بە شاعیرێکی بەهرەدار لەقەڵەمیبدەین. سەرئەنجام ڕەخنەسازەکەمان دووپاتیدەکاتەوە، کە هەڵەی مێژوویی گەورەترین کۆسپە لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی هۆنراوەدا.

**دووەم:** هەڵەی کەسی: ئارنۆلد لە شیکردنەوەی سەرچاوەکانی ئەم چەشنە هەڵەیە، پەنجە بۆ ئاشنایەتی و خزمایەتی و پەیوەندی بیری و ڕامیاری درێژدەکات و دەڵێ: گەورەترین کۆسپ لە ڕێگای هەڵسەنگاندنی هۆنراوەدا مەیلی کەسییە، چونکە ئەم ڕەخنەسازەی لەبەر ئەم مەیلە (دەقێك) بەرزدەکاتەوە یاخود نرخی دادەشکێنێ، گەورەترین کاری نابەجێ دەرحەق بە پیرۆزترین کاردەکات. کەوابوو: بۆ ئەوەی لە هۆنراوە بکۆڵینەوە و لەبەرتیشکی ڕێبازێکی

زانستیدا و پێویستی سەرشانمان ئەنجامیدەین، دەبێت هۆنراوە دوور لە هەڵەی مێژوویی و هەڵەی کەسی هەڵبسەنگێنین.

ڕەخنەسازەکەمان بۆ چەسپاندنی ئەم ئامۆژگارییە بیروڕاکانی ڕەخنەسازی فەرەنسی بەناوبانگ (مسیۆ شارل دیریکۆ) دەهێنێتەوە، کە تێیدا وتوویەتی: نرخپێدانی وێژەی کلاسیزمی فەرەنسی بە هۆی مێژووە دێرینییەکەوە هەورێکی چڵکنە، ڕەشیی و تاریکییەکەی گزنگی دواڕۆژی وێژەی فەرەنسی دادەپۆشێ. لە جیاتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەستیارە دێرینەکانماندا وەکوو ئادەمیزاد پەیکەری ئاسنین دەهێنێتە گفتوگۆ و لێدوان. هەروەها لە جیاتی ئەوەی بە چاوی ڕاستی سامانی نەتەوایەتیمان بناسین، پەرستگەی دەستکرد بۆ ئەم سامانە بە خەیاڵ بنیاتدەنێین و تەنانەت لایەنە لاواز و بێسوودەکانیشی دەپەرستین. ئەم کارەش بێگومان نەک لە بەرژەوەندی نەتەوایەتی بێبەرییە و بەس، بەڵکوو زیانێکی گەورە بە بزووتنەوەی وێژەییمان دەگەیەنێت.

## • پێوانەی هەڵسەنگاندنی هۆنراوەی بەرز

ئارنۆلد هەرچەندە بە ڕوونی دان بە ڕێزگرتن لە هۆنراوەی دێرینی مێژوویی وەکوو هەڵەیێکی گەورە دادەنێت و سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە چەشە و چێژی کەسیی ڕەخنەساز دەشێت ببێ بە هۆی سەرەکی بەرپابوونی ڕەخنەسازیی ناپەسند، بەڵام لە هەمان کاتدا بیروڕای وایە، کە هۆنراوەی دێرینی مێژوویی لەبەر تیشکی بۆچوونی کەسی دەستەدات بۆ سازکردنی پێوانەی هەڵسەنگاندنی هۆنراوە. مەبەستی سەرەکی ڕەخنەسازەکەمان لەم بیروڕایە هەڵبەت چەسپاندنی پەیوەندی نەمریی هۆنراوەی هاوچەرخە لەگەڵ هۆنراوەی دێرینی مێژووییدا.

بەڵگەشمان بۆ سەلماندنی ئەم سەرئەنجامە لەوەوە هاتووە، ئەم ڕەخنەسازە نموونەگەلێک لە هۆنراوەی دێرینی ئەغریقی و سەدەکانی بووژانەوەی هۆنراوەی نەتەوە ئەورووپییەکان دەهێنێتەوە و بە ئەوپەڕی ڕێزگرتن لە خاوەنەکانیان دووپاتیدەکاتەوە، کە ئەم نموونانە باشترین پێوانەن بۆ بڕیاردانی بەرزیی یاخود نزمیی هەموو هەڵبەستێکی باسلێکراو.

مەرجی سەرەکی ئارنۆلد لەم بیروڕایە ئەوەیە دەبێت، ئەو نموونانە لە مێشک و هەستی ئەدەبدۆستاندا ڕەگوڕیشەیان داکوتابێت و بەڕاستی سەرچاوەی لەززەتبینین و هونەربەخشندەبن. ئەم نموونانە بە لای ڕەخنەسازەکەمانەوە مەرج نییە هەڵبەستی تەواوبن، بەڵام دەشێت چەند دێڕێک بێت یان چەند دەربڕینێک بێت. بۆ بەڵگە و مەشقکردن لە سەر ئەم پێوانە ڕەخنەسازییە

ئارنۆلد دەبێژێ: با سەرنج لەم وتەیەی (هۆمیرۆس)بدەین، کە (زیۆس) واتە خوای جوانەکان لە لای ئەغریقییەکان ئاراستەی ئەسپەکانی (بلیوس)ی دەکات: ئەی هاوار بۆ ئەم دوو ئەسپە چارەڕەشە، بۆچی ئێمە بە دیاری دامانن بە (شـا) و (بلیوس)، کە هەردووکیان و ئەم شـا نەمرە لە چنگی مردن بەدەرن؟ بۆچی ئەمەمان کرد؟ بۆچی؟ بۆ ئەوەی هەمیشـە ئەم دوو بەستەزمانە لە خەم و پەژارەدا بن؟ یاخود با سەرنج لەم دێڕ و نیوەی دانتی بدەین، کە وتەی (یوجولینۆ)ی نەمرن:

**"من نەگریام چونکە دڵم بوو بە بەرد، بەڵام ئەوان گریان..."**

یاخود با لەم وشـە جوانانەی (بیاتریس) بۆ (فرجیل) وردبینەوە: (خوا بە مەزنی خۆی منـی خوڵقانـدووە، بۆیـە بە هیـچ جۆرێك زەبروزەنگ ناگاتە نەبەزی دەروونم و بڵێسـەی ئەم ئاگردانە ناتوانن ورەم پێبەربدەن).

ئـەم بەڵگانـە هەروەکـوو دیارە نموونەی بـەرزی هۆنراوەن. ڕەخنەسـازەکەمان دەیانکات بە پێوانەیەك بۆ ڕەخنەسـاز لە کاتی هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژەییدا.

## • دەیەم: "هاری لیڤن"ی ڕەخنەساز و نووسەری ئینگلیزی

ئەم نووسەر و ڕەخنەسازە لە ساڵی ١٩١٢ زایینی لەدایکبووە و لە لێکۆڵینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسـازیدا ناوبەدەرکردووە. بە تایبەتی لە دوای ئەو توێژینەوە زانسـتییەی، کە لە سـاڵی ١٩٤٦ی زایینیدا بە ناوی (وێژە وەکوو دەزگایەك) بڵاویکردەوە. ئەم توێژینەوەیە، کە دەمانەوێ وەکوو باسێك بەوردی شیبکەینەوە و لێیبدوێین، سەرەتاکەی لەم خاڵانەی خوارەوە خۆی دەنوێنێ.

١- ڕووگە و ڕێبازە زانستییەکان لە لێکۆڵینەوەی وێژەییدا.

٢- چەمکی خوریە و بەهرە لە سازکردنی وێژەدا.

٣- زانستی دەروون لە لێکۆڵینەوەی وێژەییدا.

٤- توێژەری بێگانە لە توێژینەوەی وێژەی نەتەوایەتیدا.

## • ڕووگە و ڕێبازە زانستییەکان لە لێکۆڵینەوەی وێژەییدا

دوابەدوای شۆڕشـی مەزنی فەرەنسـا، (فایکۆنت دی بۆنالد) لە لێدوانێکیدا دەربارەی ڕووگە و ڕێبازە زانستییەکان لە لێکۆڵینەوەی وێژەییدا بە دەربڕینێك خستییەڕوو، کە دەبێژێ: وێژە بیروباوەڕ و هەستی کۆمەڵ دەنوێنێ. هەمان ئەرکی ئاخاوتن لە ڕوونووسکردنی کەسایەتیی

دوێنەر دەگێڕێ. بە مانای ئەوە چلۆن ئاخاوتن و قسەکردن زمانی مرۆڤە، وێژەش زمانی کۆمەڵە.

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم ( ١٨٠٠ ) لێکۆڵینەوەیێکی (مەدام دی ستال) بە دوو بەرگ لە بارەی وێژە و پەیوەندی بە دەزگا کۆمەڵایەتییەکانەوە بڵاوکرایەوە.

ئەم لێکۆڵینەوە و لێدوانەی (فایکۆنت دی بۆنالد) ئاوێنەیەکن لە بەر تیشکەکەیدا زۆرانبازی نێوان ڕێبازی کلاسیزم و ڕۆمانسیزم ڕەنگیانداوەتەوە و بەوە کۆتاییهات، کە هەر یەکێك لەم دوو ڕێبازە ئاکامێکی سروشتییە بۆ دەرفەتێکی تایبەتی. ڕەخنەسازیی ڕاستینە بە هیچ جۆرێ ڕێبازێك بە سەر ڕێبازێکی دیدا داناشکێنێ، بەڵکوو بۆ هەریەك لەم دوو ڕێبازە بۆن و بەرامەیەك دابینەکات و ڕەنگی تایبەتی دەخاتەڕوو. سەرئەنجامی ئەم هەڵسەنگاندنەی ڕێبازی کلاسیزم و ڕێبازی ڕۆمانسیزم بێگومان لەوەوە هاتووە، کە ڕەخنەسازیی ئەورووپی لەم سەردەمەدا ڕێگای زانستی گرتەبەر و خۆی لە سۆز و هەڵچوونی کەسی و دەمارگرتنی نەتەوایەتی دوورخستەوە.

تایبەتییەکانی ئەم ڕەخنەسازە ئەورووپییە لەوەوە دابینەکرێ، کە ڕەخنەسازە هەڵگرەکانی دروشمەکەی، دەستیان بە بەراوردکاری وێژەی نەتەوایەتییە ئەورووپییەکانیان کرد و بە هۆی لێکۆڵینەوەی جوگرافی و مێژوویی‌یەوە کارەکانیان ئەنجامدا. کاری ئەم ڕەخنەسازانە هەروەکوو لە زەمینەکەیەوە دیارە لە سەر دوو بناغە دامەزراوە:

**یەکەم: بناغەی ڕەگەز و نەژادی نەتەوە**

**دووەم: بناغەی کات و سەردەم**

جوغزی ئەم دوو بناغەیە هەروەکوو ئاشکرایە، تا ڕاددەیێکی زۆر فراوانە، چونکە جگە لە وێژە بابەتی زانستی کۆمەڵ و بابەتی گشتی و بابەتی جوگرافی و ڕامیاری دەگرێتەخۆی، کە (هیبۆلێت تین)ی ڕەخنەساز و فەیلەسووفی بە ناوبانگی فەڕەنسی خۆی لە کۆڕی ڕەخنەسازی گەیاند و دەستیخستە ناو کاری لێکۆڵینەوەی وێژەییەوە بەو دوو بناغەیە ڕانەوەستا، بەڵکوو بناغەی ژینگە (البیئە)ی بە بناغەیێکی سێیەم چەسپاند، بگرە وردەوردە ژینگەی بە تاقە ڕووناکی تێگەیشتن لە وێژەدا لەقەڵەمدا.

ئەمیل زۆلا کە یەکێکە لە شاگردەکانی تین، بیروڕای وابوو، کە مامۆستاکەی لە هەڵگرتنی دروشمی بەکارهێنانی ئاکامەکانی (تەکنەلۆژی) یە، لە شیکردنەوەی وێژەدا. بەڕاستی لاسایی (بالزاك و ستاندال) دەکاتەوە، چونکە ئەمیش وەکوو ئەم دوو پەیڕەویکەرانەی ڕێبازی سروشتی وێژە بە زانست دەزانێت و شوێنی لێکۆڵینەوەی بە لایەوە تاقیگە (مختبر)یە.

## • چارەنووسی بیرۆکەی خورپە و بەهرە لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا

تەوژمی هەڵسەنگاندنی وێژە لە ڕوانگەی زانستی ڕووتەوە، تا ڕاددەیێکی زۆر چارەنووسی خورپە و بەهرەی لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا خستە مەترسییەوە و هەڕەشەی نەمان و فەوتانی لێکرد. تەنانەت ڕەخنەسازێکی ئەندێشەسازی وەکوو (فلۆبێر) بیروڕای وابوو، کە ئەو کەسەی دڵی بەرهەمی وێژەیی لە ئاسمانەوە لە وێنەی ئەستێرە دێتە خوارەوە، هیچ کەسێك بڕوای پێناکات.

ئەم هەڵوێستە هەڵبەت سەرئەنجامێکی سروشتییە بەرامبەر بە بیروڕاکانی (تین)، کە ژینگە بە تاقە سەرچاوەی بلیمەتی و هەڵکەوتوویی هونەرمەند لەقەڵەمدەدات و بڕوای وابوو، کە هێزی دەرفەت وەکوو هێزی گەردوون وایە، هیچ مرۆڤێك لە چنگی ڕزگارنابێت و پێیناکرێت خۆی لە کارتێکردنە جادووگەرییەکەی بپارێزێ. ئەم بیروڕایانەی (تین) هەروەکوو دیارە تا بڵێیت موبالەغە و زێدەڕۆیی پێوە دیارە، بۆیە فەیلەسووفێکی ماددی وەکوو (جۆرج بلیخانۆف) ڕای وابوو، کە (تین) لە بیروڕاکانیدا لاهوتێکی ئایدیالیزمی شەڕمەندە.

جان پول سارتەریش لە هەمان ڕوانگەی (بلیخانۆف)ەوە وەسفی (تین)ی بەوە کرد، کە هەرچەندە بە ناوی زانستەوە قسەدەکات، بەڵام لە جوغزی تەنگەبەری میتافیزیکیدا، بلیمەتی هەستیار و هونەرمەند زیندەبەچاڵدەکات.

بەم جۆرە سەرەڕای لێشاوی زانست بەرەو کۆڕی وێژە و هونەر لە سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بڵێسەی خورپە و ئیلهام لە کاری وێژەییدا هەر شەوقیدەدایەوە و بە تەواوی نەدەخنکا.

## • هەڵەی زانست لە توێژینەوەی وێژەی نەتەوایەتی بیانی (بێگانە)دا

ڕەخنەسازەکەمان (هاری لیڤن) هەر وەکوو دیارە تا ڕاددەیێکی زۆر بەرگری لە زانست دەکات و وەکوو ڕێبازێکی سەرەکی بۆ توێژینەوەی وێژە و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری، بە تایبەتی کە دەبینێ (مەدام دی ستال)سەرکەوتوانە لەکتێبێکی ئینسکیلۆپیدیادا بە تیشکی زانست وێژەی ئەڵمانی شیکردۆتەوە و بە وردی تایبەتییەکانی خستۆتەڕوو، بەڵام لە هەمان کاتدا بەتوندی ڕەخنە لە لێکۆڵینەوەکانی (تین)سەبارەت بە وێژەی ئینگلیزی دەگرێ، چونکە ئەم ڕەخنەسازە فەرەنسییە، واتە (تین) نەیتوانیوە لە سروشتی ئەم وێژەیە تێبگات و چەشە و

چێژی بە دیاردە جۆربەجۆر و هەمەڕەنگەکانی قایل ببێ.

هاری لیڤن لەم ڕووەوە ئەم بارەی (تین) باسـدەکات و دەڵێ: تین ڕووکەشانە لە وێژەی نەتەوایەتیی ئینگلیزیدا تێبینیکردووە، کە ئەم وێژەیە هیچ کەسایەتییەکی یەکگرتووی نییە، بەڵکوو لە چوارچێوەکەیدا دیاردەی جۆربەجۆر و بەیەکاچوو و ئاڵۆزاو ڕەنگدەدەنەوە. بۆ نموونە: لە بەشی هۆنراوەدا هەڵبەستی تەقلیدی بە کێشی یەکگرتوو و قافیەی چەسپێنراو شانبەشانی هەڵبەستی سەربەست بە هەموو کۆت و زنجیرێك بەرچاودەکەوێ. لە پەخشانیش سەرەڕای شانۆگەری شکسپیری درامای ئەلیزابیتیس شوێنی خۆی کردۆتەوە.

ڕەخنەسازەکەمان کە ئەم بۆچوونەی (تین) دەهێنێتەوە، دەڵێت: ئەم سەرنجڕاکێشانە تەنیا ئاکامـی پێوەرەکەیێتـی، کە ژینگەیە، چونکە لەبەرئـەوەی ژینگەی ئینگلیزی یەکگرتووە، وا چاوەڕێدەکات، کـە دەبێـت وێژەی ئینـگلیزیش یەکڕەنگ و یەکگرتوو بێت، کەچی ئەوەی فەرامۆشکردووە ئەم ژینگەیە خۆی لەخۆیدا ڕەنگاوڕەنگ و جۆربەجۆرە، هەروەها میللەتی ئینگلیـز لـە ڕەگـەزی سەکسـۆنی و نۆرمەندی پێکهاتووە. یەك چەشـە و یەك چێژیان بۆ دەستنادات. سەرئەنجام وێژەی ئینگلیزی ئاکامێکی سروشتییە.

## ● ڕەخنەسازە کۆمەڵایەتییەکان

هاری لیڤن لە بەر تیشکی ئەم ناونیشانەدا، سەرلەنوێ بیروباوەڕەکانی (تین) دەداتە بەر هێرشی پێنووسەکەی و دەبێژێ: "لامب"ڕەخنەسازی بەناوبانگ، کە وتوویەتی: شانۆگەری کۆمیدیا دەستکردانە سەردەمی شایەتی نواندووە، ناتوانین لەگەڵ (تین)دا یەکبگرینەوە، کە دەڵێ: شانۆگەریی ئینگلیزی بە تەواوی لەسەردەمی شایەتی (ملکی) گیانی نەتەوایەتی ڕوونووسـکردووە، چونکە (تین) لەم بڕیارەیدا هەر مێژوونووسە و بەس و بە هیچ جۆرێ نە ڕەخنەسازە و نە پێکەوە ڕەخنەساز و مێژووتووسە.

بەڵێ، ڕاستە کە پارەیێکی زۆری لە پێناو وەدەستهێنانی قەواڵە و یاداشتە کەسییەکانی سەردەمی دەقە باسکراوەکان خەرجکردووە، بەڵام ئەوەی ئەنجامیداوە بەرهەمێکی ڕەخنەسازیی هونەری نییە، بەڵکوو کۆکردنەوەی کەرەسەیێکی مێژوویی زۆر و زەبەنگە. پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە: سوودی ئەم کەرەسەیە بۆ کاری ڕەخنەسازی دەبێت چی بێت؟ ڕەخنەسازەکەمان (هاری لیڤن) بەبێ مشتومڕ وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ: (تین) بە هیچ جۆرێك نەیتوانیوە بە هۆی کەرەسەی مێژووییەوە پەردە لەسەر نهێنییەکانی کاری خوڵقاندنی هونەرمەند لابدات،

بۆیە لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (فەلسەفەی هونەر) خۆی لە لێکۆڵینەوەی هونەر، تەکنیکی بەرهەمی وێژەیی و گەوهەری هونەر ڕزگارکردووە. هەروەها کە ویستوویەتی سوود لە سامانە پەیکەرتاشییەکانی نەتەوەی ئەغریق بۆ باسکردن لە بوون و قەوارەی ئەم نەتەوەیەوە وەربگرێ، خۆی لە درێژەپێدانی توێژینەوەی ژینگەیی و مێژووییدا نقومکردووە و سەرئەنجام دەستی لە هەموو کەرەسەکان هەڵگرتووە و بە چەشنێکی سەربەست باسی لە ڕەگەز و سەردەم و ژینگەی ئەغریقییەکان کردووە.

بەم پێیە (هاری لیڤن) بڕیارێك سازدەکات، کە دووپاتیدەکاتەوە ڕێبازی ژینگەیی بەم هەموو کۆت و زنجیرەیەوە، نەك نەیتوانیوە تایبەتییەکانی کەسایەتییێکی وێژەیی لە کەسایەتییێکی دی جیابکاتەوە و بەس، بگرە هەتا نەیتوانیوە پەیوەندیی نێوانی کەسایەتی و هونەر شیبکاتەوە. باشترین بەڵگەی ڕەخنەسازەکەمان بۆ پشتگیریکردن لەم بڕیارەی هەڵسەنگاندنەکەی ڕەخنەسازی فەرەنسی بەناوبانگ (برۆنتتیر)ە، سەبارەت بە ڕێبازەکەی (تین) کە تێیدا وتوویەتی: (تین) و قوتابییەکانی لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەییدا، ئەوەی ئەنجامیانداوە، فەرهەنگێکە بە سەرگوزشتەی وێژەرەکان و بە هیچ ڕەنگێ لەم فەرهەنگەدا کاری ڕەخنەسازی بە دیناکرێ. بۆیە ڕاستی ئەوەیە کە مامۆستا ئەکادیمییە فەرەنسییەکان وەکوو(جوستاف لانسون) لە پەیڕەویکردنی ڕێبازەکەی (تین)دا، جگە لە تەواوکردنی مێژووی گشتی بە باسکردن لە ژیانی وێژەرەکان هیچ شتێکی دیان ئەنجامنەداوە.

## • بیردۆزەی گۆڕان و پەرەسەندنی چەشنی وێژەیی

هاری لیڤن لە کۆششە بێوچانەکەیدا بۆ چەسپاندنی بیروڕا کۆمەڵایەتییەکان سەبارەت بە وێژە وەکوو دەزگایێکی میللی ئایدۆلۆژی، پەنجە بۆ بیردۆزە بە ناوبانگەکەی (برونتتیر) درێژدەکات، کە لە دووتوێکەیدا بیرۆکەیێکی شیکردۆتەوە، دەڵێ: وێژە وەکوو ڕەگەزی ئادەمیزاد لقەکانی چەشن چەشنن و هەر چەشنێك لەم چەشنانەش لە قەوارەیێکی تایبەتییەوە ڕەگوڕیشەکانی سەریان دەرهێناوە ئەمجا چەکەرەیکردووە و بە زەبری چەند هۆیێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەوزبووە و گۆڕدراوە و پەرەیسەندووە و گەیشتۆتە بارێکی تازە. بۆ نموونە: کورتەچیرۆك کە مۆدەی سەردەمی هاوچەرخمانە لە بناغەوە لە حیکایەتی بەرئاگردانەوە تۆوەکەی وەشێنراوە، حیکایەتی بەرئاگردان شێوازێك بووە، لە کاتی خۆیدا لەگەڵ باری نەخوێندەواری کۆمەڵدا گونجاوە، هەروەها کەسایەتییەکانی لە دێوودرنج و شێوازەکانی لە

گێڕانەوەی ئەندێشەیی و داستانی دەنگدانەوەی ڕاددەی تێگەیشتنی ئەندامەکانی کۆمەڵە لە سەردەمەکەیدا.

پاش ئەم سەردەمە حیکایەت دەماودەم گۆڕدرا، هەتاوەکوو لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی و بڵاوبوونەوەی خوێندەواریدا بوو بە ڕۆمان و نۆڤل.

ڕۆمان و نۆڤلیش لەبەرئەوەی دووروودرێژ و قەوارە گەپ بوون، دۆخی کۆمەڵی پیشەسازی پێ قایلنەبوو. سەرئەنجام ئەم چەشنە وێژیە پەرەیسەند و بوو بە هۆی لەدایکبوونی چەشنی کورتەچیرۆك.

هاری لیڤن سەرەڕای (برونتتیر) کە ناڕاستەوخۆ کاریگەریی لە سەر وێژە هەبووە، باس لە بیروڕاکانی (جورج براندز)ی ڕەخنەسازی دانیمارکی بەناوبانگ دەکات، کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا بە پێوانەی چینایەتی وێژەی شیکردەوە و هەر بڕیارێکی وێژەیی دایەپاڵ چینێك. ئەم ڕەخنەسازە دانیمارکییە بە تەواوی وێژەی بە دەنگی کۆمەڵ لەقەڵەمدا و بڕیاریدا، کە ڕێبازی کلاسیزم ناوەڕۆکی ئایدیالیزم پەسەنددەکات و لەگەڵ بیروڕای چینی دەرەبەگ و کۆنە پەرستان دەگونجێ.

ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە شێوازدا فەنتازی و ئەندێشەییە و هەر مەیل و ئارەزووی کەسی لە ناخیدا قوڵپدەدات، دەنگدانەوەی چەشە و چێژی چینی بۆرژوازییە، بەڵام ڕێبازی ڕیالیزم کە تۆمارگەی ژیانە، چەمکی خەباتی چینی کرێکار و زەحمەتکێشانە. دوابەدوای ڕێبازی ڕیالیزم، کە ڕێبازی (هونەر بۆ هونەر) و لقوپۆپەکانی ڕێبازی پەرناسیزم وەکوو ڕەمزییەت و سریالیزم پەیدابوون. هۆی پەیدابوونیان بەرپابوونی نائومێدی و ڕاکردن لە تێکۆشان و بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی بەزین دابیندەکرێ.

## • یازدەم: "ئای. تی. ڕیتشاردز"ی ڕەخنەسازی بەناوبانگ

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی جیهانی لەو باوەڕەدان کە "ئای. تی. ڕیتشاردز"ی ڕەخنەسازی بەناوبانگ بزووتنەوەی سەرەکی مەسەلەی ئەو ڕەخنەسازییانەیە، چونکە بیروڕاکانی بەدەنگدانەوەی هەموو ڕێبازە ڕەخنەسازییە هاوچەرخەکان و هەڵسەنگاندنیان و چەسپاندنی بۆچوونی تازە لەقەڵەمدەدرێ.

ئەو ڕاستییە وا لەو مێژوونووسانە دەکات، کە پەنجە بۆ ڕێبازە ڕەخنەسازییەکەی درێژبکەن، کە بە ڕەخنەسازیی کارتێکردن (النقد التاثیری) ناویدەبەن. لە پاشا درێژە بەم باسە دەدەین بە

پێی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- ڕەخنەسازیی کارتێکردن و تەکنەلۆژیای ئابووری...

٢- بیروڕای فرۆید سەبارەت بە ئەرکی هونەر لە دەربڕینی ئارەزووەکانی مرۆڤ..

٣- بۆچوونی ماکس ئیستمان دەربارەی هونەر بەوەی، کە هێنانەدیێکی پەتی و بێگەردە...

٤- ڕووگەی "سانتیانا" لە لەزەتوەرگرتن بە هۆی هونەرەوە...

٥- بناغەکانی هەڵوێستی ڕیتشاردز لە بەرپەرچدانەوەی بیردۆزە دەروونییەکان لە پێناوی ڕاڤەکردنی وێژەدا...

٦- ڕەخنەگرتنی ڕانسۆم لە بۆچوونەکەی ڕیتشاردز، کە وتوویەتی: دەنگدانەوەی وێژە لە هەستی خوێندەواران دایە نەك لە بۆچوونی بابەتە کارتێکەرەکەدا.

٧- بەراوردکارییەك لە نێوان بەشدارییکردنی فرۆید و ڕیتشاردز لە ڕەخنەسازیدا.

ئەم خاڵانە هەروەکوو دیارن، هێڵە گشتییەکانی بیردۆزی ڕەخنەسازیی هاوڕۆژمان پێکدەهێنن. ئێمەش بە نیازی کەڵك و سوود گەیاندن بە خوێندەواران شیاندەکەینەوە و بە وردی لێیاندەدوێین.

## • ڕەخنەسازیی کارتێکردن

ڕەخنەسازیی کارتێکردن لە ڕووی تەمەنەوە لەگەڵ بەرپابوونی سەرەتای ڕەخنەسازیدا لەدایکبووە و بە بەرەبەیانی هەڵسەنگاندنی هۆنراوە لەقەڵەمدەدرێ. ئەم بیروڕایە لەوەدا پاڵپشتی خۆی وەدەستدەهێنێ، کە ئەفلاتون بەر لە نزیکەی دوو هەزار و چوارسەد ساڵ وتوویەتی: هۆنراوە جۆش بە سۆز و هەڵچوونی خوێنەر دەدات. هەروەها بەڵگەی خۆی بەوە دەچەسپێنێ، کە ئەرستۆ لەو سەردەمە دێرینەدا ڕای وابوو، کە شانۆگەری تراژیدی دەروونی تەماشاکەر لە ترس و بەزەیی پاکدەکاتەوە.

ئەمە ڕاستییێکی مێژووییە و دووپاتیدەکاتەوە، کە کارتێکردنی هۆنراوە لە خوێنەران لە مێژەوە خراوەتەڕوو، بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا، کە فەلسەفەی میتافیزیکی تا ڕادەیێکی زۆر لیکۆڵینەوە و توێژینەوەی بەجێهێشتووە و مەیدانی بۆ زانست و شیکردنەوەی فیزیکی چۆڵکردووە. ڕەخنەسازیی کارتێکردن زیاتر گرنگی پێدرا و لە سەر بناغەی یەکالاکردنەوەی زانیاری و تاقیکردنەوە شەقڵێکی وەرگرت. بۆ نموونە (گۆستاف فشنر) بە هەموو توانایەکییەوە تەنگوچەڵەمەکانی ستاتیکای خستەبەر لیکۆڵینەوەی زانستی لابوری و تێکۆشا بیردۆزەیێکی

ستاتیکی سازیکات، کە توانای ئەوەی هەبێت دیوی ناوەوەی بابەتە کارتێکەرەکە یەکالآبکاتەوە، نەك لەگەڵ ڕووکەشی بابەتەکەدا کات بە فیرۆ بدات.

سەرئەنجام ئەم زانایە دووپاتیکردەوە، کە تاقیکردنەوەی وا هەیە دەتوانێ پەردە لە سەر هۆی خۆشیبینینی خەڵك لە وێنەیەکیدا و ناحەزیان لە وێنەیێکی دیدا، هەڵبماڵێ، بەڵام دوارۆژی ڕێبازی ڕەخنەسازیی دەروونی لەم چەشنە لێکۆڵینەوە لابورییەدا خۆی نەچەسپاند، بەڵکوو بەهۆی زاناکانی شیکردنەوەی دەروونی وەکوو: ( تیودۆر لیبس و سیگمۆند فرۆید و کارل یونج)، کە بە درێژایی سەدەی بیستەم توانیان بە هۆی باسی زانستییەوە پەیوەندیی نێوانی هونەر و دەروونی هونەرمەند و خەڵکی یەکالآبکەنەوە و بچەسپێنن.

## ● بیردۆزەکەی فرۆید لە ڕاڤەکردنی هونەر

ڕەخنەسازیی کاتێکردن لە بناغەدا هێڵە گشتییەکانی لە بیردۆزە بە ناوبانگەکەی فرۆیدەوە وەدەستدەهێنێ، کە هەموو چەشنەکانی هونەر بە هێزی بێقەراری ناهۆشمەندیی هونەرمەند دەبەستێتەوە و بیروڕای وایە، کە بەرهەمی هونەری لە جیاتی ئارەزووە دامرکاوەکانی خاوەنەکەی دێنەکایەوە و لەدایکدەبێت. بە واتای ئەوەی کە هونەر ڕێگایەکە بۆ هێنانەدی ئەو خەون و خەیاڵ و ئارەزووانەی هونەرمەند، کە لە ژیانی ڕاستینەدا، ناتوانێ بیانهێنێتەدی، یاخود کۆمەڵ و واقیعی باری هونەرمەند دەرفەتی بەدیهێنانیان نادات.

فرۆید لەم بیردۆزەیدا هونەرمەند وەکوو نەخۆشێکی دەروونی تەماشادەکات، هەرچەندە جیاوازیێکی ڕووکەشی لە نێوانیاندا دەستنیشاندەکات و دەڵێ: ئادەمیزادی دەروونەخۆش بە چەشنێکی ئاڵۆز و تێکەڵوپێکەڵ ئارەزووی خەونەکانی بەبێ پەردە دەردەبڕێ، بەڵام هونەرمەند پەنادەباتەبەر تەکنیك و یاسای ڕێکخستن بۆ ئەوەی لە ژێر پەردەکانیاندا ئارەزووە قەدەغەکراوەکانی بگەیەنێتە خەڵکی. ئەمە لە لایەنی هونەرمەندەوە، کە هونەر بەرهەمی کاتێکردنی ئەوهێزانەیە، لە لایەن خەڵکیشەوە کە هونەرمەند کاریاتێدەکات بیانەوێ یان نەیانەوێ، جادووگەرانە ملکەچی شوێنەواری هونەر دەبن، چونکە لە ئاوێنەیەکدا خەون و خەیاڵ و ئارەزووە تایبەتییەکانیان دەبینن و ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان دەدۆزنەوە.

سەرئەنجام فرۆید هونەرمەند و هونەردۆستان بە ناساغ و دەروونەخۆش لەقەڵەمدەدات و هونەریش وەکوو ئاکامێکی ئاڵۆز و تێکەڵوپێکەڵ تەماشادەکات. ئەم بیردۆزەی فرۆید لە لایەن ڕەخنەسازە زانستییەکانەوە بەرەنگاری بەرپەرچدانەوەیەکی توندوتیژ بۆوە. سەرئەنجام ئەو

ڕەخنەسازانە ئەم تێبینیانەی خوارەوەیان چەسپاندن:

١- هونەر با دەنگدانەوەی هێز و ئارەزووەکانی ناهۆشمەندیی هونەرمەند بێت، بەڵام ئەم دەنگدانەوەیە لە بەر تیشکی یاسا و دەستووری هونەری بە ڕێکوپێکی دێتەبەرهەم، ئەگینا بە هیچ ڕەنگێ بەهونەر دانانرێ، بەڵکوو بە وڕێنە و ڕەفتاری هەرچیوپەرچی لەقەڵەمدەدرێ.

٢- هونەرمەند چەند لە بەرهەمەکانیدا، کەسی ئەزی (زاتی) هەبێت، هەر دەبێت چاوی لە جەماوەری دەوروپشتی بێت و تا ڕادەیێکی زۆر ملکەچی ویستەنیان بێت، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو ویستی هونەرەکەی کار لە خەڵکی بکات و لە هەست و دەروونیاندا دەنگبداتەوە. ئەگەر وانەبوو بە هیچ جۆرێ بە هونەرمەند دانانرێ و بە ئاوازێکی ناساز دەژمێردرێ.

٣-هونەرمەند، کە بە توانای بێهاوتای داڕشتن و سنعەتکاری خەون و ئاواتە تایبەتییەکانی دەردەبڕێ. بەرهەمی وا سازدەکات کە هەموو لایەنە ناهەموار و سەرچاوە کەسییەکان دادەپۆشێت و ڕێگاییێکی قووڵ بۆ خۆی بەرەو دەروونی هونەردۆستان داگیردەکات و هونەردۆستانیش بەو بەرهەمە قایللەبن و چەشە و چێژ و لەززەتی لێوەردەگرن.

## ● هۆییێکی دیکە لە هۆیەکانی بەرپابوونی ڕەخنەسازیی کارتێکردن

کە ڕەخنەسازە زانستییەکان بەو جۆرە وەڵامی فرۆیدیان دایەوە و پەیوەندی نێوان هونەر و ناهۆشمەندیی هونەرمەند و هونەردۆستیان دووپاتکردەوە، هۆییێکی تریان لە هۆیەکانی بەرپابوونی ڕەخنەسازیی کارتێکردن خستەڕوو، ئەم هۆیەش هەروەکوو (ماکس ئیستمان) دەڵێ: دەگەڕێتەوە بۆ گرنگیی دانان بە زانستدا، بە تایبەتی لەم ڕۆژانەدا.

زانست بە هەموو بابەتەکانییەوە پەیوەندیی نەمریی نێوان مادده و نامادده دەسەلمێنێ. بە مانای ئەوەی چلۆن تەندروستی ئادەمیزاد بەندە بە ساغیی دەروونییەوە، هەروەها بەرهەمی هونەریش، کە کارێکی هەستپێکراوە ئاکامی هێزێکی ناماددییە.

سەرئەنجام بەرهەمی هونەری بە گشتی و وێژەیی بە تایبەتی، پەیامێکە لە ناهۆشمەندیی هۆشمەند بۆ ناهۆشمەندیی لەززەتوەرگر لە هونەر و وێژە.

## ● بابەت و سەرچاوەی جوانی

هەرچەندە زانا و جوانناسەکان سوورن لە سەر ئەوەی، کە جوانی تایبەتی بارێکە لە شتی جوانەوە هەڵدەقوڵێ و لە بوونی لەززەتوەرگر لەو شتە دەنگدەداتەوە. هەروەها هەوڵیانداوە پێوانە

و بنواشە بۆ ئەو جوانییە بچەسپێنن، بەڵام نەیانتوانیوە بەربەرچی ڕاستییەك بدەنەوە، کە دەڵێ: جوانی شتێکی هەستپێکردنە بەو جوانییە لە دەروونی بڕیاردەرەکەیەوە هەڵدەقوڵێ. واتە: جوانی حاڵەت و تایبەتی شتە جوانەکە نییە، بەڵکوو لە ڕاستیدا هەستی ئەو کەسەیە، کە دەڵێ: ئەو شتە جوانە. بۆ نموونە: ئەگەر هاتوو خوێنەرێك بڕیاریدا، کە هەڵبەستێکی تایبەتی کارێکی جوانە و هەستیارە خاوەنەکەی توانیویەتی جوانییەك ببەخشێ. ئەو بڕیارەی خوێنەرەکە لە هەست و نەستییەوە هەڵقوڵاوە، نەك لە هەڵبەستەکە خۆی.

ئەم بیروڕایانە بێگومان جوانناسی و ستاتیکا لە هەموو ڕێباز و دەستوورێکی زانستییەوە دووردەخاتەوە و بە هەڵوێستێکی هەستی لەقەڵەمدەدات.

پرسیاریش لێرەدا دێتە پێشەوە و دەپرسێ: کە بڕیاردانی جوانیی شتێك لە هەڵوێستێکی کەسییەوە هەڵقوڵابێت، ئایا بە تێڕوانینی تەنی و فەردی دادەنرێ، یاخود چوارچێوەیێکی گشتی و جەماوەری هەیە؟

هەڵگرانی دروشمی ئەم بیروڕایە هەوڵیانداوە بناغە و بنکەیێکی مێژوویی بۆ لێکدانەوەکەیان بنیاتبنێن، بۆیە زیاتر لەسەر ڕوونکردنەوەی بیروڕاکەیان دەڕۆن و دەڵێن: هەستکردنی مرۆڤ بە جوانی لەم ڕۆژانەدا، هەرچەندە هەڵوێستێکی کەسییە، بەڵام لە بەرەبەیانی پەیدابوونی ڕەگەزی ئادەمیزاددا بارێکی گشتیی بووە، چونکە لەو سەردەمەدا، بە بێ نەریت و یاسا و بە بێ گرێ و ڕاڕایی و بە بێ پەردە و ڕوونکردنەوەی ڕووکەشی و لە ڕێگای هەست و ئارەزووە زگماکییەکانییەوە لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕاستەوخۆ دەجوڵایەوە و لەززەتی وەردەگرت، بەڵام دوابەدوای ئەم قۆناغە ئەم بارە لە ژیانی ڕۆژانەدا ئاوابوو، بەرەو ناخی دەروون کشایەوە و لەوێ خۆی حەشاردا.

سەرئەنجام زانست بە هەموو جۆرەکانییەوە، کە ویستوویێتی و دەیەوێ ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ ڕێکبخات و لێیبکۆڵێتەوە و بە دەستوور و بنواشە چەمکەکانی بنوێنێ، نەیتوانیوە بە جوانی بگاتە ناوچەی هەستکردن.

جگەلەمە زۆربەی خەڵکی کە لە بەر ئیشوکاری ڕۆژانەدا دەتاڵێنن، یاخود لەبەر تیشکی زانستدا تەنیا مێشك بەکاردەهێنن، سۆز و هەستیان لە کارخستووە.

سەرئەنجام ناتوانین هەست بە جوانیی شت بکەین یاخود با بڵێین پێیانناکرێ جوانی بە شتێك ببەخشن. کەوابوو: ئەوانەی دەتوانن ئەم کارە ئەنجامبدەن، دەستەیەکن لە هەستکەران و دەروون بێگەرد و شەفاف. ئەم دەستەیەش هەڵبەت پەیامبەرانی جوانی و جوانشووناس و ڕەخنەسازی ڕاستەقینەیە.

## • ڕیتشاردز و زمانی هۆنراوە

ڕیتشـاردزی ڕەخنەسـازی بەناوبانـگ، کە بـە زۆری بە هۆی زانسـتی دەروونەوە باڵی بەسەر کۆڕی ڕەخنەسازیدا کێشا، ئامۆژگاری خوێنەرانی هۆنراوە بەوە دەکات، کە دەبێت بیری هەڵسەنگێنەریان لە هەموو خووێکی هێمابەخش پاکبکەنەوە و ڕاستەوخۆ دەگەڵ دەقی وێژەییدا کارلێك (تفاعل) بکەن، چونکە تەنیا لە ڕێگای دەقەوە دەتوانن ناخی دەروونی خۆیان ببزوێنن و لەززەت لە خوێندنەوەکانیان وەربگرن.

تەنگوچەڵەمەی ڕاستینەش لەم ڕووەوە هەروەکوو ڕەخنەسازەکەمان دەبێژێ: ئەرك و دەوری زمانە لە گەیاندنی بیرۆکە و واتا و تاقیکردنەوەی هەستی. زمانیش لەم مەیدانەدا دوو جۆر ئەرك و دەوری هەیە:

**جۆری یەکەم:** پێشکەشکردنی زانیاری و بیرۆکەیە، کە بە زۆری فرمانی زمانی زانستە.

زمانی زانست ڕەنگە جگە لە گەیاندنی زانیارییەکەی کار لە هەستی خوێنەریش بکات، بەڵام ئەم کارلێککردنە ئەرك و مەبەستی سەرەکی نییە، چونکە ئەم ئەرکە سەرەکییە بە زۆری تێگەیاندنی خوێنەرانە.

**جۆری دووەم:** بەرپاکردنی سـۆز و هەسـت کە بە زمانە تایبەتییەکەی دەوترێ (زمانی هەڵچوونی).

ڕیتشاردز لە شیکردنەوەی زمانی هەڵچوونی، پەنجە بۆ ئەوە درێژدەکات، کە ئەم جۆرە زمانـە تایبەتییـە بـە هۆنـراوە و ئاکامە سـەرەکییەکەی پێشکەشـکردنی زانیارییەکی قەڵب و نادروسـتە. ئەم بۆچوونەی ڕیتشـاردز سـەبارەت بە زمانی هۆنراوە لەوەوە هاتووە، کە ئەرکی هەسـتیاری هونەرمەند تێگەیاندنی خوێنەران نییە، بەڵکوو ئەرکی سـەرەکی کارتێکردنە لە هەستی خوێـنەرەکانی.

پرسیاریش لێرەدا کە پێویستە ئاراستەی ڕیتشاردز بکرێت ئەوەیە: زمانی هۆنراوە یاخود با بڵێین زمانی هەڵچوون، کە بەو چەشنە خزمەتی ڕاستی نەکات و زانیاری قەڵب و نادروست پێشکەشبکات، ئایا هیچ نرخێکی ستاتیکی هەیە و لە کۆڕی جوانیدا هیچ دەورێك دەگێڕێ.

ڕەخنەسـازەکەمان وەڵامی ئەم پرسـیارە بەوە دەداتەوە، کە ڕاسـتی و ناڕاستی بە پێوانەی زانسـت و بابەتی مەوزوعی هیچ پەیوەندییێکی بە جوانییەوە نییە، چونکە جوانی هەروەکوو لەمەوبەر ڕوونمانکردەوە لە شـتە هەڵسـەنگێنراوەکەوە هەڵناقوڵێت و کەرسـەکەی لە دەرەوەی

دەروونی چێژوەرگر بوونی نییە، بەڵکوو بارێکی سۆزییە لە هەست و بڕیاردەری جوانی شتێکەوە لێشاودەهێنێت و ئەو شتە بە جوانُ و ڕەنگین، لە بەرچاوی خاوەنەکەی نیشاندەدات.

ڕیتشاردز لە سووچێکی شیکردنەوەکەیەوە سەبارەت بە زمانی هۆنراوەوتوویەتی: لە هۆیێکی هەڵچوونییەوە خزمەتی ڕاستی و ڕاستەقینە ناکات، بە هیچ جۆرێ نەیویستووە نرخی هونەری هۆنراوە بشکێنێ و وەکوو ئەفلاتون هەستیاری خوڵقێنەر بە دەستبڕ و درۆزن لەقەڵەمبدات، چونکە ئەم ڕەخنەسازە هەموو کۆششێکی بۆ نرخپێدانی هەستیاران و بەرزکردنەوەی هونەری هۆنراوە تەرخانکردووە. کەوابوو: مەبەستی لەو شیکردنەوەیە دەبێت چی بێت؟

ئێمە لەو باوەڕەداین کە ڕەخنەسازەکەمان لەم ڕووەوە ویستویەتی بەراوردکارییەك لە نێوانی زمانی هۆنراوە و زمانی زانستدا بەرپابکات و لە تێڕوانینی ئەرکی هەر یەکێك لەو دوو زمانە سروشتی جیاوازیان جودابکاتەوە. بۆ بەڵگەی ڕوونکەرەوە ئەم وەسفەی فایق بێکەس بۆ مانگ دەهێنینەوە:

ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین
هەردوو گیرۆدەی یەک ئاهی ساردین
تـۆ وێـڵ و ڕەنگ زەرد بـە ئاســـمانـەوە
منیش دەربـەدەربـەشـــــارانـــــەوە

ئـەم وەسـفـەی مامۆسـتا بێکەس، کە بـە زمانێکی هەڵچوونی ئەنجامـدراوە بە پێوانەی زانسـتی جوگرافیا و ئەستێرناسـی هەڵبەت زانیارییێکی هەڵە و نادروست پێشکەشـدەکات، بەڵام بە پێوانەی هونەر کارێکی سەرکەوتووە و هەستی خاوەنەکەی بە جوانی تۆماردەکات و خوێنەرەکەی بە هۆی ئەم تایبەتییانەوە بەشداری خەفەتی خاوەنەکەی دەکات و جۆرە چێژێکی لێوەردەگرێت.

## • ڕیتشاردز و جوانناسی

لە کۆڕی ستاتیك و جوانناسیدا، بیروباوەڕی وا چەسپێنراوە، کە بە هیچ جۆرێك تێڕوانینی کەسایەتی نە پەسەندیدەکات و نە بڕیاری جوانی دەدات.

ئەم جۆرە بیروباوەڕە بە تایبەتی لە لای جوانناسی بە ناوبانگ (سانتینا) بەرچاودەکەوێت، کە بەرپەرچی ئەم تێڕوانینە دەداتەوە و دەبێژێ: جوانیی بەرهەمێك تایبەتییێکی ئەنجامییە، شتە جوانەکە دەیدا بەدەستەوە. ئەم تایبەتییە ئەنجامییەش بەرپاکردنی چێژ و خۆشییە لە هەستی

ئەو کەساندەدا، کە جوانی ئەو بەرهەمە دەچێژن.

ڕیتشاردز و قوتابییەکانی هەرچەندە بە چەشنێکی سەرەتایی ئەو بۆچوونەی سانتینا وەردەگرن، بەڵام لە هەمان کاتدا بەتوندی لە کۆڕی ڕەخنەسازیی بەرپەرچیدەدەنەوە، چونکە بە لایانەوە ئەگەر هاتوو پێوانەی نرخپێدانی دەقێکی وێژەیی و بڕیاردانی جوانی بە لەززەتوەرگرتن و خۆشیبینینی خوێنەران دەستنیشانبکرێ، پێویستە ڕەخنەساز دوای دانپێدانانی خوێنەران بکەوێت و تێبینییەکانیان وەربگرێت، ئەوجا بیروڕای خۆی سازبکات.

ئەم کارەی ڕەخنەساز جگەلەوەی ئەنجامدانی فەرمانێکی یەکجار گرانە، ئاکامێك دووپاتدەکاتەوە، کە دەڵێ: ڕەخنەسازیی تیژ وەکوو کارێکی زانستی تەماشا ناکرێ، چونکە بڕیارەکانی بە دەنگدانی خوێنەران سازدەکرێت و دەنگی خوێنەرانیش لە بەر جیاوازی چەشە و چێژیان و لە یەکنەچوونی ڕاددەی خوێندەوارییان بە چەشنێکی گشتی ئەنجامنادرێت، بەڵکوو دووبارە هەر ئاکامی هەڵوێستێکی کەسییە و بەس. ڕیتشاردز پاش ئەو تێڕوانینە بیروڕای (بل) و (فرای) دەهێنێتەوە، کە دەڵێن: نابێت ئەرکی هونەر لە چوارچێوەی تەنگەبەری چێژبەخشین بخنکێنین، چونکە ئاسۆی هونەر لەم چوارچێوەیەدا یەکجار فراوانترە و دەتوانرێ هێما بۆ ئەو ئەرکە بەوە بکەین، کە هەستێکی نادیار و پەنهانی بەرپادەکات.

بل و فرای دوو نووسەری بەناوبانگن لە کۆڕی وێژەدا و بەرهەمیان فرە بووە. بۆیە ڕەخنەسازەکەمان زیاتر بۆچوونەکەیان شیدەکاتەوە و دەڵێ: ئەم دوو هونەرمەندە ئەو ئەرکەی هونەر لە ڕوخساری خاوەن مەبەستدا دەستنیشاندەکەن، بەڵام پرسیارێك کە دەبێت ئاراستەی ئەو دوو نووسەرە بکرێت دەپرسێ: کە خۆشبینی نادیار و هەڵچوونی پەنهانی نیشانەی بەرهەمی جوان بێت، چلۆن دەتوانرێ ڕاددەی جیاوازی جوانیی بەرهەمە هونەرییەکان دەستنیشانبکرێت؟!

ئەم پرسیارە کە ڕیتشاردز بەرپایدەکات دەیەوێ بڵێ: جوانی تایبەتییەکی بێسنوور نییە و بەرهەمە جوانەکان تاقە ڕاددەیێکی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە، بگرە جوانی پلەی جۆربەجۆری هەیە، وەك: جوانی بێهاوتا، جوانی بەرز، جوانی مامناوەندی.. تاد.

کەوابوو: ئاکامی جوانییە گشتییەکە بەم جۆرە گشتییە لە لایەن ئەو دوو نووسەرە باسکراوە، وەکوو هەوا و بێقەوارە و نەبینراوە.

سەرئەنجام ڕەخنەسازەکەمان دەچێ بۆ پێناسەیێکی (تیودۆر لیبس) دەربارەی شتی جوان کە تێیدا دەبێژێ: ئێمە لە کاتێکدا شتێك بە ناوەڵناوی جوان وەسفدەکەین، ئەگەر هاتوو ئەو شتە توانای چوونەناخی هەستییەوە هەبوو یاخود بە دەربڕینێکی دیکە، جوان ئەو شتەیە کە پێیدەکرێ بچێتەناو پێست و ناو دەروونی زاتێکی دیکەوە و جێی خۆی بکاتەوە.

تیودۆر لیبس لەم پێناسەیەدا، تا ڕاددەیێکی فرە وەکوو زانایێکی میتا فیزیکی بیر لە جوانی دەکاتەوە، چونکە هەرچەندە باس لە شتی جوان وەکوو ئاکامێکی مەوزوعی دەکات، بەڵام بە زاراوەی چوونەناو ناخ و پێستەوە مەسەلەییێکی هەستپێنەکراو بەرپادەکات و لە ئاسۆییێکی خورپەیی و هەستپێنەکراوەوە شوێنەواری جوانی دەخاتەڕوو.

## • خستنەڕووی هۆیەکانی جوانی

ڕیتشاردز زیاتر بیردۆزە ستاتیکییەکە دەخاتەبەر لێکۆڵینەوە، بەر لەوەی بۆچوونە تایبەتییەکەی خۆی سەبارەت بە خستنەڕووی هۆیەکانی جوانی بچەسپێنێ. بۆیە لەم ڕووەوە هۆ خستنەڕووەکەی (فیولت باجیە) لە لێکدانەوەی جوانیدا دەهێنێتەوە، کە دەڵێ: هەر هەستیارێك دەربڕینێك وەکوو دەربڕینی (چیاکان بەرزدەبنەوە) سازدەکات، ئەم سازکردنە لە هەستی خۆیەوە ئەنجامەدەدات، چونکە چیاکان بێگیانن و ناتوانن وەکوو گیاندار بەرزببنەوە. کەوابوو: ئەو هەستیارە لە هەست و نەستییەوە لەگەڵ چیاکان بە یەکدادەچێت و ئەو تایبەتییەیان پێدەبەخشێت.

بە واتایێکی تر هۆی جوانی شتێك، کارلێککردن (تفاعل) و بە یەکداچوونی ئەو شتەیە لە تەك سۆز و هەڵچوونی هەستپێکەرەکەیدا، ڕیتشاردز بە هیچ جۆرێك بەم تەعلیل و هۆدەرخستنە قایلنابێت. سەرئەنجام بە کورتی هۆی جوانی لە گونجاوی هەستپێکەرەکانی ئادەمیزاددا دابیندەکات. ئەم گونجاوییەش دیارە کردەوەیێکی لێکدراو و فراوانە، هەموو بوونی ئادەمیزادی بە جوانی هەستکەر دەپۆشێ.

پراکتیکی ئەم بیردۆزە بەسەر هونەردا کارێکی ئاڵۆزاو نییە، بەڵکوو تا ڕاددەیەك شیاوی مەشق و پراکتیکە. بۆ بەڵگە با هۆنراوە بە نموونە بهێنینەوە: خوێنەری هۆنراوە لەبەر تیشکی ئەم بیردۆزەدا، کە دەڵێ: هەست بە جوانی دەکەم، واتای وتەکەی ئەوەیە، کە گوێچکەی لەزەت لە ئاوازی وشە و ترپەی کێش و ئاهەنگی سەرواکەی بینیوە. هەروەها مێشکی بە ناوەڕۆکی هۆنراوەکە زاخاودراوە. چاوی بە وێنە هونەرییەکانی دیمەنێکی ڕەنگین و بەهاداری سازکردووە، جا کە ئەو خوێنەرە بە ڕاستی هەستپێکەرەکانی ئەو هەموو جوانیانەی پێبەخشیبن هەست و نەستەکەی ڕاست و ڕاستەقینە دەبێت و بە هیچ ڕەنگێ دەستخەرۆکراو و چاوبەستراو نییە.

**دوازدەم: "لاسل ئابر کرومبی"ی مێژوونووس و ڕەخنەسازی ئینگلیزی هاوچەرخ**

"ئابر کرومبی"ی مێژوونووس و ڕەخنەسازی بە ناوبانگ بابەتێکی نوێی لە بابەتەکانی ڕەخنەسازیی ئەورووپی هاوچەرخ دەربارەی یاسا و بنەڕەتەکانی ڕەخنەسازیی بە ناونیشانی:

"دەستوورەکانی ڕەخنەسازی" نووسیوەتەوە و (د. محمد عوض محمد) سەرۆکی زانکۆی ئەسکەندەرییە لە میسر وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لە ساڵی ١٩٥٤ی زایینیدا لە چاپیداوە.

ئەم ڕەخنەسازە شوێنپێی ڕێژەوە نوێخوازەکان کەوتووە و هەندێ جاریش باوەشی بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی پەتی واڵاکردووە. سەرئەنجام مێژوونووسی ئەم ڕەخنەسازییە دەتوانێ پەنجە بۆ دوو تایبەتی سەرەکی ڕابکێشێ:

یەکەم: تایبەتی دوورکەوتنەوە لە یاسای ڕێکوپێك و خۆپچڕان لە بنەڕەتی ژیری و نقومبوون لە چەشە و چێژ و بۆچوونی کەسایەتی تا ڕاددەیێکی وەها دەتوانرێ بوترێ: ئەم تایبەتییە وای لە ڕەخنەسازە ئەورووپییەکان کرد، کە وەکوو ڕێژەر وتاری ڕەخنەسازی بە ئەندێشە و شێوازی هونەری بنووسنەوە و چەشنە ڕێژەییێکی داهێنراو پێشکەشبکەن.

دووەم: تایبەتمەندی خۆبەستنەوە بە لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی میتافیزیکی و باسکردن لە بابەتی چەسپاندنی بڕیاری بیردۆزەیی هەتاکو وا لە ڕەخنەسازیی ئەورووپی هات کۆڕێکی ئایدیالیزمی لە ژێر ناونیشانی ستاتیکدا بۆ داگیربکات و مەیدانی پراکتیك و شیکردنەوەی نموونەی ڕێژەیی چۆڵبکات.

"ئابر کرومبی"ی مێژوونووس و ڕەخنەسازی بەناوبانگ بە لای ئێمەوە ئاگای لەم دوو تایبەتییە هەبووە و پێیان قایلبووە. بۆیە بە وریایی و لەبەر تیشکی ڕێبازێکی مێژوویی شیکەرەوەدا، سەرلەنوێ دەیەوێ باسی ڕەخنەسازی بکات و دەستوور و بنەڕەتە دێرینەکانی ببووژێنێتەوە و گیانێکی تازەیان بەبەردابکات و ئەم زانستە لە ڕەنگی کەسی و تەمومژی فەلسەفی ڕزگاربکات.

ئێمە لەمەولا هەوڵدەدەین بە وردی بابەتە سەرەکییەکانی کتێبەکەی (لاسل ئابر کرومبی) شیبکەینەوە.

## • سوکرات و ڕەخنەسازی

بناغەی سەرەکی دەستوور و بنەڕەتەکانی ڕەخنەسازی بە لای (ئابر کرومبی) یەوە، لە سوکراتەوە داڕێژراوە. بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە ئەم مێژوونووس و ڕەخنەسازە ئینگلیزە لە گفتوگۆی سوکرات لە گەڵ قازی و دادپەروەرەکاندا دەگێڕێتەوە، کە تێیدا وتویەتی:

کە بەرهەمی هەستیارەکانم دەخوێندەوە و لە هەڵبەستەکانیان ورددەبوومەوە، لە ناوەڕۆکە

پڕ سوود و ئامۆژگارییەکانیان سەرم سوڕدەما. لە خۆم دەپرسی چلۆن توانیویانە بەرهەمی وا ئەنجامبدەن؟! ئەمە ڕەنگە سەیر نەبێت، بەڵام سەیر لەوەدایە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەو هەستیارە خاوەن هەڵبەست و بەرهەمانە چوومە پێشەوە و داوای ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی شیعرەکانیانم لێکردن، کەچی نەیانتوانی وەڵامم بدەنەوە و مەبەست و ئامانجی بەرهەمەکانیان بخەنەڕوو. لەمە سەیرتر ئەی بەڕێزان. جارێك لە کۆڕێکدا من و ئەو هەستیارانە و شیعردۆستەکانیان کۆکردەوە و هەمان پرسیارم لێکردن، لە ئەنجامدا هەستیارەکان خۆیان دووبارە هیچ وەڵامێکیان نەبوو، بەڵام شیعردۆستەکانیان بە ڕەوانی هاتنەپێشەوە و دەستیانکرد بە ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی هەڵبستەکانیان.

ئابر کرومبی لەم دەمەتەقێیەدا بیروڕای وایە، کە سوکرات یەکەم کەس بووە لە مێژوودا توانیویەتی هێڵی جیاکەرەوەی داهێنانی وێژە لە ڕاڤەکردن و هەڵسەنگاندنی وێژە داڕێژێ. هەروەها ئەگەر زیاتر لە سەر گفتوگۆیەکەی بڕۆیشتبایە و بەبێ ئەوەی هەر خەریکی نرخشکاندنی هەستیاران بێت، دەیتوانی لایەنێکی دی لە لایەنەکانی بواری وێژەیی، کە چەشەوەرگرتنە بخاتەڕوو، بەڵام ئەمەی نەکرد، بەڵکوو زیاتر لە تەك چەسپاندنی بیردۆزە بە ناوبانگەکەیدا دەربارەی سەرچاوەی هۆنراوە و ئەرکی هەستیار و سوودیان خەریکبوو.

## ● بەهرەکانی جیهانی وێژە

ئابر کرومبی لەبەر تیشکی گفتوگۆکەی سوکرات و تێبینییەکەی سێ بەهرەی جیاواز بۆ جیهانی وێژە و بوونی هۆنراوە دەستنیشاندەکات.

یەکەم: بەهرەی نووسینەوەی وێژە و داهێنان و خوڵقاندنی هونەری شێواز، واتە (ملکە الابداع الادبي والخلق الفني)

دووەم: بەهرەی چەشە و چێژوەرگرتن لە بەرهەمی وێژەیی، واتە (ملکە التذوق الادبي)

سێیەم: بەهرەی لێکۆڵینەوەی ژیری لە وێژە و توانای هەڵسەنگاندن و نرخێدانی

بەهرەی نووسینەوەی وێژە و داهێنانی و بەهرەی چێژ و چەشەوەرگرتن لە بەرهەمی هونەری هەردووکیان پێکەوە لە توانایێکی دەروونییەوە هەڵدەقوڵێن و زگماکیانە و خواکردانە چەشنە قەوارەیێکیان لە گەڵ بوونی خاوەنەکەیاندا پێکهێناوە. هەرچەندە کە دەبێت بزانین کە لە نێوانیاندا جیاوازیێکی سەرەکی دەستنیشانکراوە. ئەم جیاوازییە سەرەکییەش لەوەدا دەخرێتەڕوو، کە چەشە و چێژوەرگرتن لە بەرهەمی وێژەیی توانایێکی ناهەموار (سلبي) و بێبەرهەمە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە چەشە و چێژوەرگرتن هیچ شتێکی زیادە ناخاتەسەر جیهانی وێژە، ئەوە نەبێت کە ئەدیبدۆست و هونەرپەرستە، بەڵام بە هۆی داهێنانی وێژەیی و خوڵقاندنی بەرهەمی هونەری توانایێکی ئیجابییە و خاوەنەکەی دەتوانێ جیهانی وێژە بە کاری وێژەیی تازە بڕازێنێتەوە. هەروەها چەشە و چێژوەرگر لە وێژە ڕەنگە وێژەر بێت، بەڵام وێژەر هەمیشە پێویستە خاوەن بەهرەی چێژوەرگرتن بێت، بۆیە لەم ڕووەوە وتراوە کە هەموو وێژەرێك چەشە و چێژوەرگرە، بەڵام هەموو چەشە و وێژەر نییە.

مێژوونووس و ڕەخنەسازەکەمان (ئابر کرومبی) بە دووورودرێژی بەرهەم و لێکۆڵینەوەی وێژە و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری بە توانایێکی ژیری و عەقڵی لەقەڵەمدەدات. بیروڕای وایە کە ئەم توانایە لە تەك توانای بەرهەمهێنان و چەشە و چێژوەرگرتن، جیهانی وێژە بنیاتدەنێن و باخچەی ڕەنگاوڕەنگ و بەهادارەکەی هەمیشە بە سەوزی دەهێڵێتەوە.

## • ئەرکی ڕەخنەسازی

ئابر کرومبی زیاتر سروشتی بەهرەی لێکۆڵینەوەی وێژە و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری، کە پێیدەڵێن (ڕەخنەسازی) شیدەکاتەوە و دەبێژێ: پێویستە بزانین، کە بەهرەی ڕەخنەسازی توانایێکی ژیری و عەقڵییە بەگوێرەی ڕێبازێکی مەنتیقی بەڕێوەدەبرێت و لەبەر تیشکی یاسا و بنواشە و بنەڕەتی ڕێکخراودا ئەنجامدەدرێ. بۆیە ڕەخنەسازی چەشنە کارێکی پیشەسازییە، کە مرۆڤ دەتوانێ فێریببێت و زانست و زانیارییەکانی وەدەستبهێنێت و بە وردی پەیڕەویبکات. بە پێچەوانەی بەهرەی بەرهەمهێنان و بەهرەی چەشە و چێژوەرگرتن، کە هەردووکیان بە زگماکی و لە ڕێگای فێربوونەوە بەچنگ ناهێنرێن.

لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا مێژوونووس و ڕەخنەسازەکەمان بیروڕای وایە، کە ئەرکی ڕەخنەسازی ڕوونکردنەوە و شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی وێژەیە. سەرئەنجام بە هیچ جۆرێك ئەرکی خوڵقاندنی وێژەر و چاندنی چەشە و چێژوەرگرتن نییە، بە مانای ئەوەی مرۆڤ بە هۆی خوێندنەوەی زانستی ڕەخنەسازییەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان نابێت بە وێژەر و چەشە و چێژوەرگر لە بەرهەمی وێژەیی، ئەگەر هاتوو زگماکییانە بەهرەی ئەوەی پێنەبەخشرابوو.

هەروەها دیارە ئابر کرومبی لەم بیروڕایانەیدا تا ڕاددەیێکی زۆر شوێنپێی سوکرات و ئەفلاتونی هەڵگرتووە، کە بەر لە نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر بۆچوونیان ئەوە بووە، کە وێژە بەرهەمی درەختی خوربە و ئیلهامە.

## ● سروشتی ڕەخنەسازی

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازیی جیهانی لە ڕووی دەستنیشانکردنی سەردەمی لەدایکبوونی ئەم چالاکییە مرۆڤایەتییە هەمیشە دووپاتیانکردۆتەوە، کە بەرپابوونی ڕەخنەسازی دوابەدوای بڵاوکردنەوەی یەکەم بەرهەمی وێژەیی چاوپەهەڵهێناوە.

ڕەخنەسازەکەمان لە ئاستی ئەم تێبینییە مێژووییەدا، بیروڕای وابووە، کە ئەمە بۆچوونێکی گشتییە و هیچ ڕاستییەکی مێژوویی ورد نادا بە دەستەوە، بۆیە بڕیارێك سازدەکات و دەڵێت: ڕەخنەسازی هەر میللەتێك، کاتێك لەدایکبووە، کە بڕیاردانی باشی بەرهەمێکی وێژەیی بەسەر بەرهەمێکی دیکەدا لە ڕێی گشتییەوە پەرەیسەندووە و پێیخستۆتە قۆناغی هەڵبژاردنی بەرهەمی هونەری لە سەر بناغەی خۆدەرخستنی ژیری و عەقڵیدا.

سەرئەنجام پەسەندکردنی بێ هۆدەرخستن و بە خراپەدانانی بە چەشنێکی گشتی بە لای (ئابر کرومبی)یەوە کارێکی ڕەخنەسازی نییە، چونکە کاری ڕەخنەسازی پێویستی بە تیشکی عەقڵ و ژیریی هەیە و پێویستە لە چوارچێوەی دەستوور و یاسادا ئەنجامبدرێ.

پرسیارێکی گرنگ بۆ دڵنیایی لە مەبەستی ڕەخنەسازەکەمان لێرەدا دەپرسێ: ئایا ژیری و عەقڵ و مەنتیق مەرجێکی گرنگە لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا؟

ئابر کرومبی بە ڕوونی و بەبێ مشتومڕ وەڵامی ئەم پرسیارەی بە ئەرێ دەداتەوە و هۆیەکانی ئەم پێویستییە ڕووندەکاتەوە و دەڵێ: وێژەر بۆ ئەوەی بەرهەمی باشتر سازبکات و خۆی لە هەموو کەموکورییەك بپارێزێ، دەبێت بە عەقڵ و مەنتیق، بڕوا بە ئامۆژگارییە ڕەخنەسازییەکان بهێنێ و هەست بە هەڵەکان بکات. هەروەها خوێنەر و ئەدەبدۆست و چەشە و چێژوەرگر بە دەستووری ژیریی و بنواشەی مەنتیقی زیاتر سوود لە وێژە وەردەگرێت و بە باشی بەرهەمی چاك لە بەرهەمی خراپ جوێدەکاتەوە.

## ● بوارەکانی ڕەخنەسازی

ئابر کرومبی بیروڕای وایە، کە ڕەخنەسازی خۆی لە خۆیدا دوور لە مەسەلەی داهێنان و خوڵقاندنی وێژە و مەسەلەی چەشە و چێژوەرگرتن لە بەرهەمی هونەری بریتییە لە بەرپاکردنی پرسیاری هۆشمەندی سەبارەت بە هەموو شتێك کە پەیوەندیی بە وێژەوە هەیە. ئەوجا وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە دیسانەوە بە چەشنێکی هۆشمەندی و عەقڵی ئەم پرسیارانە بەسەر دوو کۆمەڵدا دابەشدەکرێن:

کۆمەڵەی یەکەم: لە پرسیاری گشتی پێکهاتووە، کە لە وێژە بە فراوانی دەپرسن و وردەوردە بوارێکی تایبەتی بەرەو بەرهەمێکی تایبەتی ئاسۆی خۆیان یەکدەخەن.

کۆمەڵەی دووەم: بە پێچەوانەی کۆمەڵەی یەکەمەوە لە پارچە وێژەیەکی تایبەتییەوە بواری خۆیان بەرەو بابەتی وێژەی گشتی بەرین و فراوانتر دەبەن.

توێژەر لە بەر تیشکی پرسیارەکانی کۆمەڵەکەی یەکەمدا (وێژە) وەکوو قەوارەدارێك تەماشادەکات و دەپرسێ: پێناسەی وێژە چییە و چەشنەکانی چین و تایبەتی جیاکەرەوەی هەر چەشنێك لەو چەشنانە لە چ وێنەیەکدا خۆی دەنوێنێ و وێژە چ جۆرە ئەرکێك بەدیدەهێنێ؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە و سازکردنیان بە باسی قووڵ و فراوان، دەستوور و بنواشەی ڕێکخراو و ئاسۆی فراوان دەچەسپێنێ.

ڕەخنەسازەکەمان لێرەدا دووپاتیدەکاتەوە، کە هیچ یەکێك لەم دەستوور و بنواشانە بە هیچ جۆرێك زادەی بیرکردنەوەی پەتی و لێکدانەوەی بیردۆزەیی نییە، بەڵکوو بەرهەمی بیرکردنەوەن لە سروشتی وێژەدا، کە خۆی لە دەقی ئەنجامدراودا بەر لە یەکالاکردنەوەی خۆی چەسپاندووە و قەوارەی هەبووە. بە مانای ئەوەی نابێت ئەو پرسیارانە و وەڵامەکانیان دوور لە قەوارە و گیانی وێژە ئەنجامبدرێن و باسەکانیان سازبکرێن، بەڵکوو دەبێت ڕەخنەسازە بەرپاکەرەکانیان لە مەیدانی پراکتیکدا دەقی وێژەیی گشتی شیبکەنەوە و لێیبکۆڵنەوە.

هەرچۆنێك بێت ئابر کرومبی ئەم باسانە بە زاراوەی بیردۆزەی وێژە (نظریە الادب) ناودەبات و دووپاتیدەکاتەوە، کە ئەم باسانە لە تایبەتییەکانی چەشنێکی وێژەی لابەلا دەدوێن، بەڵام وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی کۆمەڵەی دووەم پەیوەندییان بە پارچەیێکی وێژەی تایبەتی و بەرهەمێکی دەستنیشانکراوەوە هەیە و ڕەخنەسازە ئەنجامدەرکانیان شێواز و وێنەی هونەری و وشە و ناوەڕۆك و مانا و مەبەستی پارچەیێکی وێژەیی یەکالادەکەنەوە و دەستوور و بنواشەیێکی تایبەتی دەگرێتەبەر، کە بە ناوی ڕەخنەسازیی بنەڕەتی (النقد الاساسی) ناویدەبات.

ئابر کرومبی هەرچەندە کۆششیکردووە ئەو دوو بوارەی ڕەخنەسازی لە یەکترجیابکاتەوە و لە هەموو کاتێکدا دووپاتیکردۆتەوە، کە بیردۆزەی وێژە و ڕەخنەسازیی بنەڕەتی پێکەوە بەرێوەدەچن و پەیوەندیگەلێك لە نێوانیاندا چەسپاوە.

بەڵێ، بیردۆزەی وێژە زیاتر پەیوەندیی بە بابەتی فەلسەفییەوە هەیە، کە پێیدەوترێ (ستاتیکا) واتە جوانناسی، بەڵام هەمیشە باسەکانی لە بنج و بناغەی وێژە دەکۆڵنەوە و نموونە بەرزەکانی شیدەکەنەوە، هەروەها ڕەخنەسازیی بنەڕەتییش دەبێت خۆی لە سۆز و هەڵچوونی تایبەتی بپارێزێ و نەبێت بە داردەستی ئارەزوو و مەیلی کەسی. بە مانای ئەوەی دووبارە سوود لە

بیردۆزەی وێژە وەرگرێت و دەستوور و بنواشە گشتییەکانی دەکات بە چرای ڕێپیشاندەر.

ئابر کرومبی کە بەم جۆرە بوارەکانی ڕەخنەسازی دەستنیشاندەکات سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە زۆربەی ڕەخنەسازیی جیهانی خۆی لە سازکردنی بڕیاری بیردۆزەیی و گشتی پاراستووە. بۆ نموونە کە لە ڕەخنەسازیی ئەغریقی وتراوە پێویستە هۆنراوەی شەڕوشۆڕ لە سروودی ماتەمینی بناخنرێ و بە ڕووداوی ناهۆشمەندی بابەتەکەی سازبکرێت و بە ئەندێشە و وێنەی میتافیزیکی بڕازێندرێتەوە، ڕێگا بە هەموو تازەکردنەوەیەك لەم هونەرەدا گیراوە و بەرهەمەکانی هۆمیرۆس بە لوتکە لەقەڵەمدراوە.

هەروەها کە لە ڕەخنەسازیی کلاسیزمدا یەکێتیی بابەت و یەکێتیی کات چەسپێنراون، تا ڕاددەیێکی زۆر مەیدانی شانۆگەری تاریك کراوە.

سەرئەنجام ڕەخنەسازەکەمان دووپاتیدەکاتەوە، کە دەبێت سروشتی وێژە و تایبەتییەکانی هەر چەشنێك لە چەشنەکانی لە هەموو ڕوویێکەوە لە بەر تیشکی ڕێبازی بەراوردکاریدا یەکالابکرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانین ڕەخنەسازیێکی زانستی ئەنجامبدەین.

## • پێناسەی وێژە

ئابر کرومبی لە کۆششکردنیدا بۆ شیکردنەوەی زاراوەی وێژە پێناسەیەك دەهێنێتەوە کە دەڵێ: وێژە هونەرێکە لە هونەرەکان، مەبەست و ئامانجی بە هۆی وشەوە بەدیدەهێنێ.

دوابەدوای ئەم پێناسەیە لایەنەکانی یەکالادەکاتەوە و سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە زۆربەی لایەنەکانی نادیار و گشتین. بۆ نموونە: قسەی ڕۆژانەش ڕێگای وشە بۆ گەیاندنی مەبەستێك دەگرێتەبەر. هەروەها زاراوەی هونەریش لە پێناسەدا سنووریێکی فراوانی هەیە و دەیان کاروباری ڕۆژانە دەگرێتەبەر. بۆ بەڵگە دەترێ هونەری قسەکردن و هونەری جەنگ و هونەری چێشتلێنان و .. تاد. بۆیە ڕەخنەسازەکەمان پێناسەی هونەر دەکات و دەڵێت: هونەر چەشنە کارزانین و وردەکارییەکە، ئادەمیزاد بە هۆیەوە پاش تێفکرین و پیاچوونەوە ئامانجی خۆی جێبەجێدەکات.

ئەم پێناسەیەی هونەر دووبارە فراوان و بەرینە، هونەرە جوانەکان و هونەرە بەسوودەکان دادەپۆشێت. بۆیە ئێمە ناتوانین بە هۆی پێناسەی زاراوەی هونەرەوە پێناسەی وێژە وەدەستبهێنین، ئەگینا هەوڵماندا‌وە لە ڕێگای نادیارەوە، نادیارێك بناسین و بیخەینەڕوو، ئەمەش هەڵبەت کارێکی بێ ئاکامە.

## • لایەنەکانی ویژە

ئابر کرومبی بۆ دەستنیشانکردنی سروشتی وێژە پەنادەباتەبەر یەکالاکردنەوەی لایەنەکانی وێژە و دەڵێ: گومان لەوەدا نییە، کە گرنگترین لایەنەکانی وێژە دەربڕینێکە لە هەستی بیرۆکەی خاوەنەکەی کە وێژەرە. ئەم دەربڕینە خۆی لە خۆیدا بە هیچ ڕەنگێ قەوارەیێکی دانپێدانراو و قایلبوون سازناکات، ئەگەر بێت و خەڵکی وەری نەگرن و پێیڕازینەبن. کەوابوو: لایەنی بە وێژە قایلبوون لایەنێکی دیکەی گرنگە لە لایەنەکانی ئەم هونەرە.

لەم شیکردنەوەیەدا بۆمان ساغدەبێتەوە، کە وێژە لە سێ لایەنی سەرەکیدا بوون و قەوارەی خۆی دەنوێنێ:

**یەکەم:** لایەنی وشە، کە قەوارەیێکی هەستپێکراوی هەیە و خەڵکی هەستیپێدەکەن و لە وێنەی دەنگ و ئاوازدا ئەو خەڵکە دەیبیستنەوە.

**دووەم:** لایەنی دەربڕین لە هەست و سۆز و بیروباوەڕی وێژەر، کە زاتیەتی و کەسایەتیی وێژەر دەخاتەڕوو. ئەم لایەنەش بێگومان ڕێگاییێکە بۆ ئاسۆی ڕۆمانتیکییەت و خودییەتی لە جیهانی هونەری وێژەدا.

**سێیەم:** لایەنی گەیاندن کە مەسەلەی بابەتی و ڕیالیزمی وێژە دەچەسپێنێ و ساغیدەکاتەوە، کە ئەم هونەرە بەبێ بەستنەوەی خوێنەران و گوێگران بە وێژەرەوە، وێژە هیچ ئەرکێك بەدیناهێنێت.

سەرئەنجام وێژە بەم سێ لایەنەی دەبێت بە شوێنەوارێکی خاوەن بوون و قەوارەیێکی تایبەت بە سروشت و ئەرکی بێهاوتای.

## • ئامانجەکانی ویژە

لە بەر تیشکی ئەم لایەنانەی وێژەدا، کە گوێمان لەو دوو زاراوەیە دەبێت، یەکسەر سێ ڕەگەزی بەیەکەوەبەستراو بە خەیاڵماندا دێن:

١- ڕەگەزی وێژەر

٢- ڕەگەزی خوێنەر

٣- ڕەگەزی بەرپاکردنی پەیوەندی لە نێوان وێژەر و خوێنەردا.

بێگومان پەیوەندی ڕەگەزێکی گرنگە، چونکە ئامانجی وێژە لە دووتوێیدا بەدیدەهێنرێ و بەوە دەستنیشاندەکرێ، کە ئەرکی وێژە هونەری بەرپاکردنی پەیوەندییێکە لە نێوانی وێژەر و

جەماوەری خوێنەراندا. پەیوەندیش دەتوانرێ لە چەمکی وێژەرەوە بە زاراوەی دەربڕین (التعبیر) سەرچاوەکەی دەستنیشانبکرێ.

لە لای خوێنەردا زاراوەی نواندن یاخود چەسپاندن، واتە (التمثیل) پێیدەکرێ ئامانجەکەی بخرێتەڕوو: بە مانای ئەوەی پەیوەندی لە لای وێژەر هەست و بیرۆکە دەربڕین و لە ئاستی خوێنەردا ئەو هەست و بیرۆکەیە لە مێشکیدا دەنوێنرێ و دەچەسپێنرێ.

لاسەل کرومبی بەوردی ئەرکی وێژە لە گەیاندن و بەرپاکردنی پەیوەندی شیدەکاتەوە و دەڵێ: ئەم ئەرکە هەڵبەت مەسەلەی وشەسازی و ڕستەسازی و داڕشتنی هونەرییە. لە ڕوانگەی ئەم مەسەلەیەوە زۆر جار ڕێکدەکەوێ بەرهەمێکمان بەرچاوەدەکەوێ لە ڕێگای دەربڕینە جوانەکانییەوە دڵمانڕادەکێشێت و بە جوانیی بێهاوتای هەستمان داگیردەکات و بەبێ ئەوەی بیر لە ناوەڕۆکەکەی بکەینەوە، بڕیاری هونەری دەدەین. ئەم بەرهەمە پێیدەوترێ: هونەری پەتی (الفن الصرف) بەڵام هەندێ جار بەرهەمێك جگە لە جوانی دەربڕینەکانی بە هۆی زانیاری و ناوەڕۆکە بە سوودەکانییەوە ڕەزامەندیمان وەدەستدەهێنێ. ئەم جۆرە هونەرە پێیدەوترێ: هونەری پراکتیکی، واتە (الفن التطبیقی).

ڕەخنەسازەکانمان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دوو جۆرە هونەرە واتە هونەری پەتی و هونەری پراکتیکی، بۆ هەریەکێکیان نموونەیەك دەهێنێتەوە. نموونەکەی لە هونەری پەتی، بەرهەمی هەستیاری ئینگلیزی بەناوبانگ (گیتس)ە، کە هەڵبەستێکە بە ناونیشانی (لە گوڵدانێکی ئەغریقیدا). نموونەکەی بۆ هونەری پراکتیکی کتێبە بەناوبانگەکەی (داروین)ە، کە بە ناونیشانیبنەچەی چەشنەکان (اصل الانواع)داینوە.

ڕەخنەسازەکەمان لە هەڵسەنگاندنی ئەم دوو بەرهەمەدا دووپاتیدەکاتەوە، کە بەرهەمەکەی (گیتس)جگە لە مەبەستی دەربڕین بۆ دەربڕین هیچ مەبەستێکی دیکەی نییە. خوێنەرانیش تەنیا بە جوانی دەربڕینەکانی لەززەت و خۆشی دەبینن و ڕەخنەسازانیش تەنیا لە سووچی جوانی دەربڕینەکانییەوە نرخی دەستنیشاندەکەن، کەچی بەرهەمەکەی داروین هەرچەندە، دەربڕینەکانی هونەری و جوانن، بەڵام ئەم دەربڕینە جوان و هونەرییانە مەبەستی نووسەرەکەی نەبووە، بەڵکوو مەبەستی گەیاندنی زانیارییەکی زانستییە سەبارەت بە ڕەگەزی گیانلەبەران. بۆیە خوێنەران و ڕەخنەسازان پێکەوە لە سووچی ناوەڕۆکەکەیەوە هەڵیدەسەنگێنن.

## • کەرەسەی وێژە

وێژە بە لای "ئابر کرومبی"ی ڕەخنەسازی بەناوبانگ، کە هونەری گەیاندن بێت، پێویستە خوێنەری وێژە لەگەڵ وێژەردا بەشداریێکی سۆزی بکات، کەرەسەی گەیاندن دەبێت چی بێت؟ یاخود ئەو بابەتەی وێژەر دەیگەیەنێتە خوێنەر لە چی پێکهاتووە؟

ئابر کرومبی بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، دووپاتیدەکاتەوە، کە کەرەسە و بابەتی گەیاندن هەرچی بێت لە وێژەی پەتیدا ئەو بابەت و کەرەسەیە خۆی لە خۆیدا مەبەست نییە، بەڵکوو مەبەست هەر گەیاندنە و گەیاندن بۆ گەیاندن.

پاش ئەم دووپاتکردنەوەیە دێتەوە سەر وەڵامی پرسیارەکە و دەڵێ: کەرەسەی گەیێنراوی وێژەر و بابەتە گوێزراوەکەی تاقیکردنەوەکەیێتی.

تاقیکردنەوە، کە کەرەسەی وێژەیە دیسانەوە لە لای ئابر کرومبیدا، تاقیکردنەوەیێکی ڕووتە و هیچ پەیوەندییێکی مەبەستی لەگەڵ بیرۆکەیەك یان واتایەکدا نییە. بە مانای ئەوەی ئەگەر هاتوو تاقیکراوەکەی وێژەر لە مەسەلەیێکی کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان کەسایەتی بوو. ئەم مەسەلانە وەکوو بابەتێك مەبەستی سەرەکی وێژەر لە گەیاندندا پێکناهێنن، بەڵکوو تەنیا زەمینەیەك بۆ وێژەر سازدەکەن، بۆ ئەوەی لە ناو جەرگەیەوە مومارەسەی تاقیکردنەوە بکات.

ئەم تاقیکردنەوەیەش بەم چەمکە هەڵبەت بوارێکی تەنگەبەر نییە بۆیان، بە دەستی کەرەسە و بابەتی وێژەیی بگرە بە پێچەوانەوە ئاسۆییێکی فراوان و یەکجار بەرینە، چونکە هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی ژیان چ کاروباری ڕۆژانە بێت چ ڕووداوێکی مێژوویی و بابەتێکی زانستی و فەلسەفی و ژیری بێت. بەم پێیە وێژەر دەتوانێ هەموو تێبینییەك وەکوو کەرەسەیەك بۆ بەرهەمەکانی سازبکات.

ئەوجا ئەگەر لێرەدا سنوورێك بۆ ئەم کەرەسە جۆریەجۆر و سەرچاوە فراوانە هەبێت ئەم پێوانەیە تەنیا جوانی تاقیکردنەوەکەیە. بۆیە ڕەخنەسازەکەمان دووپاتیدەکاتەوە، کە ڕەخنەسازیی ڕاستەقینە لە ئاستی کەرەسە و بابەتی وێژەدا بە هیچ جۆرێك ناپرسێ، ئایا زانیارییەکەی ڕاستە یان درۆیە؟

هەروەها ناشێت بپرسێت: ئایا لە ڕوانگەی خوو و ڕەوشتەوە ڕەوایە یاخود ناڕەوایە، بەڵکوو تەنیا پرسیاری هەر ئەوەیە، کە دەپرسێ ئایا تاقیکردنەوەی وێژەر لە کەرەسە و بابەتی بەرهەمەکەیدا جوانە یان ناشیرین؟ ئایا وێژەر توانیویەتی تاقیکراوەکەی بگەیەنێتە خوێنەر و خوێنەرەکەی بە سۆز و هەڵچوون و هەستییەوە بۆ چەشنی تاقیکراوەکەی ڕابکێشێ.

ئەم پرسیارانە تاقە پێوانەی هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژەیی سازدەکەن و بەس.

## • بنەڕەتی سەرەکی ڕەخنەسازی

کرۆمبی کە بەم چەشنە کەرەسە و بابەتی وێژە یەکالآدەکاتەوە و لەبەر تیشکی ئەم یەکالآکردنەوەیەدا بنەڕەتێکی سەرەکی لە بنەڕەتەکانی ڕەخنەسازی دادەڕێژێ، کە دەڵێ: لە نێوانی دەربڕین و وێنەکێشان لە لایەکەوە و لە نێوانی گەیاندنی تاقیکردنەوەدا پەیوەندییێکی دیالێکتیکی و جەدەلی هەیە، چونکە دەربڕین و وێنەکێشان کە وێژەر بە وشە سازیاندەکات، هۆیێکی هەستپێکراوە بۆ بنیاتنانی پەیوەندی لە تەك خوێنەردا. بە مانای ئەوەی خوێنەر ناتوانێ تاقیکراوەکەی وێژەر وەربگرێت، ئەگەر بێت و هۆی نواندنی ئەو تاقیکراوەیە لە دەربڕینی وێنە، توانای گەیاندنی نەبێت، ئەم توانایەش هەڵبەت بەهرەییێکی بێهاوتایە.

ڕەخنەسازەکەمان زیاتر لەم بەهرەیە دەدوێ و نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێ: ئەگەر هاتوو وێژەرێك چاوی بە دیمەنێکی جوان کەوت، ئەرکی ئەو وێژەرە گێڕانەوەی چۆنێتی ئەو چاوپێکەوتنە و ئەوەی بینیویەتی نییە. هەروەها پێویستی سەرشانی چەسپاندنی هەست بەرامبەر ئەو دیمەنە بە تەنیا نییە، بەڵکوو ئەرك و پێویستی سەرشانی ئەو وێژەرە گەیاندنی هەموو لایەنەکانی تاقیکردنەوەی بینینی ئەو دیمەنەیە.

بەم پێیە خوێنەری تاقیکردنەوەی ئەو وێژەرەش نایەوێ بزانێ چلۆن ئەو وێژەرە دیمەنەکەی دیوە و دەرفەتەکەی چۆن بووە؟ بەڵکوو تەنیا دەیەوێ هەست بە تەواوی تاقیکردنەوەکەی وێژەرەکە بکات و بەس.

سەرئەنجام ئەم بنەڕەتییە زۆربەی بەرهەمی وێژەیی بە وێژە دانانێ با کەرەسەکانیشیان بابەتی دڵداری و تێبینی کەسی و دەیان بابەتی خودی (زاتی) بێت، ئەگەر هاتوو لە بۆتەی تاقیکردنەوەییێکی ڕاستەقینەوەئەنجامنەدرابوو.

## • چلۆن تاقیکردنەوەی وێژەیی دەگەیەنرێتە خوێنەر

ئاشکرایە، کە ڕەخنەسازەکەمان دەرگا لە ڕووی هیچ بابەتێك داناخات، کە ببێت بە کەرەسەی وێژە، بە مەرجێك ئەو بابەتە وەکوو تاقیکراوەییێکی ڕاستینە پێشکەشکرابێت. کەوابوو: بواری بابەتی وێژە بێسنوورە، جا کە ئەم بابەتە بێسنوورە، وێژەر بە وشە دەریببڕێت و وشەش لە ڕووی چەندەوە دیارە بە ئەندازەی بابەتەکانی ژیان فراوان نییە. هەروەها لە ڕووی چۆنێتیشەوە،

سەرمایەیێکی هاوبەشە لە نێوان دوێنەرەکاندا، وێژەر چلۆن دەتوانێ بە هۆی وشەوە، کە ئەمە حاڵێتی تاقیکردنەوەکانی بێت لە وێنەیێکی داهێنراو و خوڵقێنراودا بگەیەنێتە خوێنەر؟

ئەم پرسیارە تەنگوچەڵەمەی سەرەکی هونەری وێژە دەخاتەڕوو.

ئابر کرۆمبی لەم وەڵامدانەوەیەیدا دەبێژێ: بەر لە هەموو شتێك پێویستە بزانین ئەرکی وێژەر گواستنەوەی تاقیکردنەوە تایبەتییەکەیەتی بۆ هەست و نەستی خوێنەر و بزواندنی سۆز و هەڵچوونی، جگە لە دەستگرتن بە سەر ئەندێشە و تێڕوانینەکانی، بۆ ئەوەی بتوانێ بۆ لای خۆی ڕایبکێشێ.

تاقە هۆی وێژەریش لە بەدیهێنانی ئەم ئەرکە گرانانە وشەیە، وشەش وەکوو قەوارەیێکی هەستپێکراو لە فەرهەنگ و ئاخاوتنی ڕۆژانەدا جگە لە واتای کلێشەیی هیچ شتێکی دی نابەخشێت، بۆیە وێژەر دەبێت وشەکان وەکوو ڕەمز و نیشانە بۆ دەربڕینی تاقیکراوەکەی سازبکات و وەکوو سەرچاوەیێکی خوریە و ئیلهام بەخشندە دایانبڕێژێ.

ڕەخنەسازەکەمان لەم بڕیارە ڕەخنەسازییەدا سەبارەت بە چۆنێتی گەیاندنی تاقیکردنەوە بە ڕێگای وشەوە بنەڕەتێکی گرنگ دووپاتدەکاتەوە و دەڵێ: وێژەر لە سازکردنی وشە، وەکوو ڕەمز و نیشانە نابێت تێگەیشتنی خوێنەر فەرامۆشبکات، بەڵکوو دەبێت ڕەمز و نیشانەکانی تەلیسم و موعەما نەبن.

ئـەم بـاغـە بنەڕەتییـە هەر وەکوو دیـارە، ئەوە دەگەیەنێ کە ڕەخنەسـازەکەمان لەم ڕووەوە سریالیزمی نەبووە.

## • زمانی وێژە

زمانی هەر نەتەوەیەك هۆی لە یەکتر تێگەیشـتنی جەماوەری ئەو نەتەوەیەیە، بۆیە لە ڕووی ڕێزمانەوە یاسا و دەستووری دامەزراوی هەیە و لە ڕووی وشە و واتاکانییەوە چەسپاون.

سەرئەنجام ئەگەر واتای ئەم وشانە و ئەو ڕێزمانە لەبەر هەر بیانوویێك دەستکاریبکرێت، تایبەتییەکەی تێکدەچێت و لە ئەرکی تێگەیاندن دەکەوێت. ئەمە ڕاستییەکە نە زۆر و نە کەم جێگای مشتومڕ نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا، داوادەکرێ لە وێژەری هەر نەتەوەیەك کە ئەو زمانە بە چەشنێکی خوڵقێنراو دابهێنێ و لە تەك مەبەستەکانیدا بیگونجێنێ و لە وێنەیێکی تازە و دوور لە لاساییکردنەوە پێشکەش بە خوێنەرەکانی بکات.

پرسـیاریش لێرەدا دەپرسـێ وێژەر چلۆن دەتوانێ بەم ئەرکە دوولایەنە جیاوازە هەسـتێت.

لایەنی پەیڕەویکردنی دەستوور و واتا و لاساییکردنەوە و دەستکارینەکردنی ئەو دەستوور و واتا چەسپاوانە؟

ئابر کرۆمبی بەوە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، کە وێژەر دەتوانێ ئەو ئەرکە گرانە لە ڕێگای هەستکردنێکی تایبەتییەوە بە زمان ئەنجامبدات، بەڵام ئەم وەڵامە بێگومان پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە، چونکە مەسەلەی هەستپێکردنی تایبەتی بە زمان لە لایەن وێژەرەوە سەرچاوەکەی چییە و چۆن ئاکامی دەبێت؟

ڕەخنەسازەکەمان ئەم ڕوونکردنەوەیە بە شیکردنەوەی ڕەگەزەکانی زمان پێشکەشدەکات و دەڵێ: زمان هەرچەندە گیانلەبەرێکی زیندوو و قەوارە یەکگرتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە جیهانی هونەردا چوار بەشە:

**بەشی یەکەم:** واتای وشە

**بەشی دووەم:** دەنگەکانی وشە

**بەشی سێیەم:** خورپەکانی واتای وشەیە، کە لە ڕستەیەك سازدەکرێن.

**بەشی چوارەم:** ئاوازەکانی دەنگی وشەیە، کە شانبەشانی کۆمەڵە وشەیەك لە ڕێگای ڕستەدارشتنەوەبەکاردەهێنرێن.

ڕەخنەسازەکەمان پاش ئەم دابەشکردنە، یەکە یەکە ئەم بەشانە شیدەکاتەوە و دەبێژێ: هەر دانە وشەیەك لە وشەکانی زمان، هەرچەندە واتایێکی دەستنیشانکراوی بە هۆی فەرهەنگ و بەکارهێنانی ڕۆژانەوە هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەیان واتای لابەلا لە دەوری ئەو واتایەدا خڕبوونەتەوە.

وێژەری خاوەنهەستێکی تایبەتی دەتوانێ ئەو وشەیە لەگەڵ بابەتی بەرهەمێکدا بگونجێنێ و لە ڕێگای بەکارهێنانی لە ڕستەیەکدا ئەو واتا لابەلایانە زیندوویکاتەوە و وزەکانیان بتەقێنێتەوە و بیانکات بە شوێنەوارێکی تەلیسماوی لە پێناوی بزواندنی ئەندێشە و هەستی خوێنەردا.

ئەم ئەرکەی وێژەر ئەگەر هاتوو بە چەشنێکی سەرکەوتوو، ئەنجامدرا واتای وشە لە ڕستەدا دەبێت بە ئاکامێکی تازە و خوڵقێنراو، کە خوێنەر تێیدا دەفکرێ و هەستدەکات، کە بۆ یەکەم جار دەیبیستێتەوە و بڕیاری تازەی داهێنراوی دەدات.

ئەمە لە ڕووی واتای وشە و دەستکاریکردنی ئەو واتایە لە لایەن وێژەرەوە لە ڕستەی خورپەبەخشدا، بەڵام لە ڕووی دەنگی وشەوە ڕەخنەسازەکەمان لە سەرەتاوە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە دەنگی وشە خۆی لە خۆیدا ئامێرێکی ئاوازژەنە، چونکە لە پیتی (نەبزوێن) و پیتی (بزوێن) پێکهاتووە. پیتە نەبزوێنەکان بە گوێرەی جیاوازی سازگەکانیان، ڕەنگاورەنگن و

پیتە بزوێنەکان پلەکانیان درێژ و کورت و ناوەندین.

ئەوجا وێژەری خاوەن هەستێکی تایبەتی بە زمان دەتوانێ سوود لەم وزەیەی دەنگی وشە وەربگرێت و لە دوو ڕێگاوە سۆز و هەستی خوێنەر ببزوێنێ:

١- لە ڕێگای هەڵبژاردنی ئەو وشانەوە، کە ئاوازی دەنگەکانیان دەگەڵ بابەتەکە و باری دەروونی ئەزموونەکەیدا دەگونجێن.

٢- لە ڕێگای سازکردنی چەشنە گونجاوییەك لە نێوانی ئاوازی وشەکانی ڕستەکەیدا، هەتاکو بتوانێ بە گوێرەی شەپۆلەکانی سۆزی هەڵچوونی ئاوازی نزم و بەرز و کپ و کراوە و گوشراو سازبکات و مۆسیقاییێکی سەمفۆنی بەرپابکات.

## ● دابەشکردنی وێژە

لە مێژووی ڕەخنەسازی و ڕۆشنبیریی جیهاندا وێژە بە سەر دوو بەشدا دابەشدەکرێت:

**بەشی یەکەم:** پەخشان (نثر)

**بەشی دووەم:** هۆنراوە (شعر)

ڕەخنەسازەکەمان بناغەی ئەم دابەشکردنە، لێکدەداتەوە و دەڵێ: ئەوانەی بەم جۆرە وێژە دابەشدەکەن، تەنیا لە سووچی تەنگەبەری کێش و قافیەوە کارەکەیان بە ڕەوا دەخەنەبەرچاو. هەروەها دەڵێ: ئەگەر مەبەست لەم دابەشکردنە تەنیا فێرکردن بێت، بێگومان زیانێکی ئەوتۆی نابێت، ئەگینا لە ڕووی بۆچوونی فەلسەفەی هونەرییەوە بە هەڵە دادەنرێت و زیانێکی گەورە لە بیردۆزەی هونەری وێژە دەدات.

لەم ڕوانگەیەوە دووپاتیدەکاتەوە، کە وێژە چ بە کێش و قافیە هۆنرابێتەوە، چ لەم تایبەتییە بێبەری بێت، گرنگ ئەوەیە زمانەکەی هۆنراوەیی بێت، واتە دەبێت تایبەتییە هەرە گرنگەکەی شیعری بێت.

**پرسیاریش لێرەدا دەپرسێت: مەبەست لە زمانی شیعری چییە؟**

زمانی شیعری ئەو دەربڕینە هونەرییەیە، کە بە ئەوپەڕی وردییەوە وشەی سادە و ڕستە و دارشتن بە هەرچوار لایەنەکانییەوە، لایەنی واتا و لایەنی ئاواز و لایەنی سێبەری واتا و لایەنی مۆسیقای لێکدراو بۆ وێنەکێشان و گەیاندنی ئەزموون بەکاردەهێنێ، بە مەرجێك وێنەکێشان پێویستە لە گەیاندندا ڕوون و بێگەرد و کاریگەر بێت. کە ئەمە زمانی شیعری بێت، بیردۆزەی هونەری وێژە وەکوو جیهانێکی هۆنراوەیی یەکگرتوو لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا دەبێت

تەماشاکراوێت. لە ڕووی هەڵسەنگاندن و نرخپێدانی هونەری وێژەوە نابێت پێوانەی جوانی بکرێت بە داردەست و لەبەر تیشکیدا بڕیاری سەرکەوتنی وێژەرێك یان سەرنەکەوتنی بدرێت.

جوانیی هونەری وێژە بە لای ڕەخنەسازەکەمانەوە خۆی لە خۆیدا ئامانج نییە، بەڵکوو ئامانج ئەوەیە کە وێژەر بە هۆی وێژەوە مەبەستەکەی بەدیبهێنێ. سەرئەنجام ئەگەر هاتوو مەبەستەکەی بەدیهێنا، ئەو کاتە بەرهەمەکەی بە ناوەڵناوی جوان ناو دەبرێ و هەڵدەسەنگێنرێ.

## • سێزدەهەم: ساموێل تیلور کولردج ی ڕەخنەساز

ئەم ڕەخنەسازە لێکۆڵینەوەیێکی ورد و زانستی دەربارەی نیشانە و بەڵگەکانی وزە و توانای هەستیارێتی تایبەتی نووسیوەتەوە. لە ڕەخنەسازیدا دەستوور و بنواشە (قاعدە)ی هۆنینەوەی هەڵبەست، لە مێژەوە خراونەتە بەر خامەی یەکالاکردنەوە و لەم ڕووەوە چەسپاوە، کە هەستیار وەکوو سەنعەتکارێك دەتوانێ لە سەدا هەشتای کارەکەی بە هۆی فێربوونی ئەو بنواشە و دەستوورانەوە ئەنجامبدات.

ڕەخنەسازەکەمان واتە: کولردج لەم لیکۆڵینەوەیەیدا، تا ڕاددەیەك ئەم بیرۆکەیە بەرپەرچدەداتەوە و دووپاتیدەکاتەوە، کە هەستیاری بێهاوتا و هەڵکەوتوو، پێویستە وزە و توانایێکی تایبەتی هەبێت بۆ ئەوەی بەرهەمی هۆنراوەی ڕاستینە بەدەستەوەبدا.

جا بۆ سەلماندنی ئەم بیروڕایەی شکسپیر هەستیاری ئینگلیزی بە ناوبانگ وەکوو نموونەیەك دەهێنێتەوە و هەڵبەست و شانۆگەرییەکانی شیدەکاتەوە، ئێمەش لەم باسەدا، بیرۆکە سەرەکییەکانی ئەم ڕەخنەسازە شیدەکەینەوە، بە نیازی ئەوەی لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا سوودێك بە وێژەکەمان بگەیەنین.

## • بەهرەی گشتی و وزەی تایبەتی لە هونەری هۆنراوەدا

کولردج بە وردی جیاوازی نێوان بەهرەی گشتی و وزەی تایبەتی لە ئەنجامدانی بەرهەمی هۆنراوەییدا دەخاتەڕوو و دەبێژێ: هەستیار وەکوو هونەرمەندێك لەگەڵ هەستیارێکی دیدا بە چەند تایبەتییەك لە گوێچکەی مۆسیقی و زانینی زمان و یاسای کێش و سەروا یەکدەگرێتەوە، کە پێیدەوترێ (بەهرەی گشتی).

ئەم بەهرە گشتییە بێگومان نابێت بە هۆی بلیمەتی و هەڵکەوتوویی ئەو هەستیارە، چونکە هەموو لایەنەکانی نیشانەی هەرەمەکین.

سەرئەنجام پێویستە ئەم هەستیارە خاوەن وزەیێکی تایبەتی بێت و توانایێکی بێهاوتای پێبەخشرابێت بۆ ئەوەی پێیبکرێت لوتکەی هونەری هۆنراوە داگیربکات و بە ناوەڵناوی هەستیاری بلیمەت و هەڵکەوتوو ناوببرێت.

ڕەخنەسازەکەمان سێ کاری (شکسپیر)ی هەستیاری بلیمەت و هەڵکەوتوو دەهێنێتەوە و دەیانخاتە بەر خامەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە (ڤینۆس و ئەدۆنیس و لوکریس).

پرسیار لێرەدا پێویستە بپرسێت: بۆچی (کولردج)ئەم سێ کارەی هەڵبژاردوون و کردوونی بە پراکتیك؟

ڕەخنەسازەکەمان لە وەڵامدا دەبێژێ: ئەم سێ کارە لە بەرهەمە نۆبەرەکانی (شکسپیر)ن و سەرەتای نیشانەی وزەی تایبەتین و بە وردی دەخوێنرێنەوە. ئەم تایبەتیانەی خوارەوەیان تێدا بەدیدەکرێت:

١- جوانیی ئاواز و گونجاندنی تریە و مۆسیقایان لەگەڵ بابەتەکانیاندا، کە بە وێنەی وشەی ڕەنگاورەنگ ئەنجامدراون، بەبێ ئەوەی ئەو ئاواز و مۆسیقایە بە تریەی دەستکرد و ئاهەنگی ڕووکەش خنکێنرابن.

ئەم تایبەتییە بە لای ڕەخنەسازەکەمانەوە بەرهەمی ڕەسەنی شکسپیرە و نیشانەی ئەوەیە، کە ئەم هەستیارە زگماکیانە ئاوازشوناس و مۆسیقاژەن بووە.

سەرئەنجام (کولردج) لەو بیروڕایە دایە، کە هەرگیزاوهەرگیز مرۆڤ نابێت بە هەستیار ئەگەر ئەم توانایەی لە بواری ئاواز و مۆسیقا و ئاهەنگدا پێنەبەخشرابێت.

ڕەخنەسازەکەمان بەم بیروڕایە مەبەستی فێربوونی یاساکانی کێش و قافیەی هۆنراوە نییە، چونکە ئەم یاسایانە نهێنی و جەوهەری تریەی هۆنراوە نادرکێنن، بەڵکوو وەك دەستکەوتێکی بازرگانی ئادەمیزادی زیرەك دەتوانێ لە ڕێگای کۆشش و هەوڵدانەوە بە چنگیان بهێنێ.

ئەم تایبەتییەی وزەی هەستیارێتی، کە جوانیی ئاوازە بێگومان لە بابەت و ناوەڕۆکی هونەری هۆنراوە جیاناکرێتەوە، بۆیە بابەت و ناوەڕۆکی هونەری هۆنراوەیش پێویستە لە سەرچاوەی کەسایەتی و ناخی خودێتی هەستیارەوە هەڵقوڵابن.

ڕەخنەسازەکەمان دووپاتیدەکاتەوە، کە هەستیاری خاوەن وزەی تایبەتی لە ڕێگای خوێندنەوەی کتێب و گەشتکردنەوە، بیرۆکە و واتای هەڵبەستەکانی وەدەستناهێنێ.

سەرئەنجام بەهرەی ئەنجامدانی ناوەڕۆکی بەرز و بەنرخ و لەتەك جوانیی ئاوازی گونجاودا تایبەتییەك نییە لە پۆل و کۆڕی خوێندنەوە و فێربووندا وەدەستیانبهێنێ، چونکە ئەگەر وابوو: مانای ئەوەیە کە هەستیار دروستکراوە، کەچی هەستیار لە ڕاستیدا سروشتیانە لەدایکدەبێت.

هەروەکوو ئاشکرایە (کولردج) کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئەم لێکۆڵینەوەیەی نووسیوەتەوە و ئەو تایبەتییەی شکسپیری شیکردۆتەوە، لاسایی بیرۆکە دێرینەکەی ئەفلاتون دەکاتەوە، کە توانا و وزەی هەستیاری بە خورپە و ئیلهام لەقەڵەمداوە.

ئەمە ڕاستییەکە، بەڵام پێویستە لە هەمان کاتدا بزانین، کە ڕەخنەسازەکەمان بەرەنگاری دیاردەی بلیمەتی شکسپیر بووە، لە باسکردنی ئاوازی جوان و مۆسیقای وشەی لەتەك بابەت گونجاودا بووە و ئەم دیاردەیەی کتومت لای هیچ هەستیارێکی دی نەدیوە.

جا کە زانستی هونەری هۆنراوە و فێربوونی دەستووری کێش و قافیە و ڕستەسازی و ناوەڕۆك لەبەر دەستی هەموو ئادەمیزادێك بەربڵاوبێت، بۆچی بە تەنیا هەر شکسپیر بلیمەت و هەڵکەوتوو بووە؟

ئەمە پرسیارێکی ژیری و مەنتیقییە، وەڵامدانەوەکەی بە هیچ هۆخستنەوەیێکی عەقڵی ناچەسپێنرێ. بۆیە ڕەخنەسازەکەمان پەنای بردۆتەبەر خورپە و ئیلهام بۆ لێکدانەوەی ئەو تایبەتییەی وزەی هەستیارێتی شکسپیر.

٢- نیشانەی دووەمی وزەی تایبەتی هەستیارێتی، هەڵبژاردنی بابەتە دوور لە مەیلی کەسایەتی هەستیار و دەرفەتەکان و بواری دەوروپشتی، چونکە ئەگەر هاتوو هەستیار بابەتی هەڵبەستەکانی لە ئارەزووی خودی خۆیەوە وەرگرت یاخود چاوی بڕییە سەرچاوەکانی دەرەوەی وزەی هەستیارێتی، بە هیچ ڕەنگێك بە هونەرمەندێکی خوڵقێنەر تەماشاناکرێ.

ڕەخنەسازەکەمان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم تایبەتییە حیکایەتی پەیکەرتاشێك دەگێڕێتەوە، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان پەیکەرێکی دروستکرد تەنیا قاچەکانی جوان بوون و بە هۆی ئەم جوانییەوە ناوبانگێکی فرەی دەرکرد. لە دواییدا دەرکەوت ئەو پەیکەرتاشە جوانیی قاچەکانی پەیکەرەکەی بە لاساییکردنەوەی جوانی ژنەکەی ئەنجامداوە.

کولردج لەبەر تیشکی ئەم حیکایەتەدا سەرئەنجامێك دەدا بە دەستەوە و دەڵێ: کەوابوو، سەرچاوەی هونەر لەو پەیکەرەدا، قاچی ژنەکەی پەیکەرتاشەکەیە، نەك وزەی هونەری پەیکەرتاشەکە. بە پێچەوانەی بەرهەمی (ڤینۆس و ئەدۆنیس)ەوە، کە سەرچاوەی جوانی بابەتەکانیان گیانێکی بەرز و وزەیێکی هەستیارێتییە بە بیرۆکەی بەرز و هێمای خورپەبەخش قوڵپیدەدەن و هەستی خوێنەر داگیردەکەن، کە ئەم خوێنەرە بە دوای هۆیەکدا دەگەڕێ بۆ دەستنیشانکردنی سەرچاوەی ئەو کارتێکردنەی بە هیچ جۆرێك ئەو سەرچاوەیە لە بوارێکی دوور لە وزەی هەستیارێتی شکسپیرەوە نادۆزێتەوە.

ڕەخنەسازەکەمان لە شیکردنەوەی بابەتی (ڤینۆس و ئەدۆنیس)دا بۆ چەسپاندنی ئەم

تایبەتییەی وزەی هەستیارێتی وزەی شکسپیر سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە سەرەتای بزووتنەوەی بەرهەمەکانی ئەم هەستیارە بەڵگەی توانای نووسینەوەی دراما و شانۆگەری دەدا بە دەستەوە، چونکە شکسپیر لەم کارانەیدا کەسایەتی و ئارەزووی خۆی لە پێشکەشکردنی بابەت و کەسایەتیی شانۆگەرییەکان و زۆرانبازی بیروباوەڕەکان دوورخستەوە. بۆیە کە بە بێپەردە ڕووداوی دڵداری و کارەساتی جنسی لە بەرهەمەکانیدا دەگێڕایەوە، خوێنەر بە هیچ جۆرێك گومانی لە ڕەوشتی شکسپیر نەدەکرد، بەڵکوو باش دەیزانی کە ئەم هەستیارە بلیمەتە خاوەن پەیامێکە و بەبێ ئەوەی هیچ مەبەستێکی تایبەتی هەبێت، بابەتەکانی پێشکەشدەکات و ڕووداوەکانی دەگێڕێتەوە.

ساموێل تیلور کولردج لە شیکردنەوەی ئەم تایبەتییە وزەی هەستیارێتی پشت بە باسکردن لە هۆنراوەی شانۆگەری دەبەستێ، کە تایبەتییە هەرە گرنگەکانی مەوزوعییێتی ڕووداوەکانیانە: بە مانای ئەوەی هەستیاری شانۆنووس پێویستە کەسایەتی خۆی دوورخاتەوە، بە پێچەوانەی هەستیاری خاوەن هەڵبەستی گۆرانی و خودی.

## • تایبەتی وێنەی هونەری

ڕەخنەسازەکانمان بەر لە کولردج وێنەی هونەرییان بە بڕبڕەی پشتی هۆنراوە لە قەڵەمداوە و دووپاتیانکردۆتەوە، کە هەڵبەستی سەرکەوتوو جگە لە وێنەی هونەری جوان شتێکی دیکە نییە. ڕەخنەسازەکەشمان بەم بۆچوونە هەروەکوو خۆی قایلنابێت و دەڵێ: وێنەی هونەری بۆ ئەوەی بە نیشانەی بلیمەتی هەستیار بژمێردرێ، پێویستە لە سەر سێ بناغە ئەنجامدرابێت:

**بناغەی یەکەم:** پێویستە وێنەی هونەری ئاکامی هەڵچوون و ئینفیعالی ڕەسەن و ڕاستینەبێت و نابێت دەستکردانە وەکوو سووراو و سپیاوی دەموچاوی ئافرەتێکی پیرەژنی ناشیرین ڕێکخرابێت و بەبێ قوڵپدانی گەرمی ژیان سازکرابێت، ئەگینا بە ڕەنگێکی ساردوسڕ دێتەبەرچاو و هیچ شوێنەوارێك لە دەروونی خوێنەردا بەجێناهێڵێ.

**بناغەی دووەم:** وێنەی هونەری پێویستە چوارچێوەیێك بێت بۆ کۆکردنەوەی ڕەگەزەکانی دیکەی هۆنراوە و نابێت وەکوو پوشێك بە بوون و قەوارەی بەرهەمەکەوە نووسابێت و سەرئاوکەوتبێت. بە مانای ئەوەی وێنەی هونەری لە هەڵبەستدا دەبێت لەگەڵ واتا و سۆز و ئاوازدا بەیەکاچووبێت و لەسەر بنجی کاری هونەری ڕوابێت.

**بناغەی سێیەم:** وێنەی هونەری پێویستە بە گیانێکی عەقڵی شەوقبداتەوە و ئاسمانی

هەڵبەستەکە بە هێمای ژیری و ڕۆحی مرۆڤایەتی برازێنێتەوە.

ڕەخنەسازەکەمان بۆ چەسپاندنی ئەم سیمایانەی وێنەی هونەری لە کۆڕی پراکتیکدا ئەم دوو دێڕە دەهێنێتەوە، کە دەڵێ:

"ئەوە ڕیزێکە لە درەختی سنەوبەر کە لقوپۆپەکانیان براون و چەماونەتەوە.

لەبەر تیشکی خۆرئاوادا و لە کاتی زەردەپەڕدا دەجوڵێنەوە و کە دەریا شەپۆل دەدات دەیانبینێت."

ڕەخنەسازەکەمان وێنەی هونەری ئەم دوو دێڕە بەوە هەڵدەسەنگێنێ، کە ڕووکەشن و بۆ کتێبی جوگرافیا و تۆبۆگرافی دەستدەدەن و لە جیاتی ئەوەی بەرهەمی بلیمەتی هەستیارێك بن، ئاکامی خامەی زانایەکن. بۆیە پێشنیازدەکات، کە دەبوو ئەو وێنە هونەرییانە بەم جۆرە سازبکرانایە، کە دەڵێ:

"لەوێدا، لەوێدا، ڕیزێك لە درەختی سنەوبەر هەیە، بەبێ خێوەتێکی پارێزەر ڕەشەبا پەلاماریاندەدات.

بڕوانە لەبەر تیشکی خۆرئاوا دەیانبینێت، دەیانەوێ ڕابکەن و گێژەلوکەی شوم هەڵبێن.

پرچەکانیان لەبەر هێرشی ڕەشەبا پەرشوبڵاون. پەرشوبڵاون.."

ڕەخنەسازەکەمان بەم نموونەیە تایبەتی وێنەی هونەری دووپاتدەکاتەوە و سەرنج بۆ بەرهەمەکانی شکسپیر وەکوو شانۆگەری (ئۆتێللۆ و لیر) ڕادەکێشێ و دەڵێ: سەرەڕای ئەوەی ئەم بەرهەمانە بابەتین و مەوزوعین، هۆنراوەی گۆرانی نین، بەڵام وێنە هونەرییەکانیان لەسەر ئەو سێ بناغەدا ئەنجامدراون و هەمیشە تابلۆی گەرموگوڕ و زیندوو پێشکەشدەکەن.

## • تایبەتی قووڵی و چالاکی بیری

ڕەخنەسازەکەمان کە لە باسکردنی وێنەی هونەری دەبێتەوە، تایبەتی قووڵی واتای هۆنراوە و چالاکی بیری هەستیار شیدەکاتەوە و دەڵێ: هەموو تایبەتییەکانی هونەر لە وێنەی هونەری و ئاواز و بابەتی بەکەڵك، ئەگەر بە چەشنێکی قووڵ سەرچاوە واتاکانیان نەتەقێنرابوونەوە و بە چالاکییەکی بیری سازنەکرابوون، ناتوانن ئەرکی خۆیان بەجێبهێنن"، چونکە هەستیار بەر لەوەی هونەرمەند بێت فەیلەسووفێکی خاوەن ئایدیۆلۆژییەتێکە، بۆیە ئەو بیرۆکە دێرینەیە بەرپەرچدەداتەوە، کە دەبێژێ: هەستیار ئادەمیزادێکی ساکار و سروشتییە و بە هیچ جۆرێك بیرۆکەیێکی زانستی نییە.

ساموێل تیلور کولردج بۆ چەسپاندنی ئەم تایبەتییەی وزەی هەستیارێتی بەڵگەگەلێك لە شانۆگەرییەکانی شکسپیر دەهێنێتەوە: بۆ نموونە شانۆگەری "ئۆتێللۆ"، کە بابەتەکەی باس لە گومانی مێرد دەکات و وێنەی ئێش و ئازاری ئەو مێردە لە کۆمەڵگایەکدا پێشکەشدەکات و دەیسەلمێنێ، کە شکسپیر هەستیاری کۆمەڵشوناسێکە و زانایێکە لە زاناکانی زانیاری کۆمەڵ، هەروەها ئەم شانۆگەرییە ئەوە دووپاتدەکاتەوە، کە هونەرەکەی بە قووڵی شارەزای دەروونی مرۆڤە و دەزانێ چلۆن هەڵسوکەوتی ژن و مێرد شیبکاتەوە، بۆیە تایبەتییە بەرزەکانی ئەم شانۆگەرییە لە ئاوازی لەززەتبەخش و زمانی بەهێز و بابەتی پڕ لە نائامۆژگاری و وێنەی هونەری ڕەنگاوڕەنگ بە ئەوپەڕی قووڵی و وردی بیرکارییەوە سازکراون و هێنراونەتە بەرهەم.

## • سەرچاوەکانی بلیمەتیی شکسپیر

کاتێك شکسپیر بەلای کولردجەوە نموونەی بلیمەتی هەستیارێتی بێت، پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ و دەپرسێت: شکسپیر بە چی ئەو پلە هونەرییەی داگیرکردووە و سەرچاوەکانی بلیمەتی چین؟! ئایا زگماکییانە ئەو وزەیەی پێبەخشراوە یاخود لە ڕێگای زانست و فێربوونەوە دەستیکەوتووە؟

ڕەخنەسازەکەمان لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا دەبێژێ: شکسپیر بەر لە هەموو شتێك خەریکی خوێندنەوەی هەموو جۆرە ڕۆشنبیری و زانستێك بووە و لەگەڵ چینەکانی کۆمەڵدا تێکەڵبووە و گشت لایەنەکانی ژیانی چەشتووە.

سەرئەنجام ئاکامەکانی ئەم چالاکییە بێسنوورە لە مێشك و هەستیدا جۆشیانخواردووە و بوون بە شانەکانی قەوارە و بیر و سۆزیان بنیاتنا و بوون بە جۆگەلەی تێفکرین و تێڕوانین.

ئاکامی ڕۆشنبیری و زانیاری و زانست ئەگەر بەم جۆرە لای ئادەمیزادێك سەوزبوون و چەکەرەیانکرد و لقوپۆپیان هاویشت بەرهەمیان دابەدەستەوە، دەبن بە هێزێکی زگماکی و سروشتی، بۆیە شکسپیر بە هەموو توانایێکییەوە هەستیارێکی زگماکییە و فەیلەسووفێکی بیرکەرەوەیە. مێژووی وێژەی ئینگلیزی و جیهانی هەتا هەتایە دان بەوەدا دەنێ، کە شکسپیر مردووێکی زیندووە و بەرهەمەکانی بۆ هەموو سەردەمێك و کاتێك دەستدەدەن، ئادەمیزاد نییە چەندە ڕەگەز و زمان و وڵاتی جیاواز بێت لەززەت لە خوێندنەوەی هەڵبەستەکانی نەبینێت و خۆی لە ئاوێنەی شانۆگەرییەکانی نەدۆزێتەوە.

## • چواردەهەم: مەسەلەی هۆنراوەی دراما لەبەر تیشکی دەمەتەقێی "ت.س.ئەلیۆت"دا

لەم باسەدا لە بابەتێکی تازەی ڕەخنەسازی دەدوێین، ئەویش مەسەلەی هۆنراوەی درامایەکە لەبەر تیشکی دەمەتەقێکەی (ت. س. ئەلیۆت)دا، هەموو لایەنەکانی خراونەتە بەر نەشتەری لیکۆڵینەوە، بە تایبەتی ئەم لایەنانەی خوارەوە:

١- بۆچوونی ڕەخنەسازە دێرینەکان لە باسکردنی هۆنراوەی درامی.

٢- بەراوردکارییەك لە نێوانی بیروڕاکانی ئەرستۆ و درایدن و ڕەخنەسازە هاوچەرخەکاندا لە شیکردنەوەی بەرهەمی درامی.

٣- ئەرکەکانی هونەری دراما.

٤- تەکنیکی هۆنراوەی دراما و ناوەڕۆکی خوو و ڕەوشتی.

٥- هونەری بالێ لە کۆڕی ئەرکەکانی هۆنراوەی درامیدا.

٦- هونەری دراما و نووسینەوەی هۆنراوە و پەخشان.

٧- ڕووگە ڕەخنەسازییەکان و هەڵسەنگاندنی هۆنراوەی درامی.

٨- ڕەنگدانەوەی پێویستییە هاوچەرخەکان لە هونەری دراما.

هەروەکوو لەم لایەنانەی باسەکەدا بەدەردەکەوێ، زەمینەی باسکردن لە هونەری دراما زۆر فراوان و بەرینە. ئێمەش بەپێی توانا هەوڵدەدەین ئەو بابەتانەی سەرەوە یەکالآبکەینەوە، بە هیوای ئەوەی سوودێك بە وێژەی کوردی و ڕەخنەسازیی کوردی بگەیەنێ.

## • هونەری دراما لە ئەرستۆوە بۆ درایدن

لە مێژووی ڕەخنەسازیی جیهانیدا چەسپاوە، کە ئەرستۆ یەکەم ڕەخنەسازە کە بە چەشنێکی تەواو و پێگەیشتوو، لە کتێبە بە ناوبانگەکەیدا بیوتیکا باس لە هونەری دراما بکات. لەم کتێبەدا هۆنراوەی شانۆگەری و تراژیدیا و کۆمیدیا شیدەکاتەوە. هەڵسەنگاندنی ئەم شیکردنەوەیە لە ڕوانگەی مێژووەوە ئەوە دووپاتدەکاتەوە، کە ئەرستۆ لە جوغزێکی تەنگەبەردا باسی لەم هونەرە کردووە، چونکە باسەکەی لە ڕوانگەی ڕوخسار و تەکنیکی شانۆگەرییەوە، تەنیا هێمای بۆ ژمارەی فەلسەفەکان و یەکێتیی بابەت و یەکێتیی شوێن و یەکێتیی کات کردووە. لە مەسەلەی ناوەڕۆکدا هەر گرنگی بە لایەنی خوو و ڕەوشت داوە و ئەرکی شانۆگەری تراژیدیای لەوەدا دابینکردووە، کە دەروونی تەماشاکەران لە ترس و بەزەیی پاکدەکاتەوە و بەم جۆرە ئەم ڕەخنەسازە

شاسوارە بە هیچ ڕەنگێ نەچووە بە لای دراما دا بە ڕامیاری و تەنگوچەڵەمەی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە.

ئەم بارەی باسکردن لە هۆنراوەی درامی تا ڕاددەیێکی زۆر وەکوو خۆی لە لای درایدن و جۆنسۆندا مایەوە، کە دوو ڕەخنەسازی کلاسیزمی و شوێنپێهەڵگری ئەرستۆن.

ئەم دوو ڕەخنەسازە کە لە دراما دەکۆڵنەوە باسیان لە بابەتی ئایینی و کێشەی ژیانی و گیانی نەکردووە، نە بەکەم و نە بەزیاد سەرنجیان لە ستاتیکای ئەڵمانی نەداوە و هیچ پێوانەیێکی هونەری تازەیان لە هەڵسەنگاندنی شانۆگەری هاوچەرخ بەکارنەهێناوە. بەم جۆرە دەتوانرێ بوترێ تاکو سەردەمی درایدن و جۆنسۆن، کە سەدەی حەڤدەمی زایینییە، دەرگا لە ڕووی بزووتنەوەی بیری و هونەری داخرا و هونەری دراما وەکوو مۆمیاییێکی ناو دێرینخانە، بەبێ دەستکاری لە ڕۆژگاری ئەرستۆوە مایەوە.

## • ئەرکەکانی هونەری دراما

هونەری دراما کە لە لای ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکان لە ژیان پچڕا و لە جوغزێکی تەنگەبەردا پەنگیخواردەوە، ئەرکی سەرەکی لە ئاستی تەماشاکەراندا، هەر کاتبردنەسەر و ڕابواردن بوو، بەڵام کە بزووتنەوەی ڕۆشنبیری و شارستانییێتی سەردەمی ڕاپەڕین بەتوندی میللەتە ئەورووپاییەکانی هێنایە جوڵە و وریاکردنەوە، دەیان هەستیاری درامایی نوێخوازی وەکوو: (شۆ، جولزورتی، ئارسەر بینر، جۆنز، ئارلین، کوارد) چاکی مەردانەیان کرد بەلادا و ئەسپی هونەریی درامایان بەرەو بوارە ڕاستییەکانی ژیان تاودا و ئیتر ئەرکی شانۆگەری هۆنراوەیی بە چوارچێوەی ڕابواردنی خەڵکی ڕانەدەوەستا و چووەدەرێ، هەستیارەکان کەسیان بەوە قایلنەبوون بەهرەی خۆیان بۆ خۆشی کات و ڕابواردنی بۆرژوازی و خاوەن پوول و پارە بخەنەگەڕ.

سەرئەنجام بۆ نموونە درامانووسی بەناوبانگ (بینرو) لە شانۆگەرییەکانیدا باسی ناهەمواری تەنگوچەڵەمەی ڕۆژگارەکەی دەکرد و بەبێ پێچوپەنا هەرچی کێشەی ژیان هەبوو دەیخستەڕوو. برنادشۆ ش بە پێنووسە توندوتیژەکەی و لە ڕێگای شێوازە کۆمیدییەکەیەوە برینەکانی کۆمەڵی دەرماندەکردن و هیوای بە خەڵکی دەبەخشی و ڕێوشوێنی سەرفرازی دەخستەڕوو.

بەم جۆرە ئەرکەکانی درامای هاوچەرخ ڕەنگاوڕەنگ و بە پیت و فراوان بوو. تەنانەت

مەسەلەی خوو و ڕەوشتیش، کە لە سەردەمی ئەرستۆوە سەرچاوەی هۆنراوەی شانۆگەری بوو. لە سەردەمەکەماندا ڕەنگێکی ڕیالیزمی و ژیانی وەرگرت و ئیتر وەکوو بابەتێکی میتافیزیکی بنەڕەتی پێشکەشکرا، بەڵکوو لە ڕوانگەی زۆرانبازی نێوانی چینەکانی کۆمەڵەوە دەکرا بە هەوێنی باس و دیاردە دژوار و دژ یەکەکانی دەخرانەڕوو.

## ● ڕوخسار و زمانی دراما

لە مێژووی هونەری درامادا چەسپاوە ڕوخساری فۆرمی شانۆگەری لەسەر بنواشەی پەردە پەردە واتە (فصل فصل) دامەزراوە و زمانی نووسینەوەشی بە هۆنراوە ئەنجامدراوە.

ئەم ڕاستییە مێژووییە هەڵبەت لە ڕوانگەی سامانی ئەغریقییەوە ڕەچاوکراوە، بە تایبەتی لەبەر تیشکی بەرهەمەکانی شاسوارە ئەغریقییەکانی کۆڕی دراما، وەکوو: (سۆفوکلیس، یوربیدس، ئەسخیلۆس). هەروەها کە هەستیارە کلاسیزمییەکانی ئیتاڵیا و فەرەنسا و ئینگلتەرا شوێنپێی ئەو نووسەرە ئەغریقییانەیان هەڵگرت، زیاتر مەسەلەی ڕوخساری پەردە پەردە و زمانی هۆنراوەی دراما بوو بە نەریتێکی هونەری، بەڵام پرسیار لێرەدا دەپرسیّ: ئایا لەم بارە هەر ئەم چەشنە مایەوە یاخود وردەوردە گۆڕا؟

مێژووی هونەری درامای ئەورووپایی وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەداتەوە، کە ڕەخنەسازەکان لە ڕاست ئەم مەسەلەیەدا دوو کۆمەڵن:

**کۆمەڵی یەکەم:** بیروڕای وایە کە نابێت ڕوخسار و تەکنیکی هونەری دراما لەسەر یەك بار پەنگ بخواتەوە و بە ژمارەیێکی دەستنیشانکراو لە فەسڵ و پار بنووسرێتەوە، چونکە ڕووداوە ڕاستینەکانی ژیان لە ڕووی چەندەوە یەك وێنەیان نییە و لە یەکترنەپچڕاون. هەروەها زمانی دراماش نابێت بە هۆنراوە بنووسرێتەوە و بە کۆت و زنجیری قافیەش بەندبکریّ، بە تایبەتی کە هونەری دراما بووە بە زمانی جەماوەری میللەت و جەماوەرانی میللەتیش هەموویان شاعیر و هەستیارنین.

**کۆمەڵی دووەم:** بە پێچەوانەی کۆمەڵەی یەکەمەوە، بڕوای وایە کە ڕوخساری تەکنیکی هۆنراوە باشترین شێوازە بۆ هۆنینەوەی ڕووداوەکانی دراما، بیانوو و بەڵگەیان بۆ ئەم بۆچوونە لەوەدا دەیخەنەڕوو، کە هونەری دراما لوتکەی هەڵچوون و سۆزی کەسایەتی دەنوێنێت و لە بواری ڕووداوەکاندا ئەو هەڵوێستانە تۆماردەکات، کە گەرموگوڕن کەوابوو: هونەری هۆنراوە تاقە شێوازی گونجاوە لە ڕووی تەکنیك و زمانەوە بۆ نووسینەوەی دراما، چونکە مۆسیقای

ئاواز و تریەی هۆنراوە، تاقە ڕێگایە بۆ درکاندنی بە یەکداچوونی ئارەزووی جیاوازی ئەکتەرەکان و وێنەی هونەریی هۆنراوە، بەرزترین ئاوێنەن بۆ قەوارەپێدانی ڕووداوەکانی.

هەڵوێستی ئەم دوو کۆمەڵە لە ڕەخنەسازان، ئەڵبەت کارێکی کۆتایی نەبووە، چونکە وردەوردە هەڵوێستی سێیەم بەرپابوو، کە دووپاتیکردەوە: ڕووداوەکانی ژیان و کەسایەتییەکانی کۆمەڵ لەسەر ڕەوت بەرێوەناڕۆن، بەڵکوو هەمیشە جیاواز و ڕەنگاورەنگن.

سەرئەنجام نووسینەوەی درامای سەرکەوتوو، لە ڕووی فۆرم و تەکنیک و زمانەوە نابێت خۆی بەیەك شێوازەوە ببەستێتەوە، بەڵکوو پێویستە بە گوێرەی مەنتیقی ڕووداوەکان و جۆربەجۆری ڕاددەی ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی و کەسایەتییەکان، فۆرم و تەکنیك و زمانی شانۆگەرییەکەی بگۆڕێ. بە مانای ئەوەی ئەگەر هاتوو هەڵوێستێك یان ڕووداوێك وا پێویستیکرد فۆرم و تەکنیکی پەخشانی بەشێك لە بەشەکانی شانۆگەرییەکەی بنووسێتەوە، دەبێت بە بێ سێ و دوو بە دەنگی ئەو پێویستییەوە بچێ. هەروەها ئەگەر بە پێچەوانەوە پێویستبوو بە هونەری هۆنراوە کارەکەی ئەنجامبدات، نابێت هیچ درێغیبکات، چونکە هونەری دراما ئاوێنەی ژیانە و ژیانیش هەمیشە لە گۆڕاندایە.

## • هونەری دراما لە کۆت و زنجیری هەڵبەستەوە بەرەو ئاسۆی هونەری باڵێ

هونەری دراما هەر وەکوو گوتمان لە چوارچێوەی بیروڕاکانی ئەرستۆ و ڕەخنەسازە کلاسیزمییەکاندا، دیلی چەند بنواشەیێکی ناوەڕۆکی و فۆرمی بوو، بە تایبەتی بنواشەی نووسینەوەی شانۆگەری بە فۆرمی هەڵبەست و خۆبەستنەوە بە کێش و قافیەوە لە پێشکەشکردنی ڕووداو و ڕەفتارە کەسایەتییەکان.

ئەم بنواشەیە بێگومان کردارێکی مەنتیقی نەبوو، چونکە شانۆگەری ئەگەر هاتوو وێنەی ڕاستینەی ژیان بوو، ناتوانێت بە زمانی هۆنراوە ڕەسەنیی بیروباوەڕە چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵ دەرببڕێ.

سەرئەنجام هونەری دراما، کۆڕی هۆنراوەی بەجێهێشت و پەخشانی کرد بە زمانی کەسایەتییەکانی.

جگە لەمە خۆشی لە بنواشەی یەکێتیی بابەت و یەکێتیی کات و شوێن و یەکێتیی چەندی فەسلەکان ڕزگارکرد و بوو بە هونەرێکی سەرفراز، لە هەموو کۆت و زنجیرێك، کە

ڕێگای دەربڕینی ڕاستەوخۆی لێدەگرت.

هەروەکوو دەزانین ڕێبازە ڕەخنەسازییە ئەوروپییەکان جۆربەجۆرن ئەم جۆربەجۆرییەش لێرەدا خۆی دەنوێنێ و دەپرسێ: ئایا ئەرکی هونەری دەربڕینی ڕاستەوخۆیە لە ژیاندا یاخود هونەر هەر جۆرێك بێت خۆی لە خۆیدا هیچ ئەرکێکی نییە و بوونی ڕاستەقینەی ئاکامێکی سروشتییە؟!

ڕێبازی ڕەخنەسازیی پەرناسیزم و لقەکانی وەکوو ڕێبازێکی ڕەمزی و سوریالیزم، کە دروشمی هونەر بۆ هونەریان هەڵگرتووە، وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەدەنەوە، کە هونەر بە هەموو چەشن و جۆرەکانییەوە هیچ پەیامێکی ناهونەری نییە. بە مانای ئەوەی هونەر بۆ هونەرمەندە، کە بەرهەمێك پێشکەشدەکات جگە لە دەربڕینێکی جوان و هونەری هیچ مەبەستێکی دیکەی نییە.

لەم زەمینە هونەری و ئایدۆلۆژییەدا هونەری دراما دووبارە خۆی ڕاگرت و هەموو بوون و قەوارەکەی ئەدا بەدەست پێویستییە ڕاستەوخۆکانی ژیانی ماددییەوە.

سەرئەنجام ڕێگاییێکی تازەی بۆ خۆی کردەوە، کە بە هۆیەوە دەرفەتی داهێنان و خوڵقاندنی بۆ چەند هونەرمەندێك ئامادەکرد، کە لە بەر تیشکی هێڵە گشتییەکانیدا هونەری (بالێ)یان داهێنا.

هونەری (بالێ) هەروەکوو مێژوونووسەکانی هونەری ئەوروپی دەڵێن: داهێنراوێکی ئیتاڵییە، هەرچەندە بە زۆری لە ڕووسیای قەیسەری پەرەیسەند و گۆڕا، بەڵام ئەم ڕاستییە مێژووییە ئەگەر لە سووچی پێگەیشتنی هونەری (بالێ)وە جێگای مشتومڕ نەبێ، نابێت ئەوە لە یادبکەین کە ڕەگوڕیشەی بالێ لە ڕووی مێژووەوە لە زەمینەی هەڵپەڕکێی میللی ئەغریقییەوە سەریدەرهێناوە و خەمڵاوە، چونکە هونەری بالێ لە بناغەدا پشت بە بزووتنەوە و هێمای سەماکەرەکان شانبەشانی گۆرانی و مۆسیقا دەبەستێت.

## • ڕەگەزەکان و ئامانجی هونەری بالێ

هونەری بالێ هەرچەندە تا ڕاددەیێکی فرە لە مەسەلەی نواندن (تمثیل) لەگەڵ شانۆگەریدا یەدەگرێتەوە، بەڵام لە چەند خاڵێکی سەرەکیدا تایبەتییەکانی خۆی دەچەسپێنێ، ئەم تایبەتییانەش لەبەر تیشکی بەرهەمەکانی "سترافنسکی"ی مۆسیقاژەنی بەناوبانگ و "کوکتو"ی نووسەری بلیمەتدا دەستپێدەکەن، کە سەماکەرەکان بە پێچەوانەی ئەکتەرەکانەوە

ملکەچی مەشق و ڕاهێنانێك دەبن، بۆئەوەی لەشولاریان لە تەك جوڵاندنەوە و بزووتنەوەی هێماییدا بگونجێ.

لە ئاکامدا ئەرکی سەماکەران لە باڵێدا گۆڕینی دەنگ و نیشانەی دەموچاو نییە و بەس، بەڵکوو بەر لە هەموو شتێك ڕێکخستنی جوڵانی ئەندامەکانی لەشیانە بۆ ئەوەی ترپە و بزووتنەوە پێویستییەکان ئەنجامبدەن. هەروەها لە هونەری باڵێدا ئەرکێکی سەرەکی دەگێڕن، کەچی شانۆگەری بە دەگمەن پەنادەباتەبەر ئەم مەسەلانە.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هونەری باڵێ هەرچەندە وەکوو دراما و شانۆگەری بابەتی خۆی هەیە، بەڵام ئەم بابەتە زیاتر بە لای داستان و حیکایەتی ڕەمزیدا خۆی دەشکێنێتەوە، چونکە باڵێ بە هەموو ڕەگەزەکانییەوە تابلۆیێکی ڕەمزی و نیشانەییە. ئەم تایبەتییانەی باڵێ مەبەستێکی دەستنیشانکراو بۆ ئەم هونەرە لە دوو مەسەلەدا دەخەنەڕوو:

**یەکەم: مەسەلەی ئەمری**

بابەتی هەر هونەرێك لە هونەرە جوانەکان مەسەلەی ئەمری و فەوتاندنی ئەو هونەرە دەستنیشاندەکات، چونکە ئەگەر هاتوو ئەو بابەتە کاتی و دەرفەتی بوو، هونەرەکەی سەردەمی دەبێت و ناتوانێ خۆی بگەیەنێتە لوتکەی ئەمری، چونکە کات و دەرفەت دەگەڵ هۆیەکانی خۆی ڕادەپێچدەکات و جێگا بۆ کات و دەرفەتێکی دیکە چۆڵدەکات، بەڵام ئەگەر هاتوو بابەتەکەی گشتی بوو ڕێگا بۆ هونەرەکەی بەرەو مان و خۆڕاگرتن بەرەڵلادەکات.

هونەری باڵێش لەم مەسەلەیەوە بابەتی ئەمر لە سۆز و هەڵچوونی مرۆڤەوە دەهێنێت و دوور لە کارتێکردنی کاتێکی تایبەتی و شوێنێکی تایبەتییەوە لە چوارچێوەی فۆرمێکی جواندا خۆی دەنوێنێ.

**دووەم: مەسەلەی جیهانی**

شانۆگەری لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا بە زمانێکی نەتەوایەتی نووسراوەتەوە، بابەتەکەی چەند مرۆڤایەتی بێت بە ئاسانی ناتوانێ خۆی لە چوارچێوەی ناوچە و ژینگە تایبەتییەکەی ڕزگاربکات و ببێ بە بەرهەمێکی جیهانی، بەڵام هونەری دراما وانییە، چونکە هۆیە دەربڕینە سەرەکییەکانی لە مۆسیقا و جوڵاندن و ترپە پێکهاتوون. بێگومان ئەم هۆیانەش لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا زمانی هەڵچوون و سۆزی ئادەمیزادن، کەوابوو: بە هۆی مۆسیقاوە هونەری باڵێ دەتوانێ ناوەڕۆکەکەی بگەیەنێتە هەموو ئادەمیزادێك و بەسەر جیاوازی زمان و شێوازی قسەکردنی میللەتاندا زاڵ بێت.

هەروەها لە بەرئەوەی چۆنییەتی جوڵاندن و بزواندنی لەش چەند دەربڕینێکی یەکگرتووی

لە لای ئادەمیزاددا وەکوو ڕەگەزێك سازکردووە. هونەری بالێ بە هۆیەوە توانیویەتی سنووری ناوچەیی زمان و ئاخاوتن بشکێنێ و ببێ بە زمانێکی جیهانی.

هونەری بالێ بەم ڕەگەز و مەبەستانە لە شارستانییێتیی ئەورووپیدا جێگایێکی تایبەتی بۆ خۆی کردۆتەوە و دەورێکی گرنگ لە لەزەتبەخشین و ڕابەریکردندا دەگێڕێ، بەڵام سەرەڕای ئەوە دەمێت هەر بپرسین: ئایا ئیتر ئەرکی هونەری دراما نەماوە و بە تەواوی مەیدانی بۆ هونەری بالێ چۆڵکردووە؟

ئەوەی ئاگای لە بزووتنەوەی هونەری ئەورووپی بێت، وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەداتەوە کە نەخێر، شانۆگەری هێشتا ئەرکی تایبەتی خۆی شانبەشانی هونەری بالێ دەگێڕێ، چونکە هەر یەکێکیان بواری تایبەتی خۆیان هەیە و هونەردۆستی تایبەتی لە دەوری خڕبۆتەوە.

ئەم بیروڕایە سەبارەت بە چارەنووسی شانۆگەری لە زۆرانبازیدا، مان و نەمانی لەگەڵ هونەری بالێدا، نابێت ڕاستییەك پێشێلبکات، کە دەڵێ: هونەری شانۆگەریی دراما لەم دواییەدا ڕەنگێکی پیشانگایی (استعراضی) وەرگرت و زیاتر بایەخی دا بە تابلۆی مۆسیقی و بزووتنەوەی.

بێگومان ئەم ڕەنگەشی لە بالێوە وەرگرتووە. هونەری بالێ و هونەری دراما پێکەوە خەریکن دەژین و بە یەکتر موتربە دەبن، ڕەنگە لە دوارۆژدا هونەرێکی تازە لە ناوجەرگەی هەردووکیانەوە لەدایکببێت.

## • پازدەهەم: داڕشتنی ڕۆمان و "ی.م. فورستر"ی ڕەخنەسازی بەناوبانگ

ئەم ڕەخنەسازە بە ناوبانگە لەساڵی ١٨٧٩زایینی لەدایکبووە و لە کۆڕی ڕۆماننووسین و ڕەخنەسازیدا بەرهەمێکی فرەی هەیە. لەم بەرهەمانە کتێبی ڕووگە جۆربەجۆرەکانە لە ڕۆماننووسیندا، ئەم بابەتە بەشی پێنجەمێتی. بیرۆکە سەرەکییەکانی (ی.م. فورستر)ی ڕەخنەساز لەم خاڵانەی خوارەوە دەکەونە بەرچاو:

١- بۆچوونی ئەرستۆ لە شیکردنەوەی ئەرکی کرداری کەسایەتییەکانی شانۆگەری و هونەری دراما.

٢- تایبەتییەکانی کەسایەتی لە هونەری ڕۆماندا.

٣- ڕێباز بۆ خستنەڕووی پەنهانییەکانی کەسایەتییەکان.

٤- تایبەتییەکانی داڕشتنی (چنین- حبکە)ی ڕۆمانی سەرکەوتوو.
٥- پێوانەی ڕەخنەسازی لە هەڵسەنگاندنی جوانی ڕۆماندا.
٦- بەراوردکاری لە نێوان هونەری ڕۆمان و چەشنەکانی دیکەی وێژە.
ئێمەش لەم باسەدا ئەم خاڵانەی لای سەرەوە یەکالآدەکەینەوە و هەڵیاندەسەنگێنین بە هیوای سوود گەیاندن.

## ● کەسایەتی لە نێوان ئەرستۆ و "ی.م.فورستر"ی ڕەخنەسازی بە ناوبانگ

لە ڕەخنەسازیی جیهانیدا هەمیشە هەوڵدراوە و هەوڵدەدرێ سنووری جیاکەرەوە لە نێوان ڕۆمان و شانۆگەریدا بخرێتەڕوو. سەرئەنجام لەم ڕوانگەیەوە ئەو سنوورە لەسەر ئەم بناغەیەی خوارەوە دامەزراوە:

**یەکەم: شانۆگەری هونەری دراما:**

بۆ ئەوە نووسراوەتەوە، کە بنووسرێ و لەسەر شانۆ پێشکەشبکرێ، بەڵام هونەری ڕۆمان بۆ خوێندنەوە نووسراوەتەوە و خوێنەران بە تێفکرین و پێداچوونەوە لەزەتی لێوەردەگرن.

**دووەم: ڕووداو و کارەساتەکانی شانۆگەری:**

ڕووداو و کارەساتەکانی شانۆگەری لە ڕێگای ئەکتەر و بە هۆی دیمەن و دیکۆرەوە دەخرێنەبەرچاو و دەرهێنەر شانبەشانی نووسەری شانۆگەرییەکە لە پێشکەشکردنی ئەم هونەرە دەورێکی گرنگ دەگێرێ، واتە: شانۆگەری جگە لە دەقەکەی چەند ڕەگەزێکی دیکە بەشداری بنیاتنانی دەکەن، کەچی هونەری ڕۆمان تاقە ڕەگەزێ کاریگەریی دەقەکەیەتی و بەس، بە مانای ئەوەی نووسەری ڕۆمان هەرچی هەیە لە دووتوێی ڕۆمانەکەیدا پێشکەش بە خوێنەرەکانی دەکات.

**سێیەم: شێوازی دەمەتەقێ و دیالۆگ:**

شێوازی دەمەتەقێ و دیالۆگ ڕەنگی سەرەکی گێڕانەوەی ڕووداو و کارەساتەکانی شانۆگەرییە، بەڵام لە ڕۆماندا شێوازی پێهەڵدان و وەسف و شیکردنەوە بە زۆری ئەرکی گێڕانەوەی ڕووداوەکانی دەبینن.

ئەم خاڵە سەرەکییانەی سنووری جیاکردنەوەی شانۆگەری لەگەڵ ڕۆماندا پێویستە لە یادمان نەچن لە کاتی شیکردنەوەی بیروڕاکانی (ئەرستۆ) و (ی.م.فورستر) سەبارەت بە

کەسایەتی، چونکە ئەرستۆ لە بۆچوونەکانیدا بە زۆری باسی کەسایەتیی شانۆگەری دەکات، بەڵام فورستر بە تەنیا لە کەسایەتیی ڕۆمان دەکۆڵێتەوە. هەرچۆنێك بێت ئەرستۆ لەم ڕووەوە بیروڕای وایە، کە ڕەفتار و کردار ئاوێنەی کەسایەتین و بەختیاری و کوێرەوەری ئادەمیزاد لە ڕێگای هەڵسوکەوتییەوە دەزانرێ، بەڵام ڕەخنەسازەکەمان بەم بیروڕایە قایلنابێت و بەتوندی دەیداتە بەر نەشتەری بەرپەرچدانەوە و دەڵێ: کەسایەتیی هەر مرۆڤێك و بەختیاری و کوێرەوەری هەر ئادەمیزادێك تەنیا لە ڕێگای خستنەڕووی پەنهانییەکانی ژیانییەوە بە جۆرێکی ڕاستەقینە دەناسرێ. هەروەها دووپاتیدەکاتەوە، کە ئادەمیزاد وەکوو کێوی فەرین چلۆن سێیێکی بەسەر ئاوەوەیە و ئەوەی ماوەتەوە نقومبووە بە ژێر ئاوەوە و نابینرێ، ناتوانین بە ڕەفتار و کردارەکان کەسایەتییە ڕاستینەکەی دەستنیشانبکەین. ئەرستۆ هەروەکوو دیارە کە بەو چەشنە باس لە کەسایەتی دەکات و پشت بە پێوانەی عەقڵی و هۆشمەندی دەبەستێت و وا دەزانێ، کە عەقڵی ئادەمیزاد تاقە سەرچاوەیێکە بۆ هێنانەدەرەوەی پەنهانییەکانی ناخی کەسایەتی، بەڵام ی.م. فورستر ملکەچی زانستی دەروونە و دیوی ناوەوەی کەسایەتی مرۆڤ بە سەرچاوەی ڕاستینەی بەختیاری و کوێرەوەری لە قەڵەمدەدات.

## • ئەرکی ڕۆمان

فورستر کە بەو جۆرە کەسایەتی شیدەکاتەوە و ئەرکی ڕۆماننووس لە کۆڕی ئەنجامدانی بەرهەمەکانیدا بەوە دەستنیشاندەکات، کە خستنەڕووی پەنهانییەکانی ژیانی کەسایەتییەکانی ڕۆمانەکەیەتی. ئەم ئەرکە هەڵبەت کارێکی ئاسان نییە، چونکە پەنهانییەکانی ژیان تەنانەت لە لایەن خاوەن ئەو ژیانەش ئاشکرانین و هۆیەکانیشیان لە خۆیان پەنهانیترن. بۆ نموونە: تێبینیدەکرێت کە ئادەمیزادێك لە پڕ خەفەت و ماتەمینی دایدەگرێت، کە بە دوای هۆی ئەو بارەدا دەگەڕێ، هیچ بەڵگە و نیشانەیێکی هەستپێکراو نادۆزێتەوە، هەروەها ئادەمیزاد لەگەڵ خۆیشیدا زۆر جار ڕاستناکات و تێدەکۆشێ لایەنەکانی ژیانی لەبەر هەر هۆیەك بێت لە خودی خۆی بشارێتەوە. جگە لەمە کەسایەتییەکانی ڕۆمانیش جۆربەجۆرن و هەموویان لەسەر یەك ڕەوت ناڕۆن و لە پێستێکی یەکگرتوودا بەرچاوناکەون، بەڵکوو بە گوێرەی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە و چۆنێتی ژیانیان ڕەنگی جیاواز بە خۆیانەوە دەبینن و هەندێ جاریش لەسەردەم و هەڵوێستێکەوە بۆ سەردەم و هەڵوێستێکی دی کەسایەتییەکانیان دەگۆڕێن.

پرسیاریش لێرەدا ڕوودەکاتە ڕەخنەسازەکەمان و دەپرسێت: کە ئەمە مەسەلەی کەسایەتیی

ڕۆمان بێت، ڕۆماننووس چلۆن دەتوانێت لە ئاستیدا خۆی بە دیبهێنێت؟

ی.م. فورستر بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دوو بناغەی ڕابەریکەر دەچەسپێنێ:

**یەکەم:** باشترین ڕێباز بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر پەنهانییەکانی کەسایەتی لە ڕۆماندا، دەربڕینی مەنەلۆگ و مونۆجاتە. بە مانای ئەوەی ڕۆماننووس پێویستە بواری کەسایەتییەکان بدات، خۆیان لەگەڵ خۆیاندا قسەبکەن و ورێنەی حاڵی خۆیان بگێڕنەوە. هەروەکوو چلۆن بە تەنیایی ڕازی دەروونی خۆیان دەخەنەڕوو و لە کەس ناترسن. پەنهانییەکانیان بزانن بەبێ پەردە، هەرچی لە دڵیاندا هەیە لە ڕێگای ئاخاوتنی ڕاستەوخۆوە هەڵبڕێژن.

**دووەم:** ڕۆماننووس پێویستە بچێتە پێستی کەسایەتییەکانییەوە و تەقەموسی ناخی دەروونیان بکا: واتە دەبێت کەسایەتی و ڕەنگی خۆی دابکەنێت و بە چەشنێکی مەوزوعی و بابەتی لە ڕووداوەکانی ڕۆمانەکەی بە زمانی حاڵی کەسایەتییەکانی بگێڕێتەوە.

## • دارشتنی ڕۆمان

ڕەخنەسازەکەمان هەرچەندە لە شیکردنەوەی ڕەگەزەکانی ڕۆمان وەکوو ڕەخنەسازەکانی دیکە پەنجە بۆ ڕەگەزی کەسایەتی و ڕەگەزی دەربڕین و پێشکەشکردن درێژدەکات، بەڵام باس لە ڕەگەزێکی تازە دەکات، کە بە زاراوە (دارشتن: الحبکە) واتە دارشتن و چنین ناویدەبات. کەوابوو: ئەم ڕەگەزە چییە و ئەرکی لە هونەری ڕۆماندا چلۆن بەڕێوەدەچێ؟

ڕۆمان لە ڕەخنەسازیدا بەوە پێناسەدەکرێت، کە گێڕانەوەی چەند ڕووداوێکە بە گوێرەی ڕێکخستنێکی کاتییە. دارشتن (الحبکە) لەم کارە هونەرییەدا بایەخدانە بە خستنەڕووی هۆیەکانی ئەم ڕووداوانە بەبێ ئەوەی خوێنەر بە دوای ئەو هۆیانەدا بگەڕێ و پرسیار لە بارەیانەوە بکات، هەروەها بەبێ ئەوەی ڕۆماننووس هیچ دەربڕینێکی لابەلا بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەرەکانی بۆ کەسایەتی و ڕووداوی ڕۆمانەکەی ڕابکێشێ. بۆ نموونە: کە لە ڕۆمانێکدا دەوترێ: پادشا، کە مرد ئەوجا شاژنەکە. ئەمە گێڕانەوەیێکی حیکایەتخوانییە، بەڵام ئەگەر گوترا: پادشاکە مرد و شاژنەکەی لە خەفەتا دەستی لە ژیان هەڵگرت و ڕوویکردە گۆڕستان و سەری لە گەڵیدا دانا. ئەمە هونەری دارشتن و چنینە (الحبکە) یە، چونکە هۆی مردنی شاژن دەدرکێنێ و ئاسۆیێکی درامی بە ڕووداوەکە دەدا و زەمینەی لایەنەکانی دی تەختدەکات.

## • خوێنەر و دارشتنی ڕۆمان

لە ڕەخنەسازیی ئەوروویپیدا دەمێکە لە ڕوانگەی زۆربەی ڕێبازە ڕەخنەسازییەکانەوە مەسەلەی ڕاددەی وێژەر لە ڕاددەی ڕۆشنبیری خوێنەر چەسپێنراوە، بەڵام ئەم چەسپاندنە لەبەر تیشکی پرسیارێکدا بەرپاکراوە کە دەپرسێ: ئایا پێویستە وێژەر بەرهەمەکانی بە گوێرەی چۆنێتی تێگەیشتنی خوێنەرەکانی بهێنێتە دی یاخود ئەم پێویستییە نابێت لەبەرچاوی وێژەردا بێت؟

ئەم پرسیارە هەروەکوو دیارە کێشەی هونەریی بەرهەمی وێژەیی لە پێناوی جێبەجێکردنی ئامانجەکانی وێژەدا بەرپادەکات و دووبارە ئەمەمان دەهێنێتەوە یاد، کە ڕەخنەسازە ئەورووپییەکان بە گشتی دوو کۆمەڵن:

**کۆمەڵەی یەکەم:** بیروڕایان وایە کە وێژە دەبێت بۆ جەماوەر بنووسرێتەوە، دووپاتیدەکەنەوە، کە ڕۆماننووس جگە لە تێگەیاندن و ڕابەریکردنی خوێنەرەکانی ناشێت خۆی بە هیچ شتێکی دیکەوە خەریکبکات.

سەرئەنجام مەسەلەی دارشتنی ڕۆمان لە لای ئەم ڕەخنەسازانە کارێکی سەرەکی نییە، بەڵکوو کاری سەرەکی هەر ناوەڕۆکی ڕۆمانەکەیە و بەس.

**کۆمەڵەی دووەم:** کە لە بەر تیشکی دروشمی (هونەر بۆ هونەر)دا وێژە هەڵدەسەنگێنن، بیروباوەڕیان وایە کە نابێت وێژەر بە هیچ ڕەنگێ لەبەر تێگەیاندنی خوێنەرەکانی ڕاددەی هونەری بەرهەمەکانی پشتگوێبخات.

سەرئەنجام ئەم ڕەخنەسازانە سەبارەت بە مەسەلەی دارشتنی ڕۆمان بۆچوونیان وایە، کە کارێکی یەکجار گرنگە ڕۆماننووس دەبێت بەو پەڕی گرنگییەوە پەیڕەوی دەستوورە هونەرییەکانی ئەنجامبدات.

ڕەخنەسازەکەمان (ی.م. فورستر) یەکێکە لە ڕەخنەسازەکانی هەڵگری دروشمی هونەر بۆ هونەر، بۆیە لە سەرەتاوە مەسەلەی دارشتنی ڕۆمان بە بڕبڕەی پشتی کاری هونەری ڕۆماننووس لەقەڵەمدەدات و ئەوجا دەڵێ: بێگومان ڕۆمان دەبێت لە تەک تایبەتییە هونەرییەکانیدا ناوەڕۆکێکی پەیامدار بگەیەنێ، بەڵام خوێنەری ڕۆمان لە هەمان کاتدا پێویستە لە بەرزی ڕاددەی هونەری ڕۆماندا بێت، جا بۆ ئەوەی ئەم ڕاددەیە جێبەجێبکرێت دوو مەرجی سەرەتایی لە هەر خوێنەرێك لە خوێنەرەکانی ڕۆمان بەدیهاتبێت:

**١- زیرەکی:** مەبەستی ڕەخنەسازەکەمان لە زیرەکیی خوێنەر ئەوەیە، کە دەبێت توانای تێگەیشتنی ڕووداوەکانی ڕۆمانە خوێنراوەکەی هەبێت و پێیبکرێت ئەڵقەی کارساتەکانی بهۆنێتەوە و شارەزای هەڵسوکەوتی کەسایەتییەکانی ببێت و مێشکی هەمیشە بۆ وەدەستهێنانی ئەنجامەکانی لە کاردابێت. هەروەها پێویستە خوێنەری ڕۆمان زانیارییەکی تەواوی لە زمانی ڕۆمانەکە هەبێت و بتوانێ شێوازی هونەری ئەو ڕۆمانە شیبکاتەوە و چەشەکانی لێوەربگرێت.

مەرجی زیرەکیی خوێنەر ئەگەر هاتوو بەم چەشنە جێبەجێکرابوو، ڕۆماننووس ڕۆمانەکەی بە چڕی دەنووسێتەوە و لایەنە درامییەکانی بەبێ درێژدادڕی دەهێنێتە بزووتنەوە و بە زمانی هونەری وێنەی کەسایەتییەکان و ڕەوتی ڕووداوەکان دەکێشێت.

**٢- بەهێزیی یاد:** ی.م.فورستر مەرجی بە هێزیی یاد و بیری خوێنەری ڕۆمان بە شتێکی گرنگ لەقەڵەمدەدات، چونکە هەروەکوو زانراوە ڕۆمان لە چاو کورتە چیرۆکدا کارەساتێکی دووروودرێژە و ڕووداوەکانی زەمینەیێکی فراوان لە کات و شوێن و هۆی جۆربەجۆر داگیردەکات. ئەنجا کە ئەم مەرجە لە خوێنەردا بەدیهاتبێ، ڕۆماننووس پێویستی بە ڕستەی زیادە نابێت بۆ خستنەوەبیری خوێنەرەکانی و لە قەوارەی یەکگرتووی ڕۆمانەکەیدا هیچ وشە و دەربڕینێکی لابەلای تێدا ناناخنێ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە هەموو توانای خۆی بۆ سفتی و پتەوی دارشتنی ڕۆمانەکەی تەرخاندەکات. هەموو وشەیەك و ڕستەیەك و دەربڕینێك لە شوێنی پێویستی خۆیدا بەکاردەهێنێ.

## • تایبەتییەکانی دارشتنی ڕۆمانی سەرکەوتوو

فورستر لە کۆڕی پراکتیکدا (جورج میردیپ)ی ڕۆماننووسی ئینگلیزی بەناوبانگ وەکوو بەرزترین هونەرمەند لە ئەنجامدانی دارشتنی ڕۆماندا دەهێنێتەوە. ئەوجا بۆ ئەوەی بڕوای پێبهێنین، کە بڕیارەکەی لە شوێنی خۆیەتی و ڕۆماننووسەکە لەم ڕووەوە بخاتەڕوو، بەر لە هەموو شتێك کەموکوڕی ئایدۆلۆژی ڕۆماننووسە هەڵبژاردەکەی دەچەسپێنێ و ناوەڕۆکی نابەجێی بەرهەمەکەی دووپاتدەکاتەوە، چونکە ئەم ڕۆماننووسە، واتە (جورج) هەروەکوو ڕەخنەسازەکەمان دەبێژێ: خاوەن سۆزێکی ساردوسڕ بووە و لە فەلسەفەی کۆمەڵایەتیدا بیروڕای وابووە، کە ئادەمیزاد یان دەبێت شمشێرێك بێت یان دەبێت بەرد بێت. هەروەها کابرایێکی گۆشەگیر و ناوچەپەرست بووە و هەمیشە لە ڕۆمانەکانیدا دەمار بۆ گوندەکەی گرتوویەتی و وای زانیوە، کە جیهان بە هەموو جوانییەوە هەر گوندەکەی خۆیەتی و بەس. جا کە ئەم

ڕۆماننووسە وابێت لەسەر چ بناغەیەك ڕەخنەسازەکەمان بەو چەشنە لەقەڵەمیداوە؟!

ی.م.فورستەر خۆی ئەم پرسیارە دروستدەکات و وەڵامیدەداتەوە و دەڵێت: جورج میردیپ هەمیشە ئەم تایبەتیانەی خوارەوەی لە دارشتنی ڕۆمانەکانیدا بەدیهێناوە:

١- گونجاندنی کەسایەتییەکانی ڕۆمانەکان کە هەموو ڕۆمانێکی وەکوو باخچەیێکی پاك و خاوێن، ڕێکخراو و بژارکراو سازدەکات. خوێنەر بە هۆی ئەم بارەوە هەڵسوکەوتی کەسایەتییەکان و ڕووداوەکانی ژیانیان وەکوو ئاوازی سەمفۆنییەك هەستپێدەکات.

٢- چاندنی گرێی سەرەتای ڕۆمانەکە لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی وردەوردە پەرەبسەنێت و خوێنەر هەنگاویەهەنگاو ئاگای لێبێت هەتاوەکوو دەگاتە لوتکە و وردەوردە دەکرێتەوە و ئاشکرادەبێت.

ئەمتایبەتییە هەڵبەت ڕۆمانەکان لە ناکاوی پۆلیس دووردەخاتەوە و لەپڕ خوێنەر ناحەپەسێنێ و یاری بە سۆزی ناکات، بەڵکوو چەند گرێی ڕۆمانەکان لێکدراوبێت سروشتیانە لەدایکدەبێت و ئامانجی هەڵچوونی بیری خۆی بەدیدەهێنێ.

٣- پەنهانی ڕووداوی سەرەکی ڕۆمان، کە هانی خوێنەر دەدات لە تەك بەرهەمەکەیدا بژی و بە مێشکێکی کراوە لە ڕووداوەکانی بفکرێت. نموونەی ڕوونکەرەوەی ئەم تایبەتییە ڕۆمانێکی (جۆرج)ە، کە بە ناوی خۆپەرستەوە بڵاوکراوەتەوە. لە سەرەتای ئەم ڕۆمانەدا هەرچەندە قارەمانەکەی (لاتیشیا) ڕازی خۆی دەردەکێنێت و خوێنەرەکانی تێدەگەیەنێت، کە (سیرویلوبی) دووجار دەستیبرییە و هەڵیخەڵەتاندووە و بە هەڵسوکەوتیان وا دەگەیەنێ، کە ڕووداوێکی پەنهانی هێشتا هەر شاراوەتەوە. شەوێ لە شەوان ئەم ڕووداوە پەنهانییە دەخرێتەڕوو، کە (سیرولیوبی) لە دەرگاکەی دەدات و لێیدەپاڕێتەوە، کە شووی پێبکات، بەڵام (لاتیشیا) وەکوو ئافرەتێکی ئازا دێتە پێشەوە و ملکەچی نابێت و دەریدەکات. بەم جۆرە ڕۆمانەکە وەکوو گیانلەبەرێکی زیندوو قەوارەی خۆی بە تەواوی دەنوێنێ.

**شازدەهەم: ئەرکی ڕەخنەساز لە نووسینەوەکەی ر.ب. بلاکمور دا**

(ر.ب.بلاکمور) لە نووسینێکیدا بە ناوی ئەرکی ڕەخنەساز بە گشتی لەم بیرۆکە سەرەکیانەی خوارەوە دەدوێ:

١- هۆنراوە و ژیان و چۆنێتی دەربڕینی هەستیار لە ڕووداوەکانی ڕۆژگار.

٢- بیروباوەڕی ئایدۆلۆژی و دەوری لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری.

٣- ڕێبازی هەڵچوونی و ڕاددەی سەرکەوتنی لە لێکدانەوەی هونەری ڕاستینە.

٤- شیکردنەوەی سێ نموونەی ڕەخنەسازی بۆ چەسپاندنی ئەرکی ڕاستەقینەی

ڕەخنەساز.

ئێمەش لەم باسەدا هێڵە گشتییەکانی ئەم بیرۆکانە لێکدەدەینەوە، هیواداریین سوودێك بە ئەدەب و ڕۆشنبیرانی کورد بگەیەنین.

## • هۆنراوە و ژیان

بابەتی ڕەخنەسازی لێکدانەوەی وێژەیە، بۆیە ئەرکی ڕەخنەساز بە لای (ر.ب.بلاکمور) ەوە، ئەنجامدانی ئەم لێکدانەوەیە بە شێوەیێکی ڕەسەن، کە لەگەڵ سروشت و مەبەستی بابەتی لێکدانەوەکەیدا بگونجێت. پرسیاریش لێرەدا کە ڕەخنەسازەکەمان بەرپایەکات ئەوەیە: ئایا وێژە بە گشتی و هۆنراوە بە تایبەتی چ پەیوەندییێکی بە ژیانەوە هەیە؟ ئایا هۆنراوە ژیانە؟ یاخود دەنگدانەوەی ژیانە و ڕاستەوخۆ ژیان دەرنابڕێت و بە ڕووداوە ڕەسەنەکانی ڕەنگنادادتەوە؟

ئەم پرسیارانە چەند دەربڕینەکانیان یەکگرتووین ناتوانن ڕاستییەك بشارنەوە، کە سروشتی بیرکردنەوەی ڕەخنەسازەکەمان داپۆشێت، چونکە ئاشکرایە کە ئەم ڕەخنەسازە گومان لە ئەرکی هۆنراوە دەکات وەکوو هونەرێکی ڕاستەقینە بۆ دەربڕینی ڕەسەنی ژیان.

بەڵێ، بلاکمور بەلای ئێمەوە ڕەخنەسازێکی ئەندێشەیی و فەنتازییە، چونکە بەبێ پێچوپەنا بیروڕای وایە، کە هۆنراوە ژیان نییە و هەستیار چەند ڕاستگۆ بێت نە دەیەوێ و نە پێیدەکرێ ژیان کتومت بە هۆی بەرهەمەکانییەوە پێشکەش بە خوێنەواران بکات. کەوابوو: هۆنراوە چ دەورێك لە پەیوەندی بە ژیانەوە دەگێڕێ؟

ڕەخنەسازەکەمان (ر.ب.بلاکمور) وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەداتەوە، کە هۆنراوە چوارچێوەیەکە بۆ سێبەری ژیان لە ڕوانگەی خاوەنەکەیەوە، کە پێیدەوترێ هەستیار (شاعیر). ئەم بارەی هەستیار و توانای بەرهەمەکانی بە دوو هۆ دەرخستن و تەعلیل ڕاڤەدەکرێت:

**هۆدەرخستنی یەکەم:** ئەوەیە کە هەستیار بۆ دەربڕین لە ژیان، زاراوە و وشەی خەڵکی بەکاردەهێنێ، زاراوە و وشەی خەڵکیش لە بەر چەند هۆییێکی بیری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ڕامیاری جگە لە کلێشەی بێگیان، کە ڕەمز و نیشانەی واتای خنکێنراون هیچ شتێکی دیکە نین.

**هۆدەرخستنی دووەم:** لەوەدا دابینەدکرێ، کە هەستیار ئەگەر هاتوو خۆی لە زاراوە و وشەی خەڵکی لە کاتی دەربڕیندا ڕزگارکرد و زاراوە و وشەی نوێباوی تایبەت بە بۆچوونی خۆی سازکرد، زاراوە و وشە نوێباوەکانی دیسانەوە پێیاننناکرێ ڕەسەنی ژیان دەرببڕن. سەرئەنجام

هۆنراوە چوارچێوەیێکە بۆ ژیان بە هیچ جۆرێ ئاوی ژیان نییە.

## • دوو ڕێبازی جیاواز بۆ دەربڕین لە ڕاستی

ر.ب.بلاکمور کە بەم جۆرە هۆنراوە هەڵدەسەنگێنێ و دەوری هەستیار لە ژیاندا دەستنیشاندەکات، بێگومان لە ڕاستیدا کارێکی ئاسان نییە. سەرئەنجام بەر لە هەموو شتێك ڕێبازە ئایدۆلۆژییەکان دەداتەبەر خامەی بەرپەرچدانەوە و دەڵێ: بیری ئادەمیزاد چەند خۆی بە بنەڕەتی و دەستوور و زانست چەکداربکات پێیناکرێ ڕاستی ژیان بدرکێنێ و هێڵەکانی بخاتەڕوو، بەڵکوو ئەوەی پێیدەکرێ لەوە تێناپەڕێ، کە چەند بنواشە و ئامۆژگاری پۆڵایین سازبکات و لە دووتوێیاندا ڕاستی ژیان دابمرکێنێ.

نموونەی ڕەخنەسازەکەمان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی لە لێکدانەوەی ئەرکی هونەر و پەردەهەڵماڵین لە سەر ڕاستی هونەرمەند بیروڕاکانی (فرۆید)ە. بۆیە سەبارەت بەم زانا دەروونییە دەبێژێ: فرۆید لە سازکردنی بیروڕاکانی هەرچەندە تاقیکردنەوە و تاقیگەی بەکارهێناوە و قوتابی و موریدەکانی پەنایانبردۆتە بەر تەکنەلۆژی بۆ چەسپاندنی بیردۆزەکەیان دەربارەی ناهۆشمەندی مرۆڤ بە گشتی و هونەرمەند بە تایبەتی، سەرئەنجامی بیردۆزەکەیان جگە لە دووپاتکردنەوەی شێتی و سەرگەردانی هونەرمەندی مرۆڤ هیچ شتێکی دیکەیان بەدەستەوە نادات. بۆیە ڕەخنەسازەکەمان بە سەرسوڕمانێکەوە دەپرسێت: ئایا زانستی دەروونی فرۆید، کە لەسەر بناغەی مەنتیق و عەقڵ و زانست و بیریدا ئەنجامدراوە بە کەڵکی ڕەخنەسازی دێت؟! ئایا ڕەخنەساز کە ڕێزی کارەکەی دەگرێت و ئەرکی خۆی دەزانێت، بۆی هەیە دەستبخاتە ناو دەستی فرۆیدەوە بۆ تێکدانی بەها و پیرۆزیی هونەری هۆنراوە.

هەروەکوو دیارە کە بلاکمور بەم پرسیارانە هەموو ڕێبازێکی ئایدۆلۆژی و زانستی بەرپەرچدەداتەوە و بە هیچ ڕەنگێ دانیانپێدانانێت، وەکوو شێوازێك بۆ هەڵسەنگاندنی هونەری هۆنراوە.

جا کە ئەم ئاکامەی چەسپاند چوو بۆ ڕێبازە بەناوبانگەکەی ئەفلاتوون، کە خۆی بە هیچ ڕاستییێکی کۆتایی نابەستێتەوە و هێماییێکی بۆ "مونتین"ی فەیلەسووفی بەناوبانگی هاوچەرخی کرد و وتی: ڕێبازی ئەفلاتون و قوتابییەکانی لە هەموو سەردەمێکدا باس لە ڕاستیی ژیان دەکات و چاکە و بنەڕەتی خوو و ڕەوشتی دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە و پرسیاریش لێرەدا دەپرسێ: ئەم ڕێبازە چلۆن ئەرکی خۆی ئەنجامدەدات؟ ئایا بە بڕیاری کۆتایی و بێ

مشتومڕ بۆچوونەکانی سازدەکات، یاخود بە بێ ئەوەی لە پێشەوە حوکمی خۆی ئامادەکردبێت ملی ڕێگای ڕاست دەگرێت؟

ڕەخنەسازەکەمان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، تایبەتییەکانی ڕێبازەکەی ئەفلاتوون و مۆنتین لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەستنیشاندەکات:

١- خۆدوورخستنەوە لە بڕیاری دەستکرد و کتومت.

٢- دەستکردن بە گەڕان بە دوای ڕاستیدا، بەبێ سنوور و لە هەموو بەرەکانی ژیاندا.

٣- بەکارهێنانی شێوازی دەمەتەقێ و گفتوگۆ لە لایەن ئەوانەی بیروباوەڕیان دژ یەکە و مەبەستیان دۆزینەوەی ڕاستییە.

٤- کۆتاییهێنان بە گەڕان و پشکنین بە دوای ڕاستیدا، بەبێ ئەوەی هەموو ڕێگایەك لە ڕووی توێژینەوە و لێکدانەوە دابخرێت.

ر.ب.بلاکمور هەروەکوو دیارە دەیەوێ بە پەسەندکردنی ئەم ڕێبازەی ئەفلاتون و مۆنتین ڕەخنەسازی لە کۆڕی زانست بپچڕێنێ و ئەرکی ڕەخنەساز بە بنواشە و دەستوور دابینبکات. سەرئەنجام دەیەوێ ڕەخنەسازی بە هونەر تەماشابکات و ڕەخنەسازیش وەکوو هونەرمەندێك هەڵبسەنگێنێ.

## • وتارێکی فەلسەفی دەربارەی هۆنراوە

ر.ب.بلاکمور بۆ ئەوەی بیروڕاکانی دەربارەی بێکەڵکی ڕێبازی مەنتیقی و زانستی لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا بچەسپێنێ، وتارە بەناوبانگەکەی (سنتیانا) شیدەکاتەوە، کە لە دووتوێیدا هەڵبەستێکی (لۆکریتیاس) بە ناونیشانی (سروشتی بێهاوتا) یەکالادەکاتەوە.

ڕەخنەسازەکەمان بەر لە هەموو شتێك دان بەوەدا دەنێت، کە (سنتیانا) وتارێکی پێگەیشتوو و زانستییە و دوور لە کەموکوڕی نووسیوەیەتییەوە. هەروەها ئەوە دەسەلمێنێ، کە نووسەر زاراوە و وشەی وردی لە دەربڕینی بیروڕاکانیدا بەکارهێناوە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەپرسێ: ئایا ئەم وتارە بە هەموو لایەن و باشەکانییەوە، بەرهەمێکی بە دەستەوە داوە؟!

لۆکریتیاس لە هەڵبەستەکەیدا ملکەچی سۆزی خۆشەویستی سروشت بووە و بە ئەندێشەیێکی قووڵ وێنەی زاراوەی بۆ نواندنی جوانیی سروشت لە تێڕوانینی تایبەتی خۆیەوە سازکردووە.

سەرئەنجام ئەم هەڵبەستە ئاکامێکی هونەرییە، کەچی سنتیانای فەیلەسووف ئەم ئاکامەی

وەکوو وانە و درزێکی ڕابەریکردن لێکداوەتەوە و ئامۆژگاری و پەند و تەمێی بۆ خوێنەرانی چەسپاندووە.

سەرئەنجام وتارەکەی لە جیاتی ئەوەی لێکدانەوەیێکی ڕەخنەسازی بێت بووە بە لێکۆڵینەوەیێکی فەلسەفی و ئەخلاقی و ڕەوشتی. ر.ب.بلاکمور بۆ ئەوەی زیاتر وتارەکەی سنتیانا بەرپەرچبداتەوە، نموونەیەك دەهێنێتەوە و دەڵێ: ئەگەر هاتوو وێنەکێشێك تابلۆیێکی ڕەنگینی لە بابەتێکی سروشتیدا سازکرد، هەروەها ئەگەر هاتوو قسەکەرێك باسی ئەو تابلۆیەی بۆ کردی، ئایا دەتوانیت لە ڕێگای ئەو باسکردنەوە ڕاستی تابلۆکە بزانیت؟

بەم پرسیارە دیارە ڕەخنەسازەکەمان دەیەوێ بڵێ: بە هیچ جۆرێ قسە و وتار ناتوانن نهێنیی بەرهەمی هونەری بدرکێنن و تاقە ڕێگایێك بۆ ئەوەی ئەدەبدۆست لەزەت لە بەرهەمی هونەری وەربگرێت هەر بەرهەمەکە خۆیەتی و بەس. کەوابوو: وتارەکەی سنتیانا دەربارەی (لۆکریتیاس) چەند ورد و فەلسەفیانەیە ئەوەندە لە ڕاستی بەرهەمە باسکراوەکەیەوە دوورە.

## • کتێبێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی لە تەرازووی ڕەخنەسازیدا

ر.ب.بلاکمور پاش ئەوەی بەو جۆرە وتارە فەلسەفییەکەی (سانتینا)ی دایە بەر خامەی پووچکردنەوە. کتێبە بەناوبانگەکەی (ڤان ویك برۆکس)ی نووسەری ئەمریکی دەربارەی (هێنری جیمس)ی ڕۆماننووسی بە ناوبانگ شیدەکاتەوە.

ڕەخنەسازەکەمان لە شیکردنەوەکەیدا سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە (ڤان ویك برۆکس) پەنایبردۆتە بەر زانستی دەروون و زانستی کۆمەڵایەتی، لە بەرتیشکی شارستانێتی ئەمریکا، کە شارستانێتییەکەی ماددییە، هەوڵیداوە ئەو ڕۆماننووسە واتە (هێنری جیمس) وەکوو ئاکامێکی کەرەسەی تاقیگە و تاقیکردنەوە شیبکاتەوە، هەروەها ڕۆمانەکانی وەکوو ماددەی کیمیایی و کەرەسەی بێگیان، کردوونی بە داردەستی خۆی و بۆ چەسپاندنی بڕیاری کۆتایی دەربارەی ناهۆشمەندی و دەروونی نووسەرە باسکراوەکەی.

جگە لەمە ئەم ڕەخنەسازە هەروەکوو (ر.ب.بلاکمور) دەڵێ: بەوەوە ڕانەوەستاوە بەڵکوو هێنری جیمسی کردووە بە نموونەی هەموو گەلی ئەمریکی. بیانوو و بەڵگەش لەم هەڵوێستەدا بڕیارەکانی زانستی کۆمەڵایەتییە، کە دەڵێ: ئادەمیزاد بلیمەت بێت یان نەخوێندوار لەبەرئەوەی لە کۆمەڵێکدا دەژی، هەر دەبێت نوێنەرایەتی کۆمەڵ بکات.

ئەو سەرئەنجامەی کە (ر.، ب.بلاکمور) دەیەوێ دەربارەی کتێبەکەی (ڤان ویك برۆکس)

بیچەسپێنێ، لەوە تێناپەڕێ کە ئەو کتێبە لە ئاستێکدایە و (هێنری جیمس) لە ئاستێکی دیکە دایە، بە مانای ئەوەی هیچ خوێنەرێك ناتوانێ (هێنری جیمس)ی هونەرمەند لە دووتوێی کتێبەکەی (برۆکس)دا بناسێ، بەڵکوو هەر ئەوەی دەستدەکەوێ، کە بزانێ (ڤان ویك برۆکس) چۆن بیردەکاتەوە و زاناکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی لە کۆڕەکانیاندا چی دەڵێن؟! کەوابوو: زانستی دەروون و زانستی کۆمەڵایەتی بە هیچ جۆرێك خزمەتی ڕەخنەسازی ناکەن.

## • ئەرکی ڕەخنەساز

ر.ب.بلاکمور بە لای ئێمەوە کە بەم چەشنە هەڵوێستی خۆی دەربارەی زانستە هاوچەرخەکان لە پەیوەندییان بە ڕەخنەسازییەوە دەنوێنێ، بزانێ یان نەزانێ، لە قۆناغەکانی تەمەنی ڕەخنەسازیی جیهانیدا، دەمانگەڕێنێتەوە سەر قۆناغی نابنواشەیی و نادەستووری، چونکە دەیەوێ ئەرکی ڕەخنەساز لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەستنیشانبکات:

١- ڕاڤەکردنی بەرهەمی وێژەیی بە بێ ئەوەی ئەو ڕاڤەکردنە بە زاراوەی فەلسەفی و مەنتیقی ئەنجامبدرێ.

٢- خۆدوورخستنەوە لە هەموو زانست و بیرۆکەیێکی ئایدۆلۆژی لە کاتی هەڵسەنگاندنی هۆنراوەدا.

٣- پێشکەشکردنی وتار نەك وەکوو بەرهەمێکی هاوشوێنەوار لە بری وێژە، بەڵکوو نواندنی وتاری ڕەخنەسازی لە ڕوانگەیێکەوە، کە دەڵێ: وێژە جیهانێکە و ڕەخنەسازیش جیهانێکی دیکە.

ئەم بۆچوونەی ڕەخنەسازەکەمان بە لای ئێمەوە بەرکار و کاردانەوەیەکە دژ بە ڕووگەی ماددی و زانستی و تەتبیقی و ئاکامەکانی تەکنەلۆژیا، کە بەتوندی باڵیان بەسەر هونەرمەنداندا لە ئەمریکا و ئەورووپا کێشاوە و ڕێگایان بە خەون و ئاوات و سۆزی ئادەمیزاد گرت. بۆیە بە هەموو هێزییەوە بەرەنگاری ئەم بارەی بوو، ئەم دروشمەی لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا هەڵگرت و دووپاتیکردەوە، کە ڕەخنەسازی دەبێت هونەر بێت نەك زانست، ڕەخنەساز پێویستە هونەرمەند بێت نەك فەیلەسووف و زانا.

**لەم باسەدا دەمانەوێ لە بابەتێکی تازە لە بابەتەکانی ڕەخنەسازیی نەتەوەکەمان بدوێین، ئەویش لە ڕێگای شیکردنەوەی هەندێ دێڕ لە هۆنراوەکانی هەستیارە دێرینەکانمان. هیواداریین باسەکەمان بتوانێت کەلێنێک لە ڕەخنەسازیی کوردی پڕبکاتەوە و هەنگاوێ بەرەو پێشەوە بڕوات.**

## • داهێنان و خولْقاندن لە هێنانەبەرهەمی هۆنراوە

مەسەلەی داهێنان و خولْقاندن لە کۆڕی هێنانەدی بەرهەمی هۆنراوەدا، بابەتێکی یەکجار گرنگە لە بابەتەکانی ڕەخنەسازیی جیهانی، چونکە چەند بیرۆکەیەکی فەلسەفی و جوانکەری بەرپادەکات، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە سروشتی وێژە و ئەرکی وێژەرەوە هەیە.

پرسیاری هەمیشەیی لەم ڕووەوە دەپرسێ: ئایا وێژە پیشەسازییەکە یان بەرهەم و زادەی بیر و هەستێکە؟

گومان لەوەدا ناکرێ، کە وێژە بەرهەم و زادەی بیر و هەستی وێژەرە. سەرئەنجام پێویستە ئەم بەرهەمە داهێنراو و خوڵقێنراو بێت و نابێت ئەنجامدەرەکەی لاسایی هیچ وێژەرێك بکاتەوە.

ڕاستە کە لە نێوانی هەموو وێژەرەکانی نەتەوەیەکدا چەند ڕەگەزێکی هاوبەش هەیە وەکوو زمانی نەتەوایەتی و دەستوورەکانی ڕێزمان و ڕەوانبێژی و یاساکانی کێش و سەروا، بەڵام ئەم ڕەگەزانە لە کەرەسەی سەرەتایی هێنانەدی وێژە زیاتر نین. بەمانای ئەوەی ئەم ڕەگەزە هاوبەشانە لە نێوانی وێژەراندا هەرچەندە گرنگن، بەڵام لە هەمان کاتدا بڕیاری لەدایکبوونی بەرهەمی وێژەیی نادەن. بۆ نموونە: هەموو کوردێك زمانی کوردی دەزانێ، هەروەها زۆربەی کوردە خوێندەوارەکان زۆر یان کەم شارەزاییەکیان لە زانستەکانی زمان و وێژەدا هەیە، بەڵام ئایا ئەم کوردە خوێندەوارانە دەتوانن بە هۆی ئەو شارەزاییەوە. وێژەی داهێنراو و خوڵقێنراو بهێننەبەرهەم؟

ئەمە پرسیارێکە هەستیاری پایەبەرزی کورد (نالی) ناڕاستەوخۆ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

(نالیا) ئەم غەزەلەت تازە بە تازە وتووە
بە دووسەد (مەثنەوی) و (لوببی لوباب)ی نادەم

ئەم هەستیارە هەڵکەوتووە کە شانازی بە هەڵبەستە خوڵقاو و داهێنراوەکانییەوە دەکات، دووپاتیدەکاتەوە کە سەرچاوەی ئەم دیاردەیە لە هەڵبەستەکانیدا موعانات و هەستی ڕاستەقینەیە:

بەبێ دیداری تۆ خۆڵاڵە (نالی)
عەجەب هەستاوە ئەم چەن فەردە بێ تۆ

هەروەها دووپاتیدەکاتەوە، کە هۆی سەرکەوتنی بەسەر هەستیارەکانی هاوسەردەمیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خاوەنی تاقیکردنەوەیەکە لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا:

ئەم سەرس،ەری بلازانە کەوا هەمسەری بومن
موشکیل بکەنە ساعیدی شاهێکی وەکوو من

تـــــا نەشئە نەچێژن لە لەبی کەوثەری ساقی
بێچـــارە چووزانن کە هـەموو مـەستی زەقومن

کەوابـوو: لەبـەر تیشـکی ئەم دێـرە هۆنراوانەی نالیدا، بۆمان سـاغدەبێتەوە، کە بنەڕەتی داهێنان و بنەڕەتی موعانات و تاقیکردنەوە لە ڕەخنەسازیی کوردیدا بە چەشنێك بەرچاوەکەون و سنوورێك بۆ دیاردەی لاساییکردنەوە و جووینەوە لە هەڵبەستداناندا دەچەسپێنن.
ئەم هەستیارە دیارە وبستوویەتی ئەم دوو بنەڕەتە ڕەخنەسازییە زیاتر ڕوونبکاتەوە، بۆیە لە هەمان ڕوانگەوە باسی نێوانی هەستیار و بەرهەمەکانی کردووە و وتوویەتی:

لە جگەرگۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ
بێ خەتا کەس نییە ڕازی کە لە ئەولادی درێ

واتا: باش لە هەڵبەستەکانم حاڵیبن و بەڕاستی مەعنایان لێکبدەنەوە، هەڵبەستەکانم منداڵی جگەرگۆشەمن، بە خراپی لێحاڵیبوونیان دەیانخەنە بەر فەلاقە و دارکاری. هیچ باوکێك ڕازی نییە منداڵێکی خراپەی نەکردبێ بە ناحەق لێیبدرێ.
ئەم وێنەیە هەروەکوو دیارە ئەوپەڕی سۆزی ڕاستەقینەی هەستیار بەرامبەر بە زادەی هەست و نەستی دەردەبڕێ و ئەوە دەسەلمێنێ، کە هەڵبەست پارچەیەکە لە هەستی هەستیار. جا بۆیە لە ڕوانگەی ئەم سەلماندنەوە هەستیارەکەمان لە کارتێکردنی هەڵبەستەکانی دەدوێ و دەڵێ:

ڕاستی جــــەوهـەرییـەتیغی زوبـانی (نـــــالی)
نەرم و توند ئاوی گەلوگیرە، قصەی پێ دەبڕێ

ئەم دووانە بەلای ئێمەوە هێمایە بۆ بنەڕەتێکی ڕەخنەسازیی گرنگ، کە پەیوەندی هەیە بە مەسەلەی لایەنەکانی هۆنراوەوە..لایەنی هەستیار کە سەرچاوەی داهێنانی هۆنراوەیە و لایەنی گوێگر و خوێنەر، کە بەری وەرگرتنی بەرهەمی هەستیارە و لایەنی هۆنراوە کە ئەڵقەی جەزب و ڕاکێشانە لە نێوانی دوو لایەنەکەی پێشوودا.
نالی بە بۆنەی چەند بابەتێکەوە شانازی بەوەوە دەکات، کە دەتوانێ هۆنراوە بە زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی بهۆنێتەوە.

## • زمانی هۆنراوە

گومان لەوەدانییە کە زمان بڕبڕەی پشتی هەموو ڕۆشنبیری و وێژەیەکە، چونکە زمان کۆمەڵە وشە و ڕستە و دەربڕینی شێوە و ڕوخسار نییە، بەڵکوو گیانلەبەرێکی زیندووە. دڵ و دەروونی بە بۆن و بەرامەی نەتەوە پێدووەکەی دەژیێت و قەوارەکەی ئاوێنەی تەلیسماوی نەریت و خوو و ڕەوشت و ژین و ئاوات و ڕۆژگاری ڕابردوو و داهاتووی خاوەنەکەیێتی.

ئەم ڕاستییە لە مێژووی ڕەخنەسازیی زۆربەی نەتەوەکانی ئەم سەرزەمینە تووشی کێشە و تەنگوچەڵەمەیەکی بیری و هونەری بووە، کە هەندێك جار هەستیارە هەڵکەوتووەکانی ئەم نەتەوانە لەبەر چەند هۆیەك بەرهەمەکانیان بە زمانی نەتەوایەتی خۆیان نانووسنەوە یاخود شانبەشانی زمانی نەتەوایەتی تایبەتییان بە چەند زمانێکی دی بێگانە بەرهەمەکانی هەست و نەستیان دەردەبڕن. بۆ نموونە زۆربەی هەستیار و نووسەرە جەزائیرییە عەرەبەکان دانراو و ڕۆمان و کورتەچیرۆك و هەڵبەستەکانیان بە زمانی فەرەنسی نووسیوەتەوە. هەمان مەسەلە لە زمانی وێژەی کوردیدا بەرپابووە، بۆ نموونە نالی لەم ڕووەوە دەڵێ:

"استطاعە" و قووەتی طەبعم بە کوردی و فـــــارسی
عـارەبی، ئیظهاری چـــــــالاکی و چـەسپانی دەکـا
فارس و کورد و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە
(نـــــالی) ئەمڕۆ حــــاکمی سێ مولکە، دیوانی هەیە

ئەم مەسەلەیە لە جیهانی وێژەی کوردی و وێژەی جەزائیری عەرەبی پرسیارێك بەرپادەکات و دەپرسێ: ئایابەرهەمی ئەو وێژەرە جەزائیرییە عەرەبانە، کە بە فەرەنسی نووسراوەتەوە، وێژەی فەرەنسین یاخود وێژەی جەزائیری عەرەبین؟

سەبارەت بە هۆنراوەکانی نالی و هۆنراوەی دەیان هەستیاری دێرینی کورد، کە جگە لە زمانی کوردی بە زمانی دیکە بەرهەمیان هێناوەتە ئەنجام، ئایا ئەم بەرهەمانەیان بە وێژەی کوردی لەقەڵەمدەدرێن یان بە وێژەی ئەو نەتەوانە دادەنرێن، کە وێژەکەی بە زمانی ئەوان پێوتراوە یان نووسراوە؟

## • ڕەخنەسازیی بەراوردکاری

وەك تێبینیدەکەین بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، مێژوونووسەکانی وێژەی جەزائیری

بەرهەمەکانی نووسەرە جەزائیرییەکان کە بەزمانی فەڕەنسی نووسراونەتەوە بە دەربڕینی وێژەی عەرەبی ناویاندەبەن. بە واتایەکی تر ئەو هەستیارە جەزائیرییە عەرەبە، کە بە زمانی فەڕەنسی هۆنراوە دەهۆنێتەوە بەرهەمەکانی بەردی درەختی هۆنراوەی عەرەبییە، بەڵگەی ئەو مێژوونووسانە لەوەدا سەلمێنراوە، کە بەرهەمی وێژەیی هەر لە زمان پێکنەهاتووە، بەڵکوو زمان ڕەگەزێکە لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی وێژە، کە واتا و ئەندێشە و سۆزن. جا کەواتە: دەنگی مێشك و چۆنێتی بیرکردنەوەی هەستیار بێت و ئەندێشەی بۆچوونی نەتەوەکەی بێت، کە لە سروشت و ژینگە تایبەتییەکەیەوە چەسپێنراو بێت و سۆزیشی ئێش و ئازار و ئاواتی جەماوەرەکەی بێت، ئەڵبەت بە هۆی باری ئەم ڕەگەزانەی وێژەی ئەو نووسەرە جەزائیریانەوە، هەر دەبێت وێژەی عەرەبی بێت.
لەبەر تیشکی دێرە هۆنراوەکانی نالیدا ئێمە بڕوامان وایە، کە ئەو شانازیکردنەی نالی ڕەنگە بنەڕەتێکی ڕەخنەسازی بچەسپێنێ.

## • نووسینەوە بە زمانی کوردی

نالی لە هەمان جوغزەوە شانازی بەوەوە دەکات، کە زمانی هەڵبەستەکانی کوردییە:

طەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتیحانی خۆیە مەقصودی لە (عمدا) وا دەکا
یا لە مەیدانی فەصاحەت دا بە میثلی شاهسوار
بێ تەئەممول بەو هەموو نەوعە زوبانی ڕادەکا
کەس بە ئەلفاظم نەلی خۆ کوردی یە خۆ کردی یە
هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا

واتە: زەوقی شیرینی من، کە بە لای ئەوەدا دەچێ بە کوردی شیعر بڵێ، لەبەر ئەوە نییە کە کوردییەکە ئاسانە و دەستەڵاتی بەسەر عەرەبی و فارسیدا ناشکێ، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە ئەیەوێ خۆی تاقیبکاتەوە، بزانێ شتێکی تازەی لە دەستدێ، کە لەمەوپێش کەس نەیکردبێ، کە شیعروتنە لە سەر عەرووزی عەرەبی بە زمانی کوردی یان نە؟ یاخود مەبەستی خۆتاقیکردنەوە نییە، تەبیعەتی شیعرێتی ئەوەندە سوارە بێگوێدانە ئەوەی، کە مەیدان مەیدانی فارسی یا عەرەبی یا کوردییە ئەو هەر لە خۆیەوە بە هەموویاندا ئەداتە غار یان لە هەموویاندا خۆی ڕائەهێنێ. هەرچۆنێك بێت با کەس توانجم تێنەگرێ بڵێ شیعرەکانی کوردین و هەر

شاعیرێك بگری دەتوانێ شیعری کوردی بڵێ.

بەڵێ، ڕاستە زۆر کۆلکە شاعیر دەتوانن شیعر بە کوردی ڕێکبخەن، بەڵام خۆ شیعر هەر هاوسەنگی دووسەرەکەی و یەکێتی دوا پیتەکانی نییە. شیعر بەر لە هەرچی شتە، ناوەڕۆکی ورد و واتای قووڵی گەرەکە. زانایان لە شیعردا بە دوای ئەوەدا دەگەڕێن و ئەوەش دەست کۆلکە شاعیرەکان ناکەوێ بیخەنە شیعرەکانیانەوە.

نالی لێرەدا زۆرانبازی و گفتوگۆیێکی ڕەخنەسازیی گرنگ تۆماردەکات و ڕوونیدەکاتەوە، کە لە نێوان ڕووناکبیرانی هاوسەردەمانیدا بیروڕای جیاواز سەبارەت بە نووسینەوەی بە کوردی و پێوانەی هەڵسەنگاندنی ڕەگەزەکانی هۆنراوە و دەستنیشانکردنی هەستیاری پایەبەرز هەبووە و تێڕوانینی خۆشی لەم ڕووەوە چەسپاندووە.

## • باری هۆنراوەی کوردی و ڕۆشنبیری و ڕەخنەسازی

دوابەدوای دێڕە هۆنراوەکانی نالی سەرنج لە دێڕە هۆنراوەکانی سالم دەدەین. سالم کە لە سالانی ١٨٠٠ — ١٨٦٦ی زاینیدا ژیاوە، هەرچەندە ژمارەی دێڕە ڕەخنەسازییەکانی کەمن، بەڵام تا ڕاددەیەك زۆربەی بنەڕەتەکانی ڕەخنەسازی لە دێڕە هۆنراوەکانی نالیدا باسکردووە.

ئەوەی لەم باسکردنەدا سەرنجمان ڕادەکێشێ سالم وەکوو نالی دووپاتیدەکاتەوە، کە خەڵکی لە سەردەمەکەیدا قەدری هۆنراوە و هونەرییان نەدەزانی:

ئەهلی زەمانە جەنبی هونـەر نـاکرن بە هیچ
(سالم) مەکە هەوایی ئەمـەل ئێستە بێ فلوس

ئـەم دووپاتکردنەوەیـە هەڵبـەت ئـەوە دەگەیەنێـت کە هەستیار هەڵبەستی بۆ خەڵکی نەدەهۆنییەوە و خەڵکیش بەشداری ئاکامی هۆنینەوەیان نەدەکرد و هیچ بیروڕایێکی ڕەخنەسازییان دەرحەق بەم بابەتە نەبوو، بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە تەنیا چینی ڕۆشنبیر لە مەلا و خوێندەوار و ویژەدۆستان بەو ئەرکە هەڵدەستان کە سەرچاوەی زانیارییان ڕۆشنبیریی ئایینی بوو، بەڵگەشمان بۆ چەسپاندنی ئەم ڕاستییە دیسانەوە ڕووگەی وردکاری و سەنعەتکارییە لە دانانی هۆنراوەدا، ئەم بەڵگەیەش بە ڕوونی لەم چەند دێڕە شیعرەی سالمدا خۆی دەنوێنێ:

لە عەرصەی ئەوجی عشقت بازی دڵ هەڵسا لە دەورانا
بە بەرقی پرتەوی حوسنت پەڕی سووتا لە سووتـــانا
لە ڕۆژی ئیمتیحانا دیم بەرابەر طـــــالب و مەعشوق
کەمەربەستەی هونەر هـــاتن لە تیپی عیشق بـــازانا
لەیـەک لا (نـالی و مشوی) لـە لایێ (ســالم و کوردی)
لە هەنگامەی هونەر گەرمی تکاجۆ بوون لـــە (مەولانا)
لە مەیدانی بەلاغەتدا بە سواری مـــەرکەبی مـەضمون
بە کوردی هەر یەکە تازی سوارێ بـوون لـە (بابـــانا)

کەوابوو: مەیدانی ئەم دیمەنە لە دڵدار و دڵبەر و هونەرمەندان، زانستەکانی بەلاغەیە بە هەموو لایەنە ڕازاندنەوە و شیرینکارییەکانییەوە، کە بێگومان وانەی فێرکردن و لێکدانەوە بوون، لە مزگەوت و خانەقا و تەکیێ و کۆڕە ئایینییەکانی دیکە و شۆڕەسوارانی وتنەوەی کتێبەکانی ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر و مێژووی عەرەبی و ئیسلامی و صەرف و نەحو و فەرهەنگکاری و تەسەوف و زوهد و دەیان بابەتی تر.

سالم هەروەکوو دیارە سوورە لەسەر دووپاتکردنەوەی زاراوەی بەلاغەتی عەرەبی، تەنانەت لەگەڵیشیدا وشەی (تعلیم) بەکاردەهێنێ و سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە قەڵەم ئەگەر بێت و لەم زانستەدا دوو سێ بکات، بەڵام هەمیشە لە ئاستیدا دەبێت:

قەڵەم سەرخۆشە (ســالم) بۆ تردد
لە تەعلیمی بەلاغەت مثلی مەرکەب

بەلاغە واتە ڕەوانبێژی، هەرچەندە لە ڕەخنەسازی جیابکرێتەوە بەبیانووی ئەوەی ئەم زانستە بابەتێکی پراکتیکییە پەیوەندی هەیە بە ڕازاندنەوەی زمانی وێژە لە سووچی تەنگەبەری فێربوونەوە، بەڵام لە مەیدانی ڕۆشنبیریی مزگەوتدا هەمیشە بڕبڕەی پشتی هەڵسەنگاندنی وێژە بووە و وەکوو تاقە ڕێگایەك گیراوەتەبەر لە پێناوی سەلماندنی بێهاوتایی قورئانی پیرۆز و بەرزیی شێوازی.

سـەرئەنجام ئێمە ڕامان وایە، کە قەدرشووناسەکانی هۆنراوە لەبەر تیشکی هونەرەکانی

زانستی واتا و ڕوونبێژی و زانستی جوانکاریدا لە هۆنراوەیان دەکۆڵییەوە و بەراوردیان لە نێوان هەستیاراندا بەرپادەکرد و بریاری پێشکەوتن یان دواکەوتنی بەرهەمی وێژەیان دەدا.

هەستیارەکەمان لە هەڵبەستێکی هەجوودا سەبارەت بە میرزا سلێمانی هەستیار لە هەمان ڕێچکەوە ئەو سەرنجەمان بۆ دەسەلمێنێ و زاراوەی ڕەنگین و ناوەڕۆکی چەند هێمایەکی تر تۆماردەکا و دەڵێ:

بۆ من قەڵەمە نێزە، بـــۆ تـــۆ سوپەرە دەزگـــا
بۆ تەجرەبە بالێدەم یەک چـــربە لـــــە قەڵغانت
نـــووکی قەڵەمم تیژە وەک نـــووکی درەوشی تۆ
ســـوهان زەدەیە فیکرم وەک گـــازنی بۆ ڕاڕانت
ڕەنگینە هەموو شیعرم وەک نەقشی تەکەڵتووی زین
مەضمون کەشە فیکرم وەک قوللابی درومـــــانت

میرزا سلیمانی هەجووکراو بەم دێڕانەی سالم لەبەرئەوەی هەستیار بووە دوورنییە بە هۆنراوە وەڵامی هەجووەکەی دابێتەوە و لایەنە شانازی پێکەرەکانی پووچەڵکردبێتەوە لە عاستیاندا، هونەرمەندیی قەڵەمی و جوانکاری شێوازی و قووڵی ناوەڕۆکی هەڵبەستەکانی خستبێتەڕوو، هەروەها دووریش نییە لەم ڕووگەیەوە تەکنیکی هونەری نەقائیزی عەرەبی بەکارهێنابێت، چونکە هەروەکوو لە ڕۆشنبیریی عەرەبی ئیسلامیدا زانراوە بابەتی هەجوو لە نێوان دوو هەستیاردا لەبەر تیشکی دەستووری یەکێتیی کێش و یەکێتیی سەروا و پووچەڵکردنی واتای دژواردا ئەنجامدراوە. ئەم بۆچوونەمان ڕەنگە جێگای مشتومڕ بێت، بەڵام بەڵگەنەویستە، کە ئەم دێڕانە پێوانەی ڕەخنەسازی وای نواندووە، کە لە سەردەمەکەیاندا باویوون و لە لای چینی خوێندەوار زانراوبوون. هەرچۆنێك بێت سالم دیارە لە بنەڕەتەکانی ڕەخنەسازیی سەردەمەکەی نەپچڕابوو، وەکوو نالی بەشداری مەسەلەی زمانی هۆنراوەی کردووە و لەم ڕووەوە دووپاتیکردۆتەوە کە کوردە:

مــە فــارس زوبــانم گفت (ســالم)شرح حالت گو
وتم: جانا بەلەد نیم اصطلاحی ئێوە من کـــــوردم

**هەروەها شانازی بە نرخی هەڵبەستە کوردییەکانییەوە دەکات و دەڵێ:**

زێڕە سەرمایەیە بۆ (سالم) و (کرمان)ی دەبـا
شیعری کوردی کە بدا جیلوە لە لای شێخی کبیر

## • هەستیاری بەناوبانگ. کوردی

هەستیاری بەناوبانگ. کوردی لە ژێر خێوەتی سەردەم و ڕۆشنبیریی (نالی و سالم)دا تەمەنی بردۆتەسەر، چونکە لە ساڵی ١٨٠٩ی زایینی لەدایکبووە و لە ساڵی ١٨٤٩ی زایینی کۆچی دوایی کردووە. لە هەمان ڕوانگەی هونەرییەوە لە هەڵبەستەکانیدا چەند بنەڕەتێکی ڕەخنەسازی خستۆتەڕوو، جا بۆ ئەوەی بزانین ئەم خستنەڕووە هەڵوێستێکی کەسی نەبووە و تا ڕاددەیەکی زۆر بیری بووە، سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین، کە ئەم هەستیارە وەکوو دوو هاوڕێکەی واتا: نالی و سالم سکاڵای لە دەست زەمانە کردووە و وتوویەتی:

دوڕ و یاقوت دەبارێ لەم کەلامە شیرینەی (کوردی)
خواسا کــــــوالــە دونیادا قــەدرزانێ، خـڕیـدارێ

کەوابوو لە دونیای هەستیارەکەماندا، کەس نییە قەدرزان و دوڕناسی هەڵبەستەکان بێت،

بۆیە بۆمان هەیە بڵێین (کوردی) و هونەرەکەی لە دۆڵێکدا دەژیان و خەڵکی سەردەمەکەی لە دۆڵێکی دیکەدا. ئەم بارەش هەڵبەت دووبارە سەرچاوەی ڕۆشنبیریی هەستیارانی کورد لە هێڵێکی دوور لە جەماوەری کوردانەوە دەستنیشاندەکرد. هەستیارەکەشمان بە ڕوونی پەنجە بۆ ئەو سەرچاوەیە درێژدەکات و دەڵێ:

کوردی دلێری عەرصەیی نەزم و فەصاحەتە
جەولان دەکا هەمیشە وەکوو بەرقی تیژڕەو

زاراوەی (نظم) و زاراوەی (فصاحە)ی عەرەبی لە ڕۆشنبیریی ئیسلامی و ڕەخنەسازیدا، واتاکانیان دەستنیشانکراون بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژەیی پێوانە تایبەتییەکانیان چەسپێنراون. (کوردی)یش کە شانازی بەو دوو زاراوەیە دەکات، دیارە هەموو پێویستییەکانیانی بەدیهێناوە و ڕەزامەندی چەشە و چێژی مامۆستاکانی سەردەمەکەی وەدەستهێناوە.
ئەم ڕاستییەش دیسانەوە ژینگەی ڕەخنەسازیی ئەو سەردەمە ڕەنگدەداتەوە و دووپاتیدەکاتەوە، کە ئەو ژینگەیە لە مشتومڕ و گفتوگۆی زمانی ڕەوانبێژی و عەرووز جمەی دەهات. کوردی جگە لەمە لە هەڵبەستێکی دیکەدا، بە سەردێڕی (دڵ لە محنەت کەیلە) لە باسکردنی ڕابواردن و بەزموڕەزمدا دەڵێ:

وانییە (کوردی) مائلی ئەو جۆرە ئەتوارانە بێ
لازمە شاعیر لە هەر چەشنێ بلێ بۆ ئیمتیــــاز

لەبەر تیشکی ئەم دێڕەدا دیارە، کە چەمکی هەستیاری سەرکەوتوو خوێنەوەی هەڵبەست بووە لە گشت بابەتەکانی هۆنراوە، وەکوو ستایش و شیوەن و هەجوو و دڵداری و پیاهەڵدان و باسکردنی ڕابواردن و ڕاووشکار و بابەتەکانی دیکەی هۆنراوەی سەدەکانی ناوەڕاست. ئەوجا ئەم چەمکە ئەگەر دیاردەیەك بووبێ بۆمان هەیە، کە بڵێین تاقیکردنەوە و موعاناتی تایبەتی هەستیار لەو سەردەمەدا بە تاقە سەرچاوەی هۆنراوەی ڕاستەقینە تەماشانەدەکرا و وێژەدۆستان ئەوە بووە، کە دەبێت هەستیار لە هەموو بابەتەکانی هۆنراوە هەڵبەستێك یان کۆمەڵە هەڵبەستێکی هەبێت، بۆ ئەوەی بە هەستیاری سەرکەوتوو بژمێردرێ.

## • حاجی قادری کۆیی و ڕەخنەسازی

حاجی قادر کە لە ساڵی ١٨٢٤ی زایینی لەدایکبووە و لە ساڵی ١٨٩٧ی زایینی ماڵئاوایی

لەم جیهانە کردووە، چالاکانە لە زۆربەی هەڵبەستەکانیدا بنەڕەتی ڕەخنەسازی چەسپاندووە و لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە پێوانەکانی خستۆتەڕوو. ئەم بنەڕەتانەش هەرچەندە لە دێڕە هۆنراوەکانی نالی و سالم و کوردیدا ڕەنگیانداوەتەوە، بەڵام لە ئاوێنەی هەڵبەستەکانی ئەم هەستیارەدا بە چەشنێکی تازە دێنەبەرچاو. ڕەنگە ئەم بارە ئەوەبێ حاجی قادری کۆیی زۆربەی ساڵەکانی تەمەنی لە شاری ئەستەمبوڵ بردۆتەسەر و لە دەرفەتی شارستانێتی و ڕۆشنبیریی ئەم ناوچەیە مێشك و تەبعی خۆی زاخاوداوە و هەنگاوی گەورەی لە کۆڕی هەڵسەنگاندنی وێژەدا هەڵگرتووە.

ئەم ڕاستییە هەڵبەت نابێت ئەوە بگەیەنێ، کە حاجی قادری کۆیی لە سەرچاوەی ڕۆشنبیریی و ڕەخنەسازیی هۆنراوەی کوردی دوورکەوتۆتەوە و خۆی بە ڕووگەیەکی دیکەوە بەستووە. بەڵگەشمان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە ئەم دێڕانەی خوارەوەن، کە لە هەڵبەستە بەناوبانگەکەیدا (شیوەن بۆ کەیفی) هاتوون:

زمانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی
وەهای دەزانی وەکوو بەیتی خوسرەو و شیرین
ئەمەش دەلیلە لە تەئثیری مەرثیەی کە گوتم
چوار زمانی تێدایە قەصیدەی ڕەنگین
ز لوحەی خط موزون قطعەی منظوم
خجل شد (ابن هلال) و روان (ابن متین)

لە ناوەڕۆکی ئەم دێڕانەدا وا دیارە، کە حاجی قادری کۆیی نەتەوەپەرست، ستایشی شیوەنی کەیفی بەوە دەکات، کە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە و ئەم زانینەش لە هەڵبەستەکانیدا ڕەنگیداوەتەوە. جا ئەم ڕەنگدانەوەیە لە تێڕوانینی هەستیارەکەمانەوە دەبێت چۆن بێت و لە چ ڕێوشوێنێکەوە ئەنجامبدرێ؟

حاجی قادری کۆیی بە هیچ جۆرێك ئەم پرسیارەی بەرپانەکردووە و وەڵامەکەشی لە ژینگەکەیەوە هەڵنەهێنجاوە، بەڵام هەروەکوو دیارە بە هیچ جۆرێك ڕای وا نەبووە، کە هۆنراوەی کوردی لاساییکەرەوەی هۆنراوەی نەتەوەکانی ترە:

نالی و خاکی بەبە، حاجی و کۆیە بە مەثەل
هەروەکوو حافظی شیرازە کەلیم و هەمەدان

ئەم بەراوردکارییە یەکتایە لە نێوانی ئەو هەستیارە کورد و هەستیارە فارسانەدا، ڕەنگە

کاردانەوەی ئەم ڕووگە ڕەخنەسازییە بێت، کە بە چاوی سووك تەماشای هۆنراوە و زمانی کوردی دەکرد و پاڵی بە نالییەوە دەنا هەروەکوو لەمەوبەر بینیمان، کە شانازی بە زمانی نەتەوەکەیەوە بکات و هەڵبەستهۆنینەوە بەو زمانە بە کارێکی گران و ئەرکێکی قورس دابنێ.
هەروەها ڕەنگە ئاکامی هەڵوێستێکی نەتەوایەتی بێت، بە تایبەتی کە تێبینی دەکەین ئەم هەستیارە بەو بەراوردکارییە یەکتایە ڕاناوەستێ، بەڵکوو زیاتر هەنگاوهەڵدەگرێت و دەڵێ:

شەبیهی جۆلا کە ڕازی نەبێت بە سەدڕی خۆی
مەڵێن فەصاحەتی کوردی بە فارسی ناگا
بەلاغەتێکی هەیە هیچ زوبانێ نایگاتێ
لە بێ تەعەصوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها
کە خۆتی تێنەگەیێتی، لە نیکتەکانی نەگەی
دەڵێی هەمووی هەزەیانە خوا بەڵای لێ دا
بەڵام ئەوانی کە صەڕڕافی زێڕ و زیوی قسەن
بە شاە ڕەوایە دەزانن چ سککەیێکە ڕەوا
چ حیکمەتێکە کە ئاثاری کوردە ناموسی
نە کیمیایە نە عەنقا لە بەینی ئێمە نەما

لەم دێڕانەدا حاجی قادری کۆیی بڕیارگەلێکی ڕەخنەسازی دەدات و سەرئەنجامەکەیان بەوە دەخاتەڕوو، کە هیچ هۆنراوەیەك ناگاتە ڕاددەی هۆنراوەی کوردی. ئەم بڕیارگەلەش ڕەنگە پێویستی بە بەڵگە هەبێت بۆ ئەوەی خوێنەر پێیان قایلبێت، بەڵام لەبەرئەوەی بە دێڕە هۆنراوە پێشکەشکراون دەرفەتی ڕوونکردنەوەیان نەبووە، ئەوە نەبێت کە هێما دەکەن بۆ نوکتە و حیکمەتی هۆنراوەی کوردی وەکوو دوو لایەن لە لایەنەکانی بەرزیی هونەری.
جا ئەگەر هەر ئەم دوو لایەنە شیاوی شانازیکردن بە هۆنراوەی کوردی بن، مێژوونووسی ڕەخنەسازی تێبینیدەکات، کە لە ڕەوانبێژیی عەرەبیدا زاراوەی نوکتە و حیکمە بۆ هەڵسەنگاندنی هۆنراوە لە ڕووی ناوەڕۆك و واتاوە بەکارهێنراون.
ئەمە ڕاستییەکە، بەڵام ئێمە تێبینی دەکەین، کە هەستیارەکەمان لە هەمان هەڵبەستدا سەرچاوەی تایبەتی بەلاغە و فەساحەت و نوکتە و حیکمەی هەڵبەستەکانی بە تاقیکردنەوەی کەسایەتیی خۆی دەستنیشاندەکات و دەڵێ:

ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن
ئەگەر قەبیح و کەریهن، وە گەر شەل و ئەعما
میثالی فەرخەیی ژووشک، کە پێی دەڵێ دایکی
ئیلاهی قاقومە یاخۆ سمۆرە یا دیبا

هەروەها لە هەڵبەستێکی تردا دەڵێ:

لە یەک دوو لاوە هەتیوی تەنیاش بەجێماوە
یەکێکی بیکری مەعانی دولنی طیفلی حەزین
ئەمن کە مامی ئەولنم دەیاندەمە ئودەبا
کچانی زادەیی طەبعی لەکیفی حوجلە نشین
وەلێ کوڕانی ڕەزلنین بە خاکی ڕۆم و دەڵێن
لە لای ویلایەتەوە چاودێری مامی ترین

کەوابوو: حاجی قادری کۆیی زیاتر لە سەر سەرچاوەی هۆنراوەی ڕەسەن سوور دەبێت، کە تەبع و زادەی کەسایەتییە، کەسایەتیش هەر وەکوو لەم دێڕانە و چەند دێڕێکی تر دەردەکەوێ هەندێ جار ڕەنگێکی نیشتمانی فراوان وەردەگرێت:

شیعرەکانم کە غەریبی وەتەن و نەو سەفەرن
وەرەبیخوێنەوەئەمنوقطەئەولیکیهەیە
قەدری (حاجی) بگرن، مەقصدی هەر دیدەنی یە
وەرنە هەرچی بگری نانەک و ئاوێکی هەیە

کەوابوو لە دێرە هۆنراوەکانی حاجی قادری کۆییدا دروشمی هۆنراوەی داهێنراوی کەسایەتی و خوڵقێنراوی ژینگەی خۆماڵی بەرزدەبێتەوە، بەڵام ئایا ڕەخنەسازیی کوردی لەم ژینگەیەدا توانای ئەوەی هەبوو لەم دروشمە تێبگات و شیبکاتەوە و ڕێبازی لێکدانەوەی بچەسپێنێ و زاراوەکانی سازبکات و دەستوور و بنواشە و پێوانەکانی بخاتەڕوو؟!

حاجی قادری کۆیی ناڕاستەوخۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ:

نی یە لە مومکینی ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ
بە غەیری خواجەیی دیوانی (علم الاسماء)
ئەوی حەسوود و جەهولن لەئیم و ڕەخنەگرن
لە عەیب و ڕەخنەیی عالەم بەری دەبن ئودەبا

لەم دێڕانە دیارە لە ژینگەی ڕەخنەسازیی کوردیدا کۆمەڵێك لە ڕەخنەگری حەسوود و نەزان و لەئیم هەبوون، کۆمەڵێکی ئاواش بێگومان لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا جگە لە عەیبدۆزینەوە و توانجگرتن هیچ کارێکی دیکە ئەنجامنادەن، بۆیە حاجی قادری کۆیی لە دەست ئەم کۆمەڵە پەنادەباتەبەر دەرگای خوا و دەپاڕێتەوە و دەڵێ:

ئیلاهی نەیخەیە بەر چەنگی مەندەبوور و لەئیم
نفودی (حـــاجی) کە نەیدیوە خوسرەو و دارا

حاجی قادری کۆیی زیاتر ئەم دیاردە ڕەخنەسازییە کوردییە ڕووندەکاتەوە و دەریدەخات، کە تەنانەت لە بازاڕی هۆنراوەی کوردیدا، هۆنراوەدز هەبووە و تاقمێك لە بەر هۆی کەسی دژ بە بەرهەمی هەستیاران دەجەنگان:

خەزنەیەکە بەیتی من دوو مەصرەعم داخستووە
کەس طەماعی تێنەکا ڕێگای دزم لێبەستووە
بیکە بەر دیبایی نەڤمم تا قیامەت ناددڕێ
چونکە ئەفکاری مەعانی تار و پۆیی بەستووە
ظاهیرەن بەیتم لە (نالی) و (کوردی) زۆر کەمتر نی یە
طالعم بدر گەشتەیە بەدبەختە بەختم نووستووە

هەرچۆنێك بێت حاجی قادری کۆیی بە نواندنی ئەم بارەی ڕەخنەسازیی کوردی و هێماکردنی بۆ بەرزیی هۆنراوەی نەتەوەکەی سەرئەنجامێك دەدا بە دەستەوە، کە دەڵێ: لە سەردەمەکەیدا ڕێبازێکی ڕەخنەسازیی ڕەسەن هێشتا لەدایکنەبیوو، هۆنراوەی کوردی بە بێ لێکۆڵینەوە بەجێمابوو. مێژوونووسی ڕەخنەسازیش، کە سەرچاوەیەکی ڕەخنەسازیی پەخشانی لەبەردەستدا نەبێت هەڵبەت ئەو سەرئەنجامە بە دڵنیاییەوە وەرناگرێت.

ئەم هەڵوێستەش هەڵبەت مافی خۆیەتی، بەڵام ئێمە دەتوانین بە درێژایی ئەو گەشتەمان

لەگەڵ چوار هەستیاری شاسواری کورد: (نالی، سالم، کوردی، حاجی)، کە نزیکەی سەد ساڵی خایاند، ئەم سەرئەنجامانە ڕەچاوبکەین و لە کۆڕی ڕەخنەسازیی کوردیدا بیانچەسپێنین.

**یەکەم:** لە هۆنراوەی دێرینی کوردیدا دێڕ گەلێک بەرچاوەدەکەون، هەرچەندە لەبەر چەند هۆیەکی زمانی و شێوازی و بابەتی و دەرفەتی، ناتوانرێ بە لێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازی بژمێردرێن و هەستیارە خاوەنەکانیان بە ڕەخنەساز لەقەڵەمبدرێن، بەڵام گومان لەوەدا نییە، کە ئاوێنەیەکن بۆ وێژەیی و سەرچاوەی دەستنیشانکردنی پلەی هەستیار و چۆنیەتی وەدەستهێنانی ڕەوانبێژی پەسەندکراو و دەیان مەسەلەی هۆنراوەیی لەم بابەتە.

**دووەم:** گرنگترین بنەڕەتی ڕەخنەسازی لەبەر تیشکی ئەم دێڕە هۆنراوانەدا سیانزە بنەڕەتن، کە ئەمانەن:

١- بنەڕەتی دەستنیشانکردنی سەرچاوەی هۆنراوە.

٢- بنەڕەتی مەبەست لە هۆنینەوەی هەڵبەست.

٣- بنەڕەتی ڕەگەزەکانی هۆنراوە.

٤- بنەڕەتی سەلیقە و سەنعەتکاری لە وێژەدا.

٥- بنەڕەتی تاقیکردنەوە و موعانات لە نووسینەوەی هەڵبەستدا.

٦- بنەڕەتی لایەنەکانی هۆنراوە، واتە: لایەنی هەستیاری داهێنەر و لایەنی بەرهەمی داهێنراو و لایەنی خوێنەر و گوێگر.

٧- بنەڕەتی هۆنینەوەی هەڵبەست بە زمانی بێگانە و بە زمانی کوردی.

٨- بنەڕەتی بەراوردکاری لە وێژەدا.

٩- بنەڕەتی داهێنان و خوڵقاندن و لاساییکردنەوە.

١٠- بنەڕەتی دەستنیشانکردنی ڕەوانبێژی تایبەت بە زمانی کوردی.

١١- بنەڕەتی ڕەخنەسازیی ڕەسەن و ڕەخنەسازیی نابەجێ.

١٢- بنەڕەتی دزین لە وێژەدا.

١٣- بنەڕەتی نەمریی هۆنراوە و هەستیار.

**سێیەم:** ئەم بنەڕەتە ڕەخنەسازییانە، کە لە هۆنراوەی کوردیدا، هێمایان بۆ کراوە، هەرچەندە تەمەنیان سەدەی نۆزدەمەی زایینی پۆشیوە، بەڵام بە هیچ جۆرێ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە نێوانیان و نێوانی ڕێبازە ڕەخنەسازییە ئەورووپییەکاندا بەدیناکرێ. لەکاتێکدا کە ساغبۆتەوە زۆربەی ئەم ڕێبازانە بە تایبەتی ڕێبازی کلاسیزمی نوێ و ڕێبازی ڕۆمانسیزمی و ڕێبازی ڕیالیزمی و ڕێبازی پەرناسیزمی لە هەمان سەدەدا پەرەیانسەندووە و پێگەیشتوون.

**ئەم باسە هەنگاوی یەکەمی گەشتەکەمانە لە تەك نووسەرانی مێژووی وێژەی کوردیدا، کە ناڕاستەوخۆ باسی ڕەخنەسازییان کردووە.**

## • ئەمین فەیزی بەگ

لە جیهانی ڕۆشنبیریی کوردیدا ساغبۆتەوە، کە ئەمین فەیزی بەگ یەکەم نووسەری مێژووی وێژەی کوردییە، کە بەرهەمەکەی لە چاپدرابێت و بە چاپکراوی کەوتبێتە دەستمان. پرسیاریش لێرەدا دەپرسێ: ئەمین فەیزی بەگ کێیە و سەرگوزشتەی چلۆن نووسراوەتەوە؟!

مامۆستا ڕەفیق حلمی لە بەرگی یەکەمی کتێبە بەناوبانگەکەیدا شعر و ئەدەبیاتی کوردی[1]، ل ٢٤- ٢٦ تەرجەمەی حاڵی ئەم نووسەرە کوردەی کردووە و وتوویەتی:

( ئەمین فەیزی بەگ یەکێکە لە زانایانی بەناوبانگی کورد، عەسکەرێکی عالم و

---

[1] ل ٢٤ - ٢٦

ئەدیبێکی عەسکەریبوو، لە زەمانی حکومەتی عوسمانیدا، کە هێشتا (قول ئاغاسی) بوو، مدیری مەکتەبی عەسکەری بەغا بوو، لەو وەقتەدا بە ناوی "ئەجمالی نەتائج" کتێبێکی نووسیوەتەوە، کە خولاسەیێکی علومی ریازیات و تەبیعیاتە.

بەینێکیش لە سلێمانی قوماندانی (لوا) بوو. کە تەقاویت کرا عومری خۆی هەر بە نووسین و خوێندن و گەڕان ڕابوارد، سیاحەتێکی ئەورووپاشی کرد و باقی عومری خۆی لە ئەستەمبوڵدا بەسەر برد.

ئەمین فەیزی بەگ پێش ماوەیێکی کەم لە مردنی لە ژێر ناونیشانی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)دا، کۆمەڵە شیعرێکی هەندێ لە شاعیرانی کوردی کۆکردەوە و لە چاپخانەی (ترجمان حەقیقەت) لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٩٢٠ی زایینی، ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ١٣٣٩ی ڕۆمی لە چاپیدا.

ئەمین فەیزی بەگ لە کۆڕی زانست و ڕۆشنبیریدا زۆر مەیلی لە سەر بیرکاری و وێژە هەبوو، هەرچەندە لەگەڵ هۆنراوە و وێژەدا زۆر خەریکنەبوو، بەڵام دیسانەوە بە ئوستازی ئەو هونەرە ناسرابوو، هەروەها لە هەستیارە بەناوبانگەکان و سەلیقەدارەکان دەژمێردرێت.

## ● کتێبی ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد

ئەمین فەیزی بەگ لە پێشەکی کتێبەکەیدا باسی ڕێباز و مەبەست و ناوەڕۆکی ئەنجومەنی ئەدیبانی کوردی کردووە و وتوویەتی:

( ئودەبا و شوعەرای کورد زۆرن، لاکن ئاساریان بە تەواوی جەمع و تەئلیف نەکراوە، من نیەتم کرد کە بەعزێ لە ئەشعاری کوردی تەبع و نەشر بکەم و لە شیعری هەر شاعیرێك چەند پارچەیەك ئینتیخاب بکەم و لەو مونتەخەبانە ڕیسالەی ئەنجومەنی ئەدیبانم هێنایە وجود. بەم وەسیلەیە تالیبان و راغبان کەمێك خەلاس بوون لە شیعر نووسینەوە لە سەر دەفتەری پارچە پارچە.

حەزیشم کرد کە لە پێش چشتێکدا نەبزمیەك لە ئەوسافی ئەو شاعیرانە بەیان بکەم. ئەوانەی کە شوهرەتیان هەیە ئەمانەن:

- مەولانا زیائەدین شێخ خالد
- مەلا خدر - نالی
- شێخ رەزا

- ئەحمەدی کۆر
- مەلا سالح - ئاهی
- سەید عەبدولڕەحیم - مەولەوی
- هیجری
- کوردی
- سالم و سائرە)

لەم دەقەدا دیارە، کە ئەمین فەیزی بەگ بە زۆری کتێبەکەی بۆ نووسینەوەی ژیانی چەند هەستیارێکی کوردی کرمانجی خواروو تەرخانکردووە، بەڵام لە هەمان کاتدا، بە تەواوی خۆی لە کۆڕی ڕەخنەسازی و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەو هەستیارانە نەپچڕاندووە، بەڵکوو نووکی خامەکەی لە چەند بابەتێکی ئەم کۆڕەدا بەکارهێناوە. ئەم ڕاستییەش بە لای ئێمەوە لە دوو خاڵدا بەرچاودەکەوێ:

یەکەم: دانانی ئەو هەستیارانە، بە بەناوبانگ و خاوەن شوهرەت، ئەم کارە دیارە پێویستی بە بەراوردکارییەك هەیە لە نێوانی هەستیارەکاندا، بۆ ئەوەی هەستیاری بە ناوبانگ و ناسراو لە هەستیاری بێشوهرەت و نەناسراو جوێبکرێتەوە.

دووەم: باسی تایبەتییەکانی هەستیارەکان و چەسپاندنی ڕەوتی خودییان و شیکردنەوەی پلەی هەستیارییان.

## • سەنعەتکاری لە ڕوانگەی ئەمین فەیزی بەگەوە

لە بەرهەمی هەموو هەستیارە پێشینەکانماندا ئاشکرایە، کە سەنعەتکاری و جوانکاری و هێنانەوەی جۆرەکانی هونەری ڕوونبێژی بە تایبەتی و ڕەوانبێژی بە گشتی جێگای شانازیکردن بووە. هەروەکوو ساغبۆتەوە، کە هەستیاری بێهاوتا بە پێوانەی چەشە و چێژی دێرین ئەو هونەرمەندەیە، کە ڕێگای ئەندێشەی ورد دەگرێتەبەر و بە خەیاڵ ڕێتەی هونەری جۆربەجۆر دروستدەکات. پرسیارێك لێرەدا دەپرسێت: ئەمین فەیزی بەگ لەم مەسەلەیەدا بیروڕای چی بووە و هەڵوێستی تایبەتی خۆی چلۆن دامەزراندووە؟

ئەم مێژوونووس و ڕەخنەسازە کوردە لە باسکردنی نالیدا وتوویەتی:

زەکای نالی ئینکار ناکرێ، لاکن ئەوەندە سەنایعی لەفزیەی ئیستعمال کردووە، پیاو ڕەنگە بڵێ: شیعری ئەو نەتیجەی عیلم و ئیشتیغالە.

لێرەدا ئاشکرایە، کە ئەمین فەیزی بەگ ناڕاستەوخۆ ڕەخنە لە زۆری سەنعەتکاری و جوانسازییەکانی نالی دەگرێت و ئەم هونەرانە بە ئاکامی بیرکردنەوە و بەکارهێنانی عەقڵ لەقەڵەمدەدات. هەروەها سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە هۆنراوە دوو سەرچاوەی هەیە:

١- سەرچاوەی زەکا و زیرەکی و بەهرە، کە بەرهەمە هۆنراوەییەکانی ساکار و سادە و کاریگەر و دوور لە سەنعەتکارین.

٢- سەرچاوەی عیلم و زانست و ئیشتیغال و بیرکردنەوە، کە ئاکامە هۆنراوەییەکانی لە سەنعەتکاری و جوانسازیدا جەمیان دێت و وەکوو هەموو بەرهەمێکی دەستکرد بە گوێرەی دەستوورەکانی ڕەوانبێژی ڕازێنراوەتەوە.

## • شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە تای ترازووی ڕەخنەسازیدا

ئەمین فەیزی بەگ لە نووسینەوەی تەرجەمەی حاڵی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا دووپاتیدەکاتەوە، کە ئەم هەستیارە هاوڕێی بووە و لەگەڵیدا نامەی هۆنراوەیی ئاڵوگۆڕکردووە، بۆیە لە هەموو هەستیارە کوردەکانی تر زیاتر باسیدەکات و لە هەستیارێتی دەدوێت و هەڵبەستەکانی هەڵدەسەنگێنێت.

**ئەم ڕاستییە لەوەدا دەردەکەوێتە کە لە سەرەتاوە باسی ژیانی دەکات و دەڵێ:**

شیخ رەزا لە عەشیرەتی تاڵەبانییە لە قەزای بازیاندا هاتۆتە دونیا، لە کەرکووکدا گەورە بووە، ئەویش وەکوو نالی هەم فەریزەی حەجی ئیفاد کردبوو هەم چوو بووە ئەستەنبوڵ لە ئەسنای مولاقاتدا بە قوەت و زەکا و درایەتی خۆی گەلێ ئەکابر و ئەفازلی ئەستەمبوڵی مات و مەبهوت کردبوو، یەکێك لەوانە ئەدیبی مەشهور کەمال بەگ بوو).

لەم دەقەدا ئەمین فەیزی بەگ هەرچەندە باسی چەند مەسەلەیێکی مێژوویی لە ژیانی شێخ ڕەزا دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا سەرنجمان بۆ چەند خاڵێکی ڕەخنەسازی ڕادەکێشێ، وەکوو: زیرەکی و داگیرکردنی دڵی وێژەران و پیاوماقوڵان و بەشداریکردنی کۆڕی وێژەیی، کە مێژوونووسی ڕەخنەسازیی کوردی دەتوانێ سوودیان لێوەربگرێت و بە دوای بەڵگە و شاهێدا بگەڕێ بۆ چەسپاندنی ئەم بابەتە.

ئەمین فەیزی بەگ لە هەمان سووچەوە لەسەر باسەکەی بەردەوامدەبێت و دەڵێ:

( باوکی مەرحومی کە مەشهورە بە شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی هەم شێخێکی ساحێب نەزەر بوو هەم شاعیرێکی پڕ هونەر.

شێخ ڕەزا ئەوەڵەن وەهبی و فطری بوو، سانیەن کەسبی بووە. لە چوار لیساندا شاعر بوو بیلخاسە ئەشعارە کوردییەکەی هەموو عیبارەتە لە فەساحەت و بەلاغەت لە نوقاط دەقیقە و ظرافت. ویسعەت قەریحە و مەعلوماتی خاریجی تەقریرە).[1]

لەبەر تیشکی ئەم دەقەدا دەتوانین سەرنج بۆ چوار بابەتی گرنگی ڕەخنەسازی ڕابکێشین، کە ئەمین فەیزی بەگ بە هۆیانەوە بەرهەمەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی هەڵسەنگاندووە.

**یەکەم:** مەسەلەی هەستیارێتی و زانیاری شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی، کە باوکی شێخ ڕەزایە. ئەمین فەیزی بەگ لە چەسپاندنی ئەم مەسەلەیەدا بە لای ئێمەوە ویستوویەتی بڵێ: شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەهرەی هەستیارێتی بە میرات لە باوکییەوە وەرگرتووە یاخود ویستوویەتی بڵێ شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە خێزانێکی زانیاریدۆست و لە ژێر سایەی بارێکی هەستیدا گەورە بووە و سروشتیانە بووە بە هەستیار و لەم کۆڕەدا بە ئاسانی هەنگاوی هەڵگرتووە.

**دووەم:** مەسەلەی سەرچاوەی هەستیارێتی شێخ ڕەزایە، مێژوونووسەکەمان لەم مەسەلەیەدا بڕیاردەدات، کە هەستیارییەکەی لە دوو سەرچاوەی هونەری هۆنراوەیی وەدەستهێناوە:

- سەرچاوەی بەهرە و فطری
- سەرچاوەی فێربوون و کەسبی

سەرئەنجام ئەمین فەیزی بەگ لە ڕوانگەی ئێمەوە پەنجاو پێنج ساڵ لەمەوبەر پەنجەی خستۆتە سەر مەسەلەی ڕێباز و ڕێوشوێنی هەستیارێتی.

**سێیەم:** شیکردنەوەی تایبەتییەکانی شێوازی هۆنراوەی شێخ ڕەزایە. ئەمین فەیزی بەگ لەم مەسەلەیەدا هەرچەندە بەڵگە و نموونەی لە هەڵبەستەکانی شێخ ڕەزا بۆ چەسپاندنی ئەو تایبەتیانە نەهێناوەتەوە، بەڵام گومان لەوە ناکرێت، کە بە وردی ئەم کارەی ئەنجامداوە و پلەی هونەری هەستیارەکەی دەستنیشانکردووە.

**چوارەم:** مەسەلەی تواناکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانییە، کە نووسەرەکەمان یەکەیەکە ناویبردوون و چەسپاندوونی و ڕوونیکردوونەتەوە، کە ئەم توانایانە هۆی لەدایکبوونی هەستیارێتی شێخ ڕەزایە.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ٦ (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد)

ئەمین فەیزی بەگ لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد) گرنگترین بابەتـی ڕەخنەسـازی بـەلای ئێمـەوە دەستنیشـانکردووە و هێما و ئیشـارەت بـۆ کۆمەڵێك لە هەستیارەکانی سلێمانی دەکات. ئەم هێما و ئیشارەتکردنەش ئەوەیە، کە دەڵێ:

( هیجری و کوردی و سالم ئەهلی سلێمانین، شیعریان پڕ تەڕاوەت و عاشقانەیە). [1]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە ئەمین فەیزی بەگ سێ هەستیاری کوردی بە قوتابخانەیێکی هۆنراوەیی لە سەر سێ بناغە کۆکردۆتەوە:

١- بناغەی شوێن و دەرفەت و ژینگە، کە شاری سلێمانییە.

٢- بناغەی تایبەتی شێواز، کە بە زاراوەی ( تەڕاوەت) پەنجەی بۆ درێژدەکات.

٣- بناغەی بابەتی هۆنراوەیی، کە باسکردنی دڵداری و عەشقە.

ئەم سێ بناغەیە بە لای ئێمەوە هەوێنی باسێکی ڕەخنەسازی گرنگن، کە پەنجا و پێنجساڵ لەمەوبەر مێژوونووس و ڕەخنەسازێکی کورد تۆوەکەی لە زەمینەی کوردیدا وەشاندووە و

---

١ بڕوانە ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد، ل ٧

دەرفەتی خەملاندن و سەوزبوونی بۆ ئامادەکردووە، بەڵام بەداخەوە هەتا ئەمڕۆ ڕەخنەسازێکی کورد نەهاتووە سوود لەو هەوێنە وەربگرێت و پەرەپێبدات و لە وێنەی لێکۆڵینەوەیێکی ئەکادیمی سازیبکات.

## • مەولەوی لە ڕوانگەی ڕەخنەسازییەوە

ئەمین فەیزی بەگ لە کتێبەکەیدا، گرنگییێکی تایبەتی بە مەولەوی داوە و لە ڕوانگەی چەند بابەتێکی ڕەخنەسازییەوە باسیکردووە. لەم بابەتانە مەسەلەی پەیوەندیی زوهد و تەقوایە بە هۆنراوە، کە لەبەر تیشکەکەیدا وتوویەتی:

(مەولەوی ئەهلی هەورامانە لە ساداتی کیرام و مەشایەخی عیزامی نەقشبەندییە، خەلیفەی شێخ عوسمانی تەوێڵەیە. مەسلەکی مەولەوی مەسلەکی زوهد و تەقوا بوو، لەگەڵ ئەوەشا شاعرێك بوو بێ نەزیر).[1]

لەم دەقەدا هەستدەکەین، کە ڕەخنەسازەکەمان بە لایەوە جێگای سەرسوڕمان بووە مەولەوی زاهد و خواناس و دەروێش بێت و لە هەمان کاتدا هەستیارێکی بێهاوتاش بێت. ئەم سەرسوڕمانەش هەڵبەت لە بۆچوونێکی گشتییەوە لێشاوی هێناوە و بە هیچ جۆرێك لە وردبوونەوەیێکی زانستییەوە بەرپانەبووە، چونکە لە مێژووی وێژەی نەتەوە موسڵمانەکاندا دەیان هەستیاری زاهد و موتەسەوف و خواناس بەرچاودەکەون.

نەتەوەی کوردیش کە موسڵمانە، لەم بارە بەدەرنییە و هەموو خوێندەوارێکی کورد (بابە تاهیری عوریان) چاك دەناسێ و دەزانێ، کە دەروێشێکی هەستیار و هەستیارێکی دەروێش بووە. هەرچۆنێك بێت ئەمین فەیزی بەگ دوابەدوای ئەم مەسەلەیە، باسی داهێنان و ئیبداعی مەولەوی لە تەکنیك و هۆنینەوەی هەڵبەستدا کردووە و وتوویەتی:

(مەولەوی بە موقتەزاری ئەو مەوقیعەی کە تێیدابووە هیچ چاوی بە شیعری فەرهەنگی نەکەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر ئوسلوبی ئەوان شیعری نەزمکردووە. لە قەتعەیێکیدا مەسرەعی ئەوەلی تەقفیە کردووە لە مەسرەعی سالس و قافیەی مەسرەعی سانی ڕێکخستووە، لەگەڵ مەسرەعی رابع.

ئەم ئوسوڵە خیلافی ئوسوڵی شوعەرای ئێرانە، مەولەوی لە کەسی نەدیوە، خۆی بە موناسبی زانیوە و ئیستعمالی کردووە).[2]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ۷-۸

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ۸

ئەمین فەیزی بەگ لەم بابەتە ڕەخنەسازییەدا دوو مەسەلەی گرنگ باسدەکات.

مەسەلەی یەکەم: هۆنینەوەی هەڵبەستە لە سەر تەرزی هۆنراوەی نەتەوەیێکی بێگانە، بەبێ ئەوەی بە خوێندنەوە و بە فێربوونی دەستوورەکانی ئەو تەرزەی زانیبێت.

مەسەلەی دووەم: داهێنانی تەکنیکێکی تازە لە هۆنینەوەدا، کە تا ئێستا هیچ هەستیارێك بەر لە ئەو بە لایدا نەچووبێت.

ئەم دوو مەسەلەیە هەڵبەت پێکەوە پرسیارێك بەرپادەکەن، کە دەپرسێ: مەولەوی چلۆن ئەم ئەرکەی ئەنجامداوە؟

ئەمین فەیزی بەگ هەروەکو لەم دەقەدا ئاشکرایە وەڵامیداوەتەوە و دووپاتیکردۆتەوە، کە ئەم هەستیارە کوردە بە کارتێکردنی ژینگە جوانەکەی هێزی داهێنان و ئیبداعی ئەوەندە بە جۆشبووە، کارێکی وای لێوەشاوەتەوە.

دانانی ژینگە بە هۆیێکی ڕاڤەکەری دیاردەیێکی هونەری بە لای ئێمەوە بۆچوونێکی ڕەخنەسازییە لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا. ئەمین فەیزی بەگ دوابەدوای ئەم بابەتە باسی پلە و بەربڵاوی بەرهەمەکانی مەولەوی دەکات و دەڵێ:

( لە مابەین شوعەرای کورددا مەولەوی موقابیل نیزامییە ئەگەرچی لەهجەی هەورامان و لەهجەی سلێمانی نەختێك لەیەك دوورن، ئەما شیعری مەولەوی ئەوەندە ئاهەنگدار و رووخوازە ئەهلی سلێمانی لە گۆرانیدا ئەغلەب شیعری ئەو دەخوێننەوە).[1]

کەوابوو پلەی هونەری مەولەوی دەگاتە ڕادەی هەستیارێتی نیزامی، هەروەها جیاوازی زار نەبووە بە کۆسپ لە ڕێگای بڵاوبوونەوەی هەڵبەستەکانی.

## • زانست و هۆنراوە

ئەمین فەیزی بەگ چلۆن سەرنجی لە پەیوەندیی زوهد و خواناسی بە هونەری هۆنراوە داوە لە هەمان کاتدا باسی زانست و هۆنراوەی کردووە. بۆ نموونە: لە باسکردنی هەستیاری بەناوبانگ (ئاهی)دا وتوویەتی:

( ئاهی ئەهلی سلێمانییە، ئیشتغالی هەر لەگەڵ عیلم بووە، زۆر وەختی خۆی لە شاری کۆیە رابواردووە، شیعری ئەویش رەنگینە).[2]

لەم دەقەدا هەرچەندە ڕەخنەسازەکەمان بە کورتی ئەو باسەی ئەنجامداوە، بەڵام مێژوونوسی

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩

ڕەخنەسازیی کوردی دەتوانێ لەبەر تیشکیدا، سەرئەنجامێك ڕەچاوبکات و بڵێت: ئەمین فەیزی بەگ لەو ڕەخنەسازانە نەبووە، کە ئیشکردن لە زانستدا بە دژ یەکی هۆنینەوەی هەڵبەستی ڕەنگین بزانێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە بیروڕای وابووە، کە زانا ئەگەر هاتوو خاوەن سەلیقەیێکی هونەری بوو، دەتوانێ بەرهەمی جوان و لێهاتوو ئەنجامبدات.

ڕەخنەسازەکەمان لە هەمان بۆچوونەوە باسی هەستیاری خاوەن سەلیقەی بە ناوبانگ (ئەحمەدی کۆر)ی کردووە و وتوویەتی: (ئەحمەدی کۆر ئەهلی تەرەفی سابلاغە، عالم نەبووە ئەما شیعری بە غایەت موزەییەن و غایەت عارفانەیە. ئەو نەعتەی حەزرەتی رسالتە، هەمووی موزەییەنە بە سنعەت و رەد عەجزە لەسەر سەدر، ئەحمەدی کۆر، لایقە مولەقەب بێ بە شاعیری پێغەمبەر).

ئەمین فەیزی بەگ لەم دەقەدا دووپاتیدەکاتەوە، کە هەستیار ئەگەر هاتوو زانا نەبوو، ئەو بارەی ڕێگای هۆنینەوەی هەڵبەستی پڕ سنعەتکاری لێناکرێت.

هەرچەندە ئەم چەشنە هەڵبەستە پێویستی بە ڕەوانبێژی بە گشتی و بە جوانکاری بە تایبەتی هەیە.

## • پیشەی هەستیارێتی

ئەمین فەیزی بەگ لە گێڕانەوەی سەرگوزشتەی (مەولانا خالید)دا، لە مەسەلەی پیشەی هەستیارێتی دەکۆڵێتەوە و دەڵێ:

(شێخ لە هەموو علومی زاهیر و باتیندا ساحێبی ئیقتدار بووە، هەر لەگەڵ تەدریس و ئیرشاد مەشغول بووە. شیعر نەزمکردنی نەکردووە بە مەسلەك لە مەرتبەی حافز و سەعدی زیاتر نەبێ کەمتر نییە).[1]

ئاشکرایە کە ڕەخنەسازەکەمان لێرەدا دمیەوێ هەستیاران بەسەر دوو تاقمدا دابەشبکات:

تاقمی یەکەم: ئەو هەستیارانەن، کە هۆنینەوەی هەڵبەست دەکەن بە پیشە و تەنیا لەگەڵ هونەرەکەیدا خەریکدەبن.

تاقمی دووەم: ئەو هەستیارانەن، کە لابەلا هەڵبەست دەهۆننەوە و بە زۆری لەگەڵ پیشەیێکی دیکەدا تەمەن دەبەنەسەر.

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠



• بەشی

# • دیاریی لاوان و زمان و وێژەی کوردی

دیاریی لاوان کە لە چاپخانەی بەغدا ساڵی ۱۹۳٤ی زایینی لە چاپدراوە. لە پێشەکییەکەیدا باسی ناوەرۆکەکەی کردووە و وتوویەتی:

(ئەوا پشت بە گەورەیی خوا و یارمەتی هەندێ مەزنان و خاوەن بیرەوە، ئەمساڵیش توانیمان بە ناوی دیاری لاوانەوە، دیارییەك پێشکەشبکەین، هیوامان وایە کە ئەم تەرحە نووسینانە کەڵکیان هەبێت بۆ گەلەکەمان، چونکە بێجگە لەوە کە گەلێ پەند و ئامۆژگاری و شیعر و چیرۆك و قسەی بەفەرپیان تیایە بۆ پێشکەوتنی زمانەکەمان وە بە تایبەتی بۆ ڕێکخستن و جوانکردنی چەشنی نووسیاری کوردی هەنگاوێکە بۆ پێشەوە).

لە بەر تیشکی ئەم دەقەدا ئاشکرایە، کە نووسەرەکانی دیاریی لاوان خزمەتی کەلەپووری نەتەوایەتیمان لە پەندی پێشینان و سەرگوزشتە و حیکایەت و چیرۆك و جۆرەکانی دیکەی فۆلکلۆر و وێژەی میللی بە سەرچاوەی شێوازی نووسەرانیان زانیوە و بیروڕایان وابووە، کە ئەم شێوازە لە ڕووی وشەسازی و ڕستەسازی و دارشتنەوە بە بووژانەوەی ئەو خەزنەیە دەخەمڵێ و گەشەدەکات.

ئەم تێڕوانینە بێگومان پێوانەیێکی ڕەخنەسازیی گرنگە، چونکە سامانی فۆلکلۆرییە، کە ئاکامێکی ڕەسەنە بە پارسەنگی هەڵسەنگاندنی بەرهەمی تازە لەقەڵەمدەدات و ئەم بەرهەمە بە سست و لاواز و ناڕەسەن تەماشادەکات، ئەگەر هاتوو لە ڕەوتی میراتی وێژەی دێرین لایدابوو، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر هاتوو لە بەر تیشکی شوێنەواری ئەو میراتە هەنگاوی هەڵگرتبوو بە کارێکی سەرکەوتوو تەماشادەکرێت.

ئەم پێوانە ڕەخنەسازییەی دیاریی لاوان بە لای ئێمەوە ڕێگە لە وێژەرە هاوچەرخەکان ناگرێت، کە شێوازیان تازەبکەنەوە و خوێنێکی نوێ بکەن بە لەشیدا، بەڵام ئەم خوێنە دەبێت لە دڵی کەلەپووری ڕەسەنی نەتەوایەتییەوە قوڵپیدابێت.

کەوابوو دیاریی لاوان لە سەرەتای گرێی چوارەمی ئەم سەدەیەوە دروشمی شێوازی پێشکەوتوویی وێژەی کوردی لە سەر دوو بناغە دامەزراندووە:

**یەکەم:** بناغەی ڕەسەنی، کە سەرچاوەکەی فۆلکلۆر و وێژەی میللی و شاسوارە وێژەرەکانە.

**دووەم:** بناغەی تازەکردنەوە، کە لەبەر تیشکی بناغەی یەکەمدا دامەزراوە و بە هیچ جۆرێ ڕێ بە بەرەڵڵایی و سینگکردنەوە بۆ هەموو کارتێکردنێکی بێگانە نادات.

## • وەلی دێوانە لە ڕوانگەی وێژەی بەراوردکارییەوە

لە وتارە گرنگەکانی دیاریی لاوان، وتارێکە بە ناونیشانی وەلی دێوانە، ژینی و شوێنی.

نووسەری ئەم وتارە لە پێشەکی وتارەکەیدا چەشە و چێژ بە هۆی کۆکردنەوەی بەرهەمی هەستیارە دێرینەکان دەچەسپێنێ، بۆیە دەیگێڕێتەوە و دەڵێ:

(چەند ساڵێك لەمەوبەر لە ژێر ڕەشماڵێکا پیرێکی ئوفتادەی جاف هەندێ شیعری ڕەوان و بەسۆزی لەبەر بۆ خوێندمەوە، بەڕاستی زۆر کاری تێکردم، لە هی (کەلیم) و (بێ دڵ) زیاتر! پاش ئەمە بە دڵ کەوتمە سەر کۆکردنەوەی شیعری ئەم شاعیرە بەهرەوەرە، وە زیاتر مەراقی بەسەرهاتی ژینی گرتمی).

هەروەها نووسەرەکەمان هەمان هۆ بە کۆڵەگەی مانی هەندێك بەرهەم و سەرگوزشتەی ئەو هەستیارە دەزانێ، چونکە لەم ڕووەوە دەبێژێ:

(ژینی وەلی هەروەکوو هی گەلێ لە شاعیرەکانی ترمان لەگەڵ مردنی خۆیدا کوژاوەتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ بۆ ئێمە ماوەتەوە تەنیا تارمایی خەیاڵی ئەم شاعیرە کۆچەرمیە.

ئەگەر بە سایەی چێشکەی ئەدەبی جافەکانەوە هەندێ لە شیعرەکانمان بۆ نەمایایەتەوە،

بێگومان ئێستا ناوونیشانی نەئەبوو لە تاریخی ئەدەبیاتماندا بۆ شیعرەکانی وەیا بۆ ئەو دڵداریە کوشندەیەی پەڕمیەك تەرخان نە ئەکرا لە بابەت ژینی وەلی و تاریخی بوونیەوە).

نووسەری ئەم باسە دان بەوەدا دەنێت، کە چۆنیەتی ژیانی وەلی دێوانە بە تەواوی نەزانراوە و نازانرێ، جا بۆ ئەوەی ئەم چۆنێتییەی ژیانی زیندووبکاتەوە لەگەڵ چۆنییەتی ژیانی هەستیاری عاشقی عوزری ( مەجنون لەیلا ) بەراوردیدەکات و دەڵێ:

( لە گەلێ شتا بەسەرهاتی وەلی لە هی مەجنون ئەچێ، ژینی کۆچەری و عەشرەتیان، پاکی و خاوێنی و ناهومێدی دڵداریان، وێڵی و چۆڵپەرستیان، نارەزایی باوکی یارەکانیان، پیاو کە لەم یەکێتیی سەرگورشتەیەیان ورد ئەبێتەوە خەریکە بڵێ: ئەمە ڕەنگە داستانێ بێ لە وێنەی ئەو هەڵبەسترابێ، بەڵام وانییە، شاعیر لە ڕۆژهەڵات و یار لە ڕۆژئاوابێ لە ناو لمی ئاگرین یا نزاری فێنکدا بێ، وێڵ و وەحشی یان شارستانی بێ، مەجنون، فەرهاد، شیللی، دانتی یا وەلی بێ، ئەو گیانلەبەرێکە کە ئەو ڕێگایەی سروشتی بۆی داناوە، هەر بە وێدا دەڕوا.

ئەشێ ڕێگای هەندێکیان بە دیمەن جیابێ، بەڵام هەموو بۆ (کۆی یار) ئەچن و قیبلەی هەموویان یەك شتە: دڵداری شاعیر تارێکە هەر دەستی دڵدار ئەتوانێ لێیدا، بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە هەتا ناهومێدی تەلەکانی نەپچڕێنێ و تێکینەشکێنێ ئاوازی بە جۆش و خرۆشی لێنەدرنایە).[1]

لەم دەقەدا تێبینییێکی سەرەکی خۆی دەنوێنێ، کە تەماشاکردنی هەستیارە دڵدارەکانە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و لە دێرترین زەمان و هاوچەرخدا بە تێڕوانینێکی یەکدیگیر.

ئەم ڕاستییە لە ڕووی سەرچاوە و مێژووەوە لە سەر بناغەی یەکێتیی بوونی فەلسەفەی سۆفییەتیدا دامەزراوە، کە لە مێژووی فەلسەفەی ئیسلامیدا دەستنیشانکراوە، کە وجودە. واتە بوون لە جیهانی هەستپێکراو و نادیاردا یەکە و هەستی ئادەمیزادیش هەموو سنوورێکی کاتی و ڕەگەزی و ئایینی دەشکێنێ و دەبێتە ئاوازێکی یەکگرتوو. جا ئەم ئاوازە یەکگرتووە بە هۆنراوە دەربڕابێت یان بە پەخشان، بە دڵ نووسرابێت یان بە عەقڵ و مەنتیق هیچ دەرفەتێکی نییە. لەو چەرخەدا یەکە و بە یەك سۆز قوڵپدەدات و دەژی.

نووسەرەکەی دیاریی لاوان هەروەکوو دیارە لەو ڕوانگە فەلسەفییەوە دەیەوێ بناغەیێکی ڕەخنەسازیی بەراوردکاری لە نێوان (وەلی دێوانە)ی کورد و (مەجنون لەیلا)ی عەرەبدا بەرپابکات.

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢

ئەم کارەش بێگومان لەو سووچەوە ڕەوایە، بەڵام ڕەخنەسازی پسپۆڕ داوای خستنەڕووی تایبەتی هەر هەستیارێك لەو هەستیارانە دەکات. نووسەرەکەشمان خۆی تا ڕاددەیەك هاتووە بەدەنگ ئەو داواکارییەوە، بەڵام بە چەشنێکی پراکتیکی نەیهێناوەتە دی. ئەمەش هەڵبەت کەموکوڕییەکە لە باسەکەدا و باشتر ئەوە بوو، نووسەرەکەمان ئەنجامیبدایە.

نووسەرەکەمان دوابەدوای ئەم مەسەلەیە لە شێوازی هونەری وەلی دێوانەوە، هەڵوێستی خۆی دەربارەی مەسەلەی خوێندەواریی یان نەخوێندەواریی وەلی دێوانە دەچەسپێنێ و دەڵێ:

( وەلی وەکوو ئەگێڕنەوە نزیکی دووسەد ساڵ لەمەوپێش لەدایکبووە، خۆی لە تیرەی کەمالەیی عەشیرەتی جافە. هەرچەند ئەڵێن نەخوێندەوار بووە، بەڵام هەندێك تەعبیرات و زبانی دی وای بە کەڵك هێناوە، کە پیاو ناتوانی دان بنێ بە مەدا. ئەگەر خوێندەواریش نەبووبێ بێگومان ژینی کوچەرییەتی وە تێکەڵی لەگەڵ کوردەکانی ئێران سوودێکی زۆری پێگەیاندووە. ڕەنگە بەشی زۆری ئەم تەعبیرانە لەوانەوە فێربووبێ ).[1]

لەبەر تیشکی ئەم دەقەدا ئاشکرایە، کە نووسەرەکەمان دەربڕینە هونەری و ڕەوانبێژییەکانی وەلی دێوانە بە ئاکامی فێربوون و خوێندەواریی وەلی لەقەڵەمدەدات، هەروەها بە هیچ جۆرێك بەهرەوەری هەستیار و توانای زگماکی بەسەرچاوەی جوانکاری شێواز نازانێ. ئەم هەڵوێستە هەر وەکوو لە مێژووی ڕەخنەسازیی جیهانیدا چەسپاوە، بۆچوونێکی کۆتایی نییە، چونکە بە درێژایی ئەو مێژووە دەیان ڕەخنەساز هەڵکەوتوون، کە سروشتیان بە سەرچاوەی هونەر داناوە و بیروڕایان ئەوەبووە، کە نە سەنعەتکاری، نە فێربوون، بەڵکوو بەهرە و توانای خواوەن بەخش مامۆستای هەستیاری هونەرمەندن.

بەڕاستی ئێمە نازانین بۆچی نووسەرەکەمان بە تەواوی ئەم ڕاستییەی فەرامۆشکردووە، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕەنگە بڕوای بە خوێندەواریی وەلی دێوانە هۆی ئەو بۆچوونە بێت.

## ● سەرچاوەی هەستیاریتی وەلی دێوانە

گومان لەوە دانییە کە وەلی دێوانە هەستیارێکی بەهرەوەر و داهێنەر بووە. زانستی ڕەخنەسازیش لە عاستی ئەم جۆرە هەستیارانە دەپرسێ: سەرچاوەی بەهرەوەری و داهێنراوی ئەم هەستیارە کوردە چی بووە؟

نووسەری وتارەکەی وەلی دێوانە وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە و وتوویەتی:

( وەلی هەر لە منداڵییەوە سروشتی شاعیرێتی خۆی دەرخستووە، نازانم ئەگەر جاف

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣

شـاعیر نەگەیەنێت کێ ئەبێ بگەیەنێت، لە جیهانا ئەوەی زیاتر بەش وەرگرێ لە جوانی و شیرینی و ئاهەنگ و زمزمەیی تەبیعەت هەر خێڵی جافە. ژیانیان گەشتێکی جافییە، هاوین لە گوێ ڕووبارەکانی سارد و ڕوون، لە ژێر درەختی سەوز و بەرز، لە ناو چەمەنزاری پڕ لە گوڵاڵە و وەنەوشەدا ڕادەبوێرن، زستانیش لە ژێر ئاسمانێکی شین و ساماڵ و شنەی بایێکی خۆش و گیان بە قەدەر ئاسکی گەرمیان ئازاد و بزێو، بە قەدەر ڕێواسی کوێستان تەڕ و تازە و مەزەدارن).[1]

لەبـەر تیشـکی ئەم دەقەدا تێبینیدەکەیـن، کە نووسـەرەکەمان دوو هۆی یەکدیگیری بۆ ڕاڤەکردنی هەستیارێتی وەلی دێوانە دەستنیشانکردووە:

**یەکەم: خێڵی جاف کە هەستیارەکەمان یەکێکە لە ڕۆڵەکانی**

**دووەم: سروشتی جوانی ژینگەکەی**

گومان لەوەدانییە کە لە لێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازیی زانستی سروشتی جوان و ژینگەی هەسـتیار هەمیشـە بە سەرچاوەی خوریە و ئیلهامی هەستیاران لەقەڵەمدەدات، بەڵام دانانی خێڵ بە هۆی هەسـتیارێتی هەروەکوو لە مێژووی ڕەخنەسازیی جیهانیدا چەسپاوە بۆچوونێکی تایبەتە بە ڕەخنەسازە عەرەبەکان، چونکە ئەم مێژووە بۆمان دەگێڕێتەوە، کە ڕەخنەسازە دێرینەکان هۆنراوەیان بە بەهرەی چەند خێڵێکی عەرەب داناوە و ئەم خێڵانەیان بە پێکهێنەری هەستیاری پایەبەرز زانیوە.

مێژوونووسی ڕەخنەسازیی کوردی پێویستە بپرسێت: ئایا نووسەرەکەمان لەم بۆچوونەیدا شوێنپێی ڕەخنەسازە عەرەبەکان هەڵناگرێ؟

بە لای ئێمەوە هیچ دوورنییە، کە نووسـەرەکەمان وابێت و بیرۆکەکەی لە ڕەخنەسـازیی عەرەبییەوە وەرگرتبێت. هەرچۆنێك بێت با پێکەوە گوێ لە پاشماوەی قسەکانی نووسەرەکەمان بگرین، کە وتوویەتی:

(وەلی کە لە بنیاتا شاعیر بوو ئەم ژین و گەشتەش زۆر بەکەڵکی هاتووە، گەلێ شیعری جوان و ڕەوانی پێ ئیلهامکردووە).[2]

کەوابـوو: وەلـی دێوانـە لـە درەختی ئـەو ژینگەیەی خێڵی جافـەوە، کەڵکێکی هونەری وەرگرتووە و کەوتۆتە سەر ڕێگای هۆنینەوەی هەڵبەستی ڕازاوە و جوان.

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤

## • سەرگوزشتەی وەلی دێوانە و هەڵوێستی ڕەخنەسازی

نووسەری وتارەکە چۆنێتی دڵداریی وەلی دێوانە دەخاتەڕوو، سەرگوزشتەکەی دەگێڕێتەوە و پەیوەندی هەڵبەستەکانی بەم سەرگوزشتە و ئەو چۆنێتییە نەخشەدەکێشێ و دەڵێ:

(وەلی دێوانە وەختێ ئەگاتە سیرەی کوڕێنی، ئەکەوێتە داوی (شەم)ەوە، شەم کەنیشکێکی جوان و شیرینی کەمالەیی دەبێت. هەر لە ئەوەڵ ڕۆژەوە چاوی ڕەشی شەم ئاگرێك بەردەداتە دڵی وەلی، کە پاش مردنیش نەکوژاوەتەوە..

وەلی بە سەودای دڵدارییەوە ئەکەوێتە شیعروتن. بە هۆی ئەم شعرانەوە ناوی ئەزرێ و ناوی یارەکەشی ئەزرێنێ، شیعری وەلی و جوانیی شەم لە ناو هەموو هۆز و تیرەی جافدا بڵاودەبێتەوە، تا باوکی کچە ئەگاتە تینی، ناهێڵێ کچەکەی چاوی بە وەلی بکەوێ و بەم چەشنە لە جیاتی ئاو نەوت ئەکات بە سەر ئەم ئاگرە بلێسەدارەدا.

وەلی خەو و خۆراکی لێهەڵئەگیرێ، هەموو ئیش و فەرمانی دێتە سەر شعرهەڵدان بەسەر یاری دوورکەوتوویدا. لە ئەنجامی کاردا خەبەری ئەم (مەجنون)ە تازەیە ئەگاتە میری ئەوسای جاف، هەندێ لە شیعرەکانی بۆ ئەخوێننەوە زۆر کاری لێئەکا و قەرارئەدا ئەم دوودڵە یەکخا، خۆی ئەچێ بۆ ناو خێڵی کەمالەیی، لەوێ باوکی شەم بانگئەکات و هەرچۆنێ بێت کچەکەی لێئەخوازێ.

مزگینی خوازێنی شەم ئەنێرێ بۆ وەلی و لەسەر ئەمە شاعیری ئاوارە هێلانەی شاخی خۆی بەجێ ئەهێڵێ و بە هەڵەداوان دێتەوە. لە سەر فەرمانی میر زەماوەندێکی گەورە رێکئەخەن سێ شەو و سێ ڕۆژ کوڕگەلی کەمالەیی لەگەڵ کەنیشکی باڵابەرزی جافدا ڕەشبەڵەك ئەکەن. ڕۆژی سێیەم لە سەر دەستووری خۆیان ماینێك ئەڕازێننەوە، ڕەخت و ڕەشوەی زیوی لێئەدەن و (شەم)ی سوار ئەکەن. وەلی لە پڕ دێتە پێشەوە و بە پێچەوانەی دەستووری جاف جڵەوی وڵاخەکە ئەگرێ و بە چاوێکی پڕ لە بەختیاری و دڵێکی پڕ لە جۆشەوە لێی ئەپرسێ: ئەی شەمی شەریف هەروەك من بۆ تۆ بە پەرۆشم، ئاخۆ تۆش وایت بۆ من؟ تۆش منت خۆش گەرەکە؟ شەم لە ڕووی نازەوە، یا بە ڕاستی ئەڵێ (نا). ئەم وەرامە بە جارێ ماڵی وەلی وێرانئەکات، جڵەوی وڵاخەکە بەرئەدات و ڕووە و نزار سەر ئەنێتەوە، چەند ساڵێك وێڵ و ئاوارە بە ناو شاخ و چەم و دۆڵدا ئەسوڕێتەوە، بەرامبەر بە ئاو، بە با، بە مانگ، بە ئەستێرە، بە مەل، شیعر ئەڵێت: هەموو هەستی گێتی ئەکا بە تکاکار لای (شەم) پەیامیان پیا ئەنێرێ و داوای وەرامیان لێئەکات).[1]

---

[1] مەسعود سەرچاوەی پێشوو ل٦

لەم تابلۆ پڕ سامناك و ئەشکەنجەیەدا، ڕەخنەساز لە سێ خاڵی سەرەکیدا ئەرکی هۆنراوە دەستنیشاندەکات و سەرچاوەکەی دەخاتەڕوو:

**خاڵی یەکەم:** ئەوەیە کە عەشق و دڵداری هۆی لەدایکبوونی هۆنراوەیە و هۆنراوەش ئاوازی نەمری ئەم دڵداری و عەشقەیە.

**خاڵی دووەم:** کۆمەڵی کوردەواری هەمیشە نرخی هۆنراوەی زانیوە و قەدری هەستیارانی گرتووە.

**خاڵی سێیەم:** نەریت و خوو و ڕەوشتی خێڵایەتی، هۆنراوەی دڵداری بە چاوی گومان و شورەییەوە تەماشاکردووە و ئەم هۆنراوانە بوون بە هۆی قین و نارەزایی لە هەستیاردا.

## • نمونەیەک لە هۆنراوەی وەلی دێوانە

لە هەڵبەستە ئاگرین و پڕ ئێش و ئازارەکانی وەلی دێوانە ئەم پارچە هۆنراوەیە، کە تێیدا نیاز و ڕازی خۆی لەگەڵ نەسیمدا کردووە و وتوویەتی:[1]

### دڵ وەداخەوە

ئەمشەو جە دووری دڵ وەداخـــەوە
وە داخ ئەو (شــــەم) شەوچراغـەوە
تــائـــامـــانـەسیم جەلـەیلاخـەوە
تا ئـــاما نـەسیم ڕەوزەی ڕەزوانی
قوەت بەخشی گیان سەد سەلـەفانی
نەسیم نەفەسی مەسیح ئـــــاسا بێ
شـــاهنشینی زام دلـــشنــــاسا بێ
شارەزایی یا تاغ شای شەم جەبین بێ
دۆست پەروانەی خـــاتر خەمین بێ

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٠٦

لەمەویەر لە کتێبی ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد و دیاریی لاوان، لە ڕووی ڕەخنەسازییەوە دواین و هەندێ تێبینی و بۆچوونی برێ لە نووسەرانی کوردمان خستنەبەرچاو، دەربارەی ڕەخنەسازی لە وێژەی کوردیدا. لێرەش لە کتێبی شعر و ئەدەبیاتی کوردی دانەری مامۆستای پایەبەرز و بەنرخ ڕەفیق حلمی دەدوێین و باری ڕەخنەسازیی کوردی لەو سەردەمەدا دەخەینەبەرچاو، بە نیازی کەڵکوەرگرتن و گەیاندنی ڕەخنەسازیی کوردی بە پایەی خۆی.

## • ئامانجی شعر و ئەدەبیاتی کوردی

مامۆستای پایەبەرز و نیشتمانپەروەر، خوالێخۆشبوو ڕەفیق حلمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەی لە ساڵی ١٩٤١ی زایینی بە چاپگەیاندووە. لە لاپەڕەی یەکەمیدا لە ژێر سەردێڕی (دیاری) باسی ئامانجی بەرهەمەکەی کردووە و وتوویەتی:

(ئەم چەند لاپەڕەیە، کە ئاوێنەیەکە سوڕەت و سیرەتی هەندێ لە شاعرە ناودارەکانی

کوردستانی عێراق بە وێنەی دەستەگوڵێکی ڕەنگاوڕەنگ و بۆنخۆش دەزانم، کە هەرگوڵێکی لە باخێك هەڵبژێرابێ پێشکەشی لاوانی کورد و بە تایبەتی پێشکەشی ئەو قوتابییە خۆشەویستانە ئەکەم، کە لە قوتابخانە بەرزەکاندا ئەخوێنن و لەوێدا لە شعر و ئەدەبیاتی کوردی شتێکیان بەرچاوناکەوێت.

ئەگەر بەم سپارە بچووکە توانیبێتم، کە گیانی (روحی) ئەدەبی ئەوان بجوڵێنمەوە، تەقەلایەك کە بۆ پێکهێنان و دەرهێنانی بەرگی دووەم ئەیدەم لە لام سووك ئەبێ و گیانی نیشتمانپەروەریم تازەئەبێتەوە).[1]

ئەم دەقە هەرچەندە ئاشکرایە، کە کتێبی شعر و ئەدەبیاتی کوردی زۆرتر خۆی بە لای بابەتی مێژووی وێژەوە دادەشکێنێ و ئامانجی سەرەکی دانەرەکەی تۆمارکردنی سیرە و سەرگوزشتە و ژیانی ئەدیبە باسکراوەکانێتی، بەڵام بە تەواوی خۆی لە بابەتی ڕەخنەسازی نەپچڕاندووە، بگرە ئەم بابەتە لە دوو ئامانجدا خۆی دەنوێنێ:

**ئامانجی یەکەم:** هەڵبژاردنی دەستەیەك لە هەستیارە کوردەکان و پێشکەشکردنی چەند نموونەیەك لە بەرهەمەکانیان و نواندنیان وەکوو دەستەگوڵێکی دەستنیشانکراو لە باخچەیێکی فراواندا. ئەم ئامانجەش بێگومان بە ڕێبازێکی ڕەخنەسازی دێتەدی و بە بابەتێکی ئەم هونەر و زانستە لەقەڵەمدەدرێ، چونکە هەڵبژاردنی وێژەرێك لە ناو هاوپیشەکانیدا و دەستنیشانکردنی چەند بەرهەمێکی و لێکدانەوەیان وەکوو نموونەی بەرزیی پێنووسەکەی لە بەر تیشکی پێوانەی پەسەندکردن و توانجتێگرتن و شیکردنەوە و بەراوردکاریدا ئەنجامدەدرێ.

**ئامانجی دووەم:** بوژاندنەوە و چەشە و چێژی خوێنەرانە، کە ڕاستەوخۆ یەکێکە لە مەبەستەکانی بابەتی ڕەخنەسازی.

## • حەمدی صاحبقران

مامۆستا ڕەفیق حلمی، کە لە سروشتی کتێبی شعر و ئەدەبیاتی کوردی و لە چۆنێتی ئەنجامدانی ئامانجەکان و نەخشەی باسکردنی هەستیارەکان دەکێشێ، بەم جۆرە لە هەستیاری بەناوبانگ (حەمدی ساحبقران)دەدوێ و دەڵێ:

( ئەحمەد بەگ کوڕی فەتاح بەگی ئەڕازیە و لە ساڵی "١٢٩٥"ی هیجری لە سلێمانی لەدایکبووە، هەر لە سلێمانیش خوێندوویەتی و لە حوجرە (قوتابخانە)ی مەلا عەزیز لەگەڵ ئەمین زەکی بەگ پێکەوە بوون. خزمی کوردی و سالمە، کە دوو شاعری بەناوبانگی کوردن.

[1] پرواڵە شعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی یەکەم

لە بنەماڵەی (ساحێبقڕان)ە بە فارسی و کوردی زۆری شعر داناوە. دیوانی شعرەکانی لە ١٣٣٤ی ڕۆمی و لە گرتنی سلێمانیدا سووتاوە، بەڵام لە دوای ئەم تاریخەوە دیسان دیوانێکی هێناوەتە ناو، کە هێشتا لە چاپنەدراوە.

قەسیدەکانی و غەزەلیاتی تەخمیس و تەرجیحی وێنەیێکی بەرزی تەبعی شاعرانەیەتی. لە ساڵی ١٣٥٥ی هیجری لە شاری سلێمانی لەم دنیایە کۆچی کردووە.

ئەحمەد بەگ خوا لێیخۆشبێ هەروەکوو شاعرێکی قەلەندەر خۆش مەشەرەب بوو، پیاوێکی شۆخ و بە نموود و سوارێکی باش و سلاحشۆرێکی نازاش بوو، زۆر دڵتەڕ و دەسبڵاو و میوانپەروەر بوو. لە هەر مەجلیسێکدا دابنیشتایە بە قسەی خۆش و نووکتەی شیرین ئەو مەجلیسەی ئەهێنایە نەشئە، کە شیعرەکانی خۆی ئەخوێندەوە بە دەنگێکی نێر و زەمزەمەیێکی شاعرانە ڕەنگ و بۆنێکی تری پێئەبەخشی و تامێکی زیاتری پێئەدا. بەینێك پێش مردنی پارچەیێکی لە دیوانە تازەکەی و وێنەیێکی خۆی بۆ ناردبووم).[1]

لەم دەقەدا مامۆستا ڕەفیق حیلمی بە چەشنێکی هونەری و زانستی و گەلێك زانیاری مێژوویی ڕەخنەسازی پێشکەش بە خوێنەرەکانی دەکات. ئەم زانیارییە گەلەش بە هەردوو لایەنەکەیەوە سوود بە مێژوونووسی ڕەخنەسازیی کوردی دەگەیەنێت و ئەرکی سەرشانی نووسەرەکەی وەکوو مێژووشوناسێکی زانا و ڕەخنەسازێکی هونەرمەند بەدیدەهێنێت. بۆ بەڵگە نووسەرەکەمان کە هێما بۆ سەرچاوەکانی ڕۆشنبیریی حەمدی دەکات، هەڵبەت یاریدەی ڕەخنەساز دەدات لە کۆڕی دەستنیشانکردنی لاساییکردنەوە و ڕەسەنی هەستیارەکەیدا.

هەروەها دەرفەتی ئەوەی دەداتێ دیاردە هونەرییەکانی ڕاڤەبکات و لێکیانبداتەوە. بە هەمان جۆر کە دووپاتی پەیوەندیی خێزانی بە (سالم و کوردی)یەوە دەکات، ناڕاستەوخۆ مەیدانی بەراوردکاری لە نێوان ئەم سێ هەستیارە خزمانە دەکات، جگە لەمە مامۆستا ڕەفیق حیلمی ڕاستەوخۆ لە دەقەکەیدا پلەی هەستیارێتی حەمدی لە هۆنینەوەی قەسیدە و غەزەل و تەخمیس و جۆرەکانی دیکەی بنیاتنانی هەڵبەستی کوردی دەستنیشاندەکات. سەرەڕای ئەمە بە چەند خاڵێکی گرنگیش لە بەرهەم و چارەنووسی دیوانی هەستیارەکەی دەدوێ.

ئەم تەرزە نووسینەی مێژووی وێژەی کوردی، کە چل ساڵ لەمەوبەر بە خامەی زانایێکی کورد نووسراوەتەوە، بە لای ئێمەوە نموونەیێکی بەنرخە لە کۆڕی مێژووی ئەدەبیاتدا، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو زانیمان کە زۆربەی زانیارییەکانی بە هەوڵ و تەقەلاییێکی کەسی وەچنگهێنراوە و ئەگەر لەو کاتەدا نەنووسرایەتەوە، دەفەوتان و لە کیس دەچوون.

---

[1] هەمان سەرچاوە، پێکەوە ل ١ - ٢

## • هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەسازی

مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە نووسینەوەی کتێبەکەیدا، بە چەشنێکی میکانیکی و ڕوونووسکردن ئەرکی خۆی بەدینەهێناوە، بەڵکوو زۆر جار چەژە و چێژ و بۆچوون و حوکمی تایبەتی خۆی لە نووسینەکانی خستۆتەکار. بۆ نموونە: لە هەڵسەنگاندنی حەمدیدا دەڵێ:

(ئەحمەد حەمدی بەگ جێی ئینکار نییە کە بۆ شعردانان خۆی زۆر ماندووکردووە و گەلێك لە شیعرەکانی لەبەر سنعەتی لەفزی و قافیە تەنگی لە ڕەوانی و سەلاسەت مەحرومە، بەڵام گەلێ جاریش ئەم خۆ ماندووکردنەی بە خۆڕایی نەڕۆیشتووە و شعری زۆر مەتینی داناوە. ئەم شیعرانەی خوارەوەی وێنەیێکی شعری مەتینێتی:[1]

حەرفی ناساغی بە جێم لا چاکە نەک بێجایی ساغ
کاسەیی گڵ بێ لە مەی پڕ، خاڵی نەک مینایی ساغ
نەشئە بەخشایە موحیبەت زەهری گەر تێکەڵ نەبێ
شەکریش حەتتا خراپە بیکەیە صەهبایی ساغ
پتکەدەی خۆتە دەروونم ئەی صەنەم مەشکێنە دڵ
شەوقی خۆش نابێ کە نەی بێ لالەکەت لەمپایی ساغ
عوسرەتە عوشرەت موهەیا گەر نەبێ ئەسبابی عەیش
بۆ لە یەکدانە بە حەسرەت دەستی بێ ئەعضایی ساغ
فکری خۆت ئامان مەنێرە بەر حەریفی بەد سوورشت
هەر چرووکە گەر چرووک بیکاتە بەر کاڵایی ساغ
مەعریفەت بۆ تێ گەیینی قودرەتی جانانەیە
خاص بینینی نیگارە دیدەیی بینایی ساغ
لابەرە تەکلیفی دەست و پێ لەسەر خۆت ئیستەکە
(حەمدی) دەست بۆ زاڵم و بۆ جەردە چاکە پایی ساغ

---

[1] ئەم شیعرە لە دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ صاحێبقران چاپی یەکەم ل (٣٦٠ - ٣٦١) وەرگیراوە چاپخانەی ئەسعەد ـ بەغداد لە بڵاوکراوەکانی ئامەدادی گەلاوێژ، ژمارە (٦).

## • پێوانەی وشەسازی و هەڵسەنگاندنی هۆنراوە

لە ڕەخنەسازی و ڕەوانبێژیی کوردیدا هەتا ئەمڕۆ تا ڕاددەیێکی زۆر سەنعەتکاری لەفزی و پێوانەیی و وشەسازی بە بەردی بناغەی هەڵسەنگاندنی هۆنراوە بایەخپێدانی هەستیاران گیراوەتەبەر.

سەرئەنجام بە تایبەتی لە لایەن ڕەخنەسازە ناپسپۆڕ و لاساییکەرەوەکانەوە ئەو هەڵبەستە بە بەرهەمی نایاب و بە قیمەت لەقەڵەمدەدرێت، کە لە هونەرە وشەسازییەکان وەکوو جیناس و تەورییە و تیباق جمەیان دێ، هەروەها هەستیاری سەرکەوتوو لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەو هونەرمەندیە، کە توانایێکی بێهاوتای هەیە لە دارشتنی سناعاتی لەفزی و دارشتنی وشەی ڕازاوە. مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەروەکوو بزانین یەکەم ڕەخنەسازی کورد بێت، کە چل ساڵ لەمەوبەر بەرەنگاری ئەم ڕێبازە وشەییە بوویێتەوە و لە کۆڕی ڕەخنەسازیی کوردیدا و بە ئاشکرا لە ڕازاندنەوەی سناعەی لەفزی و وشەسازی وەکوو پێوانەیێکی ڕەخنەسازی بۆ پەسەندکردنی هۆنراوە لایدابێت.

بەڵگەشمان بۆ چەسپاندنی ئەم ڕاستییە مێژووییە لەوەدا بەرچاودەکەوێ، کە مامۆستای ناوبراو باسی ئەم مەسەلەیەی لای هەستیاری بەناوبانگ حەمدی ساحێبقڕان کردووە و وتوویەتی:

(هەرچەندە مەرحوم لە سەر ئسوڵی کۆن شعری داناوە و لە فنونی شعردا زۆر ئەهمیەتی بە سەنایعی لەفزی داوە و لەم لایەنەوە پەیڕەوی شاعرە کۆنەکانی کردووە، بەڵام ئەگەر لە شعرەکانی باش وردبینەوە بۆمان دەرئەکەوێت، کە دیسانەوە ڕێگەیێکی جیاواز و سەربەخۆی گرتۆتە بەر و لە زۆر جێگادا ژۆر شاعرە بەناوبانگە کۆنەکانیش کەوتووە. مەسەلەن لە وەسفی (برۆ)دا هیچ شاعیرێکی کۆن نەماوە، کە زۆر یا کەم شیعری دانەنابێ، بەڵام ئەگەر لەم وەسفەی حەمدی بفکرین:[1]

بالی کێشاوە بە سەر حوسنا بە دوو لاوە برۆ
وەک هوما گەییە مەقامێک، پێی لە سەر چاوە برۆ
رتبە بالا بە ئینسانی بچووکی قەد مەدەن
چۆن لە ڕووی ڕۆژا بزانە تیغی کێشاوە برۆ
ڕەنگە قەت ئەهلی محبەت یەک کەسی لێدەرنەچێ
تیغی ڕاکێشاوە، ئەمری کوشتنی داوە برۆ [2]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨ - ١٠

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩

چۆنە؟ ئایا کەس توانیویەتی برۆ بگەیەنێتە جێگەیەك، کە پێی بگاتە سەر چاو بێجگە لەمە تەماشای بەیتی دووەمیش بفەرموون: ئایا لە وردی بیر و جوانی تەشبیهەکانی لەزەتێکی شاعرانە بە دڵتانا نایەت؟). دوابەدوای ئەم هەڵسەنگاندنە، مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەیتێکی فارسی لە وەسفی برۆدا دەهێنێتەوە و لەگەڵ دێڕەکانی حەمدی بەگی ساحێبقڕاندا بەراوردیەکات و دەیسەلمێنێ، کە سناعەی ئەدەبی و بەلاغەتی دێڕەکانی ئەم هەستیارە کوردە گەلێ بەرزتر و هونەری ترە. بەم جۆرە ئەم ڕەخنەسازە کوردە لە هەڵسەنگاندنی هەڵبەستدا پێوانەی تەنگەبەری سناعاتی لەفزی و وشەسازی، کە تا ڕاددەیێکی زۆر تاقە پارسەنگی پەسەندکردنی بەرهەمی وێژەران بوو فەرامۆشدەکات و ڕێبازێکی فراوان لە سەر بناغەی ڕەوانبێژیی گشتی و بەراوردکاری دەگرێتەبەر.

ئەم ڕێبازەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی، کە دەتوانین بە ڕێبازی ناوەڕۆکی ناوبەرین زیاتر لەم دەقەی خوارەوەدا بناغەکانی ڕووندەبنەوە، کە دێڕە شیعرێکی هەمان هەستیار شیدەکاتەوە و دەڵێ:

به ڕەنگ و بۆ نییە ئیحسانی دونیا هەر بە ڕێکەوتە
لە (نەی) شەکر دەبارێ، ژاڵە بەو شیرینییە تاڵە

ئێستە ئێمە لەو فەلسەفەیە بگەڕێین، کە لەم بەیتەدا دامەزراوە، بەڵام تەنیا لە وەسفی ژاڵە، کە هەم بە شیرین کراوە و هەم بە تاڵ وردبینەوە بزانین چەند جوانە.

بەڵێ، ژاڵە کە بە ڕەنگ زۆر جوان و شیرینە، کەچی بە تام تاڵە و وەکوو ژەهر وایە. (نەی) کە قامیشێکە ڕەق و تەق بەری شەکر دەگرێت، ئینجا لەبەر ئەمە شاعیر دەڵێت: (بە ڕەنگ و بۆ نییە ئیحسانی دونیا، هەر بە ڕێکەوتە) چونکە قامیش بەو ناشیرینی و بێ ڕەنگییە شیرینە، کەچی ژاڵە بەو جوانی و شیرینییە تاڵە. مەبەستی ئەوەیە کە بەخت، یا کەماڵی ئینسان لەگەڵ دیوی دەرەوەی "مظهره" پێوانەکردن زۆر جار مرۆڤ بە هەڵە دەبات.

ئەم بەیتە جوان و بە مەعنایەشی ئاخر بەیتی ئەو غەزەلەیە، کە هەمووی عیبارەتە لە فەلسەفە:

وەرە (حەمدی) ئەوی ماڵە لە پێش خۆتا ڕەوانەی کە
ئەوی بێ جێ کە چوو واچوو ئەوی جێی بێڵی کەی ماڵە؟

بەڕاستی شعرێکی بەرز و فەلسەفەیێکی قووڵە.[1]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠

## • لایەنی ناهەمواری (سلبی) هەستیاران

مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەر چلۆن لە هەڵسەنگاندن و پەسەندکردنی هەڵبەست پێوانەی لاساییکەرەوەی سناعاتی لەفزی فەرامۆشکردبوو، لەم ڕووەوە جیاوازییەکی لە نێوان خۆی و ڕەخنەسازەکانی ڕۆژگارەکەی چەسپاندبوو، دیسانەوە ڕووگەی ستایشی نەرمونیانی لەگەڵ هەستیاراندا بەجێهێشتبوو و بە ئەوپەڕی ڕاستگۆییەوە لایەنی ناهەمواری هەستیارە باسکراوەکانی دەستنیشاندەکرد و بە بەڵگە و بە هێزی حەقپەرستی دەیسەپاند:

بۆ نموونە دەرحەق بە هەستیاری بەناوبانگ بێخود لەم ڕوانگەیەوە وتوویەتی:

(بێخود لە شیعری غرامیش دا زۆر خاوەن توانایە. هەرچەن خۆی وەک عەلی کەمال باپیر دەڵێ: ڕەنگە لە دیانەت و عیلما زۆری نەمابێ مەزهەری حەدیسی (علماء أمتن) ببێ، دیسانەوە لە ژێر حوکمی تەقلید نەچووەتە دەرەوە و لە مەدحی خەت و پەرچەم و لێوی ئاڵ خۆی پێنەگیراوە. لەوەش زیاتر بەڵکوو سەردەمێک هەندێ لەو لاوە جوان و شۆخانەی نەدیبێ، کە موحیتی پڕ فەیزی سلێمانی پێیگەیاندوون، لەگەڵ ئەمەشدا لە سەر بیستن و هەر لە ژێر تەئسیری لاساییکردنەوە و حوکمی سەلیقەدا بە شعر هەموویانی هۆنیبووەوە و مەدحی کردبوون).[1]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی ڕەخنە لە بێخود دەگرێ، چونکە بە تەجروبە و موناعات ئەو جۆرە هەڵبەستانەی هۆنیوەتەوە، بەڵکوو لە ڕێگای لاساییکردنەوە و بیستن و خوێندنەوەی بەرهەمی هەستیارەکانی ترەوە کارەکەی ئەنجامداوە.

بێگومان ئەم هەڵوێستەش بۆچوونێکی ڕەسەنە لە کۆڕی ڕەخنەسازیی کوردیدا، چونکە دەیسەلمێنێ کە هەستیار چەند پایەبەرز بێت نابێت چاو لە لایەنە سەلبییەکانی بپۆشرێت.

## • نرخپێدانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی وەک ڕەخنەسازێک

هەندێ خوێنەری کورد ڕەنگە مامۆستا ڕەفیق حیلمی بە زیادڕۆ (مبالغ) لەقەڵەمبدەن، کە لە باسی پیرەمێرددا وتوویەتی:

(ئەمە سەرگوزشتەیێکی کورت و متوازیعی پیرەمێردە، ئەگینا ئەگەر بمانەوێت ئەو وەکوو هەیە و بە پێی خزمەتێک کە هی شعر و ئەدەبیات و زمانی کوردی کردووە بە خوێندەواری بناسین، وشەیێکی وامان بۆ نادۆزرێتەوە کە ئەم کارەمان بۆ ئاسان بکا. ئەوەندە ئەتوانین بڵێین کە ئەگەر ئەو (خۆرهەڵاتناسانە)ی شعری (عەلی تەرمۆکی) شاعری هەرە بەناوبانگی کوردیان

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٤

بەرچاوکەوتووە و بە یەکێك لە گەورەترین شوعەرای خۆرهەڵاتیان داناوە، چاویان بە شعری پیرەمێرد بکەوتایە شکم نییە کە ئەمیان لە خوار ئەوەوە دادەنا و زۆر جێی بڕوایە، کە پیرەمێرد لە ڕیزی یەکەمی شاعرەکانی خۆرهەڵاتا بنواندایە).[1]

## • پێوانەی کوردی پەتی لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا

کوردی پەتی لە دێرترین سەردەمەوە پێوانەیەکی ڕەسەن و گرنگی زمانی هۆنراوە بووە لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا، بۆ نموونە: هەستیاری بەناوبانگ نالی نزیکەی سەدە و نیوێك لەمەوبەر لە هەڵبەستەکانیدا شانازی بەوە کردووە، کە زمانی هۆنراوەکانی کوردییە. پرسیاریش لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی پلەی ڕابەریی مامۆستا حیلمی لە جیهانی ڕەخنەسازیی کوردیدا دەپرسێت: ئەم ڕەخنەساز و نووسەرە کوردە چلۆن ڕوانیویەتییە ئەم مەسەلەیە و لەسەر چ بناغەیەك پێوانەکەی چەسپاندووە ؟ مامۆستای ناوبراو لە نرخپێدانی پیرەمێرد و هەڵەسەنگاندنی هەڵبەستێکیدا وتوویەتی: لەم شعرە بەرزانەدا بگەڕێین بۆ وشەیەکی بێگانە، بۆ واتایەکی ناپەسند، بۆ لاری و چەوتییەك و سەرنجی ئەوە بدەن، کە شاعیر ئایا خۆی تەنگاو کردبێ مێشکی گوشیبێ بۆ یەکخستن و ڕێکخستنیان و لە دوای ئەمە لە سنعەت و بەلاغەتیش وردبنەوە کە تیایەتی.

پیرەمێرد هەروەکوو لە شعرەکانیا لاسایی کەسی نەکردۆتەوە، بەڵکوو ویستویەتی کە خۆی ببێ بە ئیمامی شاعیرە کوردەکانی ئەم عەسرە، لە لایەکی تریشەوە لە شعرا کوردێتی تاقیکردۆتەوە و بۆی دەرخستووین، کە زمانەکەمان زمانێکی دەوڵەمەند و شیرینە.

**ئەم شعرانەی خوارەوە وێنەیەکی کوردی پەتییە:**[2]

جاران دەڕۆژ بە حەچە حەچە وەبارە بەرێوە
گەرما و سەبون و لێزمەیی باران و تەڕێوە
ترسی تەریدە، پێشکەشی سوار، شەوفرینی دز
دەسیاوی باری کەوتوو لە جێگەی خلیسک و خز
ئەرکی گزیر و خانەبگیر موریانی نوێن
بۆڵەی کەبانوو خرسی قەتارچی پلاری جوێن
چەند سوتەکەی بە ئاو و کەڕووی نوردونانی کۆن
جوتە و لەقەی تەویلە و هاڵاوی تەرس و بون
ئاگری تەپالە ( لووکسی ) گزگل، کەفینی سەگ
دەستەویەخەی قەتارچی لەسەر کا شەڕە کوتەک..... تد

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٢ - ٨٣

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٩ - ٩٠

مامۆستا ڕەفیق حیلمی دوابەدوای ئەم نموونەیەی هەستیاری ئەمر (پیرەمێرد)، کە بۆ سەلماندنی کوردی پەتی زمانی هۆنەری باسکراوەکەی هێناوەتەوە، وتویەتی:

(دەبینین کە بێجگە لە وشەکانی لووکس، ساف لە ساف، عاصمە، فن ) کە لە زمانی بێگانە وەرگیراون وشەیەکی وای تیا نییە کە بە ئەسڵ و یا بەرگوێی کوردێك بێگانەبێ.

لە مانەیشا ساف لە ساف بە تەواوی بۆتە کوردی تا لێی وردنەبیتەوە نازانێکە لەبیینیانا بێگانەیە و لە وشەی صافی عەرەبییەوە وەریانگرتووە و کردوویانە بەماڵی خۆیان عاصمەکە ناوچەی حکومەتە، ناوی ئافرەتیشە و کوردەکان بەکەڵکی ئەهێنن، لێرەدا پیرەمێردیش ڕەنگە بە هەردوو مەبەسەکە بەکاریهێنابێ، هەرچی وەکوو وتاری ( طي الارض) ە لە جیاتی بەکارهێنراوە، بەڵکوو مەبەستی لە کەشف و کەراماتی ئەولیایە، کە پێشان بەم جۆرە ئەیانگێڕایەوە، پیرەمێردیش نەیویستووە دەسکاری بکا و لەدەم ئەوانەوە قسەکەی وەکوو وتراوە کردووە و بەمەش دەرئەکەوێت ئەگەر بە چاوی تێگەیشتوو لە شعرەکان وردبینەوە، وشەی وردی بێگانەی تیا نابینین.

ئەوەش لەوێ بوەستێ کە پیرەمێرد بەم شعرانە وەکوو وێنەگرێکی (وردکار) وێنەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی رابوردووی بۆ گرتووین و خستوویەتییەوە بیرمان، ئینجا پیرەمێرد لە دوای ئەوە کە لەوحەیەکمان لە ژیانی کۆمەڵایەتی پێشوو بەم وردەکارییەوە بۆ ڕەسم ئەکا و چاوی عیبرەت و ئینتیباهمان پێ ئەکاتەوە، ئەڵێ:

ئینجا کە هات بروسکە خرایە تەلێکەوە
هێنرایە خانووەوە لە چرای هەر پەلێکەوە
زۆرتر لە مانگەشەو دەر و ژور ڕوونکرایەوە
تاریکی لاچوو، تێگەیینی ئێمە مایەوە
ئیتر دەبێ بەرهەمی زانستی تێبگەین
چیتر لە مانە چاکترە بۆ بەرزێتی وەتەن
لای بەندە خوێندەوارییە، ئاە خوێندەواری
هەر میللەتێ کەفەنی نەبێ دەردی کارییە
ئاەخۆزگەخوێندنیش‌وەکوومن‌ئارەزووی‌ئەکەم
بیبینم نەبێتە گرێی قورسی کفنەکەم[1]

لەم شیکردنەوەیەدا ئاشکرایە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەربارەی مەسەلەی کوردی پەتی، زمانی هۆنراوە لە تێڕوانینێکی یەکیگیرەوە هەڵوێستێکی ڕەخنەسازیی نوێ لەسەر دوو

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٣ - ٩٤

بناغە دادەمەزرێنێ :

**بناغەی یەکەم:** چەسپاندنی کوردی پەتی لە کۆڕی وێژەدا وەکوو پێویستییەکی هونەری. ئەم بناغەیە بە لای ئێمەوە لە بۆچوونێکی دەروونی و کۆمەلایەتییەوە ھەلسەنگێنراوە، چونکە وێژەر، کە بە زمانی پەتی بەرھەمەکانی دەنووسێتەوە دەتوانێ ڕاستەوخۆ شەپۆلی دەروونی خوێنەرەکانی ببزوێنێت و لە نەریت و میراتی کۆمەڵەکەیەوە بچێتەپێشەوە و بە زمانی تایبەتیان بیروڕاکانی پێشکەشبکا.

**بناغەی دووەم:** تەماشاکردنی زمان وەکوو هۆیەك بۆ وێنەکێشان و تابلۆ سازکردن. ئەم بناغەیە دیسانەوە بە لای ئێمەوە لەو سەردەمەدا بۆچوونێکی نوێی داهێنراوە، چونکە زاناکانی ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازی تا ئەو کاتەی لە چاپدانی کتێبی شعر و ئەدەبیاتی کوردی زمانیان وەکوو ئامانج و دەربڕینێکی ڕووکەش تەماشادەکرد.

ئەم نامیلکەیە لە ساڵی ١٩٣٣ ی زایینیدا بڵاوکراوەتەوە و لە چاپخانەی کەرخ لە بەغدا لەچاپدراوە.

لەم نامیلکەیەدا وتارێکی ڕەخنەسازیی بەناوی (ئەدەبیاتی کوردی شاعیرەکانمان) بڵاوکراوەتەوە لەلایەن نووسەرێکی ناو نەهێنراوەوە، وتارەکە لە ١٢ لاپەڕە پێکهاتووە، خوێنەر دەتوانێ بیرۆکە سەرەکییەکانی وتارەکە لەم سەردێڕانەی خوارەوەدا بچەسپێنێ:[١]

- نەبوونی ڕەخنەسازیی کوردی.
- پێوانەی ڕەخنەسازیی بۆ دەستنیشانکردنی پلەی هەستیاران.
- پێناسەی پەسەندکراوی هۆنراوە.
- سەرچاوەی پێناسەی هۆنراوە.
- بەربەرچدانەوەی پێناسەی لاساییکەرەوەی هۆنراوە.

---

١ ل ٣٣ - ٤٥

- بوونی هۆنراوەی کوردی.
- خستنەڕووی هۆی باری هۆنراوەی کوردی
- ناوەڕۆکی پەسەندکراوی هۆنراوە.
- هەڵسەنگاندنی هەستیارە دێرینەکانمان.
- پێشنیازێك بۆ چارەسەرکردنی باری هۆنراوەی کوردی

لەم سەر دێڕانەدا ئاشکرایە، کە وتارەکە تا بڵێیت لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا بە نرخ و بەپیتە، ئێمەش لەمەولا هەندێ لەم سەردێڕانە شیدەکەینەوە و بە ڕێبازێکی بەراوردکاری هەڵیاندەسەنگێنین:

## • نەبوونی ڕەخنەسازیی کوردی

نووسەری وتاری ( ئەدەبیاتی کوردی شاعیرەکانمان) لە نامیلکەی یادگاری لاواندا باسی نرخپێدانی هەستیارە کوردەکان دەکات و دەڵێ: شاعیرەکانمان هەتا ئێستا بڕوا ناکەم لە واتەی سوپاس و ستایش زیاتریان بیستبێ، یەکێك بە (توتی شەکر گوفتار) و ئەوی تر بە ( بلبلی شیرین کەلام) ناوی لێناون. هەرچەندە ئەم ناوونیشانەشیان لە لاپەڕەی چەند پارچە کاغەز و گۆشەی ڕۆژنامەیەکدا بۆ نەنووسراوە، بەڵام لە مێشکی خۆیان و هەندێ دەوروپشت و ناسیاویاندا زۆر چاك جێگیربووە. بەڵێ: هەتا ئێستا بێ لێکدانەوە هەڵمانکێشاون، لەمەشدا بیانوومان هەیە، چونکە پیاو لە تاریکیدا جوان و ناشیرینی لا وەك یەکە، بەڵام لەمەودوا ڕۆشنایی زانین بەرچاومان ڕووناکدەکاتەوە، هەموو شتێ وەکوو خۆی ئەبینی و پێویستە هەر شتە بەپێی بەرزی و نزمی خۆی ڕیزبکەین و بەپێی چاکی و خراپی ناوی لێبنێین. بەبێ بۆن نەڵێین نێرگس و بە نێرگس نەڵێین بێ بۆن.[1] لەم دەقەدا دوو ڕاستی سەرەکیمان بۆ ساغدەبێتەوە:

ڕاستی یەکەم: ئەوەیە کە نەتەوەی کورد تا سەرەتای ساڵانی ١٩٣٠ ی زایینی ڕەخنەسازی زانستی نەبووە و لە ستایشکردنی هەستیاران بەبێ پێوانە و بەبێ دەستوور بەو لاوە کۆڕی لێکدانەوەی وێژە، نەڕازێنراوەتەوە.

ڕاستی دووەم: ئەوەیە کە نووسەرەکەمان مژدەی لەدایکبوونی ڕەخنەسازیی زانستیی کوردی دەدات و بەڵێنێك دەچەسپێنێ، کە ئیتر لەمەودوا هۆنراوەی ڕاستینە لە هەڵبەستی ناڕاستینە، جیادەکرێتەوە و پلەی هەستارێتی هونەری دەستنیشاندەکرێت و ئاوەڵناوی هەستیار

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣

تەنیا بەو هونەرمەندانە دەدرێ، کە شایەنی نرخپێدانن.

پرسیاریش لێرەدا دەپرسێت: ئایا ئەم بڕیارە ڕاست و ڕەوایە و بەڕاستی تا ئەو کاتە هێشتا ڕەخنەسازیی کوردی لەدایکنەبووبوو، یاخود نووسەرەکەمان زیادەڕەوی دەکات و تا ڕاددەیەکی فرە ڕەشبینە؟!

گەشتە مێژووییەکەمان کە تا ئێستا لەتەک وتار و کتێبە کوردییەکاندا کردووە، دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین: نووسەرەکەمان لەو بڕیارەیدا زیادەڕۆیە، چونکە بەر لەو بە نزیکەی ١٣ ساڵ ئەمین فەیزی بەگ" لە کتێبە خنجیلانەکەیدا ( ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد ) بە کورتی کۆمەڵێك لە هەستیارەکانی هەڵسەنگاندووە، هەروەها (شێخ نوری شێخ ساڵح)یش لە وتارە بەنرخەکەیدا، کە لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینی لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا بڵاویکردۆتەوە بە چەشنێکی زانستی پێناسەی وێژەی کوردی کردووە و پێوانەی بەرزی و نزمی شێوازی چەسپاندووە و ڕەگەزەکانی شیکردۆتەوە.

## • پێوانەیەکی ڕەخنەسازیی بۆ دەستنیشانکردنی پلەی هەستیاران

نووسەری وتارەکەی (یادگاری لاوان) کاری زانستیی خۆی لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا بە چەشنێکی هەڕەمەیی و بەبێ دەستوور ئەنجامنادات، بەڵکوو پەنادەباتە بەر پێوانەیەکی یەکدیگیرو ڕەچاو و دەڵێ:

(لەپێش ئەوەدا کە خۆم بخەمە ئەو دەریا قووڵەوە و گەوهەرەکانی شاعیرەکانمانتان بۆ لە قوڕ و زیخ جوێبکەمەوە، لە پێش ئەوەدا بە وردبین سەیری درشت و ورد، ئاشکراو شاراوەی شیعرەکانیانتان بۆ بکەم. بەڵێ لەپێش ئەوەدا خەرمانی شیعرتان بۆ بە با بکەم، پووشتان بۆ لە "کا" ببژێرم، پێویستە وێنەی گەوهەرییەکانی ئەدەبیات و شیعرتان بۆ بگرم، تاکو خۆتان بیناسن، ئەگەر دیتان.)[1] دوابەدوای ئەم پێشەکییە نووسەرەکەمان دەستی بە وێنەکێشانی هۆنراوەیی کردووە و وتوویەتی: شیعر: تەرجمانی دڵە، چ بە دڵا بێ، ئێش و ئازار، دەرد و خەفەت، هیوا و نائومێدی، شین و شادی، شیرینی و تاڵی، خۆشویستن و قین، گومان و باوەڕ، ترس و بێ باکی، خراپی و چاکیمان بە واتەی ڕێکوپێك لە شێوەیەکی دڵگیرا بۆ دەرئەخات، کە هەموو کەس لە دەمی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیا ئەبینێ.

شیعر: چرایەکە تاریکی ڕێی ژیانمان بۆ ڕۆشنەکاتەوە، یارمەتیماندەدات لە دۆزینەوەی ڕاستیدا.

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٤

شیعر: جوانی هەموو شتێکمان بۆ دەردەخات، گیان تینووی جوانی و دڵیش برسی شیرینییە، نە ئەم تێری لێدەخوات و نە ئەو تینووی لێدەشکێ.

شیعر: لە ئاوازی دڵگیری بلبل، لە سروەی سوزەی بەیان، لە تافە تافی ئاوی سەر قەڵبەز، لە فرەفڕی باڵی باڵندە، لە ورشەی گیا، لە تریفەی مانگەشەو، لە ئاوابوونی ڕۆژ و هەڵهاتنی مانگ، لە جریوەی ئەستێرە، لە شەپۆلی زریان، لە بریسکەی بروسکە، لە گرمەی هەور، لە هاڕەی باران، لە دەنگی مۆزیقە مەعنایەکمان بۆ دەردەهێنێ، کە لە هەموو دڵێکدا شاراوەتەوە، بەڵام هێشتا دەریاننەبڕیوە تا شیعرەکە دەخوێننەوە.

شیعر: ژیانە بێ دەنگ و سەنگ، هاوارکەر و قیژێنەر، ڕووخۆش و مۆن، چاو بەگریان، دەم بە پێکەنین، پڕ لە دڵداری دێت و دەچێ).[1]

لەم دەقەدا بە چەشنێکی زانستی سێ لایەنی سەرەکی بۆ چەمکی هۆنراوە دەستنیشاندەکات:

- لایەنی بابەت و ناوەڕۆکی هۆنراوە، کە هەموو وێنەکانی ژیان دەگرێتە خۆی و زەمینەیەکی بەربلاو لەبەر دەستی هەستیاراندا ئامادەدەکات.
- لایەنی ڕوخسار و شێوەی هۆنراوەکەیە، کە دەبێت دڵگیر و هونەری بێت.
- لایەنی ئامانج و ئەرکی هۆنراوەیە، کە دەبێت کەسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و چێژ و چەشەیی بێت.

هەڵبەت دەستنیشانکردنی ئەم لایەنانەی هۆنراوە بە زمانی کوردی نزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوسەر کارێکی ئێجگار گرنگ و لێهاتووە، چونکە ئەوە دەسەلمێنێ، کە ڕەخنەسازی کوردی خۆی لە ڕوانگەی تەنگەبەری پێناسەی هۆنراوە لە سووچی کێش و سەرواوە ڕزگارکردووە و بەرهەمی هەستیارانی بە پێوانەیەکی زانستی و هونەری دەستنیشانکردووە.

پرسیاریش لێرەدا، ڕەنگە بپرسێت: سەرچاوەی نووسەرمان لەم کارە زانستییەدا چییە؟ ئایا سەرچاوەیەکی خۆماڵییە؟ یاخود لە سنوورێکی بێگانەوە وەرگیراوە؟

نووسەرەکەمان خۆی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەقێك لە وتەکانی هەستیاری ئینگلیزی بەناوبانگ (شیلی) دەهێنێتەوە و دەبێژێ: شیعر وەکوو "sheiley" ئەڵێ وێنەیەکی ژیانە. لە ڕاستی ئەزەلییەوە وەرگیراوە، ئاوێنەیەکە کە ناشیرینی تیا جوان ئەبینرێ، سەرچاوەیەکە تا ئەبەد جوانی و ژیری لێ هەڵدەقوڵێ، شیعر پەچە لە ڕووی جوانییەکی شاراوە لائەدات).[2]

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥

کەوابوو: نووسەرەکەمان لە ڕەخنەسازی ئینگلیزییەوە جۆرە سوودێکی وەرگرتووە، بەڵام ڕادەی ئەم سوودوەرگرتنە چەندە و ئایا بە لاساییکردنەوە دەژمێردرێ؟!

## • بەرپەرچدانەوەی پێناسە لاسایی کەرەوەکەی هۆنراوە

نووسەری وتارەکەی نامیلکەی یادگاری لاوان هەروەکوو وتمان پێناسەیەکی وردی بۆ هونەری هۆنراوە سازکرد و لە سازکردنەکەیدا هەندێ لە وتەکانی هەستیاری ئینگلیزی بەناوبانگ (شیلی) دەربارەی هۆنراوە هێناوەتەوە و بە شێوازێکی وێژەیی لە کارەکەیدا سێ لایەنی یەکلییگیری بۆ ئەم هونەرە خستەڕوو:

- **لایەنی سەرچاوەی هۆنراوە**
- **لایەنی ڕوخساری هۆنراوە**
- **لایەنی ئامانجی هۆنراوە**

نووسەرەکەمان هەڵبەت لەم کارەدا تاڕاددەیەکی زۆر ڕێبازێکی زانستی و نوێخوازی گرتۆتەبەر.

پرسیاریش لێرەدا دەپرسێ، کە ڕەفتار وابێ، ئایا ئەم نووسەرە کوردە ئاگای لە پێناسەکانی دیکەی هۆنراوە هەبووە؟! خوێندنەوەی وتارەکە بە وردی دەیسەلمێنێ، کە ئەم نووسەرە کوردە بەڕاستی ئاگای لە هەموو کون و قوژبنەکانی باسکردنی هۆنراوە هەبووە. بەڵگەشمان بۆ چەسپاندنی ئەم ڕایە لەوەدا دەردەکەوێ، کە ئەم نووسەرە دەڵێ: شیعر: وەکوو وتنێکی وەزنداری قافیەدارە، بەڵام ئەبێ بزانین، کە وتە و لەش مەعنای گیانیەتی، لە واتەی ڕێکوپێك و مەعنای بەرز و بڵند شیعر پەیدادەبێ.[1]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە نووسەرەکەمان سەرنجمان بۆ پێناسە دێرینەکەی هۆنراوە ڕادەکێشێ، کە ڕەخنەسازی عەرەبی ( قدامە کوڕی جەعفەر) لەنیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچیدا پێشکەشیکردووە و وتوویەتی:

( الشعر کلام موزون مقفی له معنی ) واتە: هۆنراوە ئاخاوتنێکی کێش و سەرواداره و واتایەکی هەیە.

نووسەرەکەمان لەم سەرەنجراکێشانەدا بێگومان لاسایی قدامە کوڕی جەعفەر ناکاتەوە و پێناسەکەی هەروەکوو خۆی وەرناگێڕێتەوە سەر زمانی کوردی، بەڵکوو لابەلا بەرپەرچیدەداتەوە، چونکە نایەوێ ڕەگەزی وشە و ڕەگەزی واتا جیاجیا تەماشابکات، بەڵام ئەم دوو ڕەگەزە لە

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧

بۆتەیەکی یەکلییگیردا دەتوێنێتەوە و وشە بە لەش دەشوبهێنێ و واتا بە گیان.

کەوابوو: هۆنراوە گیانلەبەرێکی بێهاوتایە، هەموو ڕەگەزەکانی لە وشە و واتا و کێش و سەروا تێکسمراو و یەکلییگیر و بەیەکداچوون.

## • بوونی شیعری کوردی

نووسەرەکەی وتاری یادگاری لاوان لە بۆچوونە تازەکانیدا هەستدەکات، کە خوێنەرەکانی دەتوانن هەڵوێستی دەرحەق بە بوونی هۆنراوەی کوردی چییە؟ بۆیە دەستپێشکەری دەکات و دەڵێ: لە پاش ئەمەی کە زانیتان شیعر چییە، ڕەنگە هەمووتان بقیرێنن بەسەرما بڵێن کەوابوو وەکوو تۆ ئەڵێیت کورد شیعری نییە؟

بەڵێ هەمووتان بە تووڕەییەوە ئەم پرسیارەم لێدەکەن، چونکە لە هەموو ئەو تۆمارە شیعرانەدا، کە دیوتانە شتێکتان نەدیوە وەکوو من وتم وابێ.

چاوەڕێی ئەوە مەبن من وەرامتان "جوان" بدەمەوە خۆتان شیعری کوردی بخوێننەوە و بزانن چۆنن لەگەڵ ئەو وێنەی شیعرەی بۆم گرتن، ئەگەر لە وتنێکی وەزنداری قافیەدار زیاترتان دی بڵێن هەیەتی، ئەگینا ئێوەش لەگەڵ من بڵێن کورد شیعرێکی وای نییە، کە لە ئەدەبیاتی عالەمدا شوێنێ بگرێ، یا شایانی گوتن بێ، ناڵێم هەر شیعرمان نییە لەبەر ئاهی سوێن هەندێکمان هەیە، بەڵام گوڵە ئەستێرە بە شەوی تاریك بە ئاگر ئەزانرێ یەعنی ناتوانین لەبەر چاوی دۆست و دوژمن خۆمانی پێوە هەڵکێشین.

کە وتم شیعرمان نییە یەعنی شاعیرمان نییە. مەحوی، سالم، کوردی، نالی، ناری، زیوەر و حەمدی و موختار کێن؟

بەڵێ پێویستە پێتان بڵێم ئەمانە کێن و چین، ئەگەر شاعر نەبن، بەڵام ئەبێ لەسەرم ڕاوەستن تا لە هەلێکی تردا یەکە یەکە باسیانتان بۆ بکەم و بۆتان بکێشم. چاوەڕوانی ئەوە مەبن، کە بیانخەمە تەرازووی چەرمینەوە، چونکە شاعیران بە شیعرەکانیان ئەکێشرێن، شیعرەکانیان لەگەڵ ئەو وێنەی شیعرەی کە گیراوە ڕێکدەکەوێ یان نا؟ لەگەڵ هەمووی یا لەگەڵ هەندێکی؟ کە وەرامی ئەم پرسیارانەمان دایەوە، یەعنی شیعرەکەیمان کێشاوە ئەگەر حەز ئەکەی بڵێ خۆیمان کێشاوە، چونکە ئێمە لە هەموو کەسی "بەری بیر، کردەوەی دەست و وتەی دەمیمان گەرەکە.[1]

ئەم بڕیارەی نووسەرەکەمان دەرحەق بەمیراتی نەتەوایەتیمان لە هۆنراوەی هەستیاران تا

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧ - ٣٨

ڕاددەیەکی زۆر هەمـوو کەسێك پێی قایلنابێت، بگرە بـە زۆری خوێنەران و گوێگران لێی دوودڵ دەبن و داوای بەڵگە دەکەن.

نووسەرەکەمان هەڵبەت بێ بەڵگە نییە، بەڵکوو بە ڕێبازێکی زانستی و مەنتقی بڕیارەکەی سازکردووە، چونکە نموونەی بەرزی هۆنراوەی دەستنیشانکردووە و وێنەی ڕاستەقینەی ئەم هونەرەی کێشاوە و بەرهەمی هەستیارەکانمانی لەگەڵ ئەم وێنە و ئەو نموونەیەدا بەراوردکردووە.

ئەمـە ڕاستییەکە، بـەڵام لە هەمان کاتـدا بەراوردکارییەکەی نەزەرییـە و بە بڕیارێکی کتومتی پێشکەش کردووە، کەچی دەبوو پشت ببەستێتە ڕێبازێکی شیکردنەوە و دەیان نموونە و میسال بهێنێتەوە.

بەڵێ: ڕاستە کە بەڵێنیداوە هەستیارە ناوبراوەکان "مەحوی، سالم، کوردی، نالی، ناری، زێوەر، حەمدی و موختار" یەکە یەکە باسبکات و هەڵبەستەکانیان یەکالابکاتەوە و ئەوجا بیروڕایەکەیمان پێ بسەلمێنێ، بەڵام بەداخەوە ئەم کارەی ئەنجامنەداوە و هەرچەندە لە دواییدا چەند هۆیێکی بڕیارەکەی خستۆتەڕوو.

## • خودیی بابەتی هۆنراوەی کوردی

هۆی سـەرەکی ئینکاری بوونی هۆنراوەی ڕاسـتەقینەی کوردی لە لایەن نووسـەری وتارەکەی یادگاری لاوان لەوەوە هاتووە، کە گوایە بابەتی هۆنراوەی کوردی خودی و زاتییە، بۆیە لەم ڕووەوە دەڵێ:

زۆری شاعیرەکانمان ئەگەر لەبەرئەوە نەڵێم هەموویان دڵدارێکی خۆپەرست و بێ باکن، وەکوو یەکێکیان ئەڵێ:

**من و یارم لە کـونجێ دابنیشین**

**چ باکم عالەمێ ژێر و زەبەر بێ!**[1]

لەبەر تیشـکی ئەم دەقەدا هەسـتدەکەین، کە نووسـەرەکەمان داوای بابەتی جەماوەری و ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی لە هەسـتیارەکانمان دەکات و توانجی ئەوەیان تێدەگرێت، کە خودی و زاتی و خۆپەرستن، هەر بۆ دڵدارەکانیان سۆزیان دەجووڵێ، لە دەنگی دڵیان بەولاوە هیچ هاوار و ناڵەیەك نییە.

ئەم داواکارییە بێگومان کارێکی ڕەوایە، چونکە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بەرزبۆتەوە، کە سـەدەی میللەتانە و هەمـوو شـتێك پێویسـتە بۆ خزمەتگوزاری میللەت بەکاربهێنرێت،

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٨

بەتایبەتی هونەری هۆنراوە، کە دەنگی دادپەروەری و خۆشەویستی و ئازادییە. ئەمە لە ڕووی بابەت و ناوەرۆکی هۆنراوەی کوردییەوە، بەڵام ئەی ڕوخسارەکەی لە چ ڕوانگەیێکەوە نووسەرەکەمان هەڵیدەسەنگێنێ؟

## • شێوازی هۆنراوەی کوردی

نووسەری وتارەکەی نامیلکەی یادگاری لاوان بە توندی ڕەخنە لە هەستیارە کوردەکان دەگرێت و بابەت و دەربڕینە لاساییکراوەکانیان دەداتە بەر نەشتەر و دەبێژێ:

بە زۆر و بە خوایش ئەگرین و ئەقیژێنن، لە باسی چاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و ڕووی ڕۆژی و پرچی شەوی و باڵای سەرووی بەولاوە چیکە نازانن، بەڵام کاشکی ئەمیشیان چاک بزانیایە.

من لەگەڵ "ئەسیری" نالێم:

**(تەرکی ئەشعاری عشق بازێکە گەر زەوقت هەیە)**

چونکە لای من شیرینی دولبەران، لەنجەو لاری یاران جوانییە، بەڵام بەشێکیەتی هەمووی نییە لە هەموو ژیانێکدا بەتایبەتی لە ژیانی ئێمەدا گەلێ جوانی تر هەیە، کە پێویست بوو هەر لە زووەوە کورەی پێزانینی شاعیرەکانمانی بهێنایە جۆش.

توخوا پێم بڵێ کێ هەیە؟ لە نیوەی شەوێکی کوردستاندا . لە زەردە پەرێکدا . لە بەرەبەیانێکدا، لە ڕۆژاواییێکیدا، سەیری کێو و کەژ بکا، لە هاوینێکدا سەیری گوڵشەن، لە بەهاردا بڕوانێتە تارای سەوز و سووری دەر و دەشت، لە پایزێکدا گوێ لە ورشەی ڕەشەبا و خڕەی گەڵاڕێزان بگرێ، لە زستانێکدا گرمەی هەور، لێزمەی باران و بریسکەی گوێ لێبێ و چاوی پێبکەوێ شاعیریش نەبێ نابێ بە شاعیر؟"

لێرەدا زۆربەی سامانی نەتەوایەتیمان لە هۆنراوەی دێرین و هاوچەرخ پووچەڵکراوەتەوە و بە توندی بەربەرچدراوەتەوە و ئەم بارەش هەڵبەت لەبەر دوو هۆ بەرپابووە:

یەکەم: ئەوەیە کە شێوازی هۆنراوەی کوردی بەلای نووسەرەکەمانەوە دەستکردو لاساییکەرەوە و ڕازاوەیە و لە کلێشەی دووبارەکراو و لەیەکچواندن و خوازە و خواستن و درکەی سواو بەولاوە هیچ دەربڕینێکی نوێخواز و داهێنراوی تێدا بەرچاوناکەوێ.

دووەم: ئەوەیە کە هەستیارەکانمان لەواقیع و سروشتی وڵاتەکەیان پچڕاون و سەرنج لە جوانیی دیاردەکانی ئاووهەواو زەوی و زارەکەی نادەن.

## • هۆنراوەی دڵداری کوردی

نووسەرەکەمان واتە هەمان نووسەری وتاری ناو یادگاری لاوان لەم کۆڕەدا هەنگاو زیاتر هەڵدەگرێت و دەبێژێت: وەرە شیعرێکی دڵداری شاعیرەکانمان بخوێنەرەوە، کە ئەمە بەشی هەرە زۆری خەرمانی شیعریانە، ئەگەر شێوەی ژنێکت هاتە یادەوەری بڵێ چ ژنێکە، چینی، هندی، ئەفغانییە؟ نازانم هەرچی بێ ژنێکی کورد نییە، بەڵێ ناهەقیان نییە ژنی کوردیان نەدیوە، نەیاندیوە، بەهێ مەڕ بدۆشێ، شیرین مەشکە بژەنێ، گوڵناز بە شەدەی لارییەوە گۆزە لەسەر شان لەکانی بێتەوە، ڕەعنا گوڵەوەچنی بکا، نازدار شلومل ڕێی ڕەز بگرێتەبەر.[1]

بە ڕاستی نووسەرەکەمان لەم حوکمەدا شارەزایانە هۆنراوەی دڵداری دێرینی کوردی هەڵسەنگاندووە، چونکە ئەم هۆنراوەیە وێنەی ئافرەتی کوردی تێکداوە و بەدەربڕینی دەستکرد بگرە لە سروشتی ئادەمیزادانە دەریبەڕاندووە و وەکوو ئامێرێکی کوشندە نواندوویەتی.

پرسیاریش لێرەدا دەپرسێ بۆچی هەستیارە کوردەکان وایان کردووە؟ نووسەرەکەمان وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ:

با بەس تەفرەی خۆمان بدەین، با ڕاست بڕۆین، ئەگەرچی بۆ خۆشمان خراپ بێ، با ئاو لە دنگا بکوتین، پێ بە جەرگی خۆماندا بنێین و بڵێین: شاعیرەکانمان دزن، لاساییکەرەوەن. دزن بەڵام تونکڵ ئەدزن و ناوەڕۆک بەرئەدەن، لاساییکەرەوەن، بەڵام ڕێیان لێ ون ئەبێ، دۆش دائەمێنن.

شاعیران ئاوێنەی ژیانی کۆمەڵن، پێشڕەویانن لەژیاندا، بەڵام ئەمانەی ئێمە ئاوێکی لێڵن تارمایی بێگانەیان تیا دیارە، قەدەر لە دوامانەوە ئەڕۆن، لە عەسری بیستەمی شارستانێتیدا لاسایی شاعیرانی فارسی حەوت هەشت عەسر لەمەوبەر ئەکەنەوە، نازانن ئەوان شاعیری زەمانێك و زمانێك و ئەمان شاعیری زەمانێك و زمانێکی ترن، بەڵێ باشە لاسایی سەعدی و حافز و شیرازی بکەنەوە، بەڵام داخەکەم نایانگەنێ، ئەوان سوارن و ئەمان پیادە.

لە بابەت وێنەگرتنی ژیانەوە ئەتوانم بڵێم: کە گۆرانیبێژە نەخوێندەوارەکانمان گەلێ لە شاعیرە بەناوبانگە "بەلاغەت شارا"کان لە پێشترن. بەڵێ ئەو لادێییەی "کولنجەڕێ ڕێ.." و "خاڵەی ڕێبوار"ی داناوە گەلێ لەپێشترە لای من لەو شاعیرەی، کە ئەڵێ:

(......................)

چونکە ئەویان سەیری دەوروپشتی خۆی کردووە، ڕوانیویەتە دڵی خۆی، چی بینیبێ بەچەند واتایەکی سادە ڕێکیخستووە، بێ ئەرك و ئازار، بەڵام ئەوانی تر ویستویانە شیعر

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ٤٠ - ٤١

دابنێن، ویستوویانە دیوانەکەیان چ قافیەیەکی کەم نەبێ، ویستوویانە بەیتێ دروستکەن بۆ بت پەرستان تاکو نرخی هەموو بەیتێکی بشکێنن بە نەفامی، ویستوویانە واتەڕێژی بکەن کەس تێنەگات، شیعر بڵێن مەعنای لە سکی خۆیاندا بمێنێتەوە.[1]

کەوابوو: کەموکوڕی هەستیارەکانمان لەسێ خاڵی سەرەکیدا دەستنیشاندەکرێت:

- لاساییکردنەوەی هەستیارە دێرینە بێگانەکان.
- وەرگرتنی هۆنراوەی هەستیارەکانی دیکە، بەبێ ئەوەی هیچ موعانات و تاقیکراوەیێکیان لەو ڕووەوە هەبێت.
- سازکردنی وێنەکانی ڕەوانبێژی دەستکرد بەبێ هونەر.

## ● چارەسەرکردنی باری هۆنراوەی کوردی

نووسەرە بێ ناوەکەی نێو نامیلکەی یادگاری لاوان لە هەمان وتاردا دەرمانی چارەسەرکردنی باری دواکەوتوویی هۆنراوەی کوردی بەوە دادەبینێت، کە دەڵێ:

(بە پێچەوانەی ئەمە، پێویست بوو شیعری شاعیرانی کێو و کەژ و چیا و نەوەی گوڵشەن و گوڵزار و گەورەبووانی ناودەرد و خەفەت، پڕ بووایە لە بیری فەلسەفی بەرز بەرز. بەڵێ ئەگەر ڕاست بووایە کە بەدبەختی دەستێکی زۆری هەیە لە هەڵگیرساندنی بڵێسەی زیرەکیدا و لافاوی فرمێسك و بەری لێکدانەوە بەرەڵلانەکا. پێویست بوو شاعیرەکانمان بازی ئاسمانی ژیان، هەنگی شیرینی مژی گوڵان و دەرخەری ڕازی دڵان بوونایە.

بەڵێ ئەوانەی وتم ڕاستە و شاعیرەکانیشمان ڕەنگە ژەنگی کۆن بەریانبدا، ئەگەر خۆیان بخەنە بۆتەی ژیانەوە، جڵەو بۆ ئەسپی لێکدانەوەیان شلبکەن و دەست لە کلکی سیمرخ و گوێسوانەی شاری جابلقا بکەنەوە.)[2]

نووسەرەکەمان بەم پێشنیازەی چارەسەرکردنی باری هۆنراوەی کوردی تەنیا لە مەسەلەی بابەت و ناوەڕۆکی دەدوێت.

پرسیاریش بەم بۆنەیەوە دەپرسێت: ئایا هۆنراوەی کوردی تەنیا لەم سووچەوە لە دیلی دواکەوتوویی ڕزگاریدەبێت؟ نووسەرەکەمان خۆی گەلێ لایەنی دواکەوتنی لە ڕەوتی هۆنراوەی کوردیدا باسکردووە، کە وتویەتی:

(وەرە پێشەوە با چەند شیعرێ بخوێنینەوە، چاو لەوەش بپۆشە، کە شیعرەکانیان بێگانە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٤

لە ئێمە زۆرتر بەشـی پێویە، چونکە واتەی ئەوانی لە ئێمە زۆرتر تیایە و لە شـێوەی ئێمە زیاتر لەهی ئەوان ئەچێ. بەڵێ ئەو ڕۆژە ئەم چەشنە شیعرە باوی بووە، لە دوای ئەوەی لە قاموسا مەعنای هەموو واتە بێگانەکان دەرئەهێنی، ئەگەر زبانی بێگانەت زانی، خۆ ئەگەر نەشتزانی و هیچ پێمبڵێ لە دوای تێگەیشتن چی تێگەیشتی؟ هیچ ! بەڵێ لە هیچ هەر هیچ تێئەگەیت. ئینجا پێم بڵێ لەو دەورەشدا وەك بەکارهێنانی واتەی بێگانە باوی بووە و وتنی شیعری بێ مەعناش باوی بووە ؟ بووکە بە بارانەیە کە گیانی نییە مردووە.)[1]

لـەم دەقـەدا نووسـەری وتارەکـە لـە (یـادگاری لاوان)دا تەنگوچەڵەمـە گەلێـك لـە بوونـی هۆنـراوەی کوردیـدا دەخاتـەروو. نرخی کارەکەشـی بە لای ئێمەوە ئەگەر لـەم ڕووەوە دەستنیشـانـەکرێت پێشـنیازەکەی بۆ چارەسەرکردنی ئەم تەنگوچەڵەمانە بە تەواوی ئەرکی خۆی ناگێڕێ.

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣

**لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ٣ ی ساڵی ١٩٤٤ ی زایینی، مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی وتارێکی ڕەخنەسازی بەناونیشانی ( محمەد ئەمین بەگی جاف و ترازووی شیعر) بڵاوکردۆتەوە بۆ هەڵسەنگاندنی پارچە هەڵبەستێکی محەممەد ئەمین بەگی جاف .**

بیرۆکە ڕەخنەسازییەکانی ئەم وتارە لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆیان دەچەسپێنن:

- **پێناسەی هۆنراوەی ڕاستەقینە.**
- **سروشتی هەڵبەستە هەڵسەنگێنراوەکە.**
- **زاراوەی توانجتێگرتن و ڕەخنە.**
- **پشتبەستن بە دەستوورە ڕێزمانییەکان لە پێناوی ڕاڤەکردنی هۆنراوەدا.**
- **مەنتق و ناوەڕۆکی هەڵبەست.**

ئەم پێنج خاڵە هەروەکوو ئاشکرایە لە مەسەلەی واقیعیەت و هونەر بەگشتی دەدوێن. ئێمەش ئەم باسە لەبەر تیشکی ڕێبازێکی بەراوردکاریدا خاڵەکانی شیدەکەینەوە:

## • هۆنراوە و ڕێبازی واقیعیەت

لە مێژووی ڕەخنەسازیی جیهانیدا ساغبۆتەوە، کە دروشمی بەکارهێنانی هۆنراوە بۆ خزمەتکردنی میللەت و بەرگریکردن لە بیروباوەڕ و بڵاوکردنەوەی بیرورای جۆربەجۆر لەدێرترین سەردەمەوە بەرزبۆتەوە.

ئەم دروشمە هەروەکوو دەڵێن بە چەشنێکی فەلسەفی و ئایدۆلۆجیکی لە ئەورووپادا لە سەدەی هەژدەیەمی زایینییەوە خرایە بەر لێکۆڵینەوەی بیری و وەکوو ڕێبازێکی وێژەیی بناغەکانی چەسپێنران و پەیڕەوکەرەکانی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سەرەکییەکەی کە ( وێژە بۆ میللەتە) دەجەنگان و وتاری ڕەخنەسازییان بڵاودەکردەوە.

سەرئەنجامی ئەم بزووتنەوەیە پەیدابوونی ڕێبازی واقعیەتە لە ڕەخنەسازیی ئەورووپیدا، یەکێك لە تایبەتییەکانی ئەم ڕێبازە تازەیە ئەوەیە، کە ناوەڕۆك و بابەت و مانای وێژە دەبێت لە دەرفەت و واقیع و بوونی کۆمەڵەوە هەڵقوڵاو بێت و وێژە پێویستە گرنگی بە ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی بدات بەر لەوەی خەریکی ڕازاندنەوە و جوانکاری ڕوخسار بێت.

مێژوونووسەکانی ڕەخنەسازی ڕایان وایە، کە ڕێبازی واقیعیەتی ئەورووپی لە وێژەی نەتەوە ڕۆژهەڵاتەکانیشدا ڕەنگیدایەوە.

هەرچەند ئێمە لەو بیروباوەڕەداین، کە بەکارهێنانی وێژە بۆ خزمەتی میللەت دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە لە ڕۆشنبیری هەموو نەتەوەیەکدا، خۆماڵییانە ڕەگ و ڕیشەی داکوتاوە.

هەرچۆنێك بێت نەتەوەی کوردیش لە کۆنترین سەردەمەوە بە چەشنێك یان بە چەشنێکی دی لە باخچەی نەمری وێژەکەیدا هۆنراوەی واقیعی و خزمەتگوزاری بەرچاودەکەوێ.

پرسیاریش لێرەدا لە ڕوانگەی ڕەخنەسازییەوە دەپرسێ: ئەم هۆنراوەیە دەبێت چلۆن بێت؟ ناوەڕۆك و ڕوخسار بە چ ترازوویەك دەبێت بکێشرێن؟

مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی ناڕاستەوخۆ بە پێناسەی هۆنراوەی ڕاستەقینە وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە و دەڵێ:

هەموو ئەیزانین کە شیعر وەنەبێ هەر وێنەبێ لە بەرانبەری پەرچەکان و لە هاوسەنگی ئاو و خنجی قافیەکان و هیچی ترا، بەڵکوو لەوە بەرزتر تواندنەوەی شیشی تەڵای پاقژ و خاوێنی مەعنا لە بۆتەی بیرو مێشکی خاوەن هەستدا وە داڕشتنە لە قاڵبی وشە و پۆڵادا، ئینجا پێویستە، کە شاعیرە بەنرخەکان ئەم قاڵبە بە چەشنێ دابمەزرێنن فرە بێخەوش و جوان و بێ خوار و خێچ بێ، بۆ ئەوەی پێویست بە مشتومال و ڕەندە و خرنەك نەبێ .[1]

[1] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٣) مانگی مارت ساڵی ١٩٤٤ز، ل ٥١

بەم پێناسەیە ئاشکرایە، کە نووسەرەکەمان تەرازوویێکی ڕەخنەسازی بۆ جیاکردنەوەی هۆنراوەی ڕاستەقینە لە قسەی ڕێکخراو لەسەر ئەم بناغەیەی خوارەوەدا دامەزراندووە:

**یەکەم:** بناغەی بەرپەرچدانەوەی ئەو چەمکە دێرینە دواکەوتووە، دەربارەی هۆنراوە، کە ئەم هونەرە جوانە تەنها بە مەرجی (کێش و سەروا و ڕێکخستن)ی وشە پێشاندەدات، لە کاتێکدا ئەم مەرجانە شتێکی رووکەشن و هیچ پەیوەندییەکیان بە ڕاستەقینەی هۆنراوەوە نییە.

**دووەم:** دانانی بیر و مێشك و هەستی شاعیر بە بۆتەی خەملاندن و پێگەیاندنی هۆنراوە، چونکە ئەم سەرچاوانە کەسایەتی تایبەتی هەستیار پێکدەهێنن و ڕەنگی تاقیکردنەوەی خودی دەبەخشنە بەرهەمەکانیان.

**سێیەم:** ئەنجامدانی هەموو ڕەگەزەکانی هۆنراوە لە واتا و وشە و داڕشتنی گشتی لە جوانترین قالبدا، کە پێویست بە دەستکاری و ڕاستکردنەوە - پاش سازکردنی- نەبێت.

ڕەخنەسازەکەمان دوابەدوای ئەو تەرازووە بە شێوازێکی هێدی ڕەخنە لە هەڵبەستەکەی مامۆستا محەمەد ئەمین بەگی جاف دەگرێت و دەڵێ:

لە ژمارە ٢ی ساڵی پێنجەمی گەلاوێژدا لەژێر ناونیشانی (نیشتمانی)دا هۆنراوێکی محەمەد ئەمین بەگمان بەرچاوکەوت، هەرچەندە ئەم شیعرانەی لە دەروونێکی پڕ سۆز و گوزارەوە دەرچوو بوو، دڵێکی برینداری بە بێچووە شێرە نیشتمانییەکانی کورد نیشاندەدا، بەڵام لە لایەنی ئەدەبییەوە چاوی لێناپۆشرێ، ئێجگار لەبەرئەوە، کە محەمەد ئەمین بەگ دۆستێکی بە نرخمە حەزمکرد لە پێش ئەوەدا، کە یەکێکی تر توانج لە شیعرەکانی بگرێ من نارێکییەکەی بخەمە بەرچاو و لایشم وایە لێم ئەبوورێ.[1]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە مامۆستا مەلا جەمیل سۆزی پەتی بە سەرچاوەی هۆنراوەی سەرکەوتوو دانانێت و ناوەڕۆکی نیشتمانی ڕووت بە پێوانەی هۆنراوەی ڕاستەقینە تەماشاناکات. بەڵکوو داوا دەکات کە لایەنی ئەدەبی پێویستە هەمیشە پەیڕەوی کرابێت.

مامۆستای ناوبراو لە وتارەکەیدا باسی لایەنی ئەدەبی ناکا و بە دووروودرێژی بناغەکانی یەکالاناکاتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئاشکرایە، کە مەبەستی لە لایەنی ئەدەبی ئەو بناغانەی پێناسەی هۆنراوەیە، کە لەمەوبەر بە دەربڕینێکی وێژەیی پێشکەشیکردبوو.

سەرئەنجام ڕەخنەسازەکەمان بە زاراوەی ئێستامان پێشنیازدەکات، کە دەبێت هۆنراوەی واقیعی لایەنی هونەری تێدا فەرامۆشنەکرێ.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١

## • ڕێزمان و ڕەخنەسازی

مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی پاش ئەوەی بەو چەشنە مەرجەکانی هۆنراوەی ڕاستەقینەی خستەڕوو، لەبەر تیشکی دەستووری ڕێزمانی کوردیدا ڕەخنەی لە دەربڕینی دێڕی دووەمی هەڵبەستەکە گرت.

ئەم ڕەخنەگرتنە ـ بە لای ئێمەوە ـ پێوانەیەکی گرنگی ڕەخنەسازی سازدەکات، چونکە دەستووری ڕێزمانی هەر نەتەوەیەك گیانی زمانەکەیەتی، پێویستە لەسەر هەستیاران بە وردی پەیڕەویبکەن. هەروەها ئەم پێوانەیە ئەوە دەگەیەنێ، کە نابێت قسە و ئاخاوتنی ڕۆژانە بکرێ بە کەرەسەی هۆنراوە، بەڵکوو دەبێت زمانی یەکگرتوو، کە ڕێزمانی تایبەتی خۆی هەیە تاقە ڕێگای هەست و بیرۆکەی هەستیاران بێت.

ئەم پێوانەیەی ڕەخنەسازەکەمان هەڵبەت مەسەلەیەکی ڕەخنەسازیی گرنگ دەهێنێتە کایەوە، کە لە وێنەی پرسیارێکدا دەپرسێت: هەستیار چلۆن توانی پەیڕەوی دەستوورەکانی ڕێزمانی نەتەوەکەی بکات؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە بە لای ئێمەوە لەوەدا دابیندەکرێت، کە هەستیاری هاوچەرخ پێویستە لە ڕووی ڕێزمانەوە پەیڕەوی سامانی نەتەوەکەی بکات لە هۆنراوەی دێرین و پەخشانی هونەری و پەندی پێشینان.

جگە لەم پێوانەیە ڕەخنەسازەکەمان مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لە ڕوانگەی مەنتیقەوە ڕەخنە لە هەڵبەستە هەڵسەنگێنراوەکە دەگرێت و دەڵێ: سەرنجێکی ئەم نیوە شیعرەش بدەن:

ڕاپەڕن هەڵسن لە خەو نووستن نەتیجەی نەگبەتە

برام.. نووستن سەرەتا و نیشانەی نەگبەتییە، نەگبەتی ئەنجامی تەمەڵییە.[1]

کەوابوو: هەستیار دەبێت لە سازکردنی واتاکانیدا ئاگای لە پەیوەندیی نێوانیان ببێت و بە جۆرێ پێشکەشیانبکات، کە هۆشمەندی پێیان قایلبێت.

## • مامۆستا ا.ب هەوری و وتارەکەی د. یوسف هەیکەل

د. یوسف هەیکەل وتارێکی ڕەخنەسازی بە زمانی عەرەبی نووسیوە و لە گۆڤاری ........ بەرگی ۲ ژمارە ٤ لە ساڵی ١٩٤٤ دا بڵاوکردۆتەوە بە عەرەبی و لە لایەن خوالێخۆشبوو مامۆستا ا. ب هەورییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی و لە ژمارە ١٠ ی گۆڤاری گەلاوێژی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٤ ی زایینی بڵاوکراوەتەوە.

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢

وتارەکە بە ناونیشانی ( تەئسیری ڕەخنەگری لە سەقافەتم ) دا، کراوە بە کوردی و ئەم بابەتانەی خوارەوە دەگرێتەخۆی:

- چەشنەکانی ڕەخنەسازی.
- نموونەیەك بۆ هەر چەشنێك.
- سوودی ڕەخنەسازی.
- هەڵوێستی ڕۆشنبیران و خوێنەران لە چەشنەکانی ڕەخنەسازی.

نرخی وەرگێڕانی ئەم وتارە کە نزیکەی ٣٧ ساڵ لەمەوبەر بڵاوکراوەتەوە لەوەدا دەستنیشانەکرێت، کە بە ڕوونی ڕەخنەسازی ڕاستەقینە لە سەپاندنی بیروڕای کەسی جیادەکاتەوە و دووپاتیدەکاتەوە، کە هەموو ڕەشکردنەوەیەکی لاپەڕە بە ڕەخنەسازی ناژمێردرێ، بەڵکوو پێویستە ڕەخنەساز پەیڕەوی چەند دەستوورێك بکات، بۆئەوەی بەرهەمەکەی بە ڕەخنەسازی لەقەڵەمبدرێ.

جا کەوابوو با پێکەوە بزانین ئەم مەسەلانە چلۆن باسکراون؟

## • چەشنەکانی ڕەخنەسازی

د. یوسف هەیکەل لە وتارەکەیدا ڕەخنەسازی بەسەر دوو چەشندا دابەشدەکات..

**چەشنی یەکەم: النقد الذاتی**

**چەشنی دووەم: النقد الموضوعی**

مامۆستا ئەبوبەکر هەوری، ئەم دابەشکردنەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و وتوویەتی:

نووسەرەکان بەری ڕەخنەگری من ئەکەن بە دوو کەرتەوە:

**یەکەم: ڕەخنەگری خۆیی (ذاتی)**

**دووەم: ڕەخنەگری جێگەیی (موضوعی)**[1]

لەم وەرگێڕانەدا، زاراوەی (الموضوعی) بە زاراوەی (جێگەیی) کردووە بە کوردی، کە هەڵەیە، چونکە وشەی ( جێگا )ی کوردی لە واتادا بەرامبەر بە زاراوەی (الموضع) دێت، نەك زاراوەی ( الموضوعی ).

هەر چۆنێك بێت با بزانین ڕەخنەسازی خۆیی چییە و بە چ نموونەیەك روونکراوەتەوە؟

وەرگێڕەکەمان ( ا. ب. هەوری ) لەم ڕووەوە نووسیوێتی:

ڕەخنەگری خۆیی ئەو ڕەخنەگرییەیە، کە ڕەخنەگر بە پێی سوود و قازانجی خۆی و

---

[1] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١٠، ساڵی ١٩٤٤/ پێنجی تشرینی یەکەم ل ٥٧

توانـای خوێندنـی ڕەخنەکە ئەگرێ، بێجگە لەمەش ناوی ڕەخنەلێگیراو دەخلێکی گەورەی هەیە بە سەرەوە. ئەم جۆرە ڕەخنەگەرییە شایانی ستایش و جوان نیشاندان نییە، چونکە بە پێی میقداری تەئسیری ڕەخنەگرەکەیە لەو نووسینەوە، یان لەو هەڵبەستە. بۆیە زۆر جار ئەم جۆرە ڕەخنەگرانە تووشی هەڵەی گەورە گەورە ئەبن بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی، کە بۆی ئەچن، ڕەخنەگر تا بە توانا و بە دەسەڵات بێ لە زانیندا ڕەخنەکەی زیاتر نزیکی ڕاستییە.

نموونەی ڕوونکەرەوەی ئەم چەشنە ڕەخنەسازییە لە وتارەکەدا بەم جۆرە بووە:

(مەسـەلەن ڕەخنەگرێکی بیر و هۆشـی تازە، کتێبێکی نووسـەرێکی بیر و هۆش کۆن ئەخوێنێتـەوە هیـچ خۆشـی و لەزەتێکی لێوەرناگرێ و جوانییەکی تیا نابینێـت، لەبەرئەوە با کتێبەکـەش جـوان بـێ بـە لای ئـەوەوە ناشـیرینە و بە خراپی نیشـانی ئەدا، بـەڵام ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەوە کتێبەکە بیر و هۆشی تازە بووایە، ئەوسا ڕەخنەگر خۆشی و لەزەتی تیا ئەدی و بە جوانی نیشانی ئەدا.) [1]

بەرامبەر بە ڕەخنەسازی موچوعی وەرگێڕەکەمان ڕەخنەسازی ( جێگەیی ) وەردەگێڕێ و دەڵێ:

(ڕەخنەگری جێگەیی لەپێش هەمـوو شـتێکدا تەماشـای تەئسـیری فەنەکە ئەکرێ بەو ڕەنگەی خاوەنەکەی ویسـتوویەتی نەك بەو ڕەنگەی ڕەخنەگر ئەیەوێ لەگەڵ ئەو عامـل و زروفانەی کە لە موحیتی خاوەن فەندا کۆبوونەتەوە لە وەختی دروسـتکردنی ئەو فەنەدا، دوای ئەوە هەوڵئەدرێت بۆ دەرخستنی میقداری توانای خاوەن فەنەکە، تا چ دەرەجەیەك سەرکەوتووە لە پێگەیاندن و دروستکردنی ئەو فەنەدا)[2]

نموونەی ڕوونکەرەوەی ئەم چەشنە ڕەخنەسازییە لەوەدا دەستنیشانکراوە، کە دەڵێ:

( ڕەخنەگری جێگەیی وەك قازییەك وایە، کە خۆی لە هەموو ئارەزوو و تیشکی شەخصی دوورئەخاتـەوە و ئینجـا دەسـت ئـەکات بـە ڕەخنەگرتن لە کتێبەکە.. لە پێش هەموو شـتێکدا تەماشـای دەرەجەی زانینی نووسـەر و مەبەسـی لە دروسـتکردنی ئەو فەنە ئەکات لەگەڵ بەراوردکردنی بە نووسین (مشابە) بەو نووسینە ئینجا حوکم ئەدات بە چاکی وەیان بە خراپی. ئەم جۆرە ڕەخنەگرانە بە زۆری وەك (مرشد) وایە بۆیە یەکە یەکە نوقتەی چاك و نوقتەی خراپ نیشانی ڕەخنە لێگیراو و خوێندەواران ئەدەن ).[3]

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨

2 هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨

3 هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩

لەبەر تیشکی ئەم دەقانەدا، کە بە کورتی باسی ڕەخنەسازیی خۆیی و ڕەخنەسازیی جێگەیی - بابەتی دەکەن دەتوانین مەسەلەکە بەم خاڵانەی خوارەوە ڕوونبکەینەوە:

**یەکەم:** ڕەخنەسازیی خۆیی، بەرهەمێکی کەسییە و تاڕاددەیەکی فرە بیروڕا و بۆچوونی ڕەخنەساز دەنوێنێ، کەچی ڕەخنەسازیی بابەتی بەرهەمێکی زانستییە بە دەستوور و بنواشەی زانستەکانی زمان و ڕێزمان و ڕەوانبێژی و دەروونی سازدەکرێت و سازکەرەکەشی تاڕاددەیەکی زۆر بیروڕا و بۆچوونەکانی خۆی لەبەر هیچ هۆیەکی نازانستی نانوێنێ.

**دووەم:** ڕەخنەسازیی خۆیی وێژە و هونەرە، بەڵام ڕەخنەسازی بابەتی زانست و زانیارییە.

**سێیەم:** ڕەخنەسازیی خۆیی بۆ ڕاستی کارەکەی ئەنجامنادات بە دەستەوە، بە پێچەوانەی ڕەخنەسازیی بابەتییەوە ئامانجی ڕاستینەی خزمەتکردنی ڕاستییە.

**چوارەم:** ڕەخنەسازیی خۆیی لە زیانگەیاندن یاخود لە سوودنەگەیاندن بەدەرنییە، بەڵام ڕەخنەسازیی بابەتی لە هەموو حاڵەتێکدا جۆرە سوودێکی هەیە.

## • سوودی ڕەخنەسازیی

وتارە وەرگێڕاوەکە هەرچەند لە باسکردنی چەشنەکانی ڕەخنەسازی و هێنانەوەی نموونەکانیان باسی سوودی ڕەخنەسازیی کردووە، بەڵام دیسانەوە بە چەند دێڕێك ئەم سوودەی ڕوونکردۆتەوە و وتوویەتی:

ڕەخنەگەریی تەئسیرێکی زۆر گەورەی هەیە بۆ ئەدەبیاتی میللی ئەگەر ڕەخنەگەرییەکە خۆیی بوو بەرە بەرە ئەدەبیاتی ئەو میللەتە وەك کلۆەی ئاگرێك کە هیچ خۆشنەکرێ و جار جاریش ئاوی بکرێتەسەر کزئەبێ و زۆری پێناچێت ئەکوژێتەوە.

خۆ ئەگەر ڕەخنگەرییەکە جێگەیی بێ ئەبێ بە عامیلێکی یاریدەدەر بۆ بەرزبوونەوە و پێگەیشتنی ئەدەبیاتی ئەو میللەتە.[1]

لەم دەقەدا ئاشکرایە، کە ڕەخنەسازیی بابەتی بە هۆیەکی کاریگەر و بەرهەمێکی بەسوود پیشاندەدرێ. ڕەخنەسازیش بە ئەندازەی وێژە لەقەڵەمدەدرێ و دواکەوتن و پێشکەوتنیشی بە ئۆباڵی ئەو ئەبێت. بە مانای ئەوەی ڕەخنەساز هەروەکوو دەڵێن وێژەرێکی سەرنەکەوتوو نییە، بەڵکوو زانایەکە و بە چەند هەنگاوێك لە پێش وێژەرەوە دەڕوات و ڕابەریی دەکات و بەرهەمەکانی بە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن پێدەگەیەنێ و دەخەمڵێنێ.

ئەگەر چاوێك بە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی ساڵانی سی و چلی زایینیدا بخشێنینەوە،

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩

تێبینیدەکەین، کە زۆرانبازییەکی توند لە نێوان ڕووناکبیرە کوردەکان بەرپابووە و تاقم تاقم بە قەڵەم دەستەویەخە وتاریان نووسیوەتەوە و هەر تاقمێکیان پشتگیری ویژەرێك، یان بەرهەمێکی ویژەیی کردووە و دژ بە ویژەرێکی دیکە و بەرهەمێکی ویژەیی وەستاوە.

سەرئەنجام ڕەنگە خوێنەری بێ لایەنیش لەم بارە مێژووییە وەرسوڕماوبێت و پرسیارێکی گوماناوی دەرحەق بوونی ڕەخنەسازیی لە کۆڕی ڕۆشنبیریی کوردیدا بەرپاکردبێت و بپرسێت. ئایا هەڵوێست دەرحەق بە ڕەخنەسازیی و ڕەخنەساز دەبێت چلۆن بێت؟

وتارە وەرگێڕدراوەکە ناڕاستەوخۆ وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە و وتوویەتی:

(جا بۆیە لازمە خوێندەوارانی میللەت باش سەرنجبدەنە ئەو ڕەخنانەی کە ئەگیرێت، ئەگەر هاتوو زانرا ڕەخنەکە خۆییە بەرهەڵستیبکەن و نەیەڵن بەو جۆرە کەسانە بە نەشارەزایی میللەت بەو هەردەی هەزار بە هەزارەدا هەڵبگێڕن بەناوی خزمەتی ئەدەبیاتەوە.)[1]

کەوابوو: پێویستە خوێنەری کورد بەشداری ئەو زۆرانبازییە بکات و ڕێگا بە توانجگرتن و توانجگەران بگرێت و نەهێڵێ بەناوی زانست و ڕۆشنبیرییەوە ویژەی نەتەوەکەمان تێکبدەن.

ئەم بانگەوازە هەڵبەت ئاواتێکە و نزیکەی چل ساڵ لەمەوبەر بەرزبۆتەوە و هیواداریین لەم ڕۆژانەدا بێتەدی.

## • دڵداری هەستیار لەنێو گڕی ڕەخنەسازیدا

مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەروەکوو لەمەوبەر لێیدواین، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا ( شعر و ئەدەبیاتی کورد ) کە زۆربەی بەشەکانی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکردۆتەوە، بۆچوونی ڕەخنەسازیی تایبەتی خۆی هەبوو دەرحەق بە هەستیارە دێرین و هاوچەرخە کوردەکان.

ئەم بۆچوونە هەروەکوو لە ژمارەکانی ساڵی ١٩٤٤ی زایینی گەلاوێژدا دەردەکەوێ، زۆرانبازییەکی ویژەیی و ڕەخنەسازیی توندوتیژی بەرپاکردو خوێنەر و ڕۆشنبیر و زانا کوردەکانی کرد بە دوو تاقمەوە:

**تاقمی یەکەم:** بەرەنگاری بوونەوە و بەرپەرچی بیروڕاکانیان دایەوە و وتارگەلێکی ڕەخنەسازییان لەم ڕووەوە نووسییەوە.

**تاقمی دووەم:** بە پێچەوانەی تاقمی یەکەمەوە چاکی کۆششیان کرد بە لادا و پێنووسیان لە کۆڕی بەرگریکردن لە بیروڕاکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی خستەکار.

ئێمە بۆ بووژاندنەوەی ئەم بزووتنەوە ڕەخنەسازییە، کە تەمەنی نزیکەی ٣٧ ساڵ دەبێت،

---
١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩

بیروڕاکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەربارەی هەستیاری جوانەمەرگ (دڵدار) یەکالآدەکەینەوە و زۆرانبازییەکەی مامۆستا دەخەینەڕوو، چونکە ئەم زۆرانبازییە لەم ڕۆژانەشدا بە حەق یان ناحەق بەرپادەبێت و پێویستی بە هەڵسەنگاندن هەیە، بە هیوای ئەوەی لەبەر تیشکی ڕێبازێکی ڕەخنەسازیی زانستیدا هەڵیسەنگێنین و سنوورێکی بۆ دەستنیشانبکەین.

## • زەمینەی زۆرانبازیی ڕەخنەسازی

زەمینەی ئەو زۆرانبازییە ڕەخنەسازییەی، کە دەربارەی هەستیاری جوانەمەرگ (دڵدار) خراوەتەڕوو لە چوار بۆچوونی ویژەیی پێکهاتووە:

**یەکەم:** بۆچوونی مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەربارەی دڵدار، کە لە ژمارە ٩ ی مانگی ئەیلوول و ژمارە ١٠ ی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ ی زایینی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها لە بەرگی دووەمی شعر و ئەدەبیاتی کوردیدا لەچاپدراوەتەوە.

**دووەم:** پێشەکییەکی سەردەستەی نووسەرانی گۆڤاری گەلاوێژ دەربارەی بۆچوونی ڕەخنەسازێکی کورد بە نازناوی (جیم) ەوە، کە لە ژمارە ١ ی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی پێنجەم - کانوونی دووەمی ١٩٤٤ ی زاییندا بڵاوکراوەتەوە.

**سێیەم:** بەرپەرچدانەوەی مامۆستا ڕەمزی قەزاز دەربارەی بۆچوونەکەی مامۆستا (جیم)، کە لە ژمارە ٣ ی ساڵی پێنجەمی گۆڤاری گەلاوێژ مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٤ دا لەچاپدراوە.

**چوارەم:** بەرگریکردنی دڵداری هەستیار لە هەڵبەستەکانی، کە لە ژمارە ٨ی گۆڤاری گەلاوێژدا ساڵی ٥ مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٤دا بەرچاوەدەکەوێ.

## • بۆچوونە ڕەخنەسازییەکانی مامۆستا ڕەفیق حلمی

ڕەفیق حیلمی دەربارەی دڵداری هەستیار لە سەرەتادا سەرگوزشتەی ژیانی دەگێڕێتەوە و سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە ناوی ( یونس ڕەئوف )ە و لە ٢٢ ی شوباتی ١٩١٧ ی زایینی لە کۆیە هاتۆتە دنیاوە.

ئەوجا باسی سەرچاوەی هەستیارێتی و پلەی هونەری دەکات و دەیژێ :

(دڵدار لاوێکی زرنگ و خوێنگەرمە، خاوەن بیرێکی ژیرانە و پیرانەیە، گیانێکی خاوێن و ڕوحێکی بەرزی هەیە، هەر لە منداڵییەوە تووشی گێرەوکێشە و تەنگوچەڵەمەی زەمانە

هاتووە و ژیانێکی کەم و زۆر سەخت و تاڵ و بە ئەندێشەی ڕابردووە. لەبەر ئەمە ئاشنایی سارد و گەرمیی دنیایە و جێگەی هیوای دوارۆژە، شاعیرێکی خواییە و ئیلهامی شاعیریی لە هەوای سازگار و لە بەرزیی شاخەکانی نیشتمانەوە وەرگرتووە.

هەرچەن بەهۆی منداڵی و خەریکبوون لەگەڵ خوێندن زۆری شیعر دانەناوە و ئیمڕۆ لە شاعیرە ناودارەکان ناژمێردرێت، بەڵام بەو شیعرانەدا، کە هەیە و بەرچاوی ئێمە کەوتووە و بە نور و جەوهەری ئەو زەکایە وا کە لەو چەند شعرەدا دەبینرێت جێگەی شك نییە، کە دڵدار شاعری عەصری و ناوداری دوارۆژ ئەبێ ).[1]

دوابەدوای ئەمە مامۆستا ڕەفیق حیلمی دووبارە دەچێتەوە سەر هەستیارێتی دڵدار و سروشتی هەڵبەستەکانی و پلەی هونەری دەستنیشاندەکات و دەڵێ:

(دڵدار بەلای ئێمەوە شاعیرێکی زۆر بالایە، ئەگەر لە هەندێ شیعریدا ناپوختەیی هەبێت، بەهای شاعیرێتی پێ ناشکێت، مناڵێك کە هەموو ژیانی لەگەڵ خوێندن ڕابواردبێ و هێشتا لە خوێندنی ڕەسمی ڕزگاری نەبووبێ ناتوانێ ببێ بە شاعیرێکی کەسبی.)

بەڵام دڵدار هەر لە مەکتەبی ئیبتیدائییەوە دەستیکردووە بە شیعروتن و لەم مەیدانەدا گۆی هونەری بردۆتەوە. لەبەرئەوە ئێمە کەموکورتی شعرەکانی ئەومان نەگرتۆتە پێشچاو و ئیمانمان هێنا بەوە کە شاعرێکی فطری و خواداوە. هیچ گومانی تیا نییە، کە فرسەتێکی بچووك و تەبعێکی ئەدەبی کەم، دڵدار دەگەیەنێتە ڕیزی شاعرە گەورەکانی کورد).[2]

ڕەخنەسازەکەمان مامۆستا ڕەفیق حیلمی پاش ئەو تێبینیانە باسی شێواز و ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی دڵدار دەکات و لەگەڵ هەستیارە سەنعەتکارە کوردەکاندا بەراوردیدەکات و دەڵێت:

( ئەوەیش لەوێ ڕاوەستێ کە لە نوقتەی فکری قووڵ و خەیاڵی وردەوە ئێستەیش دڵدار گەلێ لە ژوور ئەو شاعرانەوەیە، کە هەندێ وشە و تەعبیری وا دەهۆننەوە و ئەیکەن بە نەزم کە بە دیمەن و بیستن شیرین و ڕەنگینن، بەڵام لە حەقیقەتدا پووچ و بێکەڵکن.

ئێمەش ناتوانین لێرەدا هەندێ شعری دڵدار بنووسین کە زادەی بیرێکی قووڵ و زەکایەکی ئێجگار تیژن و بەلاشمانەوە ئەو شیعرانە وێنەیەکی ڕوون و ڕەوانی تەفکیری عەصرییە، بەڵام زۆر جێی ئەسەفە، کە پەیوەندیی گرانی – تقالید - ئیمڕۆ مانعی بڵاوکردنەوەمانە.

ئەتوانین بڵێین، کە ئەوەی دڵدار و شاعیرێتی بڵندی دڵداریشی بە ئێمە ناسی ئەو جۆرە شعرانەیەتی، کە لە هۆنینەوەی وشە و تەعبیری ڕەنگاوڕەنگ و ڕێکخستن و یەکخستن و

---

[1] گزگلری گەلاوێژ، سالی ٤/ژمارە ٣، مانگی ئەیلول - سالی ١٩٤٣، ل ١-٢

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢ - ٣

قافیە زیاتر کۆڵینەوەی فەلسەفەی ژیان و تەبیعەت ئەخاتە بەرچاومان و تەرزی تەفکیری ئەم شاعرەمان تێئە گەیەنێ، کە بە عومر منداڵ و بەهۆش و لێکدانەوە گەورە و پێگەیشتووە)[1]

پرسیاریش لێرەدا ڕەنگە بپرسێت: کە دڵداری هەستیار بەو جۆرە بێت، ئایا لە مێژووی وێژەی کوردیدا لە هیچ هەستیارێکی کورد دەچێت؟

مامۆستا ڕەفیق حیلمی دیارە ئەم جۆرە پرسیارە لە مێشکیدا هەبووە، بۆیە وتوویەتی:

(دڵداری هاونیشتمانی حاجی قادری شاعری بەناوبانگی کورد لە شعر وتنیشدا پەیڕەوی ئەم هاونیشتمانەی خۆی کردوە و لەسەر شوێنێ ئەو ڕۆیشت)[2]

لەبەر تیشکی ئەم دەقانەدا بۆ دەستنیشانکردنی بۆچوونە ڕەخنەسازییەکەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەربارەی دڵداری هەستیار، دەتوانین لە ڕوانگەی ڕەخنەسازیی نەزەرییەوە ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاوبکەین:

**یەکەم:** دڵدار بەلای مامۆستا ڕەفیق حیلمییەوە هەستیارێکی خواکرد و فطرییە و تا ئەو سەردەمەی باسیکردووە، هێشتا نەبوو بوو بە هەستیارێکی کەسبی.

مانای ئەم بۆچوونەش بە زاراوەی ڕەخنەسازیی ئێستامان، ئەم هەستیارە کوردە بەر لەوەی هونەرمەندی سەنعەتکار و جوانی ساز و کێش و سەروا دروستکەر بێت، وێژەرێکی خاوەن بیرۆکە و پەیامدار بووە. هەستیاری ناواش بێگومان لەناو کاروانی هەستیارە کوردەکاندا دەنگێکی تازەی هەیە و تاڕاددەیەکی زۆر زانستەکانی ڕەوانبێژی و وشەسازی فەرامۆشدەکات.

**دووەم:** ئەم هەستیارە چاوەڕێی بلیمەتی لێدەکرێت و هێشتا خۆی نەگەیاندۆتە پلەی بەرزی هەستیارە کوردە ناودارەکان.

**سێیەم:** ئەم هەستبارە - واتە دڵدار- هەڵبەستی ناوەڕۆك عەصری هەیە، مامۆستا ڕەفیق حیلمی بڵاوینەکردۆتەوە، بە بیانووی ئەوەوە، کە لەگەڵ نەریت و تەقالیدی ئێستای کورددا ناگونجێت.

ئەم خاڵە ڕەخنەسازییە بەلای ئێمەوە تێبینییەکی ڕەخنەییان لەسەر هەیە، ئەم تێبینییەش ئەوەیە مامۆستا ڕەفیق حیلمی خۆی هەستی بەوە کردووە، کە دڵدار لە هەڵبەستەکانیدا کەموکورتی بەرچاودەکەوێ، کەچی لە هەمان کاتدا پاکانەی بۆ دەکات و هۆی ئەم بارەی دەگەڕێتەوە سەر خەریکبوونی لەگەڵ خوێندن و کەمی تەمەنی.

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢ - ٣

2 گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١٠/ ساڵی ٤، تشرینی یەکەمی ١٩٤٣، ل ١٥

## • زانستەکانی وێژە لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانی دڵداردا

مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەروەکوو وتمان پاش ئەوەی لە ڕوانگەی ڕەخنەسازیی نەزەرییەوە پلەی هونەریی دڵداری دەستنیشانکرد، دەستیکرد بە شیکردنەوەی ڕوخساری چەند نموونەیەك لە بەرهەمەکانی، لەم کۆڕە پراکتیکی و تەتبیقییەدا پشتی بە زانستەکانی وێژە بەست. بۆ بەڵگە هەڵبەستێکی دڵداری تۆمارکرد، کە بەم دێڕە دەستپێدەکات:

دڵ بە دوی ئەفسانە کەوت و وای ئەزانی وا ئەبێ
ئیشی دنیـــا ڕەنجی پێناوێ بـە خۆی کۆتا ئەبێ

ئەوجا لە ڕووی ناوەڕۆك و ڕوخسارەوە هەڵیسەنگاند و وتی:

( ئەم شعرانە، کە عیلاجی هەندێ دەردی کۆمەڵایەتی و نیشتمانیمان پیشاندەدا، هەروەکوو لە لایەن فکرەوە پوختە و بە کەڵکە لە نوقتەی ئەدەبیاتیشەوە پەسەند و بەهادارە. لە صنعەتی شعر کەم و زۆر بەشدارە. جارێ لە لایەن وەزن و قافیەوە هیچ کەموکورییەکی نییە یا قافیەکانی زۆر ڕێك و جوان و شاعرانەیە. نیوە شعرەکانی پێنجەم و هەشتەم "جیناسێکی تام"ی زۆر جوانی تیایە. لە بەیتی دوای مەتلعەکەشدا تەشبیە و ئیستعارەیەکی شیرین و شاعرانەی هەیە و بەکورتی شعرەکانی مەتین و ئاهەنگدارە ).[1]

لەبەر تیشکی ئەم دەقەدا کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی جگە لە نرخپێدانی هەڵبەستەکە لە ڕووی ناوەڕۆك و بەدیهێنانی ئامانجی کۆمەڵایەتییەوە، پشت بە زانستی کێش و سەروا دەبەستێت و بەرهەمەکە لە سووچی عەرووزەوە هەڵدەسەنگێنێ. هەروەها لە لایەن جوانکارییەوە بە زاراوەکانی زانستی ڕەوانبێژی عەرەبی وەکوو تەشبیە و ئیستیعارە جوانی چەند دێڕێکی هەڵبەستەکە دەخاتەڕوو.

ئەم ڕاستییە ئەوە دەگەیەنێت، کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی بە زانست، نەك بە مەیل و ئارەزووی کەسیی نرخی هونەریی دڵداری هەستیاری زانیوە، هەرچەندە دەبێت لە هەمان کاتدا تێبینیبکەین، کە ئەم ڕەخنەسازە کوردە نەمرە بە شێوازێکی شیکەرەوە ئەو زانستانەی بەکارنەهێناوە، بەڵکوو بەهێما و ئیشارەت سەرەنجی خوێنەرەکانی بۆ ئەو لایەنە جوانکارییانە ڕاکێشاوە.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو

## • دڵدار و هۆنراوەی چیرۆک

مامۆستا ڕەفیق حیلمی بۆ ئەوەی بە ڕوونی و بە بەڵگەی جۆر بە جۆر نرخی ناوەڕۆکی هەڵبەستەکانی دڵدار بچەسپێنێ و قەناعەت بە خوێنەرەکانی بکات، هەڵبەستێکی "دڵدار"ی شاعیر بەناونیشانی قەل و ڕێوی دەهێنێتەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

### قەل و ڕێوی

ڕۆژێ لــە ڕۆژانــا قــەلــێ
وەستا لـە سـەر کۆلکـە چڵـێ
سـەلکێ پەنیـری لـە دەنـووک
ویستـی کـە بیخـوا لـە هەلـێ
ڕێــوی بــەلایـدا تێپـەڕی
چاوی بـە قـەل کەوتـو مەلـێ[1]
ویستـی بــەفێڵ لێـی بسەنێ
دەسپێکــرد پیــا هەڵبڵــێ[2]
وتـی ئـەی بولبولــی زەمــان
ئـەی نەغمەخوانـی سـەر تەلێ
بیستومــە مــن ناوبانگــی تــۆ
تــووخــوا گــۆرانیــم بــۆ بڵـێ
قــەل وەختــێ زاری داپچــڕان
پــەنیری کەوتــە بــن تــەلــێ
ڕێــوی پــەنــیری قــۆستــەوە
بـەڵام لـە پێــش ئـەوەی هەلێ
وتـی: ئەوجـا بـەسـە نـەفـام
گوێـت لـێ بێ ڕێوی بۆت بڵــێ
وەختــێ شتێکــت گرتــە دەم
کــەر مــەبــە گۆرانــی مەلێ
ئەمــیش کــەرانــەبێ کــەوا
تــەفــرە دراوی تــۆ چــەلــێ[3]

---

١ مەلێ = مەگەر = تومەز
٢ پیا هەڵ بڵێ = پەسنیا هەڵبدا = تیر
٣ چەڵ = پەشێوی قاقڕیان بە (چەڵ) دەڵێن

مامۆستا ڕەفیق حیلمی پاش هێنانەوەی ئەو هەڵبەستە وتی:

( مەوزوعی ئەم فکرە لە زمانی بێگانەوە وەرگیراوە و بێکەسی شاعری عەصری سلێمانیش بە وێنەیەکی زۆر شیرین خستویەتییە سەر زمانی کوردی. وەرگێڕانەکەی دڵداریش لە جوانیدا لە هینەکەی بێکەس کەمتر نییە و دەستکارییەکی کەمی کە تیا دەبینرێت، حوسنێکی تری داوە بە فکرەکە، واتە هەروەکوو کچێکی دولبەری بێگانە بەرگێکی نایابی کوردی لەبەرکرابێ، جوانی و شیرینییەکەی ڕەونەقێکی زیاتری پیانەکا و زووتر ئەچێتە دڵی لاوێکی کوردەوە، ئەم فکرە بە لای منەوە لە دوای ئەوەی، کە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی جوانتر و شیرینتر بووە )[1]

لەبەر تیشکی ئەم دەقەدا ئاشکرایە کە ڕەخنەسازەکەمان پەنادەباتە بەر پێوانەی زانستی وەرگێڕان و ڕێژەی بەراوردکاری و پلەی هونەریی کارەکەی دڵدار دەچەسپێنێ، بەڵام چەسپاندنەکەی بە چەشنێکی بڕیاری کتومت ئەنجامداوە.

بە لای ئێمەوە دەبوو مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەڵبەستەکەی فایەق بێکەس و ناوەڕۆکی هەڵبەستە بیانییە وەرگێڕاوەکەی بهێنایە و لەتەك ئەو هەڵبەستەی دڵداردا بەراوردیانبکات، بۆ ئەوەی سەرئەنجامەکە لە وێنەیەکی شیکراوەی زانستیدا بەرچاوبکەوتایە.

## ● دڵدار و هۆنراوەی دڵداری

مامۆستا ڕەفیق حیلمی بۆ ئەوەی حوکمی بەسەر دڵداری شاعیردا، هەموو بابەتەکانی هۆنراوە بگرێتەوە، تەنانەت هەڵبەستی دڵداری ئەم هەستیارەشی شیکردۆتەوە، بۆ نموونە دەربارەی غەزەلێکی بە ناونیشانی: "ئەی بای شەماڵ" وتویەتی:

پۆستەی هەوایی ! پەیکی موژدەبەر !
ئەگەر هاتوو ڕێت کەوتە کۆی دلبەر

چەن شاعرانەیە و چەندە وەسفێکی شیرینە بۆ بای شەماڵ، هەروەها ئەم بەیتەش کە دەڵێ:

مەوێستە تاکو لای شۆخێ کەوا،
تیری نیم نیگای لە دڵما ڕووا !

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٥

هەر بە شاعیرێکی سەنعەتکار و شارەزای ئەدەب بەهای بۆ دادەنرێ.. لە بەیتی:

جار جاریش لە دوای ناڵەی دڵی زار،
فرمێسک ئەڕژێنێ وەک هەوری بەهار !

سەنعەتێکی مەقصود هەیە، واتە بە تایبەتی ( ڕژاندنی فرمێسک )ی دوای (ناڵەی دڵی زار ) خستووە. تاوەکوو دەسەڵاتی شاعر بەسەر مەغزای شعرەکەیا وەکوو ( حوکمی تەبیعەت) بەسەر هەوری بەهاردا جاری بێ.[1]

لێرەدا ئاشکرایە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی شێوازی سەنعەتکار و جوانکاری و ڕازاندنەوەی وشەی بە نیشێکی هونەری لەقەڵەمدەدات و دڵداری لاسایی‌کەرەوەش وەکوو بابەتێکی سەرکەوتووی هۆنراوە دەزانێ.

ئەم جۆرە بۆچوونە ـ بێگومان ـ جێگای مشتومڕە و هەموو ڕەخنەسازێك پێی قایلنابێت، چونکە لاساییکردنەوە لە هونەری هۆنراوەدا لە داهێنان و ئیبداعەوە دوورە، بۆیە مامۆستا ( ج ) هەروەکوو لەمەودوا دەبینین، ئەم بۆچوونەی ڕەخنەسازەکەمان پووچەڵدەکاتەوە و سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە چەمك و مەفهومی هۆنراوە هەروەکوو لە نامیلکەی ( یادگاری لاوان ) دا چەسپاوە ئەو چەشنە هەڵبەستانە بە هۆنراوە نازانێت.

جا مامۆستا ( ج ) چلۆن بەرەنگاری مامۆستا ڕەفیق حیلمی بووە و بە چ پێوانەیەك بەرپەرچی بۆچوونە ڕەخنەسازییەکانی داوەتەوە؟

## سەردەستەی نووسەرانی گۆڤاری گەلاوێژ و مامۆستا ڕەفیق حیلمی

بۆچوونە ڕەخنەسازییەکەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی بوو بە هۆی کاردانەوەیەکی وێژەیی لە لای نووسەرێکی کورد بە نازناوی ( ج ) کە وتارێکی بۆ گۆڤاری گەلاوێژ نارد. سەردەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤارە پێشەکییێکیان بۆ وتارەکەی مامۆستا ( ج ) نووسییەوە و وتیان:

(لەو زنجیرە وتارەی کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەسەر شیعر و ئەدەبیاتی کوردی نووسیویە و بەرە بەرە لە گەلاوێژدا بڵاوئەکرێتەوە، لە ژمارە "٩، ١٠"ی ساڵی چوارەمدا باسی دڵدار کرابوو، لەوساوە چەند جارێك لە گەلێ شوێنەوە بەرگوێی ئیدارەخانەی گەلاوێژدا دراوە، کە ئەیانەوێ لە باسەکەی دڵدار بکۆڵنەوە، تا ئەم جارەی دواییە بەناوی ( جیم )ەوە وتارێکی دوور و درێژمان بۆ هات، کە لە "شعر و ئەدەبیاتی کوردی" دواوە و لە شاعرێتی دڵدار - ی کۆڵیوەتەوە.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠

وا هەندێ لە وتارەکە شایانی ناوبردن بێ و بۆ نووسین بشێ لە لاپەڕەی لێکۆڵینەوەدا نووسرا، بەڵام ئەبێ ئاگاشمان لەوەبێ، کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە ژمارە ٩ دا لە باسی دڵدار دا خۆی وتوویەتی: هەرچەند بەهۆی منالّی و خەریکبوون لەگەڵ خوێندن، زۆری شعر دانەناوە و ئەمڕۆ لە شاعیرە ناودارەکان ناژمێرێت، بەڵام بەو شعرانەدا کە هەیە و بەرچاوی ئێمە کەوتووە و بەو نور و جەوهەرەی ئەو زەکایەدا، کە لەم چەند شعرەدا دەبینرێت جێگەی شك نییە کە دڵدار شاعیری عەصری و ناوداری دواڕۆژ ئەبێ ).[1]

لەبەر تیشکی ئەم دەقەدا دوو ڕاستیمان دەرحەق بە هەڵوێستی سەردەستەی نووسەرانی گەلاوێژ لەم زۆرانبازییە ڕەخنەسازییەدا بۆ ساغدەبێتەوە:

**ڕاستی یەکەم:** ئەوەیە کە گۆڤاری گەلاوێژ هەموو بەرپەرچدانەوەکەی مامۆستا ( ج ) ی بڵاونەکردۆتەوە.

ئەم ڕاستییەش ئەوە دەگەیەنێ کە گۆڤاری گەلاوێژ لەو کاتەدا بیروڕای تایبەتی لە وتارە بڵاوکراوەکانیدا هەبووە و بە چەشنێکی میکانیکی هەموو شتێکی لەچاپنەداوە.

**ڕاستی دووەم:** ئەوەیە کە سەردەستەی نووسەرانی گەلاوێژ لەم مەسەلەیەدا، مەیلی لەتەك مامۆستا ڕەفیق حلمی - دا بووە، چونکە بە جۆرێکی ناڕاستەوخۆ وەڵامی مامۆستا ( جیم )ی بەوە داوەتەوە، کە مامۆستا ڕەفیق حلمی لە وتارەکەیدا بە تەواوی دانی بە هەستیارێتی دڵداردا نەناوە.

## • مامۆستا (جیم) و بەرپەرچدانەوەی بۆچوونەکەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی

مامۆستا ( جیم ) بۆچوونە ڕەخنەسازییەکەی مامۆستا ( ڕەفیق حیلمی ) بەرپەرچدەداتەوە و وتوویەتی:

(ئەم جارە لەسەر و گوێلاکی باسێك ئاڵاوم، کەم کەس هەیە لە وێژەی بێ، ئەو باسە پڕ ئەندێشە و بەسامەش - شعر و ئەدەبیاتی کوردی - یە، کە بە قەڵەمی مامۆستا ڕەفیق حلمی بەگ بڵاوئەکرێتەوە. ئەگەر کەموکوڕییەك لەم باسەدا بخەمەبەرچاو، مامۆستای ناوبراو تۆ بڵێی کەس بمێنێ نەحەپەسێ و وەك شارە زەردەواڵە لێم نەوروژێ و ستارم لێهەڵنەگرن؟ تۆ بڵێی لەگەڵ هەموو شتێکدا من لە حەن پلار و توانج گوێم کەڕ و کاسە و لە عاست ئەو کوچك و

[1] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١/ ساڵی ٥، کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤، ل ٦٢

کوڵۆیانەی ئەم و ئەو توڕی ئەدمنە بەرپێ بە عاستەم چاوم تروسکەی تێدا ماوە؟

کوت و مزرەقی ئەڵێم: مامۆستا ڕەفیق حلمی بەگ لە نووسینەوەی شعر و ئەدەبیاتی کوردیدا باش وردنەبۆتەوە، لێرەدا ناڵێم مامۆستامان لە مەعنای شعر نەگەیشتووە، یا ناڵێم لەو چەند دێڕەی - یادگاری لاوان - کە لەژێر عنوانی - شاعرەکانمان - دا نووسراوە وردنەبۆتەوە، بەڵام ئەو شعرانەی، کە شعر و ئەدەبیاتی کوردی پێ پڕکراوەتەوە، ئەو مەعنایانە ناگەیەنن، کە - یادگاری لاوان - یا مەعنای شعر داوای ئەکا.

باسکردنی شعر زۆری پێ ئەوێ، نووسراوی شاعرەکانمان ئەخەمەوە پێش چاو و ئەڵێم شعر تەنها جوانییە، پەرێکە باڵدار، مۆسیقایەکە هەموو نەغمەیەکی موچڕکێك بێ. ئەمە کۆنترین مەعنای شعرە، ئنجا فەرموون شعرەکانمان بخوێننەوە، بزانن بۆ ئاهی سوێند نەبێ کامیان لە شعر ئەچێ، بۆیە من ئەڵێم شاعرمان زۆر کەمە و بە دەگمەن هەمانە.

خۆ هەموو لەو لاوە بوەستێ هاتنەکایەی ئەم جارەی شاعری تازەمان دڵدار، ئاگر و بڵێسەیەکی وای نایەوە مەگەر هەر مامۆستای خۆشەویستمان خۆی بتوانێ بیکوژێنێتەوە.

نازانم بە چ جۆرێ شعرەکانی دڵدارتان پێشکەشبکەم، مامۆستا لە لایەکەوە دەفەرمووێ: "جێگەی شك نییە کە دڵدار شاعری عەصری و ناوداری دواڕۆژ ئەبێ"، لە لایەکی تریشەوە لەسەر قەصیدەی قەل و ڕێوی ئەفەرمووێ: "ئەم فکرە بە لای منەوە لە دوای ئەوە کە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی جوانتر و شیرینتر بووە." نازانم مامۆستا چۆن ئومێدی لێئەکات، یەعنی هێشتا نەگەیوەتە ئەو پایەیەی کورد چاوی تێبڕیوە، لەم لاشەوە چۆن داویەتە پاڵ شاعرێکی گەورەی فەرەنسا وەکوو — لافۆنتین؟ دووبارە لە لایەکی ترەوە ئەفەرمووێ: "مناڵێك کە هەموو ژیانی لەگەڵ خوێندن ڕابوردبێ و هێشتا لە خوێندنی ڕەسمی ڕزگاری نەبووبێ، ناتوانێ ببێ بە شاعیرێکی کەسبی، یەعنی هێشتا شاگردە و شاعر نییە، ئەی کەوابوو: لەو لاترەوە چۆن ئەفەرمووێ: خۆزگە هەموو لاوێکی کورد لەسەر ئەم پێ و شوێنەی بڕۆیشتایە.

نازانین ئەگەر دڵدار هێشتا هەر شاگرد بێت لە ئەدەبدا چۆن هانمان ئەدا پەیڕەویبکەین؟

ئەمە یەك دوو دێڕ لەو تۆمارە دوور و درێژەی کە ئەمویست باسی شعر و ئەدەبیاتی کوردی پێ لە - کەو - بدەم، خۆزگە ئەمزانی بە بای گوێی چەند کەس خۆشە؟ دیارە کەم کەس، چونکە پیاوێکی وا گەورە کەموکوڕی لێناوەشێتەوە.

خۆزگە خوێندەوارانی خۆشەویست هەریەك لە عاستی خۆیان تێیانهەڵئەکرد، سا یا منیان لەم باوەڕەپاشگەز ئەکردەوە، یا پشتیان ئەگرتم و لارە سەنگی باری ئەدەبیاتی ئێستایان

ڕاستنەکردەوە )[١]

لەبەر تیشکی ئەم دەقە ڕەخنەسازییە کە تەمەنی نزیکەی سی و حەوت ساڵ ئەبێ، دەتوانین باری ڕۆشنبیری و وێژەیی و ڕەخنەسازیی کوردی لەم خاڵانەی خوارەوەدا بخەینەڕوو:

**یەکەم:** خوێنەری کورد بەناوی - نووسەر - مەستبوو، پایەبەرزیی وێژەریان زیاتر لە ڕاستی بە لایانەوە گرنگ بوو، بۆیە مامۆستا جیم پێش ئەوەی ڕەخنە لە مامۆستا ڕەفیق حلمی بگرێ، سێ و دووێکی دەکرد، واتا پڕکێشی نەدەکرد نەوەکوو مامۆستا لێی دڵگیرببێ..

**دووەم:** لەو سەردەمەدا هێشتا لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا چەمکی ڕاستینەی هۆنراوە نەچەسپابوو.

سەرئەنجام مامۆستا جیم سەرنجی خوێندەوارانی ڕادەکێشا بۆ - یادگاری لاوان - کە لە لایەن نووسەرێکی کوردی ناونەبراوەوە نووسرابووەوە، تێیدا بە ڕوونی پێناسە و تەعریفی هۆنراوەی ڕاستەقینە — ڕاستینە - کرابوو، تایبەتییەکانی ڕەچاوکرابوو، کە بە ڕوونی قسەی ڕووکەشی کێش و قافیە جیاکرابووەوە.

**سێیەم:** لە نێوان ڕۆشنبیرە کوردەکانی ئەو سەردەمەدا دەربارەی سروشت و ئەرکی هۆنراوە دوو بۆچوونی دژ یەك باویان هەبوو.

- بۆچوونی هۆنراوەی پەیامدار، کە گرنگییەکەی لە ناوەڕۆکدا دەستنیشاندەکرا.
- بۆچوونی هۆنراوەی جوانکار و هونەریی، کە نرخی لە ڕوخساردا سەنعەتکار و ڕازاوەکەی دابیندەکات.

**چوارەم:** ڕەخنەسازیی کوردی، تارادەیەکی زۆر بەبێ بەڵگە و شیکردنەوە بڕیارەکانی ڕەچاودەکران و بنەڕەتییەکانی دەخرانەڕوو، بۆیە مامۆستا جیم لەیەکنەچوونی بیرۆکەکانی مامۆستا ڕەفیق حلمی لە هەڵسەنگاندنی هەستیارێتی دڵداردا بە توندی بەرپەرچدەدایەوە.

## • مامۆستا ڕەمزی قەزاز و مامۆستا "جیم" لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا

مامۆستا ڕەمزی قەزاز لە سەرەتای وتارەکەیدا دەڵێ:

( لە گەلاوێژی ژمارە "١"ی ساڵی ١٩٤٤ دا لە بابەتی لێکۆڵینەوەی شعر و ئەدەبیاتی کوردی لە لایەن مامۆستا ڕەفیق حلمی بەگەوە، مامۆستا - ج - چەند وتارێکی نووسیبوو. یەك دوو جار خوێندمەوە زۆر سەرسام مام و واقم وڕما و وتم: - ج - دیارە نووسەرێکی بەهێز و تین و جەسارەتێکی ئەدەبی بڵندی هەیە و نووسینی ڕێکوپێك و بێگەردە، بۆچی تاکو ئێستا

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٢ - ٦٤

خۆی شاردۆتەوە و نەهاتۆتە کایەوە ؟

لەدوای ئەم گوفتار و یادکردنەوەی خۆم لەگەڵ خۆما بڕیارمدا کە بەچەند دێڕێکی کورت بەربەرەکانی — ج — بکەم .[1]

دوابەدوای ئەم چەند دێڕە، کە تێیدا ئاشکرایە مامۆستا ڕەمزی قەزاز جۆرە گاڵتەیەك بە مامۆستا جیم دەکات و بەرەنگاری دەبێت و دەڵێت: - ج - هەروەکوو تێگەیشتووم و بۆم دەرکەوت لە نووسینەکەتا، کە سەرنجی مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەگ وەرئەگیرێ بۆ نووسینی بابەتی شاعرەکانمان لە لاوانی کورددا، ئەتەوێ بڵێی کورد ئەدیبی نییە، جا ئەگەر وانییە تکایە بفەرمو وا نییە، هەموومان مامۆستا ڕەفیق حیلمی زۆرباش ئەناسین و لە دەریای ئەدەبیاتا شارەزای مەلەوانی بووین و ئەزانین کە یەکێکە لە مەلەوانە بەناوبانگەکانمان لەم دەریای بێ بنەدا، لەم سەدەی بیستەمەدا.

مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە نووسینیا ڕێی — تشجیع - ئەگرێ ئەیەوێ بە قەڵەمەکەی هەموو شاعیرێك و هەموو نووسەر و ئەدیب و قسەزانێك وا پشت قایم بکا، کە هەر هەوڵ و تەقەلایان بەرزکردنەوەی نووسین و شعر و ئەدەبیات بێ، کە ئەمەش بۆ نەتەوەیەکی دواکەوتووی وەکوو کورد لە هەموو شتێ پێویستترە .

- ج - لە کاتێکدا کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەناو دەریای ئەدەبیاتی کوردیدا مەلەی ئەکرد، ئێمە هەموومان ئەگەر ئاو بگەیشتایە قولەپێمان ئەخنکاین، کەچی ئێستا کە خوا نەیبڕێ هەموو مەلەوانین و فەخر بە خۆمانەوە ئەکەین لەگەڵ ئەوەشا هێشتا ناگەینە ڕەفیق حیلمی، چونکە لەو دەمەدا ئەو دەستی دایە ئەم کردەوەیە ئێمە لەو بیرە دوور بووین ).[2]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە بەرپەرچدانەوەکەی مامۆستا ڕەمزی قەزاز دژی بۆچوونەکەی مامۆستا جیم لەسەر هیچ بناغەیەکی ڕەخنەسازیی زانستی نەدراوەتەوە و نەچەسپێنراوە، جگە لە دڵسۆزی نواندنی خۆی بەرامبەر بە مامۆستا ڕەفیق حیلمی. هەروەها هانی جەماوەری کورد دژی مامۆستا جیم دەدات و وا وێنەی دەکێشێت و دەیخاتەبەرچاو، کە جیم دان بە هەستیارانی کورددا نانێت و ئینکاری بوونی هۆنراوەی کوردی دەکات. جگە لەمانە مامۆستا ڕەمزی قەزاز هیچ تایبەتییەکی زانستی و هونەری ڕێبازە ڕەخنەسازییەکەی ناخاتەڕوو.

مامۆستا قەزاز سەرەڕای ئەم تێبینیانەی دەرحەق بەرپەرچدانەوەکەی لەسەر قسەکانی بەردەوامدەبێت و دەڵێت:

---

١ بڕوانە گەلاوێژ (٣)، ساڵی (٥)، مارتی ١٩٤٤، ل ٥٣

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٣ - ٥٤

( - ج - لێکۆڵینەوەی ئەدەبیاتی کوردی تەنیا بە یەکێك نەسپێراوە، نەتەوە پێگەیشتووەکان ئەم بابەتەیان تەنیا بە یەکێك نەسپاردووە، بەڵکوو هەر کەسێك لە توانایا بوویێت و بە خۆیا ڕاپەرموویێ لەم بابەتە دواوە و ئەدوێ. ئەمرۆش تۆ بە نووسینی ئەدەبی ئەگەر بەخۆتا ڕائەپەرمووی فەرموو وەرە کایەوە بەشێك لە گەلاوێژ بۆ خۆت بکەرەوە، لێکۆڵینەوەی خۆت دەرخە، ئەگەر لێکۆڵینەوەی تۆ لە هی خەڵقی تر باشتر و بەرزتر بوو، ئەوا هەموو نەتەوەکەت دڵڕوون ئەبن و فەخرت پێوەئەکەن. خۆشاردنەوە لەم ڕۆژەدا گوناهێکی زۆر گەورەیە، لێخۆشبوونی نییە، ئەگینا ئەمەش نەکەی لەگەڵ خۆشاردنەوەشا ببی بە دڕك لەسەر ڕێی ئەدیبەکانمانا بڕوێی، لەوانیش بێ بەشمان ئەکەی، لام وایە ئەمە کردەوەیەکی جوان نییە و زۆر ناشیرینە )[1]

لێرەدا هەستدەکەین کە مامۆستا ڕەمزی قەزاز کاری ڕەخنەساز بە شتێکی زیانبەخش لەقەڵەمدەدات و بەبێ ڕێباز داوای نووسینەوەی لێکۆڵینەوە دەکات. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە مامۆستای ناوبراو بە دەربڕینی هەڵچوونی و سۆزی باسی وێژەی کوردی دەکات و دەڵێت:

( "ج" ئەدەبیاتی کوردی زۆر قووڵە و وەکوو دەریایەکی بێبن وایە ئەدیبەکانمان وەکوو دەریا وان خۆیان نوقوم ئەکەن. شتمان لەم دەریا بێنە بۆ دەرێنن، هەندێکیان قوڕ و لیتەیان بەردەست ئەکەوێ و هەندێکیان مرواری و بەردی بەنرخ، ئێمەش کامی بەنرختریێ ئەومیان وەرئەگرین سەرزەنشتی ئەوانی تریش ناکەین، چونکە ئەگونجێ جارێکی تر ئەوانیش شتی زۆر بەنرخیان بەردەست بکەوێ، هەروەها تا ئێستا تۆش نە قوڕ و لیتە و نە مرواریت دەرنەهێناوە، سەرەڕای ئەمەش کە هاتییەکایەوە دەستە و کوتەك هاتووی ڕێ لە ئەدیبەکانمان ئەگری، ڕۆژی سەرزەنشتی نییە هەرکەس بۆ خۆی چی لە توانایە هەیە بیکا بۆ پێشخستنی ئەدەبیاتی کوردی، چونکە زەمانەکەمان زۆر لەدوایە پێشخستنی پێویستترە لەوەی ئەمڕۆ چاکی و خراپی نووسینی ئەدیبەکان بخەینەکایە، کاتێ کە پێشکەوتین ئەمانە هەمووی ئەگونجێ و ئەکرێ ئەگینا ڕۆژی هەوڵدانە)[2]

بەم دەقەدا دەردەکەوێت کە مامۆستا ڕەمزی قەزاز دروشمی خنکاندنی ڕەخنەسازیی کوردی هەڵگرتووە و داوای دەرگاداخستن لە ڕووی ڕەخنەسازەکانماندا دەکات، چونکە بەبێ لێکۆڵینەوەی زانستی و شیکردنەوەی هونەری بڕیاری ئەوە ئەدات، کە وێژەی کوردی دەریاچەیەکی قووڵ و فراوانە، ڕاستیش وا نییە، بە بەڵگەی ئەوەی خۆی دان بەوەدا ئەنێت،

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٣ - ٥٤

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٥

کە زمانی کوردی تا ئێستا خزمەت نەکراوە و پێویستی بە خزمەت هەیە.

وێژەی کوردی وەکوو دارستانێك وایە درەختی بەرداری هەیە و شوێنەواری سازگار و جوانی تێدا بەرچاودەکەوێت، بەڵام هیچ کەسێك ناتوانێ دان بەوەدا نەنێ کە شان بەشانی ئەم لایەنە هەموارە - ئیجابی - و پایەبەرزی وێژەی کوردی، لایەنی ناهەمواری - سلبی - شی بە ڕوونی هەستپێدەکرێ.

مامۆستا ڕەمزی قەزاز خۆشی ئەم ڕاستییەی ڕەچاوکردووە و دووپاتیکردۆتەوە، کە لە دەریای وێژەی کوردیدا چەند وێژەرێك توانایان نییە و قوڕ و لیتەمان بۆ دەردەهێنن، لە کاتێکدا کە دەبوو مرواری و بەردی بەنرخمان پێشکەشبکەن.

پرسیاریش لێرەدا هەڵبەت ڕوودەکاتە مامۆستا ڕەمزی و دەپرسێت: هەڵوێستی ڕەخنەسازی کورد بەرامبەر بەو وێژەرە کوردانە دەبێت چۆن بێت؟

ئایا دەبێت قوڕ و لیتەکەیان بە مرواری و بەردی بەنرخ پیشانبدەن و فێڵ لە جەماوەرانی ئەم نەتەوەیە بکەن؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە هەڵبەت بە لای هەموو کەسێکەوە تەنیا بە دەربڕینی "نەخێر" دەدرێتەوە، چونکە هەڵوێستی پێچەوانەی ئەم هەڵوێستە ڕەخنەسازییە ئەوپەڕی زیان دەگەیەنێ بە بزووتنەوەی وێژەی کوردی نەك پێشخستنی.

ڕاستە کە مامۆستا ڕەمزی قەزاز شتی وا پەسەندناکات، بەڵام لەکارخستنی ڕەخنەسازیی کوردی یان کۆسپ خستنەبەری ئەو کارە دەدات بە دەستەوە.

دڵداری هەستیار لە بەشداریکردنی ئەو زۆرانبازییەدا وتارەکەی بە وێنەکێشانی هەڵوێستی ڕۆشنبیرە کوردەکانی ئەو سەردەمە دەرحەق بە کتێبەکەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی - شیعر و ئەدەبیاتی کوردی - دەستپێدەکات و سەرئەنجام ڕووی دەم دەکاتە مامۆستا جیم و دەبێژێ:

( کاکە برا.. هەروام زانیوە هەرکەسێك کە تازە شتێك بهێنێتە دی، تا دەمێکی کەم تا ئەم شتە نەکەوێتە نێو زارانەوە، هەر کەسە چاك و خراپ، ڕاست و درۆ، لە دەروونێکی پاك و پیسدا بێ یان نەبێ دەمەتەقێ لێئەکا، ئەوجارەش کە جەنابی ڕەفیق حلمی بەگ کتێبەکەی بەشێکی لەچاپداوە و بەشەکەی تریشی پەی دەرپەی لە گەلاوێژدا بڵاوکردەوە، بووە هەوێنی ڕەخنەی ئەو ڕەخنەسازانەی کە گوایا بە دەروونێکی پاکەوە ڕەخنەیَ لێئەگرن، بەڵام هیچ کامێکیان وەکوو جەنابت خۆیان بەدیارنەخست، نووکی زێڕینی قەڵەمەکەیان نەگەیاندە گەلاوێژ، لەم بابەتەوە زۆر سوپاس ئەکرێیت .

من حەقی ئەوەم نییە، کە هەر کەسێك ئینکاری شاعریم بکات، بە زۆرداری شاعریی

خۆمی ببەمە گوێچکەوە، لەبەرئەمە ئەم نووسینەم نابێ بەم چاوە سەیربکرێت کە چاوم لەم مرازە پڕ بێ نە ...

با بێینەوە سەر ماهیەتی ئەم جاجکە — بنێشتە - کە ئەیجاوین، لە زۆر کەسم بیستووە کە جەنابی ڕەفیق حلمی بەگ کتێبی شعر و ئەدەبیاتی کوردی دانەناوە، بەڵکو لە ڕووی ڕاستییەوە شعر و ئەدەبیاتی سلێمانی داناوە. داردەستی ئەم کەسانە ئەوە بوو، کە جەنابی مامۆستا ڕەفیق حلمی بەگ بێجگە لە سلێمانییەکان دان بە کەسی تردا نانێ، لای وایە کە کورد سلێمانییە و بەس، بەڵام مرازی ئەم کەسانە لە گێرەشێوێنی زیاتر چیتر نەبوو، لەبەر ئەمە بە شەت و پەتی و نیوەچڵی وتاری خۆیان قوتدایەوە بە گوێی شۆڕی و شەرمەزاری لە. کونجی نیوە زەریانا دەرکەوتن.

هەندێکی کەش ئەیان وت کە: "خزمەتی گەل بە نووسینی پڕوپووچ ناکرێ، بەڵکوو خزمەت ئیشکردنە". ئەو کەسانەش وەکوو ڕۆژ خۆیان ئاشکراکرد، کە ئەوانیش لەوانی پێشوو درووزن خاوێنتر نەبوون.

کاکە برا.. ئەمە وێنەیەکی زۆر کورتی ئەم دەمەتەقێیە بوو کە بیستم و وتراو هاواری پێوەکرا. تەبیعی ئەم باسە زۆر دوور و درێژە.

ئیمڕۆ هەلی ئەمە هەڵنەکەوتووە، کە ڕاستەقینەی ئەم وتارانە ئاشکرابکرێن، بەڵام من بۆ ئەمەی کە باسەکەم ناتەواو نەبێ ئەموستم بۆ درێژکرد و بەس![1]

هەروەکوو لەم دەقەدا دەردەکەوێت چەند کەسێك لە ڕۆشنبیرە کوردەکانی ئەو سەردەمە بە ناحەق و بەبێ ڕێبازێکی زانستی توانجیان دەگرتە کتێبی شعر و ئەدەبیاتی کوردی کە لەکاتی دانانیدا بێ گومان کارێکی گرنگ و بەسوود بووە.

مێژوونووسی ڕەخنەسازیی کوردی، کە ئەم ڕاستییە دووپاتدەکاتەوە دەتوانێ سەرنج بۆ باری ئێستای ڕەخنەسازیی کوردی ڕابکێشێ، کە لە زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا بەهەمان شێوە نووسەرەکانیان پلار دەهاوێژن و توانجدەگرن و لەبەر هۆی نازانستی نرخی کاری وێژەی بەسوود دەشکێنن.

کەوابوو: مێژوو لەم ڕووەوە دووبارەدەبێتەوە، جا هیواداریین کە ئیتر لەمەودوا بەردەوام نەبێت و ڕەخنەگرتن بۆ بەرزی ئەدەب و بەشێوەیەکی زانستی بگیرێ.

---

[1] بروانە گەلاوێژ ژمارە (٨)، ساڵی ٥، ئابی ١٩٤٤، ل ٦٢ - ٦٣

## ● ڕەخنەسازیی تەتبیقی

"دڵدار"ی هەستیار پاش ئەوەی وێنەی ڕەخنەسازیی کوردی سەردەمەکەی بەو جۆرە دەکێشێ، لە قسەکانیدا بەردەوامبوو و وتی:

(هەندێکی کەش ئەیانەوێ لە ناحیەی فەنییەوە ڕەخنە لە ڕەفیق حلمی بەگ بگرن کە یەکێکیان جەنابتی. یەك لە وتارەکانیان ئەمەیە کە ڕەفیق حلمی بەگ ناشاعیرێکی کردۆتە شاعر. خاوەن ئەم فەرموودەیە جەنابت و ناشاعرەکەش منم، بەڵام هەر کەسێکی ڕەخنەباز ئەبێ تیر ئەندازە بێ تیر بێ نیشانە هاویشتن جوان نییە، وەیا خۆ مەشقێکە کە فێرە تیرهاوێشتنکردنە. ئەڵێم:

کاکە جیم.. هەر چەندێکی لە ناحیەی نووسیندا زۆر بەرزە، بەڵام لە ناحیەی "پێویستە چۆن بێ" دوورە.

برا.. جارێك نە لە جەنابتەوە نە لە غەیری جەنابتەوە، شعرێکی من هەڵنەوەشێنرایەوە لە ناحیەی مەعناوە، کە ڕەفیق حلمی بەگ خۆشی ئەڵێ: لەم ناحیەوە کەموکورتی هەیە، وە فەنی شعر کەل و کۆسپیان نەخستە بەرچاوانەوە تا ببێتە داری دەستی ئەو کەسانەی بڵێن: ڕەفیق حلمی بەگ یەکێکە خاوەن هەڵەیەکی وەکوو - دڵدار- ئەهاوێتە ڕیزی شاعران )[1]

بەم چەشنە دڵداری هەستیار بەهیچ کلۆجێك لە مامۆستا جیم دڵگران نەبووە، چونکە ڕەخنەی لە مامۆستا ڕەفیق حلمی گرتووە و بە هەستیارێتی ئەم قایل نەبوو، بەڵکوو داوای ئەوەی لێدەکات کە هەڵبەستەکانی شیبکاتەوە و واتا و دەربڕینەکانیان هەڵبسەنگێنێ و ئەمجا بڕیاری هەستیارێتی، یان ناهەستیارێتی بدات.

ئەم داواکردنەی دڵداری هەستیار بە زاراوەی ڕەخنەسازیی ئێستامان بابەتی ڕەخنەسازیی تەتبیقی و پراکتیکی دەگرێتەوە، کە نەك لەسەر قسەی ڕووت و بۆچوونی نەزەری حوکمی خۆی بدات، بەڵکوو پێویستە لەسەر بناغەی شیکردنەوە و لێکدانەوە و بە ڕێبازێکی زانستی بڕیاری خۆی سازبکات.

دڵداری هەستیار بۆ چەسپاندنی داواکارییەکەی و ڕوونکردنەوەی وێنەی هەندێك لە ڕۆشنبیرەکانی سەردەمەکەی حیکایەتێکی فۆلکلۆری کوردی دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

ڕۆژێکیان دوو کەسی سەرسەخت"عنود" کەوتنە چەندوچوون لەسەر شتێکی ڕەش، کە لە دوورەوە لێیان دیاربوو، ئایا ئەمە "بزن"ە یان "قەل"ە. یەکێکیان ئەیوت ئەمە قەلە، ئەویتریان خۆی بە زەویدا ئەمالی ئەیوت ئەمە بزنە، کە لێی نزیکبوونەوە بەردیان تێگرت "قەل بوو فڕی"، ئەوەی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٣ - ٦٤

ئەیوت قەلە ڕووی لەوی تر کرد و وتی: "ئا دیت کە قەل بوو؟" هاوڕێکەی ددانی لە چیرەوە برد و وتی: "بشفرێ هەر بزنە"

برا.. زۆر تکا لە تۆ و لەو کەسانە ئەکەم کە لە سکی خۆیاندا ئاوەدانن گەر دەستتان هەیە بەردێکم بۆ ڕاوەشێنن تا بزانن من بزنم یا قەل؟ دەنا بەچاوی بزن سەیری قەل بکرێت نابێ قەل ببێتە بزن.

ئیتر گەر بەردەقانیت نییە پەیدایکە، بەردێکم بۆ تێناگری؟ کاکە جیم)١

ئەم حیکایەتە فۆلکلۆرییە هەڵبەت ڕاستی گەوهەری بزووتنەوەی وێژەی کوردی بە تەواوی دەرنابڕێت، بەڵام لە هەمان کاتدا بە چەشنێکی کاریکاتێری دەمارگرتن و مەیل و هەوای نووسەری کورد وێنە دەکێشن، ئەم دیاردەیەش دەبێت بزانین شتێکی تایبەت بە نەتەوەی کورد نییە، بەڵکوو سەرئەنجامێکی سروشتییە لە قۆناغێکی مێژوویدا زاڵدەبێت.

ئەمە ڕاستییەکی مێژووییە، بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستە دووپاتیبکەینەوە، کە نابێت ئەم دیاردە نا تەندروستییە پەرەبسێنێ و تەشەنەبکات و ببێت بە ڕەنگی جیاکەرەوەی ڕۆشنبیریی کوردیمان.

هەرچۆنێک بێت ئەم زۆرانبازییە ڕەخنەسازییە، کە هەتا ئێستا لێیلواین و دامانە بەر نەشتەری شیکردنەوەو هەڵسەنگاندن سەرەڕای لایەنە ناهەموارییەکانی – سلبییەکانی - لایەنێکی هەمواری – ئیجابی - هەیە و دەبێت بە هۆی جوڵانەوەیێکی بیری و زانستی.

## ● مامۆستا جیم لە تای ترازووی ڕەخنەسازیدا

مامۆستا جیم لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ١٦ ی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٤ ی زاینیدا، وتارێکی بەپیتی نووسیوەتەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی وتارەکەی مامۆستا ڕەمزی قەزاز دەربارەی نرخپێدانی (شعر و ئەدەبیاتی کوردی) و توانجگرتن لە مامۆستای ناوبراو.

ئەم وتارە تازەیەی مامۆستا جیم هەرچەندە بەشداریکردنێکە لەم زۆرانبازییە ڕەخنەسازییەدا، کە شیمانکردەوە، بەڵام لە تای ترازووی ڕەخنەسازیدا بابەتگەلێکی ڕەخنەسازی و بیری و خووڕەوشتی زانستی بەرپاکردووە، کە دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوە سەردێڕەکانیان بخەینەڕوو:

- سوودی وێژەی بێگانە بۆ وێژەرە کوردەکان.
- پێویستی ڕەخنەسازی و دەوری ڕەخنەساز لە خەملاندنی وێژەی کوردیدا.
- پلەی وێژەی کوردی و هونەری وێژەرەکان.

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٤.

- نەریت و خووڕەوشتی زانستی لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژە لە ڕەخنەسازیدا.

ئێمەش لەم باسەدا بە نیازی سوود گەیاندن بە وێژەی کوردی لە هەندێ لەو خاڵانە دەدوێین و شیاندەکەینەوە و هەڵیاندەسەنگێنین.

## • سوودی وێژەی بێگانە بۆ وێژەرە کوردەکان

مامۆستا جیم لە سەرەتای وتارەکەیدا بەکورتی باسی کەڵکی وێژەی بیانی بۆ وێژەرە کوردەکان دەکات و دووبارە هەژاری وێژەی کوردی دووپاتدەکاتەوە و دەڵێ:

(ناو بە ناو لە ناو خۆمانا ئەبێ سەرەتاتکێیەك لەگەڵ بووکی ئەدەبا بکەین، بەڵام کام ئەدەب؟ ئەدەبی بێگانە. حەقمانە پیاوی فەقیر لە بۆنی ڕۆن و پیازی هاوسێی دەوڵەمەند زیاتر چارە یا دەسەڵاتێکی تری هەیە؟

ئەدەبمان هەیە، نالێم هەر نیمانە، بەڵام وا نە ڕست بخاتە ملمان و لوتمان بەسەر خۆیا داژەنە. تا چەمەنیش ڕاوەستابێ کێ خۆی لە کرین ئەدات؟ ڕەنگە بڵێن تا ماڵ وەستابێ مزگەوت حەرامە. منیش لەگەڵتانا دێم بەڵام نابێ سەر بە ماڵێکی وادا بکەین، کەر تێیدا بکەوێ دانی بشکێ.)

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە ڕەخنەسازەکەمان دروشمی سوودوەرگرتنی لە وێژەی بیانی هەڵگرتووە، بەڵام پرسیاری گرنگ لەم ڕووەوە دەپرسێت: ئەم سوودوەرگرتنە چلۆن دێتەدی؟ ئایا وێژەرە کوردەکان لە ڕێگای لاساییکردنەوەی وێژەی بیانییەوە دەتوانن وێژەی نەتەوەکەیان دەوڵەمەندبکەن؟

مامۆستا جیم هەروەکوو دیارە وەڵامی ئەم پرسیارەی نەداوەتەوە، بۆیە پێویستە ئێمە لێرەدا دووپاتیبکەینەوە، کە وێژەی بێگانە هەڵبەت جۆرە سوودێکی هەیە بۆ وێژەرە کوردەکان، بەڵام ئەم سوودە دەبێت بە زیان و کۆسپ لە ڕێگای پەرەسەندنی وێژەی کوردیدا.

ئەگەر هاتوو وێژەرەکانمان تۆسقاڵێك (تۆزوکەیەك) ڕێگای لاساییکردنەوەیان گرتەبەر، سوودەکەی بە زیان دەگەڕێ بۆ وێژەکەمان، چونکە وێژەی بیانی چەند بەرز و بەکەڵك بێت، لەبەرئەوەی ئاوازی شارستانێتی و ڕۆشنبیریی کەسایەتیی نەتەوە بێگانەکەیەتی، بە هیچ جۆرێك بۆ درکاندنی باری کۆمەڵەکەمان دەستنادات.

بەڵێ لە ژیاندا یاسای وەرگرتن و پێبەخشین دەستوورێکی سروشتییە، بەڵام دەبێت ئەم دەستوورە بە بنواشەی بەیەکاچوون و کارلێککردن (تەفاعول)ی نادەستکرد و عەفەوی

ئەنجامبدرێ، نەك بە پینەکردن و سەپاندن و ملکەچکردن و شوێنپێهەڵگرتنی نەزانانە.

## پێویستی ڕەخنەسازی و دەوری ڕەخنەساز

مامۆستا جیم لە وتارە بە پیتەکەیدا دووبارە بە کورتی باسی پێویستی ڕەخنەسازی و دەوری ڕەخنەساز دەکات و دەیێژێ:

(کەممان هەیە دان بە کەموکوڕی ئەدەبمانا نەنێ، کەچی لەوە ناگەم بۆچی خراپە ئەدەینە پاڵ (ڕەخنە = تنقید)؟ گوایە ئاوێنە نەبێ ئینسان جوانی و ناشیرینی خۆی بۆ لێك ئەکرێتەوە؟ ئاوێنەی ئەدەبیش ڕەخنەیە. یا بۆچی بۆ ئێمەی ساوا لە ئەدەبا نەشێ؟ گوایە شاعر یا کاتب ڕەخنە ئەیرووخێنێ؟ بەهێزتری نەکا، لەوە مەترسن دەست بنێتە بینی. ئەمەش هەروا. ئەی ئەبێ تووڕەبوون لە ڕەخنەگر مەعنای چی بێت؟ ئەو ڕەخنەگرەی دۆستانە بە دڵێکی پاکەوە ڕیسی براکانی دەکاتەوە بە خوری، ئەبێ بۆچی ڕقەی لێبکێشن؟ هەیە بڵێ تووڕەیی نیشانەی بێدەستی نییە؟ یا ڕێ بەوە بەریت لە زەردەخەنە زیاتر شتێکی تر بە هێزتر هەبێ لە عالەما)[1]

لەبەر تیشکی ئەم دەقەدا ئاشکرایە، کە مامۆستا جیم دان بە پێویستی ڕەخنەسازیدا دەنێت و ئامانجی ڕووندەکاتەوە و ئەرکی ڕەخنەساز دەستنیشاندەکات. ئەم کارەش بێگومان گرنگییێکی تایبەتی هەیە لە پێناوی چەند چەمکێکی هەڵە دەربارەی زانست و هونەری ڕەخنەسازی، کە لەو سەردەمەدا باویان هەبوو و وا خەڵکیان تێدەگەیاند، کە دەبێت باوەش بۆ هەموو لاپەڕە ڕەشکەرەوەیەك بکەنەوە و ستایشی هەموو قەڵەمهەڵگرێ بکەین و نابێت هیچ کەسێ لەم کۆڕەدا زویر ببێت. کەچی بە پێچەوانەی ئەم بارەوە ڕەخنەسازەکەمان دروشمی ڕەخنەسازی بۆ پەرەپێدان و خەملاندنی وێژەی کوردی هەڵگرتووە.

## • دەمەتەقێیەکی تر لەگەڵ مامۆستا ڕەمزی قەزازدا

مامۆستا جیم پاش چەسپاندنی مەسەلەی گرنگی ڕەخنەسازیی باری وێژەی کوردی دووبارە ڕووی کردە مامۆستا ڕەمزی قەزاز و وتی:

(با لە ڕێ لانەدەین. مەوزوعی لاپەڕەی ٥٣ ی گەلاوێژی ژمارە ٣ ی ئیمساڵ لێکۆڵینەوەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بوو، بەڵام داخەکەم هەرچەندە سەرم هێنا و سەرم برد

---

[1] بڕوانە عوسمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨ ـ ٥٩.

ڕێم بە هیچ نیازێکی نەبرد، ناچار سەرە ڕێگام بۆ دانا وتم: ئەگەر نیازی بەربەرەکانی جیم بێ، هەروا بە قسەی ڕووت سەرناگرێ و ناچێتە سەر و ئەگەر بە شان و باهو هەڵدانی ئەم و ئەو ئەبێ لە ژێر ئەو عنوانەدا ناشێ و دەست نادا. خۆ ئەگەر نیازیش لە ئەدەبیات بێ کوا شیعر و کوا ئەدەبیات؟

سەرنجدانێکی نووسراوی ئەو لاپەڕەیە وا لە ئینسان ئەکات بە تایبەتی منی تێگیراو پڕ بە دەم هاوار بکەم و بڵێم: "فەن شەخسیەت و شەخسیەت فەن نییە."

کەوابوو: ئیتر ئەبێ موناسەبەت لە مەعبەینی مەوزوعێکی ئەدەبی و گەورەیی مامۆستا ڕەفیق حلمی بەگدا، چی بێ وا مامۆستا ڕەمزی بەربەرەکانێ لە سەر ئەکات و کێ هەیە دان بە گەورەیی و شارەزایی ڕەفیق حلمی بەگدا نەنێ، بەڵام ئەگونجێ ئەگەر قەسیدەیێکی ناشیرین بە جوان لە قەڵەم بدات، یا ناشاعرێك بکا بە شاعر ڕەخنەی لێنەگرێ، چونکە گەورەیە و دانایە؟

بەڵێ. بە تۆ بێ نابێ کەس دەس لە دەسی بدات، بەڵام بۆ نەوازیشی فەن دەس لە دەسی زۆری وا ئەدرێت.

ئەمە وا ئەفەرمووی گوایە وتومە کورد شاعری نییە؟ نازانم تۆ وا تێگەیشتبی، ئەگینا وتومە کورد شاعری بووە و هەیەتی، بەڵام بە پەنجەی دەست ئەژمێررێن.

دیسان ئەفەرمووی مامۆستا ڕەفیق حلمی لە نووسینا هەمیشە ڕێی تەشجیع ئەگرێ. با دوور نەڕۆین هەر لە خۆت بپرسم ئەبێ "دڵدار" بە خۆی و بەرزترین قەسیدەکەیەوە وەکوو قەل و ڕێوی ببرێتە ڕیزی مەولەوی و گۆران و.. یا لە گەڵیانا بخرێتە دووتوێی دوو بەرگەوە؟ خۆت مەعنای شعر ئەزانی و شاعریش ئەناسی کێیە؟ کەوابوو ئیتر بە ڕەوای ئەبینی بە هەموو قسەیێکی ڕێکوپێك بڵێ شعر و بە هەموو کەس بوترێ شاعر؟ بیستووتە یا بە سەدەف بڵرێ مرواری یا بەزەرد بوتری زێڕ.

تۆ ئەفەرمووی تەشجیعی وەها بۆ نەتەوەیێکی دواکەوتووی وەکور کورد لە هەموو شتێ پێویستترە، نەك بوونە دڕك و داڵ لە ڕێگای ئەدیبێکا !. منیش ئەڵێم ڕەخنە لەوە پێویستترە بۆچی؟ دڵدار شاعر نییە، بەڵام مامۆستا ڕەفیق حلمی هانی داوە ببێتە شاعر. ئایا بەو هاندانە ئەبێتە شاعر لە ماوەیەکی زۆر دووریشا؟ ئەمە باشتر بوو یا بهاتایە سەرزەنشتی بکردایە و سەرنجی ڕاکێشایەتە سەر کەموکوڕییەکانی؟ سەرزەنشتی ئەبێ هەر نیشاندانی کەموکوڕی و پلار و توانجگرتنە ئەم و ئەو ئەبێ هاندانیشە بۆ ڕێگای ڕاست دۆزینەوە و پێشکەوتن)[1]

---

١ بڕوانە هەمان سەرچاوە لاپەڕەی پێشوو ل ٥٩ ـ ٦٠

لەم دەقەدا کە بەرپەرچدانەوەیەکە بۆ بەرهەرکانێیەکەی مامۆستا ڕەمزی قەزاز لە تەك ڕەخنەسازەکەماندا، مامۆستا ( جیم). ئاشکرایە کە سێ بنەڕەتی ڕەخنەسازی ڕەچاوکردووە:

**یەکەم: جیاکردنەوەی کەسایەتیی نووسەر لە بەرهەمەکانی.**

**دووەم: چاوپۆشین لە کەموکوڕی هەستیار، لەبەر هیچ هۆیەك.**

**سێیەم: دانانی سنوور بۆ پلەی هەستیارەکان و تێکەڵنەکردنی ئەو پلانە.**

## • مامۆستا بێکەس و مامۆستا أ.ب.هەوری لە کۆڕی بزووتنەوەی ڕەخنەسازیدا

لە کۆڕی ڕەخنەسازیی کوردیدا مامۆستا مامۆستا فایەق بێکەس و مامۆستا ئەبوبەکر هەوری لە ژمارە "٢"ی مانگی شوبات و ژمارە "٤"ی مانگی نیسان و ژمارە"٥"ی مانگی مایسی ساڵی پێنجەمی گۆڤاری گەلاوێژ، واتە ساڵی ١٩٤٤ی زایینی بزووتنەوەیێکی ڕەخنەسازییان لە کۆڕی ڕەخنەسازیی کوردیدا بەرپاکرد.

بەرپابوونی ئەم بزووتنەوەیە بەوە دەستیپێکرد، کە مامۆستا ئەبوبەکر هەوری لە ژمارە "١"ی ساڵی پێنجەمی گۆڤاری گەلاوێژدا لەژێر عینوانی - پەیڕەوی خیام - دا چەند چوارخشتەکییێکی بڵاوکردەوە.

ئەوجا مامۆستا فائق بێکەس چوار - چوارخشتەکی - لەم بەرهەمەی مامۆستا "أ. ب. هەوری"دا لە ژمارە "٢"ی گۆڤاری گەلاوێژ مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٤ دا خستنەبەر پێنووسی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن.

بەم جۆرە مامۆستا هەوری هاتە مەیدانەوە و وەڵامی مامۆستا بێکەسی دایەوە و زۆرانبازێکی ڕەخنەسازیی و ڕۆشنبیریی هەڵگیرسایەوە.

ئێمەش لەم باسەدا بەرەو دوا چەند لایەنێکی ئەم زۆرانبازییە بۆ دەستنیشانکردنی ئەڵقەکانی مێژووی ڕەخنەسازیی کوردی شیدەکەینەوە بە نیازی ئەوەی هەنگاوی ڕەخنەسازیی کوردی بەرەو پێشەوە بەرین.

## • بەرپرسیارێتی گۆڤاری کوردی

مامۆستا فایق بێکەس لە پێشەکی وتارەکەیدا باسی بەرپرسیارێتی بەڕێوەبەرێتی گۆڤاری گەلاوێژ لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی وێژەرە کوردەکانی ئەو سەردەمەدا دەکات و دەڵێ:

(ئەم گۆڤارە کە ئەستێرەیێکی بە شەوق و پڕشنگدارە لە ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردیدا، داخەکەم جارجار هەندێ شتی ناشیرینی تیا ئەبینرێ، کە ئەبێتە پەڵە هەورێك بەری ڕووناکی و درەوشانەوەی ئەو ئەستێرەیە ئەگرێ و ئەو دیمەنە جوانە دڵدارە لە چاو ئەشارێتەوە، کە بەمەش لە جیاتی ئەوەی خۆشی ببەخشێ بە پێچەوانەی ئەوە دڵی خوێندەواران تەنگ ئەکا.

لێرەدا نازانین گلەیی لە کێ بکەین، لەو کەسانەی کە شتی وا بێ تام و ناپوختە ئەنێرن بۆ ئەم گۆڤارە نازدارە یا لەو کەسەی بکەین کە سەرپەرشتی گەلاوێژی گرتۆتە دەست؟ ئەگەرچی گەلێ لە خوێندەوارەکان لایان وایە، کە ئۆباڵی ئەو کەموکوڕییە لە سەر شانی ئەو کەسەیە، کە سەرپەشتی گەلاوێژ دەکا، بەڵام من لام وایە ئەمە ڕەوای حەق نییە، چونکە لە گەلاوێژدا بەشێك تەرخانکراوە بۆ لێکۆڵینەوە، کە هەموو کەسێ حەقی هەیە بە شێوەیێکی جوان، کە لە سنووری نەزاکەت دەرنەچێ چ لە شعرەوە چ لە وتار بکۆڵینەوە و لێیبدوێین.)[1]

لێرەدا مامۆستا فایق بێکەس نزیکەی ٣٧ ساڵ لەمەوبەر کێشەیەك دووپاتدەکاتەوە، کە تا ئیمڕۆ باڵی بە سەر زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا کێشاوە، ئەم کێشەیەش بڵاوکردنەوەی لاپەڕەیەك مامۆستا بێکەس بەرپرسیارێتی ئەم کێشەیە دەخاتە ئەستۆی پەڕە ڕەشکەرەوەکان، بەڵام ئێمە لەو باوەڕەداین، کە باری کێشەکە تەنها بەسەر شانی لێپرسراوانی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانەوەیە، چونکە ئەمانە دەبێت لە بەر تیشکی پێوانەی زانستی و بەبێ دەمارگرتن بەرهەمەکان لە بێژنگی ڕاستی بدەن و تەنیا بەرهەمی بەنرخ بڵاوبکەنەوە.

## ● هەڵسەنگاندنێکی گشتی بۆ چوارینەکانی مامۆستا ا.ب.هەوری

مامۆستا فایق بێکەس دوابەدوای دووپاتکردنەوەی ئەو کێشەیە باری چوارخشتەکییەکانی مامۆستا "ا. ب. هەوری"ی هەڵسەنگاندووە و وتویەتی:

( لە ژمارە "١"ی ساڵی ٥ لە دیوانی گەلاوێژدا لە ژێر عینوانی "پەیڕەوی خیام"دا چاومان بە چەند ڕوباعییەك کەوت لە لایەن "ا. ب. هەوری"وە ڕێکخرابوو نەك من تەنیا هەرچی خوێندەواران هەیە هەموو لەم شعرانە بێزار و وەڕس بوون و زوبانی حاڵی هەموومان بە جارێ ئەڵێت: خیام گۆڕ هەڵتەکێنە ا. ب. هەوری وەها پەیڕەویت ئەکا.)[2]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە شێوازی مامۆستا بێکەس بە هیچ جۆرێ زانستی نییە و دەربڕینی هەستبریندارکەری بەکارهێناوە و لە سەرەتاوە بڕیاری خۆی بە بێسوودی کارەکەی

---

١ گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٢)، ساڵی ٥، شوباتی (١٩٤٤)ی زایینی، ل ٦٥.

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٥ ـ ٦٦

مامۆستا ا. ب. هەوری داوە.

هەرچۆنێك بێت ڕەخنەسازەکەمان لە توانجگرتنەکانیدا بەردەوامدەبێت و دەڵێ:

(ئینجا سەرنج بدەنە ڕوباعییەکانی ا. ب. هەوری بزانن ئەڵێ چی؟ لە یەکەم ڕوباعیا ئەفەرمووێ:

من کە بێ پرس بێمە دنیاوە
هەر بە ناچاریش بچمە دواوە
کوێم مەیل بێنێ ڕوو لەوێ ئەکەم
چیم لە سەکوەڕ و لە بەنگ و باوە

جارێ لە پێش ئەمەدا کە بۆ مەعنای ئەم ڕوباعییە بگەڕێین، ئەگەر مامۆستا ا. ب. هەوری لێمان ببوورێ ئەیخەینە تەرازوی شعرەوە، لە پاش کێشانی بۆمان دەرئەکەوێ، کە مەسرەعی یەکەمی لەنگە، ئەبووایە وا بووایە (من کە بەبێ پرس... هتد) خۆ ئەگەر بۆ مەعناش بگەڕێین ئەوە هیچ، چونکە ئەڵێت: کوێم مەیل بێنێ ڕوو لەوێ ئەکەم. ئەمە ڕاست نییە. گریمان مامۆستا ا. ب. هەوری ئارەزووی فەرموو بچێتە لەندەن، پاریس، ئەمریکا، چۆن ئەتوانێ و بە چی ئەچێ، چونکە نە پارە و نەتوانای ئەوەی هەیە، کە ئەو ئارەزووەی بە جێبهێنێ، کەوابوو ئەم قسەیە ڕاست نییە، جگە لەوە لە مەسرەعی چوارەما ئەڵێ: (چیم لە سەگوەڕ و لە بەنگ و باوە) هیچ تەڕاوەت و زەوقێکی ئەدەبی تیا نییە، چونکە شعر ئەبێ مۆسیقایەك بێ، عاتیفەی ئینسان بجزوێنێ و مەستی شادی بکا، نەك بە سەگوەڕ گرژ و ڕەنجیدەی بکا. سەرەڕای ئەمە بەنگ و باو نییە بەند و باوە )[1]

مامۆستا فایق بێکەس لەم هەڵسەنگاندنەدا، چوار پێوانەی ڕەخنەسازیی گرنگی بەکارهێناوە:

- **پێوانەی کێش**
- **پێوانەی واتا**
- **پێوانەی چێژ (تذوق)**
- **پێوانەی وشەسازی**

پرسیار لێرەدا داوای چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو پێوانە گرنگانە دەکات؟

ئایا دەبێت بە بڕیاری کتومت بەکاربهێنرێن یاخود بە شێوازێکی شیکەرەوە و هێنانی بەڵگە و شاهێد ڕەخنەساز بیانگرێتەبەر؟

---

[1] بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٦

ئاشکرایە کە مامۆستا بێکەس هەڵسەنگاندنەکەی تەقریری و بڕیارییە دەبوایە زیاتر درێژەی بە لێکۆڵینەوەکەی بە بەڵگەوە بدایە و بە دەربڕینی ڕوونکەرەوەش کارەکەی ئەنجامبدایە. ئەمە ڕاستییەکە، بەڵام ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێت، کە وتارەکە بۆ گۆڤارێك نووسراوەتەوە، لاپەڕەکانی گۆڤاریش هەر ئەوەندە هەڵدەگرن.

## • فەلسەفەی خیام و مامۆستا هەوری

مامۆستا بێکەس لە هەڵسەنگاندنی دووەم چوارخشتەکییەکانی مامۆستا هەوری ئەڵێ:

( بێینەوە سەر ڕوباعییەی دووەم، تەماشاکەن چی ئەفەرمووێ:

چۆنم هێناوە وای ئەبەمە سەر
بەندەی کەسێکم ڕاست و هونەروەر
قسەی نەزان و پیاوی ڕیاکار
لای من گەڤینە یا زەڕینی کەر

تکاتان لێ ئەکەم خوێنەرە بەڕێزەکان لەم ڕوباعییەدا چ نەزعەیێکی فەلسەفی تێدایە، کە لە بیری خیام بچێ؟ ئایا گەڤینی سەگ و زەڕینی کەر، کە هاوتای بیری قووڵ و وردی خیام بکات؟ من نازانم؟ ا. ب. هەوری ڕقی لە خیام هەستاوە، خەریکە بەم دەنگە ئابڕووی بەرێ، یا لە گەلاوێژ یا لە خۆی؟ ).[1]

دیسانەوە ئاشکرایە مامۆستا فایق بێکەس لەم دەقەدا هەرچەندە بۆچوونەکەی ڕاست و ڕەوایە، بەڵام شێوازەکەی لە سەر هیچ بناغەیێکی زانست و هونەری ڕەخنەسازیی ئەنجامنەدراوە، چونکە بە دەربڕینی گاڵتەجاری و بە جۆرێکی بڕیاری نووسراوەتەوە. لە کاتێکدا دەبوو بەراوردکارییەك بە بەڵگە و نموونەی لە نێوان فەلسەفەی خەیام و ئەم چوارخشتەکییەی (هەوری )دا بەرپابکردایە. بۆ ئەوەی لە وێنەیێکی هەستپێکراودا ئەوەی بڕیاریدا دەریکەوتایە.

ئەم بارەی هەڵسەنگاندنەکەی مامۆستا بێکەس هەڵبەت ئەوە دووپاتدەکاتەوە، کە لەو قۆناغەی تەمەنی ڕەخنەسازیی کوردیدا، کە ئەوە و پشتێك لە ڕۆشنبیرانی کورد دەنوێنێ، نەخۆشییێکی کوشندە ڕەگوڕیشەی داکوتابوو. سەرئەنجام ئەم نەخۆشییە تەشەنەیکرد و بوو بە جۆرە بەڵایەك، کە لەم ڕۆژانەدا بە دەستییەوە دەناڵێنین. بەڵێ ژمارە نییە لە زۆربەی ژمارەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەکان شوێنەواری ئەم بەڵایەی تێدا بەرچاونەکەوێت و لاپەڕەکانی بەو جۆرە هەڵسەنگاندنە ڕەشنەکرابنەوە، بۆیە لێرەدا پێویستە بانگەوازێك ئاراستەی بەرپرسیاران و ڕۆشنبیرە کوردەکان بکەین و بە هۆیەوە داوای هاوکاری بکەین بۆ چارەسەرکردنی ئەم بەڵا

[1] بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٦٦ ـ ٦٧

(نەخۆشی ) یە، چونکە جگە لەوەی ساردی و دووبەرەکی دەخاتە ناومانەوە هیچ سوودێکیش بە بزووتنەوەی وێژە و ڕۆشنبیریی ڕەخنەسازییەکەمان ناگەیەنێ.

## • بەڕێوەبەرانی گۆڤاری گەلاوێژ و دەمەقاڵەی وێژەیی

ئەگەر بە سەرپێیی چاوێك بە لاپەڕەكانی ساڵی پێنجەمی تەمەنی گۆڤاری گەلاوێژدا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێ، کە ڕۆشنبیر و خوێندەوار و وێژەرە کوردەکانی ئەو سەردەمە تووشی گێرەشێوێنییەکی وێژەیی بوون و تاقم تاقم دەستە و قەڵەم دەجەنگان.

وێنەی ئەم بارە لەم بانگەوازەدا بەرچاودەکەوێ، کە لێپرسراوانی گۆڤاری گەلاوێژ لە ژمارە "٤" ی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٤ لە ژێر ناونیشانی (چاو چاو) بڵاویانکردەوە و وتیان:

( تکائەکەین لەوانەی ئەیانەوێ ڕەخنەیەك بگرن یا وەرامبدەنەوە بە چەشنێکی ئەدەبی بێنە کایەوە و دیسان هەتا دەتوانن مەرامەکەی خۆیان بە کورتی بنووسن و هەم لە پەردەی نەزاکەتی نەکەنە دەرەوە )[1]

ئێمە وەك تێبینیدەکەین ئەم بانگەوازە تا ڕاددەیێکی زۆر لە شوێنی خۆیەتی، بەڵام پرسیاریش لێرەدا ڕوودەکاتە بەرپرسیارانی گۆڤاری گەلاوێژ و هەموو گۆڤارێکی دیکەی کوردی و دەپرسێ: کەوابوو بۆچی ڕێگای بڵاوکردنەوە دەدرێت بەو وتارانەی، کە پەردەی نەزاکەت دەدڕێنن و لە شێوازی زانستی دەچنەدەرەوە؟

هەر چۆنێك بێت لێرەدا با بابدەینەوە سەر وەڵامەکەی مامۆستا هەوری و بزانین لە سەر ڕەخنەکەی مامۆستا بێکەس، کە لە هەمان ژمارەدا بڵاوکراوەتەوە؟ کەوابوو با وێنەی ئەم بارە چلۆن چووە بەڕێوە؟

## • ناونیشان و ناوەڕۆک

مامۆستا بێکەس لە هەڵسەنگاندنی چوارخشتەکییەکانی مامۆستا هەوری لە ژێر ناونیشانی ( پەیڕەویکردنی خیام ) دا بڵاوکراونەتەوە. سەرنجمانی بۆ ئەوە ڕاکێشاوبوو، کە ناو و فەلسەفەی خیام هیچ پەیوەندییەکی بە ناوەڕۆکی ئەو چوارخشتەکییانەوە نییە.

مامۆستا ئەبوبەکر هەوری ئەم سەرنجەی مامۆستا بێکەسی بەرپەرچدایەوە و وتی:

( جاری ڕەخنەتان لە عینوانی شعرەکان گرتبوو، وا لەبەر ئێوە وەرامەکەتان ئەدەمەوە،

---

١ بڕوانە ژمارە (٤)ی ساڵی ٥ی نیسانی ١٩٤٤ی زایینی لاپەڕە (٦٥) گۆڤاری گەلاوێژ.

ئەگینا شتێکی وای تێدانییە، هەموو کەس ئەزانێ یەکێك، کە ناو لە شتێك ئەنێ لەسەر ئیجتیهاد و ئارەزووی خۆیەتی، بە تەواوی بۆ ئەوە نییە ئیسم و موسەمای موتابیق بێ، مەسەلەن پیاوێك کوڕەکەی ناو ئەنێ سەلاحەددین کەچی ئەو کوڕە ئەبێ بە جوتیار ئەمە چ گوناهێکی باوکی تێدایە نەبوو بە سەلاحەددینی مەشهور، من کە ناوی خیامم هێناوە مەعنای ئەوە نییە، کە من خۆم خیامم یان بە تەواوی هاوبیری خیامم، ئەگەر وا بوایە ئەبوو هەمیشە لە مەیخانەدا بوومایە.)[1]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە مامۆستا هەوری لەوەی توانجەگرتنە مامۆستا بێکەس بە هیچ جۆرێك وەڵامەکەی شایەنی پێقایلبوون نییە، بۆیە مامۆستا بێکەس خۆیشی ئەمەی بەرپەرچدایەوە و وتی:

(مەبەست لە ڕەخنەگرتن لە ئەشعار و ئەدەبیات، ئیسلاح و ڕێگا نیشاندانە نەك شەڕە قسە، بە وەڵامەکەی گەلاوێژی ژمارە "٤"ی سالی "٥" تانا وا دەرکەوت، کە دڵگیربوون، منیش وام بە ئێوەدا ڕانەئەپەرموو، کە ئەوەندە کەم چیکلدنە بن و ئامۆژگارییەکانم بە خراپ تێبگەن. ئایا نەتبیستووە کە پێشینان وتوویانە: "دۆستم ئەوەیە کە ئەمگرێنێ" جا با بێینەوە سەروکاری وەڵامەکەت.

من خوا نەخواستە چۆن بە تۆ ئەڵێم خۆت ناوناوە (عومەر خیام) مەبەسی من ئەوە بوو کە کەسێ پەیرەوی کەسێکی کرد ئەبێ یان شان بە شانی ئەو کەسە بڕوا بە ڕێدا یا هیچ نەبێ نەختێ لەو بچێ، خۆ بە ناشوکری نەبێ شعرەکانی ئێوە هیچ فڕێکی بەسەر شێوە و بیر و ئسلوبی خیامەوە نییە)[2]

ئاشکرایە کە مامۆستا بێکەس لێرەدا خاوەن حەقە، چونکە ناونیشان دەبێت لە ناوەڕۆکەوە هەڵهێنجرابێت و مۆری جیاکەرەوەی بێت و ناونیشانی کتێب و هەڵبەستیش وەکوو ناوی ئادەمیزاد نییە، کە مامۆستا هەوری دەیکات بە بیانوو بۆ نەگونجانی ناونیشانی هەڵبەستەکانی لەگەڵ ناوەڕۆکەکانیدا.

## • خەڵکی و هەڵسەنگاندنی هۆنراوە

مامۆستا ئەبوبەکر هەوری لە سەلماندنی نرخی چوارخشتەکییەکانیدا، پشتی بە هەڵسەنگاندنی خەڵکی بەستووە و وتوویەتی:

---

١ گەلاوێژی ژمارە (٣)ی سالی (٥)ی مارتی سالی ١٩٤٤ی زایینی، ل ٦٢

٢ بڕوانە گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٥) سالی ١٩٤٤، ل ٥١

(من لە پێش ئەوەدا ئەو شعرانە بنێرم بۆ گەلاوێژ و لە پێش ئەوەشدا ئێوە بڵێن، نیشانی چەند کەسێکم دابوو، بە پێچەوانەی ئێوەوە ئەوان بەلایانەوە چاك بوو، ئەوەتان بۆ نەچووە سەر کە وتبووتان: نەك من بە تەنیا هەرچی خوێندەواران هەیە هەموو لەم شعرانە بێزار و وەڕس بوون. ئەمێنێتەوە سەر ئێوە و هاوبیرەکانت بە تەنها ئەوەندە وەکالەتێکی عامی قبوڵ ناکرێت.)[1]

مامۆستا هەوری کە کەسایەتی پەسندکەرەکانی بەرهەمەکەی بەو جۆرە دەستنیشانکردووە، مێژوونووسی ڕەخنەسازیی کوردی بۆی هەیە، کە بڵێ: ئەو کەسانە پسپۆڕ و وێژەر نەبوون، بۆیە مامۆستا فایەق بێکەس ئەم تێبینییە بە هەل وەردەگرێ و دەڵێ:

( ئەو کەسانە کێن نیشانت داون خۆت وتووتە؟ ئایا نیشانی زێوەر و بێخود و پیرەمێرد و سەلام و شێخ نوریت داوە؟ ئەگەر ڕاست ئەفەرمووی پێم بڵێ کامیان لە پێش ئەوەدا کە بینێری بۆ گەلاوێژ دیویانە؟ وەکوو من بزانم تەنها بۆ سێ چوار کەسێکی نەشارەزات خوێندوەتەوە، کە بە باشەییەکی ئەوان دەسخەڕۆبوویت و لە گەلاوێژا بڵاوتکردەوە. بۆ ئەوەی زۆر درێژەی پێنەدەین ئەم دەعوایەمان کە عیبارەتە لە چاکی و خراپی ڕوباعییەکانت، کە لە گەلاوێژی ژمارە ٢ ی ساڵی ٥ دا نووسراوە حەواڵەی ڕای وجدانی شاعر و ئەدیبانی کوردی ئەکەین و بە پەرۆشەوە تکایان لێئەکەین، کە بیروباوەڕی خۆیانمان لە لایەن ئەو روباعیانەوە لە گەلاوێژا بۆ بنووسن، کە بە تەواوی پێ لە ناتەواوی شعرەکانی خوت بنێ و جارێکی تر تووشی هەڵەی وا نەبیت )[2]

مامۆستا فایەق بێکەس کە لەم دەقەدا هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژە و کاری ڕەخنەسازیی تەنیا دەدا بە دەستی پسپۆڕ و وێژەرە شارەزاکانەوە، کە بەڕاستی لەم کۆڕەدا خاوەنی خیبرە و تاقیکردنەوەن و لە ڕێگای زانست و تەجرەبەوە بڕیاری چاکە و خراپەی کاری ئەدەبی بدەن.

کەچی مامۆستا ئەبوبەکر هەوری بیروڕای لەم ڕووەوە روون نییە، لە کاتێکدا دەبوو، هەڵوێستی خۆی بە ئاشکرا بچەسپاندایە.

هەرچۆنێك بێت ئەم بارە ڕەخنەسازییە لە چوارچێوەی مێژووی ڕەخنەسازیی کوردیدا خۆی بەسەر سەردەمی ئێمەشدا کێشاوە و تا ڕاددەیێکی زۆر پسپۆڕی و شارەزایی ناکرێ بە مافی ڕێپێدەری وێژە هەڵسەنگاندن، بەڵکوو بە پێچەوانەوە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەم ڕۆژانەماندا، بە زۆری هەڵسەنگاندن لە لایەن ناپسپۆڕ و ناشارەزاکانەوە لە کۆڕی ڕەخنەسازی و نرخێندانی کاری زانستیدا بڵاودەکرێتەوە، کە بەڕاستی خاوەنەکانیان سنووری ڕاستی حەقیقەت دەشکێنن و زۆر جاریش زانیاری بڵاودەکەنەوە و بیرۆکەی ڕاستینە و مێژوویی دەستکاریدەکەن.

---

١ بڕوانە گەلاوێژی ژمارە (٤) ساڵی (٥) نیسانی ١٩٤٤ی زایینی، ل ٦٢

٢ بڕوانە گەلاوێژی ژمارە (٥)ی ساڵی (٥)، مایسی ١٩٤٤، ل ٥١ - ٥٢

زیانی ئەو بارە ڕۆشنبیرییە زۆر زیانبەخش و ڕێگاتێکدەرە و نابێت ئیتر لەمەودوا لە خنکاندنی حەقیقەتدا بەردەوامبێت، چونکە نزیکەی نیو سەدە لە مانەوەیدا زۆر زۆرە.

## • زمانی ڕەخنەسازی و سازکردنی وێژە

زمان کە لە وشە و دەربڕین و ڕستە پێکهاتووە، ئاوێنەی هەست و نەست و عەقڵی دوێنەر و قسەکەرە، هەروەها پردێکی جادووگەرە لە نێوان خاوەنەکەی و ئەوانەی گوێیان لێدەبێت یان دەینووسنەوە.

سەرئەنجام زمان هەمیشە شوێنەوارێکی گرنگ بە جێدەهێڵێت و دەبێتە هۆی ئاکامێکی چاك یان خراپ، بۆیە لەم ڕووەوە دووپاتکراوەتەوە، کە ڕەخنەساز و وێژەر پێویستە هەر یەکێکیان ئاگای لە زمانی دەربڕینەکەی بێت.

پرسیاریش بە بۆنەی شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە لە لێکدانەوەی مامۆستا هەوری و هەڵسەنگاندنەکەی مامۆستا بێکەس دەپرسێ: ئەم دوو نووسەرە کوردە چلۆن ڕەفتاریان کردووە؟

مامۆستا بێکەس توانجی ئەوەی لە مامۆستا هەوری گرتبوو، کە لە چوارخشتەکییەکانیدا هەندێ وشەی و دەربڕینی بێنەزاکەتی بەکارهێناون، بۆیە مامۆستا هەوری توانجگرتنەکەی بەرپەرچدایەوە و وتی:

( ڕەخنەت لە شعرەکانە، کە نەزاکەتیان کەم تیایە، کەچی ڕەخنەکەت درۆزنیش نەزاکەتی تیا نادۆزیتەوە، بێجگە لەمەش ئەم ڕەخنەیە ڕاستەوخۆ بۆ زمانی کوردییە، چونکە زمانەکەمان بێ پێچ و پەنا بە سەربەستی شت ئەڵێت: بۆ ئیسپاتی ئەمەش وا چەند قسەیێکی پێشینان ئەنووسین، کە وەختی خۆی لە ژیان و گەلاوێژدا نووسراون و لە نەزاکەتدا هەروەك هینەکانی من وان، جا نازانم بۆ چ ئەو حەلە ئەو ڕەخنەیەت نەگرت و نەتفەرموو ئەم قسە و پەندی پێشینانە نەزاکەتیان تیانییە، وازیان لێبێنن با لە بیربچنەوە:

**١- نان بدە بە سەگ مەیدە بە سپڵە.**

لێرەدا سەگ تەرجیح دراوە بەسەر سپڵەدا.

**٢- دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە.**

ئەمیش هەر مەبەس ئینسانە )[1]

مامۆستا فایەق بێکەس ئەم وەڵامدانەوەیەی مامۆستا هەوری خستەبەر خامەی بەرپەرچدانەوە و وتی:

---

١ بڕوانە گەلاوێژ ژمارە (٤)، ساڵی (٥)، نیسانی ١٩٤٤، ل ٦٣

( جەنابی مامۆستا ا. ب. هەوری ڕەخنەکەی من وەکوو فەرمووتانە بۆ زوبانی کوردی نییە، تەنها بۆ شعرەکانی تۆیە، کە ڕەونەق و نرخی زوبانی کوردی شکاندووە، هەر کەس بیخوێنێتەوە بە هۆی ئەوەوە نەفرین لە هەموو شعرێکی کوردی ئەکا، ڕەنگە ئێوە وا بزانن کە شعرەکانتان نموونەی بەلاغەت و فەساحەتی زوبانی کوردییە و هەر کەسێ ڕەخنەی لێبگرێ وەکوو ڕەخنەی لە زوبانی کوردی گرتبێ وایە، ئەگینا کەی من ڕەخنەم لە زوبانی کوردی گرتووە؟ چۆن من قسە و پەندی پێشینان بە ناشیرین ئەژمێرم؟ چونکە هەر کەسە نەختێ تێگەیشتنی ببێ ئەزانێ ئەوانە نایابن و لە جێگای خۆیا بە کارهێنراون. تێناگەم ئەمە چ دەخلێکی هەیە بە سەر روباعییەکانی تۆوە )[1]

لەبەر تیشکی ئەم دوو دەقەدا ئەم ڕاستیانەی خوارەوەمان بۆ ڕاستەبنەوە:

١- مامۆستا ئەبوبەکر هەوری دەستی بەوە کردووە، کە بەکارهێنانی وشەی سەگ و سپڵە و شتی وا لەم بابەتانە لە چوارخشتەکییەکانیدا چەژە و زەوقی تێدانییە، بەڵام بیانووی بۆ پاکانەکردن لەم کارە پەندی پێشینانی کوردییە، کە وشەی ئاوایان بەکارهێناوە.

٢- مامۆستا بێکەس بە چەشنێکی زانستی ئەو بیانووەی بەرپەرچدەداتەوە و دەیسەلمێنێ، کە وشە و دەربڕین خۆی لە خۆیدا لەنگ و بێ نەزاکەت نییە، بەڵام شوێنی بەکارهێنانیان بڕیاری سروشتیان دەدات. بە مانای ئەوەی وشەی سەگ و سپڵە ئەگەر هاتوو لە شوێنی خۆیدا بەکارهاتبوو و مانای هەڵبەستەکە پێویستی پێیان بوو، ڕەوان دەبن و چێژ و زەوق پێیان قایلدەبێ. بە پێچەوانەی ئەمەشەوە ئەگەر لە شوێنی خۆیان نەبوو کەس پێیان ڕازینابێت.

## • ئەرکی ڕەخنەساز

خوێنەری ئەم دەمەقاڵە وڕێژییەی نێوان مامۆستا ئەبوبەکر هەوری و مامۆستا فایەق بێکەس، کە هەڵدەسەنگێنێ جگە لە وێنەی شەڕەقسە و توانج و پلارگرتنە یەکتر هیچی دی نابینێ، ڕەنگە بپرسێت ئایا مامۆستا فایەق بێکەس کە بەشداری ئەم جۆرە ڕووداوەی کردووە، لە چ ڕوانگەیەکەوە خۆی تووشکردووە؟ ئایا ئەو کارە بە ئەرکێك دەزانێ یاخود لە مەیل و ئارەزووی دوژمنایەتییەکی کەسییەوە هەنگاوی هاوێشتووە؟

مامۆستا بێکەس لە ژمارە ٧ ی گۆڤاری گەلاوێژ، مانگی ٥ ساڵی ١٩٤٤ لە ژێر ناونیشانی: (سەرنجدانێك لە ئەدەبیاتی مەنگوڕی ) ناڕاستەوخۆ وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە و وتویەتی:

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢

( ئەوەتەی لە گەلاوێژا بەشی لێکۆڵینەوە تەرخانکراوە من زۆر تووشی دەردی سەری و ناخۆشی بووم، باوەڕم پێبکەن لە ژینی خۆم بێزارم هەروەکوو پێشینان وتویانە: دارێکم بە دەستەوەیە هەر دوو سەری..... نازانم چی بکەم؟ ئەگەر ڕەخنەم لە شعری کەسێ گرت ئەو کەسە لە خۆڕایی لێم ئەبێتە دوژمنی بە خوێنی سەرم تینوو، چونکە داخەکەم ئێمە هێشتا لە مەعنای ڕەخنەگرتن نەگەیشتوین، بە جنێوی ئەزانین، ئەگەر قسەش نەکەم و هەرچییەکم دی چاوی لێبنوقێنم و بە سەریا بڕۆم و گوێی نەدەمێ ئەوەش نابێ، چونکە زۆر بە گوناهێکی گەورەی ئەژمێرم. ئەگەر ناوەڵێکم ڕێگا هەڵە بکا، ڕێی نیشاننەدەم و نەیخەمە سەر شەقامی ڕاست، بە شەرتێ خۆشم شارەزای ئەو ڕێگایە بم. جا لەبەر ئەم دوو سەبەبە کە باسمکرد سەرم لێشێواوە و زۆر خراپ داماوم، نازانم چی بکەم؟! لەگەڵ ئەوەشدا من گوێ نادەمە هیچ کەس و لە ڕەخنەگرتن هەتا پێم بکرێ دەستهەڵناگرم، چونکە بە پێویستی ئەزانم لە سەر شانی خۆم بۆ بەرزبوونەوەی ئەدەبیاتی کوردی هەتا لە توانامابێ هەوڵبدەم و درێغی نەکەم )[1]

مامۆستا فایەق بێکەس لەم دەقەدا هەرچەندە لە پێشەکی قسەکانیدا خۆی بە ( ڕاڕا ) نیشاندەدات و وا دەردەخات، کە نازانێ لە دەست هەستیارە کوردە تازە پێگەیشتووەکان چ هەنگاوێ هەڵبگرێ، بەڵام لە کۆتاییدا بڕیاری ئەوە دەدات، کە ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجامبدات.

ئەم وێنەیە بەڕاستی لەم ڕۆژانەدا تازە دەبێتەوە، چونکە کاری ڕەخنەسازیی لە لایەن زۆربەی خوێنەرەکانماندا وەکور مەسەلەیێکی کەسایەتی لە قەڵەمدەدرێت و بە شەڕە دەمارگرتن تەماشادەکرێت.

مامۆستای هۆنراوەشووناسی میللەت دۆست، هەڵبەت بەو چاوە ناڕوانێتە مەسەلەکە، بەڵکوو کاری ڕەخنەگرتن و سازکردنی پێوانەی هەڵسەنگاندن بە تاقە ڕێگای خەملاندن و پێشکەوتنی وێژەی کوردی دەزانێ، بەمەرجێك هەنگاوهەڵگری شارەزا و پسپۆڕ و خاوەن تەجرەبە و ئەدەبدۆست بێت. کەوابوو: مامۆستا بێکەس چل ساڵ لەمەوبەر ڕەخنەسازیی کوردی لە سەر سێ بناغە دامەزراندووە:

**١- تەماشاکردنی ڕەخنەسازی وەکوو ئەرکێك.**

**٢- خزمەتکردنی وێژەی نەتەوایەتی وەکوو ئامانجێك.**

**٣- شارەزایی لە کاری ڕەخنەسازیدا.**

---

[1] ١ بڕوانە گەلاوێژ ژمارە (٧)ی ساڵی (٥)، تەمموزی ١٩٤٤، ل ٦٢

## • مامۆستا گۆران و کەڵکی ئەدەب

لە ژمارە ( ٥، ٦ )ی گۆڤاری گەلاوێژی مانگی مایس و حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٤ ی زایینی هەستیار و هونەرمەندی کورد مامۆستا عەبدوڵڵا گۆران وتارێکی بەنرخی بە ناونیشانی ( کەڵکی ئەدەب ) بڵاوکردەوە.

ئەم وتارە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە تەزەرییەی ئەدەبەوە هەیە و بەشداری جیاوازێکی بیری و هونەری دەربارەی کەڵك و بێکەڵکیی وێژە بۆ کۆمەڵ دەکات و وەڵامی پرسیارێکی گرنگ دەداتەوە، کە دەپرسێت: ئایا کۆمەڵگای کوردی پێویستی بە زانست هەیە یان بە وێژە بۆ ئەوەی بتوانێ ڕێگای پێشکەوتن بگرێتەبەر و خۆی بگەیەنێتە ڕاددەی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان.

## • بەراوردکاری لە نێوان زانست و وێژەدا

مامۆستا گۆران لـە وێنـەی چیرۆکێکدا و بە شێوازێکی دەمەتەقێی بیـروڕای چەند خوێندەوارێکی کورد دەرحەق بە سوودی زانست و بێکەڵکی وێژە دەردەبڕێ و دەڵێ:

( لە سووچی چایخانەیەکدا کۆڕیکی بچووکمان گرتبوو، لە نووسراو (کتێب) ئەدواین. لە ناومانا یەکێك لێوی لە باسی نووسراوی ئەدەبی هەڵقرچان بە ساردییەوە وتی: من هەزار نووسراوی ئەدەبیم لا پولێکە، کام نووسەر کە ئەڵێی بە ناوبانگە هەر نووسراوێکم بدەیتێ ناتوانم لاپەڕەیێکی لێبخوێنمەوە، بەڵام نووسراوی زانست (علم) هەر مەپرسە، بەرگێکی گەورەی فیزیا لە ماوەیێکی کەمدا ئەخوێنمەوە و کە تەواوی ئەکەم وا ئەزانم خەوێکی خۆشم دیوە.

یەکێکی تر هەڵیدایە و وتی: ئەدەب چییە؟ وڕێنە و خەیاڵپڵاوە، بە ڕاستی هەر نووسراوی زانستە کار بکاتە سەر ئیقتیسادیاتی وڵات و پێشکەوتن و بەختیاریی میللەت، ئەگینا زگی برسی بە وتاری پفهەڵدراو تێرنابێ و هەزار کەلیمەی ڕازاوە و سەد خەیاڵی دوور و درێژ پولێکی گیرفان ناکا بە دوو.

هەروەها سێیەمیش پشتی هاوڕێکانی گرت و وتی: بێگومان ئەمەیە جیاوازی خستۆتە میانی گەلەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، ئەبینین ڕۆژهەڵاتییەکان چاویان بڕیوەتە ئاسمان لەبەر ئەمە ناتوانن هەنگاو بۆ پێشەوە بنێن، لەسەرەتای ژیانیانەوە چۆن بوون هەروەها ماونەوە و لە جێی خۆیان چەقیون، پێشکەوتنیان بۆ نییە؟!

بەڵام ڕۆژئاواییەکان، چونکە ئەزانن هۆی ژیانیان لەسەر زەوییە، هیچ بە تەنگ ئاسمانەوە نین، چاویان بڕیوەتە بەردەم و دەور و پشتی خۆیان، مێشکیان تەنیا بە هەوڵدان خەریك ئەکەن

بۆ هەڵگرتنی قۆرتی سەر ڕێگایان و هەتا دنیا بمێنێ لە ڕۆژهەڵاتییەکان دوورئەکەونەوە)[١]

مامۆستا گۆران بە هەمان شێواز لە سەر گێڕانەوەکەیدا، بەردەوامدەبێت و دەڵێت:

(منیش هەر لە سەرەتای گفتوگۆوە تا ئەهاتم پیشم ئەخواردەوە، دوایی کەوتمە جوڵە و ویستم بە کەلەبەرێک بەری لافاوی پێشم بەربەڵاکەم، بەڵام ئەم هاوڕێیەی دواییم گورج بواری نەدام و لەسەر وتارەکەی خۆی ڕۆیشت: لەبەر ئەوە من ئەڵێم ئەگەر بمانەوێ لە سەر بناغەیێکی باش کورد پێبگەیەنین و بیخەینە ڕیزی گەلە هاوچەرخەکانەوە پێویستە واز لە شعر و ئەدەب بێنین و ڕێی ڕووناکی زانست و ڕاست - حەقیقەت — بگرینەبەر )[٢]

## • مامۆستا گۆران و ئەرکی وێژە

مامۆستا گۆران پاش ئەوەی ئەو دەمەتەقێیەی تۆمارکرد، سەرنجی خوێنەرەکانی گەلاوێژی بۆ زیانی ئەو بیروڕایانە ڕاکێشا و دووپاتیکردەوە، کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ئەم چەشنە قسانە بەرپەرچدراونەتەوە و هیچ کەسێك بە دەهۆڵ و زوڕنای خۆی تێر هەڵناپەڕێ.

سەرئەنجام ئەم هونەرمەندە چەند سەردێڕێکی لەم خاڵانەی خوارەوە دەستنیشانکرد و بۆ وەڵامدانەوەی بیروڕای ئەو خوێندەوارە کوردانە:

١- ئەدەب چییە

٢- بەراوردی ئەدەب لەگەڵ زانست و کارسازی لە تەك دەزگاکانی تری کۆمەڵایەتی

٣- بە تایبەتی کەڵکی ئەدەب بۆ کورد

مامۆستا گۆران لە شیکردنەوەی ئەم خاڵانەدا وتی:

( لە دنیادا هەروەکوو ئینسانێك نابینی، ئەگەر یەکێك لە پارچە ئەساسییەکانی لەشی ناتەواو بێت، بۆ نموونە: مێشك، دڵ، جیهازی هەناسە، جیهازی خواردن و هەزم، هەروەها میللەتێکیش نابینی ئەدەب و شیعری نەبێ، کە لەگەڵ ئایین، ڕەوشت و خوو، زوبان، تاریخ، هەریەکە چەشنە کەرتێکی لەش لە میللەت دروست ئەکەن.

قەومێکی ئینگلیزی بێ ئەدەبی ئینگلیز، قەومێکی فرانسزی بێ ئەدەبی فرانسزی، قەومێکی ژاپۆنی بێ ئەدەبی ژاپۆنی، هێنانەبەرچاو چەن دوورە لە ڕاستی ببنە سەر کەڵکی ئەم پارچەیە بۆ لەشی میللەت، دڵ ئەو مەلەکەیەی هەست بە شادی و خەفەت ئەکا لە دەروونی ئینسانا بۆ ئینسانێك چی ئەدەبیش بۆ کۆمەڵ کتومت ئەو شتەیە، بۆ تاکێکی

---

١ گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (٥ و ٦)ی مایس و حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٢ی ساڵی (٣)، ل ٢٤ - ٢٥

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥ - ٢٦

(فەردێکی) کۆمەڵیش لە باری کۆمەڵایەتییەوە هەر ئەومیە.

پیاوێك بێنەرە پێش چاو، تووشی چەشنە نەخۆشییەك هاتبێ ئەو جوانیانەی لە زەوی و ئاسمانا هەیە، لە ڕەنگ و دەنگ و بۆ، هەست بە هیچ کامیان ناکات.

ئەو تامەی کە لە وتاری خۆشدا هەیە، ئەو جوانییەی لە کردەوەی شیرینا هەیە، ئەو بەرزییەی لە ڕەوشتی چاك و پاکا هەیە، ئەو ڕووناکی و بریسکانەوەیەی لە بیر و باوەڕی ڕاستا هەیە، هەمووی لا هیچ بێ؟

لە بەهرەی چێشتنی ئەمانە بەشبڕاو بێ. تکا ئەکەم ئەم کلۆڵە کە بە فەرزی مەحاڵ دروستی ئەکەین ئەبێ نرخی ژیانی چەن بێ؟

باوەڕبکە ئەدەب نەبووایە کە - سوپاس بۆ کردگار- ئەم نەبوونە سەری نەگرتووە ئێمە هیچ کاممان؟ بەوانەشەوە کە بە چاوی سووك بە ئەدەبا ئەڕوانن، ژیانمان لە ژیانی ئەو پیاوە باشتر و خۆشتر و بە مەعناتر نەئەبوو، ئەدەب و شعرە و بە تێکڕایی هونەرە جوانەکان، ئێمە وا لێئەکا لە کاتێکدا لەگەڵ گاجوت لە سەر ئاخوڕێك نەلەوەڕێین، لە لایێکی ترەوە گیانمان ژیانی دەروونیمان لەگەڵ فریشتە دەست لە گەردن بە ئاسمانەکانا بسوڕێتەوە - هەر ئەوە لە شەڕەشەقی ژیانا تاوە نا تاوێك لەشی شەکەتیمان ئەگرێتە باوەش، دڵی سەغلەتمان ئەلاوێنێ، گیانی ماندوو و مردوومان ئەحەسێنێتەوە.

هەر ئەوە تاوێك ئەبێ بە زوبانی فەلسەفە، تاوێك ئەبێ بە زوبانی سەرکردەی شۆڕش و ڕاپەرینەکانی گەل لە بێداریمان ئەورووژێنێ، ئەمانکا بە گژ جەور و ستەما، بێزارمان ئەکا لە خراپە، هانمان ئەدا بۆ چاکی، بۆ ڕاستی بۆ داد و ئینساف.

ئەو کەسانەی نرخی ئەدەب ناسەلمێنن، بۆ عیبرەت (پەند) لە ئینگلیزەکان وەرناگرن، کە ڕازین بەوە هندستانیان لە دەست دەرچێ نەك شکسپیرلە تاریخی ئەدەبیان کەمبێتەوە، بە تایبەتی ئەدەب بۆ کورد، کە لە سەرەتای دروستکردنی هەستی میللی دایە چەشنی هیچ پێویستییێکی تر نییە.

بۆ چاوێك بە تاریخی ئەو قەومانەدا نەگێڕین، کە لە پێش کورددا ئەم شەقامەیان بڕیوە و لە ئەنجامدا بە ئاوات گەیشتوون؟

لەم لاپەڕە درێژانەدا ئەخوێننەوە، کە هەر قەومێك گەیشتبێ بە پایەی شارستانی لە پێش هەموو دەزگایێکی تری کۆمەڵیدا، وەك دەزگای زانست و کارسازی بازرگانی، ئایینی، دانانی دەستوور. دەزگای ئەدەبی دامەزراندووە. لە پێشەوە درەختی شعر پێگەیشتووە، بەری تەواوی دەمی کۆمەڵی شیرین کردووە، ئەوسا دەزگاکانی تری کۆمەڵایەتی لە سەر بنج و ریشەی ئەم

چوزەرە نەمامیان دەرداوە. لە ناو یۆنانییەکانا شعری هۆمیرۆس پێش فەلسەفەی ئەفلاتون، زانستی ئەرستۆ، دەستووری سولون، ئاوەدانی چەرخی بەرەکلیس کەوتووە.

عەرەبەکان حەوت هەڵواسراوەکەی شعریان لە پێش موعجیزەی ئیسلام و شارستانییەتەکانی دەوری ئەمەوی و عەباسیدا هاتۆتە دنیاوە )[1]

بەم جۆرە کەڵکی ئەدەبی لە زمانی ویژەرێکی بە ناوبانگی کوردی وەك مامۆستا (گۆران)ەوە دەچەسپێنرێ.

## • شێخ سەلام و چوارینەکانی خیام لە تای ترازووی دڵداری هەستیاردا

دڵداری هەستیار لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ١، ٢ ی مانگی کانونی دووەم و شوباتی ساڵی ١٩٤٣ وتارێکی ویژەیی و ڕەخنەسازیی بە ناوی (عومەر خیام)ەوە دەربارەی چوارینەکانی ئەم فەیلەسووفە، کە لە لایەن شێخ سەلام - ەوە کراوە بە کوردی بڵاوکردەوە، لە وتارەکەدا ئەم بیرۆکە سەرەکیانەی تێدا چەسپێنراوە:

- ڕاددەی هونەری و سەرکەوتنی شێخ سەلام لە وەرگێڕانەکەیدا..
- سوودی وەرگێڕانی چوارخشتەکییەکانی عومەر خیام بۆ ئەدەبیاتی کوردی..
- هەڵوێستی خەڵکی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەرحەق بە فەلسەفە و چوارخشتەکییەکانی خیام..
- هەڵسەنگاندنی ڕاستەقینە لەم ڕووەوە..

ئێمەش بە پێی بۆچوون و توانای خۆمان هەوڵدەدەین، کە ئەم بیرۆکانە شیبکەینەوە بە نیازی سوود گەیاندن بە ویژەی کوردی.

## • شێخ سەلام و وەرگێڕانی چوارخشتەکییەکانی خیام

دڵدار لە پێشەکی وتارەکەیدا، کارەکەی شێخ سەلام هەڵدەسەنگێنێ و پەنجە بۆ ئەو هۆیە درێژدەکات، کە پاڵیپێوەناوە لەم کۆڕە ئاڵۆز و پڕ مشتومڕەدا، بەرهەمی وا بە زمانی کوردی پێشکەشبکات.

(سەرئەنجام لەم ڕووەوە توێژەرەکەمان دەڵێ:)

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٨ - ٣١

( شاعیری شیرین وتار- شێخ سەلام - بەرەبەرە ڕوباعیاتەکانی خیامی بە کوردی هەر بە هەڵبەست هەڵگێڕایەوە، پەیدەرپەی لەم گۆڤارەدا بڵاویکردوونەتەوە.

ئەم هونەرمەندییەی وا بەرز و ئەم کاری وا گران لە مێشکێکی هونەرمەندی وەك سەلام نەبێ نەوەشاوەتەوە، لای هەموو لاوێکی ئەدەبپەروەر ئاشکرایە، سەلام وەنەبێ هەر لە خۆڕایی ئەم کارەی گرتبێتە شان یا بۆ خۆ پێهەڵکێشان، ئەم گرانبارییەی هەڵگرتبێ، بەڵکو مرازی لەم ماندوبوونە ئەوەیە، کە وەك ئاوێنەیێکی ڕوون بە تیشکی عەکس ڕۆژی ئەندێشە "خیام" تاریکایی ئەدەبیاتی کورد ڕۆشنبکاتەوە.)[1]

کە ئەمە سوودی کارەکەی شێخ سەلام بێت، دڵداری هەستیار بە گشتی ستایشی کردبێ، مێژووی ڕەخنەسازیی کوردی داوا لەم ڕەخنەسازە کوردە دەکات کە هۆیەکانی ئەم ستایشە بدرکێنێ و بیانخاتەڕوو. دڵداری ڕەخنەساز دیارە هەستی بەم مەسەلەیە کردووە، بۆیە لە باسەکەیدا بەردەوامدەبێت و دەڵێ:

( بەڵام - سەلام - لەم کارەی سەرکەوتووە یان نا..؟ ئەمە شتێکی زۆر ئاشکرایە کە هەموو هەڵگێڕانەوەیەك (ترجمە) تام و بۆ و ڕووناکی جارانی هەندێ سووك ئەکا، ئەگەر شێخ سەلام لەم کردەوەیەدا هەندێکیش لە جغزی (دائیرە) دارشتن و ڕەونەقی ئەدەبی خیام چووبێتە دەرەوە، ئەمە شتێکە، کە هەرگیز نابێ بکرێتە کوتەکی دەستی ڕەخنەبازان - ناقد - بەڵکوو بە پێچەوانەی ئەمە پێویستە چاوی هاندانی بکرێتەوە و دەستی ئافەرینی لە پشت بدرێ.

نامەوێ لەم نووسینەدا سەرتاپا باسی سەلام و چوار خشتەکییەکانی تێدا بکەم، لەگەڵ ئەمەش ناتوانم خۆم لە پیرۆزە یادی ئەم هونەرمەندییەی سەلام لابدەم، چونکە ڕوباعیاتە کوردییەکانی ئەم، هەندەی فارسییەکانی خیام پڕ نەشئە و بەرزن. بەڵێ ئەدەبیاتی هەموو میللەتێك چەشنە سۆزێك و ئاوێکی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام هەر ئەدەبێك کە بوونی فەلسەفە بەرزەکەی خیامی تێکەوت چەشنە ڕووناکاییێك وەرئەگرێ، کە وەکوو ڕۆژێکی زۆر جوانی بەهاری لە ئاسمانی ئەو ئەدەبیاتەدا ئەدرەوشێتەوە. بێگومان ئەدەبی کورد لە لایەن سەلامەوە بەم تیشکە بە تینە ڕوونبکرێتەوە شتێکی کەم شایانی سوپاسییە)[2]

لەم دەقەدا ئاشکرایە کە دڵدار، بە هیچ ڕەنگێ ڕێبازێکی زانستیی ڕەخنەسازیی نەگرتۆتەبەر بۆ شیکردنەوەی وەرگێڕانەکەی شێخ سەلام و نرخپێدانی هەموو کارەکەی لە جوغزی پیاهەڵدان و هێماکردنێك بۆ کەموکوڕی چاوەڕێکراو لە بەرهەمێکی وا دەرنەچووە.

---

١ بڕوانە گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (١١)، ساڵی (٤)، کانوونی دووەمی ١٩٤٣ ز، ل ٣٤

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤ - ٣٥

سەرئەنجام مێژوونووسی ڕەخنەسازیی کوردی دەتوانێ بڕیاری ئەوە بدات، کە ئەم ڕەخنەسازە کوردە لەم دەقە گرنگەی بابەتی ڕەخنەسازی، کە مەسەلەی وەرگێڕانە هیچ هەڵوێستێکی پێویستی نەنواندووە و ئەرکی سەرشانی خۆی بەدینەهێناوە.

## ● ئەرکی چوارخشتەکییەکانی خیام

دڵداری هەستیار و ڕەخنەساز هەرچەندە وەرگێڕانەکەی شێخ سەلامی بە تەواوی بە پێوانەی ڕەخنەسازی هەڵنەسەنگاند و شینەکردەوە، بەڵام بە دووروودرێژی و بە چەشنە پیرۆزییەك باسی گرنگی چوارخشتەکییەکانی عومەر خیامی کرد و ئەرکی هونەری و بیریان چەسپاند و وتی:

( هەموو میللەتێك ئەم ئەندێشە وردانەی کە خیام ڕاستی بێگومانی پێ ئاشکرا کردووە کەوتۆتە بەرچاو، وە یاخود خیام مامۆستای ئازادیپەروەری ئەندێشە، لە سەر کورسی مامۆستایی دانیشتووە، بە دەنگێکی بەرز لەسەرخۆی بە سامی پڕ مەعناوە، بە لێوێکی کە بۆ شت ئاشکراکردن هەڵقرچابێ. گەلێك پەردەی درۆ و دەلەسەی (خوێنی ئادەمیزادمژانی) بۆ هەموو گێتی دادڕیوە، دەنگی ئازادی ئەمیری خیام چووتە گوێچکەی ئەم ئادەمیزادانەی کە لە زیندانی نەزانیندا بە کۆتی باوەڕی خواروخێچەوە بەندکراون... هەرچەندێکی خیام فەیلەسووفێکی ڕۆژهەڵاتە، بەڵام ئەم چرایە لە سەر زەوی دانرابوو تیشکی بە تینی گەیشتبووە ڕۆژاوا و هەموو دنیا، ژێرەکەشی هەر تاریك بوو، بەڵام ئەم حەقیقەتپەرستانەی، کە لە وڵاتانی دەرەوە چاویان بەو تیشکە هەڵێنابوو، بە دوای کەوتن تا هاتنە ڕۆژهەڵات، ئینجا بە پیرۆزەوە بە زنجیری شۆرەت بە ئاسمانی ئەمری و خلودەویان هەڵواسی، ئنجا ئێمەش زانیمان کە خیام کێیە و چییە ؟ )[1]

دوابەدوای خستنەرووی نرخی چوارینەکانی و نیشاندانی دەوری ئەم فەیلەسووفە لە جیهانی بیر و هونەردا دڵداری هەستیار و ڕەخنەساز، باسی ناحەزەکانی دەکات و دەڵێ:

( ئەم تەم و مژەی کە لە وتاری دوژمنانی خیامدا پەیدا بووبوو، بوو بە هۆی ئەمەی کە تیشکی خیام داپۆشێ، بەڵام لێوردبوونەوەیەك لەمەش وردنەبێتەوە، کە لە سەر چی دوژمنایەتیان لەگەڵ کردووە؟ بە ڕاستی پاسخی ئەم پرسیارە هەموو فەلسەفەی خیامی تێدایە، بە خێرایی پاسخی ئەم پرسیارانە تینووەتی پرسیارکەر ناشکێنێ، پێویستە کە بە چاوێکی لاتەریکانە سەیری خیام و دوژمنانی بکرێ، ئنجا پاسخ بدرێتەوە )[2]

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨

سەرئەنجام دڵدار بیروڕای ڕۆژهەڵاتشووناس و زانا ڕۆژئاواییەکان لەم ڕووەوە پێشکەشدەکات و دووپاتیدەکاتەوە، کە هۆی دوژمنایەتیکردن لەگەڵ خیامدا، نابێت لە سووچی جیاوازی مەزهەبی و ڕەگەزایەتی دابینبکرێ، بەڵکوو دەبێت بزانین کە ئەم هەستیارە بلیمەتە فەیلەسووفێکی ئازادیپەروەر لە ڕێگای هونەری هۆنراوەوە بیرۆکەی سەرفرازی لە هەموو نەریتێکی دواکەوتوو لاساییکردنەوەمێکی ناهۆشمەندی بڵاوکردەوە و دەنگی زوڵاڵی پەردەڕامالین لە سەر ڕاستی هەموو گۆمێکی بیری مەنگ دەشڵەقاند، بۆیە لە ئاکامدا ئەو کەسانەی بەرژەوەندییان لە سەر بناغەی (دواکەوتن)ی جەماوەردا بنیاتنرابوو، بەربەرەکانێی چوارخشتەکییەکانی خیامیان دەکرد و بانگەشەی (پڕوپاگەندەی) خراپیان دەرحەقی بڵاودەکردەوە و بە کافر و خوانەناس و دوژمنی ئایین لەقەڵەمیاندەدا.

هەرچۆنێك بێت دڵداری هەستیار لە کۆڕی پێناسینی خیام و شیکردنەوەی فەلسەفەکەی و باسکردنی هەڵوێستی دوژمنانی تاڕاددەیێکی زۆر سەرکەوتوو بوو، بەڵام لە ڕووی هەڵسەنگاندنی وەرگێڕانەکەی شێخ سەلام نە زیاد نە کەم نەیتوانیوە ئەم کارە ڕەخنەسازییە ئەنجامبدات، چونکە دەبوو بە وردی ڕاددەی هونەری وەرگێڕانەکە یەکالابکاتەوە و بیخاتە تای تەرازووی ڕەخنەسازیی زانستییەوە، بۆ ئەوەی خوێنەری کورد بڕیاری هەڵوێستی خۆی دەرحەق بە کارەکەی بدات و بزانێ ئایا دەتوانێ بەهۆی ئەو وەرگێڕانەی شێخ سەلامەوە لە فکر و هونەری خیام تێبگات یاخود وەرگێڕانەکە پێینەکراوە ئەم هونەر و فیکرە بە زمانی کوردی دەربڕێ.

## • بێکەسی نەمر، مامۆستا کاردۆخی لە تای تەرازووی شیعردا هەڵدەسەنگێنێ

لەم باسەدا لە بیروڕای دوو مامۆستای بەڕێز یەکەمیان هەستیاری بەناوبانگی کورد مامۆستا فایەق بێکەس و دووەمیان محەممەد ئەمین کاردۆخییە دەدوێین، کە لە سەر مەسەلەی ناوەڕۆك و ڕوخساری هۆنراوە لە هەڵبەستێکی مامۆستا کاردۆخیدا دەربارەی زیانی عەبا و پەچە بەرپابوو، ئومێدوارین، کە سوود و کەڵك بە ئەدەب و ڕەخنەسازیی کوردی بگەیەنن.

## • ناوەڕۆکی هۆنراوە

لە مێژووی ڕەخنەسازیی جیهانیدا، کە بابەت و ناوەڕۆکی هۆنراوە لە ڕووی بیر و مەنتقەوە

چەند ڕاست و بە کەڵکی کۆمەڵ بێت، بەهیچ جۆرێ ئەم ڕاستی و کەڵکە نابن بە هۆی بەرزیی خاوەنەکەی لە ڕووی هونەرەوە.

مامۆستای هەستیار فایەق بێکەس دیارە زانستیانە ئاگای لەم ڕاستییە ڕەخنەسازییە هەبووە، هەر بۆیە لە وتارێکیدا بە ناونیشانی (م. کاردۆخی لە تای تەرازوی شیعردا)، کە لە ژمارە ٩ ی گۆڤاری گەلاوێژدا لە ساڵی چوارەمیدا لە مانگی ئەیلوولی١٩٤٣ زایینی بڵاوکراوەتەوە و وتویەتی:

( لەم ڕۆژانەدا هەندێ لە لاوە تازە پێگەیشتووەکانمان لە لایەن عەبا و پەچەوە دەستیان کردووە بە نووسـین و لە (ژین و گەلاوێژ)دا، کە هەندێکی بە شـیعر و هەندێکی بە پەخشـان بڵاوکراوەتەوە، بە ڕاستی شایانی سوپاس و دڵخۆشییە، کە ئەم فکرە بەرزە هاتۆتە ناوەوە و لە هەموو لایەکەوە لێی ئەدوێن.

ئێمە لێرەدا نامانەوێ باسی قازانج یا زیانی عەبا و پەچە بنووسین، بەڵام تەنها مەبەسمان ئەو لاوانەیە کە تازە دەستیان داوەتە قەڵەم و بە خوێن گەرمییەوە خۆیان فڕێداوەتە مەیدانی نووسینەوە. جا لەبەرئەوە کە هەندێکیان نووسینەکانیان کاڵوکرچە، ڕەونەق و جوانییەکی وەها نابەخشن بە ئەدەبیاتی زمانی کوردی و کارناکاتە سەر مێشکی خوێنەواران )[1]

مامۆستا فایەق بێکەس لە سەر ئەم باسە نموونەیەك ئەهێنێتەوە و دەڵێ:

( لەم لاوانە م.کاردۆخی ناو، لە گەلاوێژی ژمارە ٧ ی ساڵی چوارەم، لە ژێر عینوانی - عەبا و پەچە - دا مەنزومەیەکی نووسیوە، ئەگەر باش سەرنجی بدەێ ئەبینن، کە لە چەند بەیتێکی پێشەوەیدا هیچ خراپەیێکی عەبا و پەچەی نەخستۆتە بەرچاو، بە پێچەوانەی ئەو نیازەی کە ویستویەتی لێی بدوێت )[2]

مامۆستا محەمەدئەمین لە هەمان گۆڤاردا - ژمارە ١١ ی ساڵی چوارەم، مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٣ ی زایینی - وەڵامی فایەق بێکەسی دایەوە و لە سەرەتای وەڵامدانەوەکەیدا وتی:

(لە پێشەوە سوپاسی بێ پایانی مامۆستای ئەدیب فایەق بێکەس ئەکەم نەك تەنیا بۆ ئەوە کە منی خستە ناو تای تەرازوی شعرەوە، بەڵکوو بۆ ئەوە کە واجبە لە سەر هەموو کوردێك قەدری بزانێ، بە ڕاستی وتارەکەی زۆر پەسەند و ڕێك بوو. زۆر تەئسیری کردە سەر مێشکی خوێندەواران. چاوی زۆر کەسی پێ کرایەوە، زانرا کە ڕەخنە گرتن زۆر باش و نایابە، سەبارەتە

---

١ گەلاوێژی ژمارە (٩)، ساڵی (٤)ی ئەیلوولی ١٩٤٣ ز، ل ٥٥

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦

بۆ پێشکەوتنی ئەدەبیاتی، زانرا کە شاعر و لاوەکانی کورد نەنووستوون. جا چونکە بۆ هەموو حوکمێك تەمیزنك هەیە و بۆ هەموو لێکۆڵینەومیەك وەڵامێك هەیە وا بە پەلە لەسەر داواکردنی مامۆستای ناوبراو کە لە لاپەرە ٨٥ ی گەلاوێژی ژمارە ٩ ی ساڵی چوارەمدا نووسیبوویان، ئەم چەند دێرەم پێشکەش بە خوێندەواران کرد، تا چاك لە چەوتی و نارێکی وتاری پێشوو تێبگەن و لەو تەلیسمە ڕزگاربین)[1]

کەوابوو مامۆستای ناوبراو دان بە کەڵکی ڕەخنەسازی دەنێت، مافی وەڵامدانەوەش دەدا بە ڕەخنەلێگیراوەکان.

سەرئەنجام تێبینییەکانی مامۆستا بێکەس یەکەیەکە شیدەکاتەوە و سەبارەت بە باسنەکردنی زیان و خراپەی پەچە لە هەڵبەستەکەیدا دەڵێ:

( زۆرتری خوێندەواران شارەزای خووڕەوشتی ئەم ناوچەیەن ئەزانن سەربەستی فکر و ئازادی، دیلی دەستی عادەتی ئەم شوێنەن و هەر لەبەر ئەم جێگەیە بوو، لە پێشەوە بەین بەین شعرەکانی عەبا و پەچەمان شاردەوە و بۆ گەلاوێژمان نەنارد، تا مەبەسەکەمان لە یەکتر پچڕا، تا مامۆستا ف. بێکەس فەرمووی: لە چەند بەیتێکی پێشەوەدا هیچ خراپەیێکی عەبا و پەچەی نەخستۆتە بەرچاو بە پێچەوانەی ئەو نیازە، کە ویستویەتی لێیبدوێ.

بەڵێ ئەمە ڕاستە، بەڵام وەکوو وتم سەبارەت هەر چوار لایە، ناتوانم ئەو بەیتانە بڵاوکەمەوە وەکوو لە شعری دواییا وترابوو، ئەمامی فکر، کە بە هۆی ناوچەوە وشك بوویێ و شعر و پەخشان ئەو فکرە بێبەر و وشکبووە لە هەموو کاتێکدا قابلی تەنفیذ)[2]

مامۆستا کاردۆخی لەم دەقەدا بە هیچ ڕەنگێ سەرکەوتو نییە، چونکە لە پێوانەیێکی بیری و ڕەخنەسازی لایداوەتەوە، کە دەڵێ:

( هەستیار ڕابەری کۆمەڵ و خوڵقێنەری بیئە و دەرفەتە، کەچی خۆی بە ملکەچی تەریت و عاداتی دواکەوتوو پیشانددات.)

ئەمەش ڕەخنەسازیی زانستی ڕێپیشاندەر پێی قایلنابێت.

## ● هەڵوێستی بێکەس لە هونەری وشەسازیدا

وشەسازی لە دارشتنی هۆنراوەدا، هونەرێکی گرنگە. چەند پێوانەیێکی ڕەوانبێژی و ڕەخنەسازی بۆ هەڵسەنگاندنی سازکراوە. مامۆستا بێکەس لە وتارەکەیدا هەڵوێستێکی تایبەتی

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١

لەم ڕووەوە هەیە. بۆیە وتویەتی:

( لە بەیتێکا کاردۆخی چەند وشەیێکی ڕیزکردووە، کە هیچ پێویست نییە و زۆر ناشیرین دێتەبەرچاو، کە ئەڵێت:

پەنا بە خوا لە کاتێکا لە پڕ ڕووبەندی هەڵێنێ

دەمار و گۆشت و ئێسقان دڵی بینەر ئەسوتێنێ

ئێمەش تێناگەین م. کاردۆخی مەبەستی تەنقیدی عەبا و پەچەیە یاخود تەعریفی عیلمی فەسلەجە ئەکات، کە ئەم چوار وشەیەی لە تەنیشت یەك ڕیزکردووە: دەمار، گۆشت، ئێسقان، دڵ. دیسان هەر لەو بەیتەدا ئەڵێت: ڕووبەندی هەڵێنێ - هەڵدێنێ.

ئێمە ئەم تەعبیرەمان نەبیستووە، چونکە نابێژێت ڕووبەند یاخود پەچە هەڵدێنێ، بەڵکوو چاو هەڵدێنێ بێژراوە و بیستراوە )[1]

لەم دەقەدا دوو پێوانەی گرنگ بەرچاودەکەون:

یەکەم: سازکردنی وشەی زانستی لە بەرهەمێکی ویژەییدا. کە مامۆستا بێکەس بەم سازکردنە قایل نییە.

دووەم: بەکارهێنانی دەربڕینێك کە لە ناو خەڵکیدا باونییە، بەرگوێنەکەوتووە.

مامۆستا محەمەد ئەمین کاردۆخی وەڵامی پێوانەی دووەم دەداتەوە و دەڵێ:

( مامۆستای شاعیر واتە بێکەس وتویەتی ئێمە تەعبیری ڕووبەندی هەڵێنێ - یا هەڵدێنێ - مان نەبیستووە. ئەم نەبیستنە نابێتە دەلیل بۆ ئەوەی کە ئەم تەعبیرە ناڕێکە، چونکی هەموو کوردەکانی موکریان و لیوای هەولێر ئەزانن کە ڕووبەند هەڵدێنێ، مەعنای ڕووبەندی لائەدا و بەرز ئەکاتەوە و لەو دوو ناوچەیەدا ئەم تەعبیرە زۆر بە کارئەهێنرێت لەگەڵ ئەمەشا بێتوو ئەمە وا نەبێ دووبارە بۆ تێکنەچوونی وەزنی شعر دروستە بەکارهێنانی، عەرەبەکان لە قاعیدەی عیلمی شعر ئەڵێن:

**يغتفر للشاعر ما لا يغتفر لغيره.**

بۆ نموونە دیقەت لەم شعرە بفەرموون:

**مسجد اسست على التقوى**

**يدخلون بهـا ألو الالباب**

لێرەدا دوو ناڕێکی لەم بەیتەدا هەیە:

١- مسجد موزەکەرە، ئەبوایە (أسس)ی بووتایە نەك (أسست).

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٦

٢- ئەبووایە (یدخلون فیها)ی بووتایە نەك (یدخلون بها ).

ئەم دوو شتە ناڕێکەی لێ قبووڵکراوە لەبەر ئەو قاعیدەی سەرەوە، کە وتمان. خۆ من نێرم بە مێ نەکردووە، خۆ من شتێکم نەوتووە لە کوردستانا نەوترابێ یان نەبیسرابێ )[1]

ئەم وەڵامدانەوەیەی مامۆستا کاردۆخی تا ڕاددەیەك لەوەدا ڕاست و ڕەوایە، کە پەنادەباتە بەر سازکردنی ئەو تەعبیر و دەربڕینە لە لایەن تاقمێك لە کۆمەڵی کوردەواریدا، بەڵام پشتبەستنی بە مەسەلەی سازکردنی دەربڕینی هەڵە بە بیانووی ئەوەی بۆ شاعر و هەستیار هەیە هەڵەبکات، بە هیچ جۆرێك قبووڵناکرێ، چونکە ئەم مەسەلەیە لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا بەو جۆرە نییە، کە مامۆستا کاردۆخی دەیخاتەڕوو.

لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا مەسەلەی (الضرورة الشعرية) ڕێگا بە هەڵە نادات، بەڵام لەبەر تیشکی چەند بنواشەیێکی ڕەخنەسازی دەرفەت بە وێژەری هونەرمەند و خوڵقێنەر دەدرێ، کە دەربڕینی تازە سازبکات و ڕێگای نوێ لە ئەنجامدانی ئەرکی هونەری خۆی بگرێتەبەر و بە هیچ جۆرێك لاسایی کەس نەکاتەوە.

سەرئەنجام ئەگەر مامۆستا کاردۆخی بیوتایە ( ڕووبەندی هەڵدێنێ ) دارشتنی خوڵقاوی خۆمـە و خـۆم داهێنـاوە، بە لای ئێمەوە وتەکەی باشـترین وەڵام دەبـوو، بۆ بەرپەرچدانەوەی مامۆستا بێکەس.

## • سەرواسازی

مامۆستا بێکەس کە هەستیارێکی شارەزایە و لە دەستووری هۆنینەوەی هەڵبەستدا خاوەن تەجرەبەیە، لەبەر تیشکی ئەم تەجرەبەیە و شارەزاییەدا، ڕەخنەی لە سازکردنی سەروای دێڕێك لە هەڵبەستەکەی مامۆستا کاردۆخی گرت و وتی:

**( سەیرێکی ئەم بەیتەش بکەن:**

ئەگەر دیقەت بکەن ئەمڕۆ لە حاڵی کوردی زۆر جێگە

پەچە و عەبا و دەواری ڕەش بە پێ ناوە و بەپێ جێگە

بەڵێ، ئەم شـیعرە مەوزونە بەڵام وادیارە، کە م. کاردوخی لە ئسـوڵی شعرا نەشـارەزایە، چونکە دوا وشەی هەر دوو مەسرەعەکە کە (جێگە) یە، ئەبێ کەلیمەی پێش (جێگە) لە سەر

1 بڕوانە گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٨) ساڵی (٤)ی تەشرینی دووەم ساڵی ١٩٤٣ ز، ل ٦٢.

یەك وەزن بێ، تەماشایەكی ئەم بەیتەی زێوەر بكەن، كە وێنەیەكە بۆ ئەمە:

ئەی وە تەن چەند خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی

مەزرەعەی توخمی نەشات و بـــاعیسی ژینی منی

لێـرەدا دەبینیــن كە وشـەی (منی) لە هەردوو مەسـرەعی بەیتەكەدا بەكارهێنـراوە، بەڵام وشەی پێش (منی) لە هەر دوو مەسرەعەكەدا لە سەر یەك قافییەیە، كە عیبارەتە لە شیرینی و ژینی ).[1]

مامۆستا كاردۆخی سەبارەت بەم تێبینییەی مامۆستا بێكەس دانی بە هەڵەی خۆیدا ناوە و وتوویەتی:

( لە لێكۆڵینەوەكەی مامۆستا ف. بێكەسدا، شتێك كە زۆرم پێ خۆش بووبێ و وەكوو گوڵ پێی گەشامەوە و بەلامەوە زۆر ڕێك بووبێ، بە مامۆستای لەمەودوام (قافیەی شیعر) بوو، كە یەكێكیان چەوت بوو (هەرچەندە مەوزون بوو) چونكی ئەم ئەزانی دوا وشـەی دوو مەسرەع ئەگەر هاتوو یەك كەلیمە بوو پێویستە وشەی پێش ئەو دوو كەلیمەیە لە سەر یەك وەزن بێ، بەڵێ ئەمەم نەزانیبوو، بەڵام ئەم زانی كە زۆر لە شاعیرەكانی فارس و ئەدیبەكانی سەدەی بیستەم فەرموویانە: شاعر پێویست نییە زۆر خۆی ماندوویكا بۆ دۆزینەوەی قافیە، شعر هەر مەوزون بێ بەسە. مەبەس لە شعر دەرخستنی ئامانجە نەك ڕیزكردنی وشە و قافیە )[2]

مامۆسـتا كاردۆخی لە مەسـەلەی سـەروادا، كە دەڵێ: هەسـتیاران گوێیان نەداوەتێ، بێگومـان لـە ڕاسـتییەوە هێجـگار دوورە، چونكـە سـەروا ( قافیە) لە هەڵبەسـتدا، بە زمانە ڕۆژهەڵاتییەكان هەموویان بنج و ڕەگەزێكی گرنگە و هەرگیزاوهەرگیز فەرامۆشناكرێت.

بەڵێ لە یەك هەڵبەستدا ڕەنگە سەروای ڕەنگاوڕەنگ بەكاربهێنرێ و هەستیار خۆی بە یەكێتیی سەرواوە نەبەستێت، كە بەرهەمەكەی لەم ڕۆژانەدا بە زاراوەی ( هۆنراوەی سەربەست - الشعرالحر) ناودەبرێ، بەڵام بە هیچ ڕەنگێ نابێت هەستیار لە دەستووری سازكردنی قافیەدا لابدات و هەڵەبكات، چونكە جۆربەجۆریی قافیە لە هەڵبەستدا شتێكە و هەڵەكردن شتێكی تر.

## • سازكردنی وێنەی هونەری

مامۆستا فایەق بێكەس سەبارەت بە وێنە هونەرییەكانی هەڵبەستەكەی مامۆستا كاردۆخی لە لێكچوواندن و خوازە و خواستن و دركە، واتە: ( تەشبیە و مجاز و استعارە و كنایە) چەند

---

[1] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٣)، ساڵی (٤)، ئەیلولی ١٩٤٣ ز ل ٥٦

[2] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (١١)، ساڵی (٤)، تەشرینی دووەمی ١٩٤٣ ز ل ٦٣

تێبینییەکی نواندووە و وتوویەتی:

( لە شعرێکی تریا ئەڵێت عەبا دەسماڵی جۆلایە. ئێمە بەش بە حاڵی خۆمان تا ئێستا لەم دەسماڵی جۆلایەمان نەبیستووە و لە گەلێ پیرەژنیشمان پرسیوە، لە پێکەنین بەولاوە هیچ وەڵامێکی تریان نەداوەتەوە. ئەمانە هەمووی لە لایەك بوەستێ لە هەموو سەیرتر ئەم شعرەیە:

(چوارلا) شعری (کاردۆخی) دواخست و لە ناوی برد

نەمامی فــکری هەڵکێشا لە خاک و ڕۆژ و ئاوا کرد

ئەمەیە سەری لە ئێمە تێکداوە، ئەمەیە بە داخەوە پێوەی ئەتلێینەوە و تێناگەین، ئەمەیە: "المعنی فی بطن الشاعر."

هاوار، خوێندەوارینە. هاوار شـاعرانی کورد، لەم تەلیسـمە ڕزگارمان کەن، یا بە داخەوە سەرنەنێینەوە، مەبەس چییە لەم شعرە تێمان بگەیەنن؟

ئینجا تۆش جەنابی م. کاردۆخی تکا ئەکەین ئەم گرێکوێرەیەمان بۆ بکەرەوە، مەبەست چییە لەو شعرە ؟ مەعناکەی چییە؟ هەموو بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی وەڵامێکی تۆین.

ئیتر تکای دواییمان ئەوەیە لەو لاوانەی کە تازە دەست ئەکەن بە نووسین و شعردانان لە پێشـەوە شـارەزاییەکی تەواو پەیدابکەن و موتالەعەیەکی زۆری ئەشـعار و ئەدەبیاتی کوردی بکەن، ئەگینا ئەگەر مەبەس لە نووسین هەر وشەڕیزکردن بێ هیچ نرخێکی نابێ، ڕەنجەکە بـە فیـرۆ ئەڕوا، نە خۆیان و نە هاوزەمانەکانیان سـوودێکی لێنابینـن. جا بەو بۆنەوە هیوادارم نووسـینی لاوەکانمان بە پوختی و بە ڕێکوپێکی بکەوێتە بەرچاو )[1]

مامۆستا کاردۆخی هەڵبەت وەڵامی بۆ ئەو تێبینیانەی مامۆستا فایەق بێکەس هەبووە، بۆیە وتوویەتی:

( لە بەیتی دواییا، کە زۆر بە پەرۆشـەوە داوای مەبەس و مەعنای ئەو شعرە کرابوو، کە لە کاتی چاپکردنی مەسـرەعی دووەمیا لە جیاتی ( ئاوی ) وشـەی (ئاوا ) نووسـرابوو، ڕاستکردنەوەی بەم جۆرەیە:

(چوارلا) شعری (کاردۆخی) دواخست و لە ناوی برد

نەمامی فکری هەڵکێشـا لە خـاک و ڕۆژ و ئاوی کرد

چوارلا : محیت: بیئە: ناوچە: ئەو جێگەیەی کە پیاو تیایا ئەژی.

چوارلای کاردۆخی بوو بە سەبارەت بۆ فەوتان و دواکەوتنی شیعرەکانی، هەر ئەو چوارلایە بوو بە سـەبەب بۆ هەڵکێشـان و دوورخسـتنەوەی نەمامی فکر لە ئاو و خاك و لە ڕۆژ، کە

---

١ بڕوانە گەلاوێژ ژمارە (٩)، ساڵی (٤)، ئەیلولی ١٩٤٣، ل ٥٨ - ٥٩

هەرسێکیان پێویستی ژیانی ئەمام و درەختن.

لێرەدا ناتوانم زیاتر لەمە بنووسم، زۆرتری خوێندەواران شارەزای خووڕەوشتی ئەم ناوچەیەن، ئەزانن سەربەستیی فکر و ئازادی دیلی دەستی عادەتی ئەم شوێنەن. هەروەهاش بۆ تەعبیری - عەبا دەسماڵی جۆڵایە - فەرمووتە پێکەتینی پیرەژنانە، بۆ مەعنای تێمان ناگەیەنی ئەم دەسماڵی جۆڵایە چییە؟ ئایا دەسەسرێکی مەوهوم نییە. ئایا ئیسمی بێ موسەما نییە؟ وەکوو ئەم سێ شتە: (تەیری عەنقا، دەشتی جابولقا، پلاوی خانەقا) ئیتر ئایا ڕاست نییە ئەگەر ژن مەیلی خراپەی هەبێ بێ عەبا هەر هیچ نییە و شتێکی خەیاڵییە).[1]

مامۆستا فایەق بێکەس و مامۆستا کاردۆخی، کە لەم دوو دەقەدا ڕەخنە لە یەکتر دەگرن، هەڵبەت جیاوازییەکەیان لە سەر سازکردنی وێنەی هونەری بە وشە دامەزراوە.

مامۆستا بێکەس داوای ڕوونی و ڕەوانی وێنە هونەرییەکانی شێواز لە مامۆستا کاردۆخی دەکات، چونکە لێکچواندنی عەبا بە دەسماڵی جۆلا هیچ مەعنایەك ناگەیەنێ. ئایا کە جۆلا عەبا دەچنێ دەبێ بە هی خۆی و خۆی لەبەری دەکات؟ ئەمە پرسیارێکە وەڵامەکەی ڕوون و ئاشکرایە، کە عەبا نیشانەی جۆرە تەقالیدێکی تایبەت بە ئافرەتە، بەڵام هەستیار نەیتوانیوە بەو وێنە هونەرییەی واتاکەی خۆی بدرکێنێ.

هەروەها زاراوەی چوارلا کە مامۆستا کاردۆخی بە مانای بیئەی عەرەبی سازیکردووە، بە هیچ جۆرێك بۆ ئەو مەبەستە دەستنادات، چونکە چوارلا واتاکەی (الجهات الاربعه) یە، کەچی (البیئه) ماناکەی هیچ پەیوەندییەکی بەم مەبەستەوە نییە. ئایا (البیئه) تەنیا مەعنای لای ڕاست و لای پێشەوە و دواوە دەگرێتەخۆی یان زیاتر کارتێکردنی سروشتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری دەگەیەنێ، کە هێزی ماددی و مەعنەوی پێکەوە ئاکامەکەیەتی.

مامۆستا کاردۆخی پاش ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپی لەو دێڕەدا بە لای ئێمەوە لە تەشبیهکردنی فیکر بە ئەمام تا ڕاددەیەکی زۆر سەرکەوتووە و وێنەیەکی هونەری جوانی سازکردووە، بەتایبەتی کە پەیوەندییەکانی ئەم تەشبیهەشی لە ئاووهەوا و خاك هێناوەتەوە.

لێرەدا پێویستە ئەوە دووپاتبکەینەوە، کە شیعری کوردی لە مەسەلەی وێنەی هونەری پێویستە لە تەمومژی و لێڵی و ناڕوونی دوورکەوێتەوە هەروەکوو - مامۆستا بێکەس چل ساڵ لەمەوبەر وتوویەتی: بۆ ئەوەی ماناکەی ڕوون بێت و هەستیار پەیامی خۆی بگەیەنێ، بەڵام بەداخەوە لەم ڕۆژانەدا ئەم پێویستییە لە لایەن زۆربەی هەستیارە لاوەکانمانەوە فەرامۆشکراوە و بە لاساییکردنەوەی مەدرەسەی ئەدەبی پەرناسی و سریالی لە ئەورووپا، زمانی هۆنراوەی

---

[1] گەلاوێژ ژمارە (١١)، ساڵی (٤)، تشرینی دووەم (١٩٤٣)ی زایینی، ل ٦٠ - ٦١

کوردیان کردووە بە تەلیسم و موعەما و تەنانەت دەستوورەکانی شێوازی هۆنراوەی ڕەمزیشیان پێشێلکردووە.

## • شعر و شاعر لە وتارە ڕەخنەسازییەکەی ماموستا شێخ محەمەدی خاڵدا

ماموستا شێخ محەمەدی خاڵ لە ژمارە ٥ ی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی ٧ی مانگی مایسی ١٩٤٦ زایینی، وتارێکی ڕەخنەسازی بە ناونیشانی: ( شعر و شاعر) بڵاوکردەوە. سەرباسەکانی ئەم وتارە بە گشتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆیان دەنوێنن:

- **پێناسە و سەرچاوەی شیعر..**
- **دەور و ئەرکی شاعیر لە کۆمەڵدا..**
- **لاساییکردنەوە و نوێخوازی لە هۆنراوەی کوردیدا..**

ئێمە بە هیوای سوود گەیاندن بە هۆنراوەی کوردی، ئەم سەرباسانە یەکە بە یەکە شیدەکەینەوە وهەڵیاندەسەنگێنین.

## • پێناسە و سەرچاوەی هۆنراوە

ماموستا شێخ محەمەدی خاڵ بە خامە بە پیتەکەی و بە شێوازێکی وێژەیی پێناسەی هۆنراوە دەکات و پەنجە بۆ سەرچاوەکانی درێژدەکات و دەڵێ:

( شعر قسەیێکی ڕێکوپێکی زۆر جوانە کە لە دڵ و دەروونی هێندێ خاوەن بیری خوادادەوە هەڵئەقوڵێ بۆ سەر زمانی، لە پەردە و کالایێکی موزیقیدا، کە بە بیستنی مەردوم ئەکەوێتە جونبوش و جوڵەجوڵ.

شعر سروشێکی (وحی) دەروونییە، لە ئاسمانی مێشکەوە بە هۆی فریشتەی (مەلەک)ی بیرەوە دێتەخوارێ بۆ سەر زمان و قەڵەمی شاعر).[1]

ماموستا خاڵ لەم دەقەدا هەرچەندە زاراوەی وحی و مەلەک بەکاردەهێنێ و ڕەنگە وا تێبگات کە پێناسەکەی بۆ هۆنراوە میتافیزیقی و ناواقیعییە، بەڵام ئاشکرایە، کە ئەم دوو زاراوەیە بەستراون بە بوون و وجودی هەستیارەوە وەکوو ئینسانێکی سەر ڕووی ئەم زەمینە بە بەڵگەی ئەوەی وشەی بیر، کە دوو پارچەی هەستپێکراون لە لەشی ئادەمیزاددا، ماموستا خاڵ

---

[1] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٥)، ساڵی (٧)/ مایسی ١٩٤٦ی زایینی، ل ٤٤

بە سەرچاوەی شیعر دایاندەنێ. دڵ و بیری شاعیریش هەڵبەت لە کۆمەڵ و ژینگە و ڕووداوەوە ناوەڕۆك و بیرۆکە وەردەگرن، کە لایەنی گرنگی هەڵبەست لە قاڵبی زماندا خۆی دەڕازێنێتەوە.

## • دەور و ئەرکی هەستیار

مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ پاش شیکردنەوەی سروشتی هۆنراوە، لە دەور و ئەرکی هەستیار دەدوێ و دەڵێ:

( شاعر هەندێ جار مەعنای تازەی نەودیمەن دائەڕێژێ و بیری زۆر جوان ئەهۆنێتەوە بە ڕەنگێکی وا، کە هەموو ژیرێك تیا سەراسیمە ببێ، لەم حەلەدا شاعر وەك دەریایی (غواصی) یەك وایە، کە لە بنکی دەریادا گەوهەر و بەردی بە نرخی وا دەرێنێ، کە شایستە و زیبندەی نقیمی ئەموستیلەی پەنجە و گوارەی گوێ و ملوانکەی گەردن و سەرسنگی جوانان بێ.

یا وەك کیمیاگەرێك وایە کە خاکێکی تایبەتی لە بۆتەدا بتوێنێتەوە و لە پاشا دایڕێژێ بە شووشە زێڕیکی وا کە وەك چرا بدرەوشێتەوە.

گاهێ شاعر مەعنای هەر جایێ (مبتذل) ئەهێنێ و لە پەردە و کاڵایێکی وا جوان و ڕەنگاوڕەنگ پیشانی ئەدا، ئەڵێی هێشتا نەوتراوە و نەبیستراوە، لەم دەمەدا شاعر وەکوو سەنگ تەراشی وایە، کە لە پارچە بەردێکی ناڕێك، ئادەمیزادێکی ڕێکوپێك داتاشێ، لە وێنەی ئافرەتێکی جوانی شەنگ و شۆخی باڵا لاولاوی ناوقەد باریك، یا لە وێنەی پادشاییێکی دادپەرستی نیشتمانپەروەر یا زانایێکی دانای پێشەوا، کە هەموو کەسێ بە شانازییەوە لە ژوور سەرییەوە و بەرامبەر بە خۆی دابنێ بۆ جوانی یا بۆ یادگار و پەند بە ژیری.

بە ڕاستی قەریحەی شیعر شتێکی زۆر زۆر سەیرە، کە لە دڵ و دەروون و مێشك و سەری هێندێ کەسا هەیە و لەگەڵ سروشتیا تێکەڵە.

شاعیر ئەگەر بیەوێ ئەتوانێ بە شیعری ئاگرینی خۆی ئاگر بەربداتە دڵی هەزاران کەس، لە خەوی بێهوشی بێداریان بکاتەوە، کاڵای تەمەڵی و ترسنۆکی داکەنێ لەبەریان، بە چەك و قەڵغان و زرێی مەردی و نەبەردی بیانڕازێنێتەوە.

شاعیر ئەتوانێ بە پەند و ئامۆژگاری خۆی، ڕەوشت و خووی ناشیرین لە دڵان دەرێنێ و ڕیشەکێشیان بکات، لە جێگای ئەو، ڕەوشت و خووی جوان بڕوێنێ و ئاویبدا، تا ڕیشە دابکوتێ.

شاعیر ئەتوانێ بە وتاری دڵفڕێنی خۆی دڵڕەقان نەرمبکا و دەستی دەستقوچاوان بکاتەوە

بۆ هەموو جۆرە پیاوەتی و یارمەتیدانێکی کۆمەڵایەتی.

شاعیر ئەتوانێ بە جادوو (سحر)ی حەڵاڵی خۆی مەردومی خەفەتبار بێنێتە پێکەنین و ئادەمیزادی کەیفخۆش بێنێتە گریان و چاوسڕین.

شاعیر ئەتوانێ لە هەموو دەمێکا بە هەموو ڕەنگێ و لە هەمو ڕوویێکەوە کاربکاتە دڵ و دەروونی مەردوم، بە ئارەزوی خۆی هەڵیانسوڕێنێ.

جا ئەگەر خواستی خوا وابوو بە گەلێک، کە چاکیان بۆ بێنێتە پێشەوە، ئەوا چەند شاعیرێکی خوێندەواری وریای دوور ئەندێشەی ژیری خاوەن بیری بەرزی بە ڕەوشت و خووی جوانیان ئەخاتە ناو و بە شیعری پەند و ئامۆژگاری بەرزەوە پێشیان ئەکەون و لە هەموو تەنگانەیەکدا ڕێگایان بۆ ڕووناک ئەکەنەوە و چرای زانینیان بۆ دائەگیرسێنن.

قەریحەی شعرییە کە مەجاز لە کۆمەڵی ئادەمیزاددا سەرەتا و پێشڕەوی حیکمەت و فەلسەفە و مایەی سەرکەوتنیان بووە بۆ سەر پلەی شارستانی و خۆشبەختی.

کەوابوو هەر گەلێ تا شاعیری تێگەیشتووی زۆرتر بێ بەختیارترە)

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لەم باسە گرنگەدا هەرچەندە لە چەند بابەتێکی کەسی و هونەرییەوە، دەور و ئەرکی هەستیار دەستنیشاندەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم دەور و ئەرکە دەبەستێ بە ئامانجی کۆمەڵایەتی و گەلەوە، بەم جۆرە هەستیار لە ڕوانگەی ئەم توێژەرە کوردەوە، پێشەوایەکە و لە هەموو بابەتە هونەرییەکانیدا دەبێت خزمەتی نیشتمان و نەتەوە بکات.

## • پێوانەی نوێخوازی لە هونەری هۆنراوەدا

هەستیاری پەسەندکراو لە ڕوانگەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵەوە، کە ئەوانە پێوانەکانی هەڵسەنگاندنی پێوانەی هەستیار بێت دەبێت هۆنراوەی نوێی کوردی چلۆن دەستنیشاندەکرد؟.

ڕەخنەسازەکەمان وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە و دەڵێ:

(بەڵێ مەبەس لە شعر و شاعر ئەمانەن کە وتمان نەك ئەو شاعرە کۆنە پەرستانەی هەرزەگۆیانەی بێ گیان و دەمارانەن، کە لە شێوەیێکی کۆنی هەزار ساڵ لەمەوپێشدا فێری شیعروتن بوون و چەن تەشبیە و ئیستعارەیێکی ناقۆڵایان لە شاعرە کۆنەکانەوە بە کەلەپوور (میرات) بۆ بەجێماوە. هەموو ڕۆژێ لە کاڵایێکی کۆنی ڕزیوی ناشیرینی بێکەڵکا دەری ئەخەن. بە مەدح یا زەم یا مێژووی لەدایکبوون، یا مردنی ئەم و ئەو بە سەری ئەبەن. کۆمەڵ ئەبێ لە سروشتی بێفەڕی ئەم جۆرە شاعرانە چ بەهرەیەك وەرگرێ و ؟!! لە گوفتار و وتاری

پێچراوەی ئەم هەرزەگۆیانە چ قازانجێ بکا ؟!!

شعر لە هەموو شتێك زیاتر نزیکترە بە گیاندار لە دەستووری پێگەیشتن و خەملین (نشوء - إرتقا)دا هەمیشە ئەبێ لە گۆڕان و تازەبوونەوەدا بێ و بە پێی ڕۆژ کالا لەبەرکا.

شاعر ئەوەیە کە بیری خۆی بخاتە شعرەوە نەك بیری باو باپیری. شاعر ئەوەیە کە بیری ئەمڕۆ بنووسێ نەك بیری دوێنێ، یا سبەینێ، چونکە بیری دوێنێ کەرووی لێنیشتووە، بیری سبەینێش کالۆکرچ و پێنەگەیشتووە. شاعری ئەمڕۆ ئازاد و سەربەستن، لە کەس ناترسن، شعری ئەمڕۆ دیلی ئەوزانی خەلیل و عەرووز نییە.

زۆرترینی شاعیرە کۆنەکانمان تا چەند ساڵ لەمەوپێش شعرەکانیان هەر لە باسی زوڵف و خاڵ و چاو و برۆ و گەردن و باڵا و ناوقەدا بووە، تەنانەت پیاوە دینییەکانیشمان هەر لەو بابەتەوە شعریان وتووە. وەك هیچ مەعنایێکی تری نەبووبێ وابووە، زۆر سەیرە غەزەلی هەر کامێکیان ئەخوێنیتەوە لە دڵداریدا ئەبینین، دڵدارەکەی لە شعرێکا نێر و لە شعرێکا مێیە، وەك مامۆستا ڕەفیق حیلمی ئەڵێ: هەر وەك نێرەمووك بووبن وایە. ئەمە لەبەر چییە، لەبەر ئەوەیە کە هیچیان بە ڕاستی عاشق نەبوون و دڵداریان نەبووە، هەمووی لە ڕووی چاولێکەرییەوە بووە. هەر دیوانی شاعرێ کە تەماشا ئەکەی لەمپەڕی تا ئەوپەڕی هەمووی باسی زوڵف و خاڵە، حاجی قادری کۆیی ناحەقی نەبووە، کە ئەڵێ:

**(باسی زوڵفی درێژ و چاوی بە خەو نەبڕایەوە بووە....)**

تاقانە شاعرێ لە کوردستانا کە بە ڕاستی شاعر و تێگەیشتوو بوو پێویستی (واجبی) خۆی بەرامبەر بە خوا و بە نیشتمان و بە کۆمەڵ بە جێهێنابێ. لە پاش ئەحمەدی خانی و مەلای جزیری، حاجی قادری کۆییە، کە سەد ساڵ لەمەوپێش بووە. زۆر سەیرە شیعرەکانی لە ستایش و دڵداریشدا هەر دێتەوە سەر ئەو بیرە بەرزەی، کە بوویەتی، چەند جوانە ئەم شیعرەی، کە ئەڵێ:

مەعلومە بۆچی حاجی مەدحت ئەکـا بە کوردی

تا کەس نەڵێ بـە کوردی نەکراوە مەدحی باری

ئەگەر ڕاستت ئەوێ حاجی قادر شاعیری ئەو ڕۆژە نەبوو، بەڵکوو شاعیری سەد ساڵ پاش خۆی بووە. ئەو ڕۆژە کەس نەیناسیوە، ئەمڕۆ ئەناسرێ و شیعرەکانی پەسەند ئەکرێ و چەپڵەی بۆ لێئەدرێ وەك (فردەوسی)، کە لە پاش هەزار ساڵ ناسرا و پەسندکرا و کۆڕی بۆ گیرا، بەڵام حاجی قادر لە پاش مردن و ڕزین لەم چەپڵەڕێزانە چ بەهرەیەك وەرئەگرێ؟!

سا خوا بە میهرەبانی خۆی گیانی ئەو بە بەهەشت خۆشنود و دڵی هاونیشتمانەکانیشی بە

